




# سێبەری ئازادی

«هەوراز و نشێوەکانی مێژووی خەباتی کۆمەڵەی ژ.کاف»

کەمال عەبدوللاهی

# سێبەری ئازادی

**هەوراز و نشێوەکانی مێژووی خەباتی کۆمەڵەی ژێ.کاف**

**۱۳۲۱-۱۳۲٤**

# سێبەری ئازادی

## هەوراز و نشێوەکانی مێژووی خەباتی کۆمەڵەی ژێ.کاف

## ١٣٢١-١٣٢٤


نووسەر

## کەماڵ عەبدوڵلاهی






سلێمانی ٢٠٠٨

ع ۹۲۸ عەبدوڵلاهی، کەماڵ
سێبەری ئازادی، هەورازو نشێوەکانی مێژووی خەباتی کۆمەڵەی ژێ. کاف ۱۳۲٤-۱۳۲۱/
دانانی کەماڵ عەبدوڵلاهی.
سلێمانی: بنکەی ژین، ۲۰۰۸.
٤۷۳ل: وێنە، بەڵگەنامە، ۵،۱۷×۲۵ سم.- زنجیرە: ۹۲.
۱-کوردستان- مێژوو. ۲- ناونیشان. ۳- زنجیرە: (۹۲).
کتێبخانەی گشتیی سلێمانی زانیاریی سەرەتایی بۆلێن و پێرستی ئامادە کردووە

## سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

• زنجیرە: ۹۲
• ناوی کتێب: سێبەری ئازادی
((هەورازو نشێوەکانی مێژووی خەباتی کۆمەڵەی ژێ. کاف ۱۳۲٤-۱۳۲۱))
• نووسەر: کەماڵ عەبدوڵلاهی- Abdullahi.kamal@yahoo.com
• رووبەرگ: مەهاباد ـ کلبەی گرافیک ـ عەلی سەمیمی ـ ۲۲۲۹٤٦۳ ٤٤۲ ۹۸+
• ئێدیت و مۆنتاژی وێنەکان: مەهاباد ـ کلبەی گرافیک
• پیتچنین: مەهاباد ـ تاهیر کەریمی ـ ۲۲۲٤۹۷۵ ٤٤۲ ۹۸+
• بەرگەژمێر: ۱۰۰۰
• نرخ: ٦۵۰۰ دینار
• ژمارەی سپاردن: ۲۲۵۹ی ساڵی ۲۰۰۸
• شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان



لە بڵاوکراوەکانی
**بنکەی ژین**
بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و رۆژنامەوانیی کوردی
هەرێمی کوردستان: سلێمانی، ئەندازیاران، گەڕەکی ۱۰۵، کۆڵانی ۵، خانووی ۲۳، سنووقی پۆست: ١٤
تۆرماڵ: ۳۱۲۹۱۰۲ ئاسیا: ۰۷۷۰۱۵٦۵۸٦٤ یا ۰۷۷۰۱٤٦٤۸۳۳ سانا: ۱۱۲۸۳۰۹
www.binkeyjin.com

# پێرست

بابەت | لاپەڕە



**بەشی یەکەم**
**ناساندنی گۆڤاری ئاوات**

## بەشی دووهەم
## چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی ژ.ک



## بەشی سێهەم
## ناساندن و شیکردنەوەی لاپەڕەکانی نوسخەی کۆتایی ئەسڵی گۆڤاری نیشتمان و وەلانانی بەرپرسەکەی



## بەشی چوارەم
## پەیمانی سێ سنوور

## بەشی پێنجەم
## ناساندنی ناوی نهێنی ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) و رەمزی چەند شارێک



## بەشی شەشەم
## سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی کێ بوو؟



## پاشکۆ

# پێڕستی وێنەکان

# پێشکەش

ئەو بەرهەمە پێشکەشە بە:

- گەل و نیشتمانەکەم کە هەمیشە شانازیم پێوە کردوون و پێموایە لە پێناویاندا ئەو بەرهەمە کەمترین خزمەتە.

- هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەم بەگشتی و بەتایبەت دایک و بابی خۆشەویستم کە لە کاتی لێکۆڵینەوەدا دڵگەرمیان دەکردم و هەمیشە بە چاوی رێزەوە لە نووسین و کارەکانمیان دەڕوانی و هەروەها بۆ برای گەورە و خۆشەویست و بەڕێزم کاک دوکتور «حوسێنی عەبدوڵڵاهی» کە هانی دام لە خۆم رابببینم و یەکەم وتارم بڵاو بکەمەوە. وێڕای ئەو ئازیزانە پێشکەشە بە خوشکی خۆشەویستیشم «شادی» خانم کە بە هۆی ئەو بەرهەمەوە زەحمەتێکی یەکجار زۆری بۆ لەبەریەکڕانانی نووسراوەکانی خۆم لەگەڵ تایپکراوەکەی کەوتە سەر شانی و زۆرم پێوە ماندوو بوو.

- بە هەموو ئەو بەڕێزانەی لەم بەرهەمەدا یارمەتییان داوم.

# سپاس و پێزانین

لێرەدا جێی خۆیەتی سپاسی هەموو ئەو خوشک و برا بەڕێز و خۆشەویستانە بکەم کە هەر کەس بەپێی توانای خۆی لەو لێکۆڵینەوەدا یارمەتی داوم. سپاسی ئەو بەڕێزانە دەکەم کە بە دڵێکی کراوەوە ئامادە بوون وتوووێژیان لەگەڵ بکەم.

لە قووڵایی دڵمەوە خۆم بە ئەمەگداری کاک «عەبدوڵلای سەمەدی» و مامۆستای بەڕێز کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» دەزانم. سپاسی تێبینی ورد و ڕەخنەی بەجێیان دەکەم کە بێگومان بۆ پوختوپاراوتر کردنی ئەم بەرهەمە بەڕاستی کاریگەر بوون. بێشک ئەگەر دڵفراوانی ئەو دوو بەڕێزە نەبوایە کە بە بەڵگە و کتێب و سەرچاوەی باش و ڕاوێژیان گەلێکیان یارمەتی داوم، ڕەنگبوو کەس چاوی بەو بەرهەمە نەکەوتبا.

سپاسی هەستی بەتینی مامۆستای خۆشەویست و بەڕێزم کاک «عەلای سپێهرەددین» دەکەم کە ڕێنوێنی کردم و هانی دام و کتێبخانەکەی لەبەردەست نام و بۆ ئەم کارە زۆری دڵگەرمی دامێ و پتر لە خۆم پەرۆشی تەواوکردنی ئەم لێکۆڵینەوە بوو و هەروەها سپاسی ماندووبوونی «هێرۆ»خانمی کچیشی دەکەم کە زەحمەتی وەدەستخستنی چەند سەرچاوەی وەئەستۆ گرت.

دنیایەک رێز و حورمەتم بۆ «هاجەر»خانم و «رەعنا»خانمی زەبیحی هەیە کە هەرکام بەنۆرەی خۆیان، بە وتوویێژ و لەبەردەستنانی چەند وێنەیەک یارمەتییان داوم.

رێز و ئیحترامێکی یەکجار زۆرم بۆ کاک «رەحمانی خانزادێ» (نیکنەفس) و کاک «قادری تەوەککول» و کاک «قادری پاکڕەوان» و کاک «دڵشادی پاکڕەوان» و خوالێخۆشبوو کاک «مەحموودی تەلعەتی» هەیە کە وتوویێژم لەگەڵ کردوون و لە زانیارییەکانیان بەهرەیەکی زۆرم وەرگرتووە.

سپاس و رێزم هەیە بۆ هەموو ئەو ئازیزانەش کە هەرکام بە لەبەردەستنانی کتێب و وێنە دەستیان گرتووم:

کاک «ئەحمەدی شەریفی»، کاک «سەیدمحەممەدی سەمەدی»، کاک «سەلاحی ئاشتی»، کاک «ئەحمەدی بەحری»، کاک «عەزیزی وەلیانی»، کاک «رەفیق ساڵح»، کاک «فەرەیدوونی حەکیمزادە».

سپاس و پێزانین و حورمەتێکی زۆرم هەیە بۆ کاک «تاهیری کەریمی» کە جگە لە تایپی ئەم کتێبە، لە باری زمان و رێنووسیشەوە بەڕاستی بەهرەم لێوەرگرتووە.

هەروەها سپاسی بێپایانم هەیە بۆ کاک «عەلی سەمیمی» کە ئەرکی رازاندنەوەی رووبەرگ، ئێدیتی وێنە و بەڵگەکان و دەقی ئەو بەرهەمەی وەستۆگرتووە.

لە کۆتاییدا سپاس و پێزانینم هەیە بۆ هەموو ئەو کەسانەی بە هەر شێوەیەک یارمەتییان داوم و من ناویانم لە بیر چووە. خودا لە گەورەیی هیچ لایەکی کەم نەکا.

# پێشەکی

لاپەڕەکانی مێژووی گەلەکەمان پڕە لە خەبات و راپەڕین. مێژوو شاهیدە کە ئەو گەلە لە شەڕی مان و نەماندا و لە پێناوی پاراستنی خۆی و نیشتمانەکەی و دابین کردن و بەرگری لە ماف و داخوازییەکانی، شێلگیرانە و بێوچان بەربەرەکانی کردووە.

هەر کات ئاوڕێک لە مێژووی پڕ لە نەهامەت و شەڕ و کوشتاری کورد بدەینەوە، وەکوو فیلمێک دێتە بەر چاومان کە چۆن ئەو گەلە لەو کاتەوە کە هەستی بە چەوسانەوە و زوڵم و زۆری کردووە، بۆ پارێزگاری لە خۆی، مەتەرێزی بەرگری گرتۆتە بەر و بە هەموو شێوەیەک بەرەنگار بۆتەوە.

دەڵێن ئەوانەی رابردوو لە بیر دەکەن، مەحکوومن بەوەی کە دووپاتی بکەنەوە؛ کەوایە ئێمە دەبێ لە رابردوو وەکوو چرایەک بۆ داهاتوو تەجروبە وەرگرین. بەڵام ئەم رابردوویە ئەگەر نەنووسرێتەوە و تۆمار نەکرێ، چۆن ئەزموونی لێ وەردەگیرێ؟

مرۆڤی کورد بۆخۆی دایمە لە بەربەرەکانیدا بووە و دەرفەتی نووسینەوەی تێروتەسەلی مێژووی وڵاتەکەی نەبووە، ئەگەریش ویستبێتی شتێک بنووسێ، ئەوە یا کۆسپیان خستۆتە بەر رێگای، یا لەبەر هەژاری و نەداری و وەدەستخستنی بژێوی ژیان، نەپەرژاوە ماوەیەک لە کاتی خۆی بۆ

نووسینەوەی مێژووی گەل و نیشتمانەکەی تەرخان بکا: ئەوەی شتێکیشی نووسیوەتەوە، چونکە کەرەسە و ئیمکاناتی چاپی نەبووە، یا نووسراوەکانی بۆنی رەخنە و پەردە لادان لەسەر ئەو نەهامەتی و تاڵی و سوێرییانەی لێهاتووە کە بە سەر گەلەکەیان هێناوە، ئەوە بەرهەمەکەیان فەوتاندووە وتووشی رۆژی رەشیان کردووە، یا لە ترسان ئەوەندەی لە خۆی رانەدیوە چاپیان بکا و هەتا ئێستاش هەر بە دەستنووس ماوەتەوە.

لەم نێوەدا پاشکەوتوویی کۆمەڵی کوردەواری لە لایەک و حکوومەتی زەبروزەنگ لە لایەکی دیکە، بوونە دەردی سەرباری دەردان و هۆکارێکی گەورەتر لە نەنووسرانەوەی مێژووی کورد.

لێرەدا ئەم بارودۆخە هەلێکی لەباری بۆ نووسەرە بێگانەکان رەخساندووە کە بە هۆی کوردنەبوون و دووربوون لەم وڵاتە، لەو ترس و دڵەراوکەیە رەها ببن و تا رادەیەک راستییەکان بنووسنەوە، ئەویش ئەگەر ئاگاداری رەنج و نەهامەتییەکانی ئەم گەلە بووبن و دەگەڵی ژیابن و زمان قەڵەمێکی بەخێریان بە سەر لاپەرەکانی مێژوویدا هێنابێ. هەڵبەت بەداخەوە چی واشی نەماوە ئێمەش بەم باوەڕە بگەین کە ئەگەر بمانەوێ راستیی رووداو یا هەر بابەتێک بزانین، ئەوە دەبێ بەرهەم و کتێبی بێگانەکان بخوێنینەوە.

هەر لاپەڕەیەکی مێژووی کوردستان هەڵدەینەوە، داستانی قارەمانی سەرکردەیەک و هەڵگیرسانی شۆڕشێکی تێدا تۆمار کراوە. با دوور نەڕۆین و ئاوڕێک لە مێژووی کۆمەڵەی «خۆیبوون» و «شۆڕشی ئاگری» بدەینەوە.

«شۆڕشی ئاگری» وەکوو باڵی نیزامی و چەکداری کۆمەڵەی «خۆیبوون» بە سەرۆکایەتی «ئیحسان نووری پاشا» ساڵی ١٣٠٧ی هەتاوی (١٩٢٨ی زایینی) لە چیای ئاگری هەڵاییسا و تا ساڵی ١٣٠٩ی هەتاوی (١٩٣٠ی زایینی) بەردەوام بوو. تا ئێستا لەسەر ئەو شۆڕشە چەندین وتار و کتێب و لێکۆڵینەوە بڵاو بۆتەوە کە خاڵی هاوبەشی زۆربەی ئەو نووسراوانە ئەوەیە کە ئەو شۆڕشە ئاڵای تایبەت بە خۆی هەبووە و ئاڵاکەی لە سەر چیای ئاگری و ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی ئەو شۆڕشە شەکاوەتەوە. هەروەها مارشی میللی تایبەت بە شۆڕش لە چیای ئاگری دەنگی داوەتەوە.

لەو بێئیمکاناتییەشدا رۆژنامەیەک بە ناوی «ئاگری» وەکوو زمانحاڵی ئەو راپەڕینە چاپ و بڵاو کراوەتەوە. کۆمەڵەی «خۆیبوون» و «شۆڕشی ئاگری» پێوەندی بەربڵاویان لەگەڵ چەند وڵاتێک ساز کردووە و دەیان چالاکی دیکەشیان لە مێژووی بزووتنەوەکەیاندا تۆمار کردووە. بەڵام تا ئێستاش رەنگە زۆرکەس مێژووی ئەو شۆڕشە وەک ئەفسانەیەک بنووسنەوە و تەنانەت هێندێک لە دەسکەوتەکانی بە زێدەڕۆیی لەقەڵەم بدەن و لەو بڕوایەدابن کە ئەو شۆڕشە بەو تەمەنە کورتەیەوە ناکرێ و نەیتوانیوە دەسکەوتی وا گەورەی هەبووبێ و دووریشە توانیبێتی لەگەڵ وڵاتانی دەرەوە پێوەندی سازکردبێ. بەڵام کاتێک دەبینین دەیان کتێب و بەڵگە لە بەڵگەنامەکانی وڵاتانی ئینگلیس و رووسیا و ئێران لەسەر ئەو شۆڕشە بڵاو کراوەتەوە و زۆر تێکۆشەری ئەو بزووتنەوەیە لە کوردستانی سووریاوە خۆیان گەیاندۆتە ئاگری و پاشان بیرەوەرییەکانی خۆیان نووسیوەتەوە، دێینە سەر ئەو باوەڕە کە هیچ دووریش نییە دەسکەوتی وا گەورەی لێ کەوتبێتەوە.

خوێندنەوەیەکی قووڵ و وردی ئەو بابەتانە وردەوردە رووناکبیر و بیرمەندانی کوردیشی هان دا بۆ بەرگری لە خاک و نیشتمانەکەیان و بووژاندنەوەی زمان و فەرهەنگی گەلەکەیان، پتر هەست بە بەرپرسیێتی بکەن و تەکانێکی بەهێز بە خۆیان بدەن. ئەگەرچی ئەو بزووتنەوانەش درەنگ دەستیان پێکرا، بەڵام هەرچی بێ مەشخەڵەکەی هەڵکرا و کوردیش دەستی بە نووسینەوەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی مێژوو و ئەدەبیاتی وڵاتەکەی کرد.

گێژەڵووکەی مێژوو، ماڵ و حاڵی کوردی وەها تێکەوە پێچاوە کە هەر شتەی خستۆتە جێیەک. رۆژگاری کوردی کردۆتە گلۆلەیەکی ئاڵۆز و پساو کە هەر سەرەداوەی لە لایەکە. وەها ئاڵۆز کە دەیان و سەدان جۆلای وەستا و کارامەی دەوێ هەتا ئەو هەمووە داوە بخەنەوە سەر یەک و لە یەکتریان گرێ بدەنەوە. ئەوان دەبێ رایەڵ و پۆی ئەو داوە ئاڵۆزانە بکەنەوە و بە کەرەسەکانی کارگاکەیان و دواتر بە مەکووکی بیر و زەینیان و تێوەدانی رەنگی جوان، کەشکۆڵی جوان و شیاوی تێهاوێن و کری رازاوەی لێ ساغ بکەنەوە.

مێژووی گەلی کورد پرش و بڵاو و ئاڵۆزە، نادیارە و تا رادەیەکیش رەنگی چیرۆکی بەخۆوە گرتووە. پشوودرێژی و شێلگیری و خۆماندووکردنێکی

بێوچانی زۆری دەوێ هەتا لەو پرش و بڵاوی و نادیارییە بێتە دەرێ. ئەرکێکی گەلێک قورس و گران و سەختە بەڵام دەگونجێ و ئاستەم نییە.

بە زەحمەت و رەنج و تێکۆشان و شەووشەونخوونی و ئارەقی نێوچاوانی سەدان ئینسانی خەمخۆر و نیشتمانپەروەر و لە خۆبوردووی وەک بنەماڵەی بەدرخان و بلیمەتی وەک مامۆستا حوسێن حوزنی موکریانی و... رۆژگاری ئەم گەلە گەیشتۆتە ئەورۆ.

زۆر بوون ئەو نیشتمانپەروەر و فیداکارانەی ئامادە بوون لە خۆشی خۆیان ببوورن و هەموو تەمەن و ژیانیان بۆ خزمەت بە گەلەکەیان بەخت بکەن و هەر لەو رێگایەشدا بە شانازی سەر بنێنەوە. ئەوان بە هەر رەنج و چەرمەسەری و بەهایەک بووە هەتا ئێرەیان هێناوە. درێخییان نەکردووە و لە بارودۆخە پڕ مەترسیدارەکاندا گیانی خۆیان لە سەر بەری دەستیان داناوە و لە پێناو گەیشتن بە ئامانجەکانیان لە هیچ تەنگ و چەڵەمە و ناخۆشییەک نەپرینگاونەوە. نەبوونی ئیمکانات و بێهێزی مادی و فەقیری و نەداری کاری تێنەکردوون و بگرە وای کردووە هەنگاوی بەبڕشتتر و قایمتر بهاوێن.

بەهەق ئێمە بە دڵ و بە گیان منەتبار و قەرزداری ئەو پیاوە بوێر و کۆڵنەدەرانەین. لێرە بەدواوە باری ئەرکی قورس و گرانی ئەم کەڵەپیاوانە، دەکەوێتە سەر شانی ئێمە. هەر لێرەشدایە کە ئەرکی ئێمە وەک نیشاندانی ئەمەگداری و پێزانین بەو هەموو تێکۆشان و چاکە و خزمەتە بەنرخانەی ئەوان، دەست پێدەکا.

بەش بە حاڵی خۆم لەمێژ بوو پێوە بووم لە سەر بەشێکی مێژووی وڵاتەکەمان بەرهەمێک بڵاو بکەمەوە. ئەوە بوو بڕیارم دا چەند بابەتێکی مێژووی سەردەم بکەمە سەردێڕی لێکۆڵینەوەکانم و دەستبەکار بم. زۆر جار ئەو بیرەم بە مێشکدا دەهات کە بۆچی دەبێ لە سەر مێژووی بزووتنەوەیەکی وەکوو کۆمەڵەی «ژێ. کاف»کە مەودایەکی وای لەگەڵ رۆژگاری ئێستاماندا نییە، کارێکی پوخت نەکرابێ و مێژوویەکی ئەوەندە نادیاری و ئەفسانەیی هەبێ. ئاخر هەموو جارێ ئەو کۆمەڵەیەشم وەکوو شۆڕشەکەی ئاگری دەهاتە بەر چاو و لەو بڕوایەدا بووم کە ئەگەر مێژووی کۆمەڵەی (ژ.ک)یش نەنووسرێتەوە، هیچ دوور نییە مێژووی ئەو بزووتنەوەیەش وەک شۆڕشی ئاگری و دەیان شۆڕش و

چونکە بەڕاستی باوەڕم بەو قسە جوانەی «مۆنتێسکییۆ» هەیە کە دەڵێ: «دەبێ زۆر بخوێنینەوە تا بزانین هیچ نازانین»، ماوەیەکی زۆر هەر خەریکی دیتنەوەی سەرچاوە و بەڵگەی تازە و وتووێژ لەگەڵ ئاگادارانی بواری لێکۆڵینەوەکەم بووم. جاروبار شتێکیشم دەنووسی بەڵام هەموو جارێ کە ساغ دەبوومەوە بڵاوی بکەمەوە ئەو فەرمایشەی «مامۆستا هێمن»م وەبیر دەهاتەوە کە دەڵێ: «وەباڵی کوردتان بە ئەستۆی ئەگەر خۆتان ماندوو نەکەن» هەر بۆیە بۆ ماوەیەکی زۆر لە خۆم ڕانەدی و پێشم دروست نەبوو بڵاویان بکەمەوە.

دیسان وەخۆ کەوتم، وێنە و بڵاوکراوە و سەرچاوەی زۆر باشی دیکەشم وەدەست خستن. بەڵام نایشارمەوە کە پەیداکردنی ئەوەندە بەڵگە و بڵاوکراوانە کە لەم بەرهەمەدا هاتوون و کەلکیان لێ وەرگیراوە کارێکی گەلێ سەخت بوو. زەحمەت و کوێرەوەرییەکی زۆرم کێشا، زۆر ماندوو بووم هەتا ئەوەندە شتەم وەدەست کەوت. بەڵام لە پێناوی گەورەیی ئەرکەکەم هیچیانم وەبەر چاو نەهێنا و هەموویانم وەپشت گوێ خستن و بە خۆشییەوە هەوڵەکانم بێسوود نەبوون.

دەڵێن: «خراپترین جەوهەر و نووسین، باشترە لە بە بڕشتترین و باشترین بیر و زەین.» کەسانێک هەبوون کە دەوری سەرەکیان لە چالاکییەکانی سەردەمی بزووتنەوەی «کۆمەڵەی ژ.ک»دا گێڕابوو و بەشداری کار و خەباتەکانی بوون بەڵام لەبەر هەلومەرجی ناخۆشی پاش هەڵوەشاندنەوەی «کۆمەڵەی ژ.ک» و دواتر رووخانی کۆماری کوردستان، پەرەوازە بوون و لە دەربەدەریشدا دەرفەتی نووسینەوە و تۆمار کردنی مێژووی رووداوەکانی ئەو سەردەمیان نەبووە؛ یا ئەوە کە بارودۆخەکەیان بۆ نووسینەوەی زانیارییەکانیان بە لەبار و گونجاو نەزانیوە. هەر بۆیە پاش ماوەیەک بێ ئەوەی کەس هەستی پێکردبێ، زۆر نهێنی گرینگ و زانیاری دەگمەن و نەگوتراویان بە سەربەمۆری دەگەڵ خۆیان بردۆتە ژێر گڵ. هەڵبەت ئەوە جودایە لەو هەمووە بەڵگە و سەنەد و بڵاوکراوانەی کە هەر لە سەردەمی کۆماردا بە دەست بەرپرسانی کورد و بە مەبەستی نەکەوتنە دەستی زانیاری سووتێنران یا لە بن خاکدا رزین و فەوتان. هەروەها جوداشە لەو هەمووە بەڵگە و سەنەدانەی کە لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی وڵاتانی دراوسێدا دەپارێزرێن و هەتا ئێستا چاوی کەسیان پێنەکەوتووە.

بەڕاستی ئینسان داخ دەیکوژێ ئەگەر دەبینێ یا دەبیسێ کە زۆر کەسیش هەن کە بەڵگە و سەرچاوەی دەگمەن و بڵاونەکراوەیان لە لا دەست دەکەوێ، بەڵام نە ئەوەیە بۆخۆیان دەست بدەنە قەڵەم و شتێکی لەسەر بنووسن، نە ئەوەشە یارمەتی کەسێک بدەن هەتا لە فەوتان رزگاریان بکەن.

دەڵێن یەکێک لە کابرایەکی دەدا، کابرا هەرچی زیاتری وێدەکەوت، دەیگوت لێمدە با زیاتر قەڵس بم. رێبوارێک بەوێدا دەڕوا و گوێی لێدەبێ، دەڵێ جا کاکە ئەوە مردی، ئەدی کەنگێ قەڵس دەبی؟!

نازانم ئەوانەی بەڵگە و سەنەدێک بە خۆیانەوە شک دەبەن کەنگێ قەڵس دەبن و بڵاویان دەکەنەوە؟ پێم وایە رایانگرتوون بۆ کاتێکی نادیار کە خودا نەبێ کەس نازانێ ئەو وەختە کەی وەدی دێ!

ئەوەندە زانیارییەش کە نێونێوە لە کتێب یا گۆڤار و بیرەوەرییەکیشدا چاپ کراوە و بڵاو بۆتەوە لە چاو چالاکییەکانی ئەوکات، دڵۆپێک لە دەریای پڕ راز و رەمزی ئەو سەردەمن، تازە ئەگەر بۆچوونی شەخسی و لێکدانەوەی هەڵە و دوور لە راستی رووداوەکانیان تێکەڵ نەبووبێ. ئەوانەی ئەندامی ئەم کۆمەڵەیەش بوون، زۆربەیان لە نێوماندا نەماون. ئەوانەی ئێستاش ماون، یا بابەتەکانیان لە بیر چۆتەوە یا چەند کەسێکی دەگمەنن کە دیتنەوەیان سەختە و کەمیان دەتوانن یارمەتیدەر بن.

هەرچۆنێکی بێ، کاتێک دەستم بە لێکۆڵینەوە کرد تا رادەیەکی زۆر هۆکارەکانی بە نەناسراوی مانەوەی بەشێکی دیکە لە مێژووی دەسەڵاتی کۆمەڵەی (ژ.ک)م بۆ دەرکەوت. دوورکەوتنەوە لە کاتی رووداوەکان یەکێکی دیکە لەو هۆکارە گرینگانەیە . ئەگەر بێتوو ئێمە لە کاتی خۆیدا مێژووی فەرهەنگ و ئەدەبیات و بەسەرهاتی گەل و نیشتمانی خۆمان تۆمار نەکەین و نەیاننووسینەوە، ئەوە رۆژبەڕۆژ لە کاتی روودانیان دوور دەکەوینەوە و زۆر کەسی ئاگادار لە بابەتەکانیش لە دەست دەدەین. هەڵبەت ئەم بابەتە زۆربەی جووڵانەوە و شۆڕشەکانی دیکەی کوردیش دەگرێتەوە.

بەپێی تەواوی ئەو هۆکارانەی لێرەدا باسیان هاتووە، ئەوەی لەو نێوەدا بۆ نووسەر و لێکۆڵەری کورد دەمێنێتەوە، چەند کتێبی بیرەوەری و سەدان

دەڵێن لە «میکل ئانژ»یان پرسیوە: «چۆن لەو بەردە رەقوتەقانە ئەو پەیکەرە جوانانە دروست دەکەی؟ لە وەڵامدا گوتوویەتی: بەر لەوەی دەست بەکار بم، شێوەیەکی جوانی ئەو پەیکەرانە لە نێو بەردەکاندا دەبینم، تەنیا ئەرکی من ئەوەیە شتە زیادییەکانیان لێ فڕێ دەم».

لێرەدایە کە ئەرکی لێکۆڵەری کورد وەک وەستایەتی جۆلاکان و پەیکەرەتاشینی «میکل ئانژ»ی لێدێ. نووسەر دەبێ لە نووسراوەی کتێب و گۆڤارەکان ورد بێتەوە و بابەتەکانی باسکراو لەگەڵ ئەوەندە بەڵگەی لە بەر دەستدا ماون لە بەریەک رابنێ و بەراوردیان بکا و دواتریش بە هێزی قەڵەم و بیر و هۆشی، تۆزتەکێنێکی بکا. لێکدانەوە ناڕاستەکانیان لێ فڕێ دا و بەردەشۆریان بکا و بەکاوەخۆ لە بێژینگیان بدا هەتا لە کۆتاییدا پەیکەرەی مێژوویی گەل و نیشتمانی خۆی لێ ساغ کاتەوە.

ئەگەرچی نامەوێ تاوانی روون‌نەبوونی مێژووی کۆمەڵەی ژ.ک و چالاکییەکانی باوێمە سەر ئەستۆی کەس و بۆخۆشم لەو باوەڕەدام کە لە سەردەمێکدا بلاونەکردنەوەیان بە سەلاحتر بوو هەتا بلاوکردنەوەیان، بەڵام پێم وایە ئیدی لەوە زیاتر پاساو و ئەمما و ئەگەر هێنانەوە دروست نییە. بۆیە قۆڵم لێ هەڵماڵی و زۆربەی کات و ساتی خۆم بۆ شیکردنەوە و توێژینەوە لەو بوارەدا تەرخان کرد. چونکە هیچ دوور نەبوو ئەگەر منیش لەسەر پەیداکردنی بەڵگەی باش و دەگمەنی دیکە راوەستابام، ئەوەندە بەڵگەیەش لە ناو چووبا، ئەودەم منیش دەچوومە رێزەی ئەوانەی بە هۆی کەمتەرخەمیان بوونە سەبەبکاری نەمانی بەڵگەکان و بە نادیاری مانەوەی مێژووی گەلەکەمان.

ئەم توێژینەوەیە زۆرتر لە سەر رووداوەکانی سەردەمی دەسەڵاتی «کۆمەڵەی ژ.ک» لە ساڵەکانی ١٣٢١ هەتا ١٣٢٤ی هەتاوی دواوە. هۆی ئەم کارەش ئەوە بوو کە لە سەر رووداوەکانی دوای ساڵی ١٣٢٤، کتێب و وتار و تەنانەت تێز و پایاننامەیەکی زۆر نووسراوە. هەر بۆیە چەند بابەتێکی رووداوەکانی ئەو ماوەیەی کە کۆمەڵەی ژ.ک پێشەنگی خەبات بووە، وێڕای چەند بلاوکراوەیەکی ئەو سەردەم کراوەتە بابەتی شیکردنەوە و توێژینەوەکانم و لە هێنانە گۆڕی ئەو بابەتانەش کە زانیاری ورد و بەڵگەی پێویستی لەسەر بلاو نەکراوەتەوە دوورەپەرێزیم کردووە.

لەم بەرهەمەدا لەسەر سێ بڵاوکراوەی سەردەمی کۆمەڵەی ژ.ک، واتە گۆڤارەکانی «نیشتمان» و «هاوار» و «ئاوات» قسە کراوە. گۆڤاری ئاوات بە تێروتەسەلی شیکردنەوەیەکی لەسەر کراوە و وشە بە وشەی لەگەڵ نوسخەی سەرەکی بەراوەرد کراوە و دوای رانان و نووسینەوە بە رێنووسی ئێستای زمانی کوردی، تایپ و دواتریش خودی گۆڤارەکە ساغ کراوەتەوە. هۆی ئەم ساغکردنەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زۆر کەس باوەڕیان بەوە نەبوو کە گۆڤارێک بەو ناوە چاپ کرابێ یا لەو بڕوایەدا بوون ئەگەریش چاپ بووبێ تا ئێستا نەماوە دەنا سۆراغێکی پەیدا دەبوو.

بە هۆی وتارێکی نێو ئەم گۆڤارە و بە شیکردنەوەی گۆڤاری ژمارە ٧و٨و٩ی «نیشتمان» و وتووێژ لەگەڵ چەند کەسی ئاگادار لە رووداوی گیرانی «مامۆستا زەبیحی» و هاوڕێیانی، ئەم بابەتە بە دووروودرێژی باسی لێکراوە و رۆژی گیرانی ئەم چەند کەسەش بە روونی دیاری کراوە.

هۆکارەکانی گیرانی مامۆستا زەبیحی وەک دەسپێک و زەمینە خۆشکردنێک بۆ گۆڕینی بنەما و دروشمەکانی کۆمەڵەی ژ.ک لە لایەن رووسەکان و لابردنی بەرهەڵستکاران لە بەرامبەر خۆیان و دەوری ئەوان لە بە دیلگیران و هەوڵنەدان بۆ ئازادکردنیان شی کراوەتەوە و بە وردی باسی لەسەر کراوە.

لە پەنا ئەوانە کورتە مێژوویەک لە دامەزراندنی «کۆمەڵەی ژ.ک» و هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی و سیاسەتی زلهێزەکان بەتایبەتی رووسیا و ئینگلیس بەرامبەر بە کورد بە درێژی باسی لەسەر کراوە. ئەوجار بە هۆی شیکردنەوەی نوسخەی سەرەکی ژمارەی کۆتایی گۆڤاری «نیشتمان»ی ژمارە ٧و٨و٩ و وتارێکی نێو ئەم گۆڤارە بە ناوی «پەیمانی سێ سنوور» و هەروەها کەلک وەرگرتن لە وتارێکی گۆڤاری «ئاوات»، هەموو لایەنەکانی ئەم باسەش شیکردنەوەی لەسەر کراوە و بە خوێنەران ناسێندراوە.

چونکە ئەم ژمارەیە پێشتر لە چەند کتێبێکدا چاپ و بڵاوکرابۆوە، لە دووپات کردنەوەی هەموو لاپەڕەکانی لەم بەرهەمەدا خۆم پاراستووە و تەنیا ئەو لاپەڕانەم هێناوە کە لە نوسخە دەستکاریکراوەکەیدا نەبوو. بەم چەشنە ئەم نوسخەیەش بەو چەند لاپەڕەیە بەتەواوی ساغ بۆتەوە.

جگە لەوانە لەسەر چەند شێعری بڵاونەکراوەی شاعیرانی ئەو سەردەم و هەروەها چۆنێتی هێنانی چاپخانە لە رووسیا بە وردی قسە کراوە و وێڕای ناساندنی چەند کەسایەتییەکی نەناسراو و ناوی نهێنی هێندێک لە ئەندامان و چەند رووداوێکی گرینگی ئەو سەردەم و سەربازانی ونی ئەم کۆمەڵەیەش باسیان لێکراوە و بە خوێنەران ناسێندراون.

هەڵبەت لە بەشی هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی «کۆمەڵەی ژ.ک» کورتەباسێکیش لە گۆڤاری «هاوار» کراوە، بەڵام ئەو بابەتە شیکردنەوە و لێکدانەوەی پتر هەڵدەگرێ. لە کاتی شیکردنەوەکاندا رەنگە هێندێک لە بابەتەکان دووپات کرابووبنەوە، بەڵام ئەو دووپات کردنەوانە بۆ ئەو مەبەستە بووە کە هەر جارەی باسێکی پێ روون بکرێتەوە و بابەتێکی پێ لێکبدرێتەوە.

لەم بەرهەمەدا رەنگە بە هۆی کوردبوونی خۆم بە چاوی کوردێکەوە چاوم لە بابەتەکان کردبێ، بەڵام بە مەعلوومی بێلایەنی خۆم لە رووداوەکان پاراستووە و لایەنی کەسم نەگرتووە. ئەوەی لێکۆڵینەوەی بەردەست لە لێکۆڵینەوەکانی پێشووتری ئەم باسەش جیا دەکاتەوە، بوونی چەند بەڵگەی رەسەنە کە تا ئێستا لە هیچ کتێبێکدا بڵاو نەکراوەتەوە. هەر ئەو بەڵگە رەسەنانەشن کە بوونە پاڵپشتێکی باش بۆ دەوڵەمەند کردن و بەپێز کردنی بەرهەمەکە.

ئەم نووسراوەیە یەکەم بەرهەمی منە و خۆشم بە کارێکی بێهەڵەی نازانم. دوای کێڵان و داچاندن و دروونەوە و کێشەویەکی زۆر، خەرمانەکەم بەبا کردووە، زرینگاندوومەتەوە و باڵەکەوم کردووە. خەرمانی سوورم بۆتە ئەو کۆیە.

بەو هیوایەی چەند لاپەڕەیەکی نادیاری مێژووی گەلەکەمان روون بکاتەوە و کەلێنێکی کتێبخانەی کوردیش بۆ خۆی تەرخان بکا؛ جێگای سوودی رووناکبیر و لێکۆڵەران بێ و منیش توانیبێتم ئەرکی سەر شانم بە باشی و بە دروستی بەجێ گەیاندبێ و ئەمەگداری خۆشم بەرامبەر بەو هەمووە زەحمەت و تێکۆشانەی گەورەپیاوانی رابردوو نیشان دابێ.

لە قووڵایی دڵمەوە باوەڕم بە رەخنە هەیە و پێم وایە ئەم کارە بەرهەمەکە پوختەتر دەکا و هەڵە و ناڕاستیشی لێ بژار دەکا و کەسیش بەتەنیا ناتوانێ

هەموو شتێک وێکڕا بزانێ؛ هەر بۆیە بەوپەڕی سپاسەوە تامەزرۆی بیستن و خوێندنەوەی ڕەخنە و تێبینی هەموو خوێنەرە بەڕێزەکانم.

**تێبینی:**

لە پاش ئامادەبوونی ئەم بەرهەمە بۆ چاپ و بڵاوبوونەوە، ماوەیەک بەر لەوەی بچێتە ژێر چاپ، بەخۆشییەوە چەند کتێب و وێنەی زۆر بەنرخ و دەگمەنی دیکەم کەوتە دەست کە بۆ بەڵگەدارتر کردنی ئەو بەرهەمە، حەیف بوو چاوپۆشییان لێ بکەم. هەر بۆیە کەلکی پێویستم لێ وەرگرتوون بەڵام لەبەر ئەوەی ڕازاندنەوە و داڕشتنی کتێبەکە تێکنەچێ، لە ژێر ناوی «پاشکۆی (دوو)» خستوومانەتە لاپەڕەکانی کۆتایی. با ئەوەش بڵێم کە ئەم بەشە پێڕستی ناو و شوێن و... بۆ ئامادە نەکراوە. هیوادارین لە چاپەکانی دواییدا وێڕای تێبینی خوێنەرانی خۆشەویست لە شوێنی خۆیان دابندرێن.

# ١

# ناساندنی گۆڤاری ئاوات

بەر لە ناساندنی ئەم گۆڤارە بە پێویستی دەزانم، باسێک لەو کتێب و بەرهەمانە بکەم کە لە سەر گۆڤاری «ئاوات» زانیارییان داوە و دواتر ئەسڵی گۆڤارەکە بە وردی شی دەکەینەوە و بە خوێنەرانی دەناسێنین.

دوکتور «کەماڵ مەزهەر ئەحمەد» لە پەراوێزی ژمارە ١٠١ی لاپەڕە ٨٣ی کتێبەکەی (تێگەیشتنی راستیی و شوێنی لە رۆژنامەنووسی کوردیدا) دەڵێ: «چەند نووسەرێکی کورد باسی گۆڤاری «ئاوات»یان کردووە کە گۆیا ئەویش ساڵی ١٩٤٥ یا ١٩٤٦ لە مەهاباد چاپ کراوە. لە لاپەڕە ٢٣٩ش لە بەشی «پاشکۆی دووهەم»دا دەڵێ: «ئاوات، مەهاباد ساڵی ١٩٤٥، گۆڤارێکی وێژەیی - زانستی - کۆمەڵایەتی بوو. تەنها ٣ (؟) ژمارەی لێ دەرچووە».

دوکتور «جەماڵ خەزنەدار» لە لاپەڕە ١٦ی کتێبی «رۆژنامەگەری لە کوردستان»دا دەڵێ: «گۆڤاری ئاوات ساڵی ١٩٤٥ لە مەهاباد بڵاو کراوەتەوە: گۆڤارێکی عیلمی و کۆمەڵایەتی بووە و سێ ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە».

کاک دوکتور «هیمدادی حوسێن» لە لاپەڕە ٢٧٠ی کتێبی «رۆژنامەنووسی سەردەمی کۆماری دێموکراتی کوردستان ١٩٤٢ - ١٩٤٧»دا، دوای ناساندنی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» دەڵێ: «... هەر وەکوو خۆی (شاپەسەندی) دەڵێ، هەوڵی داوە گۆڤاری «ئاوات»ی دەرکردووە و بە نازناوی رەمزی نووسیوییە و ٣

ژمارەی لێ چاپ کراوە کە بەداخەوە ئێمە هیچ ئەسەرێکی ئەم گۆڤارەمان دەست نەکەوت».

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لە نووسراوەیەکی خۆیدا کە لە بڵاوکراوەی «کوردستانی نوێ» چاپ کراوە دەڵێ: «... مەکینەیەکی «نییۆ فلۆسکاب» و هێندێک «حەرف»مان دەست کەوت و گوێستمانەوە بۆ مەهاباد. پێش ئەوەی دەس بکەین بە چاپی ژمارەیەکی نوێی [نیشتمان]، زەبیحی بە سەردا گیرا. پێم خۆش نەبوو چاپخانەکە بێ ئیش بمێنێتەوە. بە دەرفەتم زانی گۆڤارێک بە ناوی «ئاوات» چاپ و بڵاو بکەمەوە...».

مامۆستا «هێمن»یش لە لاپەڕە ٢١ی پێشەکی دیوانی «تاریک و روون»دا دەڵێ: «... کۆمەڵە، گۆڤاری «ئاوات»یشی چاپ کرد و من لەویشدا نووسیم».

مامۆستا «حەسەنی قزڵجی» لە گۆڤاری «رێگا»دا پاش ئەوەی باسی بزووتنەوەی چاپەمەنی و بڵاوکراوە کوردییەکان دەکا، دەڵێ: «... لە ماوەی یەکساڵی کۆماری کوردستانی ئێران «رۆژنامەی کوردستان، گۆڤارەکانی «کوردستان»، «نیشتمان»، «هاواری نیشتمان»، «ئاوات» و «گڕوگاڵی منداڵانی کورد» لە مەهاباد و «هەڵاڵە» لە بۆکان و «راوێژ» لە سنە و ناوچەکانی تری کوردستانیش بە نۆرەی خۆیان کەوتنە ناو کاروانی چاپەمەنییە کوردییەکان...»

کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» لە لاپەڕە ٤٠٨ی کتێبی «ئاوڕێک لە مێژووی مەهاباد» لە بەشی «بڵاوکراوە و گۆڤاری چاپکراو لە مەهاباد یا سەر بە مەهاباد»دا دەڵێ: «گۆڤاری ئاوات بڵاوکراوەیەکی عیلمی - کۆمەڵایەتی بووە کە پتر لە سێ ژمارەی لێ دەرنەچووە».

کاک «محەممەدعەلی سوڵتانی» لە لاپەڕە ٤٨٨ی بەرگی دووهەمی کتێبی «احزاب سیاسی و انجمن‌های سری در کرمانشاه»دا دەڵێ: «... لە ساڵی ١٣٢٣ کۆمەڵە بوو بە حیزبی دێموکڕات و تێکۆشانی ئاشکرای خۆی دەست پێکرد. ئۆرگانی حیزب رۆژنامەی «کوردستان» بوو. چەند گۆڤار و بڵاوکراوەی دیکەش لە لایەن حیزب بڵاو دەکراوە (گۆڤاری ئاوات و نیشتمان)....».

بە سرنجدان بەوەی کە ئێستا گۆڤارەکەمان دەست کەوتووە، ئەم گۆڤارە بە تێروتەسەلی دەناسێنین:

گۆڤاری «ئاوات» ژمارە ١ی ساڵی یەکەمی لە ڕۆژی سێشەممە ڕێکەوتی ١ی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی بەرامبەر لەگەڵ ٢٣ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥ چاپ و بڵاو کراوەتەوە. ئەو گۆڤارە لە سەر لاپەڕەی ١٩/٥ لە ١٢/٥ سانتی‌میتری لە سەر کاغەزی کایی، دروست مانگێک دوای دەرچوونی گۆڤاری «هاوار» (= هاواری کورد) چاپ و بڵاو کراوەتەوە، ٢٠ لاپەڕەیە و یەک لاپەڕەی بچووکیش لە نێوان ڕووبەرگ و لاپەڕەی ٢دا وەک تەبلیغات هاتووە بەڵام بە لاپەڕە حیساب نەکراوە. بڕیار وا بووە مانگێ دوو جار بڵاو بکرێتەوە، واتا بە دوو حەوتووان ژمارەیەکی لێ چاپ بکرێ. لاپەڕەی یەکەمی بە ناوی گۆڤارەکە و بە شێوەی ڕێنووسی ئەوکات (اوات) دەس پێدەکا. لە ژێر ناوی ئەودا، گۆڤارەکە ناسێندراوە کە «گۆڤارێکی ئەدەبی و تاریخی و کۆمەڵایەتی کوردی‌یە» و لە خوار ئەویش ژمارەی دەرچوونی گۆڤارەکە و پاشان وێنەیەکی «شێخ عەبدولقادری شەمزینی» کراوەتە ڕووبەرگی و بە لاپەڕەی ١ داندراوە. هەروەک پێشتر گوتمان نێوان لاپەڕەی ١ و ٢ کاغەزێکی بچووک وەکوو تەبلیغاتی گۆڤارەکە هاتووە کە ئەویش لە ئەندازەی ١٣ لە ٨ سانتی‌میتریدا چاپ کراوە. لە ژێر ناوی گۆڤارەکەوە شێعرێک نووسراوە و لە لای ڕاستی ئەو لاپەڕەیەش بە خەتتێکی ورد نووسراوە «پەراوی (ژ.ک) پێشکەوتن». کاک «عوبەیدیللا ئەیبووبیان» سەبارەت بە ڕووبەرگ و ئەو لاپەڕە تەبلیغاتییە دەڵێ: «کلێشەی ڕووبەرگی «ئاوات»م لەگەڵ کاک «مستەفا نەژادی» لە چەرم بڕی و لاپەڕەی تەبلیغاتەکەشم بە دەستی خۆم لە چاپخانەی کۆمەڵەی (ژ.ک) چاپ کرد». لە لاپەڕە دووی ئەو گۆڤارە خاوەن ئیمتیاز و بەرپرسی گۆڤاری «ئاوات» ناسێندراوە کە بە ناوی «محەممەدی ئازەر» لە کۆمەڵەی (ژ.ک)دا ناسراوە و ناوی نهێنی کاک «محەممەدی شاپەسەندی»یە. کاک محەممەد بە دوو ناوی «م. ئازەر» و «ئازەر» وتار و نووسراوەکانی لە گۆڤاری «نیشتمان»یشدا بڵاو کردۆتەوە. ئەگەرچی بڕیار وابووە کە «ئاوات» مانگێ دوو جار بڵاو بکرێتەوە و لە لاپەڕە ٢ و ٢٠یش‌دا هەواڵی چاپکردنی ژمارە ٢ی «ئاوات» بە خوێنەران دراوە، بەڵام پتر لە یەک ژمارەی لێ بڵاو نەکراوەتەوە. هەر لە لاپەڕە ٢دا «ئابوونە»ی گۆڤاری «ئاوات» بۆ خوێنەرانی دیاری کراوە کە لەودا جیاوازی

قوتابییەکان بە نرخێکی کەمتر لەبەر چاو گیراوە، بە چەشنێک کە «ئابوونـە»ی ٢٤ ژمارە «٢٢٠ قران» بووە بەڵام بۆ مەلا و قوتابییەکان «١٨٠ قران» بـووە و هـەر دانەشی بە ١٠قران فرۆشتراوە. «ئابوونە»ی گۆڤاری «ئاوات» پێشەکی وەرگیراوە، هۆیەکەشی لە خوار ناوی نووسەران و بابەتەکان بەو جۆرە هاتووە: «چون ئـەو مجەللەیە پووڵی ئابوونە نەبێت هیچ گوونە دەرامەدێکی نییە، تکا لە خوێنـەرە خۆشەویستەکان ئەکەین بە گەیشتنی ئەو ژمارەیە پووڵی ئابوونەمان بۆ بنێرن.» بەو شێوەیە بۆمان دەردەکەوێ باری ئابووری گۆڤارەکە باش نەبووە و ئیمکانات و کەرەسەی پێویست وەکوو کاغەز وپێداویستییەکانی چاپەمەنی لەبەر دەسـتدا نەبووە، سەرەڕای ئەو کەموکووڕیانە و باری خراپی ئابووری کە لە گۆڤـارەکەدا وەبەرچاو دەکەوێ، کاتێک ئەو گۆوارە لەگەڵ گۆڤـارەکانی فارسـی سـەردەمی خۆی هەڵسەنگێندرێ، کەموکووڕی تێدا دەبیندرێ کە ئەویش دەگەڕێتـەوە سـەر نەبوونی ئەزموونی رۆژنامەگەری، بە تایبەت بۆ کورد کە لەمپـەر و بەربەسـتی لە هەموو بوارەکانی پێشکەوتن لە سەر رێگای داندراوە. بەڵام لەسەر ئـەوەش‌ڕا ئەگەر بارودۆخی ئەو کـاتی کوردسـتان لەبـەر چـاو بگـیرێ، بـە دڵـنیاییەوە دەتوانین بڵێین لە زۆر گۆڤاری فارسـی سـەردەمی خـۆی بـەبایختر نـەبووبێ، کەمبایەختریش نەبووە. هەر لــە لاپـەڕە ٢دا نـاوی بابەتـەکان و نووسـەرەکان هاتووە کە بە ناوی نهێنی وتارەکانیان بڵاوکراوەتەوە. ئەو جەدوەلـە پوختـەی هێندێک زانیاری لە بارەی گۆڤاری «ئاوات» پێشان دەدا:

| | |
|---|---|
| ژمارە | ١ |
| ساڵی دەرچوونی | ١ی خەزەڵوەری ١٣٢٤ (٢٣ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥) |
| خاوەن ئیمتیاز و بەرپرس | محەممەدی شاپەسەندی |
| ژمارەی لاپەڕەکان | ٢٠ لاپەڕە و لاپەڕەیەکی تەبلیغاتی |
| وتار | ٥ دانە |
| شێعر | ٥ دانە |
| وێنە | ١ دانە |

| | |
|---|---|
| چاپخانەی | کۆمەڵەی (ژ.ک) |
| وتاری وەرگێڕدراو | ۲ دانە |
| ئامانج | کۆشیش لە پێناو سەرخستنی کورد و ژیاندنەوەی فەرهەنگی کورد |
| جۆری دەرچوون | نیومانگە |
| سەرنووسەر | سەید محەممەدی حەمیدی |
| زمان | کوردی و فارسی |
| دوایین ژمارە | ۱ |
| ئەندازە | ۱۹/۵ لە ۱۲/۵ |

نووسەرەکان بێجگە لە (ر.ه ) و (ئەشکەیی) کە لە بەشەکانی دیکەدا بە وردی لەسەریان دەدوێین، بریتین لە: «م.ح» (سەید محەممەدی حەمیدی)، «م. ئازەر» (محەممەدی شاپەسەندی)، «هێمن» (سەید محەممەدئەمینی شێخولئیسلامی).

## شیکردنەوەی ناوەرۆکی گۆڤاری ئاوات

لێرەدا هێندێک لە بارەی ناوەرۆکی گۆڤارەکە دەدوێین و بەپێی توانا شییان دەکەینەوە: لاپەڕە ۳: لە لای راستی ئەو لاپەڕە بەر لەوەی وتاری یەکەم دەست پێبکا، نووسراوە: پەنا بە خوای مەزن. لە نێوەڕاستی سەرووی ئەو لاپەڕەیە ناوی گۆڤارەکە بە شێوەی نووسینی ئەوکات (اوات) نووسراوە و لە چوار لاوە بە گوڵ و ئەستێرە بە شێوەی هونەری رازێندراوەتەوە کە لەویشدا ناوی گۆڤارەکە رەچاو کراوە. هەر لەو لاپەڕەدا ئامانج لە چاپ و بڵاو کردنەوەی گۆڤاری «ئاوات» بەو شێوەیە نووسراوە: «ئامانجی ئێمە کۆشیش لە پێناو سەرخستنی کورد و ژیاندنەوەی فەرهەنگی کوردە» کە لێرەشدا بەرنامەکانی

«ئاوات» ناوی سەرنووسەری بە سەرەوە نییە، بەڵام بەو پێیەی کە یەکەم وتار لە لایەن «سەید محەممەدی حەمیدی»یەوە نووسراوە وێدەچێ هەر ئەو سەرنووسەری گۆڤارەکە بووبێ. یەکەم وتاری گۆڤاری «ئاوات» بە زمانی فارسی لە لاپەڕە ٤ و لە ژێر ناوی «نویسندگان فارس بخوانند» واتە نووسەرە فارسەکان بیخوێننەوە، چاپ کراوە. لەو وتارەدا نووسەر باسی شوێنی جوغرافیایی کوردستان و ریشەی نەژاد و پێوەندییەکانی کورد وەک نەژادی ئاریایی دەگەڵ «پارس»ەکان دەکا و پاشان لەسەر خەت و زمان و ئەدەبیاتی کوردی بەوردی دەدوێ. نووسەر بۆ ئەو وتارە لە کتێبی «مێژووی کورد و کوردستان»ی «ئایەتوڵلا مەردووخ» کەلکی وەرگرتووە. لە لاپەڕە (٥ و ٦ و ١٧ و ١٩ و ٢٠)یش‌دا نووسەر وەڵامی چەند پرسیاری لاپەڕە ٥ دەداتەوە کە وەکی بۆخۆی دەڵێ: «لە وەڵامی هێندێک لە زمانلووسانی بەکرێگیراو و... وتارەکانی دوکتور «سەنجابی» مامۆستای زانکۆی «تاران»، کە بوختان و درۆ و دەلەسەیان بۆ کوردەکانی ئێرانی هەڵبەستووە، دەیهەوێ بە تێکڕایی و بەدرێژی وەڵامی ئەو چەند پرسیارانە بداتەوە». نووسەر بۆ وەڵامی پرسیاری ژمارە یەک هەتا پێنج، بەڵگەی هێناوەتەوە کە بەڵگەکانی دەگەڵ بارودۆخی ئێستای کوردیش تەواو دەگونجێن و بۆ ئێستاش جێگای پرسیارن: کە بۆچی سەرەڕای ئەوەی گەلی کورد بە ئێرانی رەسەن دەزانن، بەڵام ئەگەر کورد داوای مافی خۆی بکا بە سەربزێوی دادەنێن یا دەڵێن کورد مێژووی نییە، زمان و خەتی نییە، هیچکات وڵاتێکی سەربەخۆیان نەبووە. نووسەر گلەیی ئەوە دەکا کە حکوومەتی ناوەندی هیچ کارێک بۆ کوردان ناکا.

ئەوەی لێرەدا بەپێویستی دەزانم سەرنجی بۆ رابکێشرێ ئەوەیە کە لەو وتارەدا سەرەڕای هێندێک هەڵەی رێنووسی، هەستی نەتەوەیی لە زۆر بابەتی‌دا خۆی نواندووە و خوێنەری کورد و فارس هەست بەوە دەکەن کە جیاوازییەکی زۆر، لە نێوان قسە هەتا کردەوەی بەرپرسانی حکوومەتدا هەیە و کورد ستەمێکی زۆری لێکراوە و چەوسێندراوەتەوە؛ هەروەها لەو وتارەدا باسی رەگەزی کورد بە شێوەیەکی عیلمی و زانستی کراوە، بەڵام سەرەڕای ئەو خاڵە گرینگانەی وتاری یەکەم، نووسەر دوو بۆچوونی جیاواز لە یەکتری باس کردووە: لە لایەک دەڵێ،

چ دەبێ خوێندن بە زمانی کوردی ئازاد بکرێ و ئێمەش ئازاد بین و هەروەها دەڵێ کورد رەگەز و زمان و خەت و ئەدەبیاتی جیاواز لە فارسەکانی هەیە و لە لایەکیش دەڵێ: گەلی کورد خۆیان بە ئێرانی دەزانن، پەیڕەوی و فەرمانبەری لە «شا» و دەوڵەت و قانوونی ئێران بە ئەرکی خۆیان دەزانن کە ئەوە لەگەڵ ئەو بۆچوونانەی باسمان کرد یەکتر ناگرنەوە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەم وتارە یەکێک لە بەکەلکترین وتارەکانی گۆڤارەکە پێکدێنێ. لە لاپەڕە (٧ و ٨ و ٩)، وتاری «سواری رەشپۆش» لە لایەن کاک «محەممەدی شاپەسەندی» نووسراوە و ئەم وتارە لە گۆڤاری «اطلاعات هفتگی» وەرگیراوە. نووسەر لە خوار بابەتی نووسراوەکەی دەڵێ: «تا نیقابی لەسەر روو بوو، گەورەترین قارەمانی شەڕی دیمەشق و وەختێکی نیقابی لادا هاتە ناو ژمارەی گەورەترین ژنانی گیتی» نووسەر مەبەستی لە وەرگێڕانی ئەم وتارە یەکەمیان ئەوەیە: کە بڵێ ژنیش ئەگەر بیهەوێ و بواری بدەنێ لە پیاوان نامێنێتەوە و قارەمانێتی سەیر لە خۆی نیشان دەدا و بەو شێوەیە دەتوانێ بێتە رێزەی گەورەترین ژنانی دنیا. دووهەمیشیان ئەوەیە: کە بە پشتبەستن بە خودا و ئیمان بە خۆ بوون و یەکێتی و بەرنامەی دارێژراو، دەکرێ بە سەر لەشکری زۆروزەوەندی دوژمندا زاڵ بین و لە ژێردەستی و دیلیەتی بێینە دەرێ، هەروەها پێمان دەڵێ کە بوونی یەکێتی و بوێری و سووربوون لە سەر هەر ئامانجێک سەرکەوتنی لە دوایە. سێهەمیشیان ئەوەیە کە نووسەر دەیەوێ بە خوێنەر بڵێ کە کەسێکی دەیەوێ کارێک بکا، پێویست بە خۆڕانان و خۆنیشاندان ناکا، تێدەکۆشێ و روح و گیانی لە مەترسی داوێ بەڵام ئامادە نییە کەس پێبزانێ، چونکە مەبەستی هەمووان گەیشتن بە یەک ئامانجە. هەروەک دەبینین قورسایی گێڕانەوەی داستانەکە کەوتۆتە سەر «زیرار» و «خەولە»ی خوشکی. ئەو دووانە دەوری سەرەکی لەو قارەمانەتییەدا دەگێڕن و ئەو کردەوانەی باسمان کردن لە واندا بەدیدەکرێ. لاپەڕە ٩: لە خوار ئەم لاپەڕەیە دوای تەواوبوونی وتاری «سواری رەشپۆش» بەشی «قسەی نەستەق»، وتەیەکی بەنرخی «شێکسپیر» هاتووە کە دەڵێ: «هەمیشە کار بکەن و بکۆشن تا کراسی ئیفتیخار و گەورەیی بپۆشن، هەمیشە لە پێش چاوتان بێ کە

ژەنگاوییە لە ڕەونەق کەوتووە» لەو بەشە لە گۆڤاری «ئاوات»دا دروست شێوەی داڕشتنی گۆڤاری «نیشتمان» ڕەچاو کراوە چونکە بەشی «قسەی نەستەق» بەشێکی گرینگی هەموو ژمارەکانی «نیشتمان» پێکدێنێ و بەهایەکی زۆری پێدراوە.

لاپەڕە ١٠: لەو لاپەڕەدا چاومان بە پەخشانێکی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لە ژێر ناوی «برای دوورم» دەکەوێ کە ئەو پەخشانەمان لە لاپەڕەکانی دوایی و بەشێکی جیاوازدا بەوردی شی کردۆتەوە.

لاپەڕە ١١ هەتا ١٤ش بەشی «گەنجینەی ئەدەبیات»ە کە ئەو بەشەش بە جودا تێبینی و شیکردنەوەی لەسەر کراوە.

لە لاپەڕە ١٥ تا ١٧، چاومان بە وتاری «محاکمەی هیتلێر» دەکەوێ کە بە شێوەی تەمسیلی باسی چۆنیەتی ئەو محاکمەیە دەکا کە نووسەر وەک هەواڵنێری گۆڤارێک خۆی ناساندووە و لەو شوێنە واتا «جەهەننەم»، پرسیارەکانی لە هیتلێر دەس پێدەکا. هەڵبەت پێش چوونە ناو باسی ئەو لاپەڕەیەش پێویستە بڵێم هەڵەیەک لە دانانی ژمارەی لاپەڕە ١٥دا کراوە و بە ٥١ نووسراوە کە هەڵەی چاپییە. لێرەدا نووسەر چەند مەبەستی گرینگی بیری کوردانەی خۆی لە نێو ڕاپۆرتەکەدا گونجاندووە کە چەند لایەنێکی دەخەینە بەر چاوی خوێنەران:

١- پێداهەڵگوتن و تاریفی ئەرتەشی شووڕەوی بە شێوەی ناڕاستەوخۆ: نووسەر بە بیانووی محاکمەکە بە شان و باهۆی شووڕەوی هەڵدەڵێ و ئەو دەوڵەتە وەک ڕزگاریدەری نەتەوە چەوساوەکان دەناسێنێ. هەڵبەت لە وتاری «سەید محەممەدی حەمیدی»ش‌دا ئەو کارە کراوە. بەڵام ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی کە بڵێین نووسەری ئەم بابەتانە لایەنگر یان پیاوی ڕووسەکان بوون، بەڵکوو ئەوکات هەر لە سەرەتای دامەزراندنی «ژ.ک» زۆر هەوڵ دراوە سرنجی دەوڵەتە زلهێزەکانی وەک ڕووسیا و ئینگلیس بۆ یارمەتی‌دان بە کوردەکان ڕابکێشرێ، بەڵکوو بە هۆی ئەوانەوە بکرێ گەلی کوردیش بە مافە ڕەواکانی خۆی بگا.

٢- زەقکردنەوەی ملهوڕی و شەڕفرۆشی هیتلێر و ئەو کوشتن و بڕینەی لەو شەڕە ماڵوێرانکەرە کەوتەوە.

٣- ئاکامی شەڕەکە و سەرەنجامەکەی، سەرکەوتن بۆ نیشتمانپەروەران و ئەوانەی کە بەرگرییان لە نیشتمانەکەیان دەکرد و تێکشکان و ملشکانیش بۆ ئەوانەی شەڕەنگێزن کە هەمووی ئەوانە پەیامێک بوو بۆ «ڕەزاشا».

٤- یەکێک لە گرینگترین ئامانجەکانی ئەو وتارە ئەوەیە کە نووسەر دەیهەوێ بە خوێنەر بڵێ ئەگەر خەڵکی دنیا بە دەست خوێنڕێژێکی وەکوو هیتلێرەوە دەناڵێنن، ئێمەی کوردیش بە دەست دەسپەروەردەکەی هیتلێر واتا «ڕەزاشا»وە دەناڵێنین و بەم شێوەیە ستەملێکراوی و چاکی و پاکی کورد بە خوێنەر نیشان دەدا و دەڵێ: کە هەرچی هیتلێر و دەسپەروەردەکانی بەڕێوەی دەبەن، کورد نەیکردووە، هەر بۆیە کاتێک هیتلێر لە نووسەر پرسیار دەکا: بۆ ئاگر کارت لێناکا؟ دەڵێ: «ئەمن یەک نەفەر کوردم و بە ئیختیاری خۆم هاتوومەتە ئێرە.» پاشان لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «کورد حەقی کەسی پامال نەکردووە و دەسپێشخەری شەڕی ماڵوێرانکەر نەبووە بەڵکوو حەقی ئەوان لە ژێر پێی دەسپەروەردەکانی هیتلێردایە. کورد گوناهکار نییە، حەقی نەتەوە بچووکە بێخەتا و بێگوناهەکانی، پامال نەکردووە» و بەو شێوەیە تەنانەت لەو محاکمەیەش‌دا بێگوناهی و پاکی گەلی کورد بەرجستە دەکا.

لاپەڕە ١٧: پاشماوەی سەروتاری گۆڤارەکەیە.

لاپەڕە ١٨: لەو لاپەڕەدا هەڵەیەک لە ژمارەی لاپەڕەکان‌دا کراوە. دوای لاپەڕە ١٧ ، لاپەڕە ١٩ هاتووە کە دیارە هەڵەیە، چونکە لە پەراوێزی لاپەڕە ١٧، لە بەشە فارسییەکەی نووسراوە: پاشماوەکەی لە لاپەڕە ١٩یە کە دروستە و لە جێی خۆیدا هاتووە. ئەوەی بۆ ئەو لاپەڕەیەش دەبێ ئاماژەی پێبکرێ ئەوەیە کە لە لاپەڕە ١٨دا وتاری «کورتە مێژووی جەنگی گەورەی ڕابردوو»ی تێدا بڵاو کراوەتەوە کە ئەم وتارە بە هەڵە لە بەشی بابەتەکان واتا لاپەڕی پێڕشتی گۆڤارەکەدا لە بیر کراوە. لەم وتارە و وتاری یەکەمی گۆڤاری «ئاوات»دا بە بابەتە مێژووییەکانی ئەوسەردەمی بایخێکی زۆر دراوە. لەم وتارەدا کە ئەویش لە زمانی فارسی وەرگێڕدراوەتەوە، باس لە چۆنیەتی هەڵایسانی شەڕی یەکەمی جیهانی هاتووە کە بە هۆی کوژرانی وەلیعەهدی وڵاتی ئوتریش بە دەست قوتابییەک دەستی پێکرد و دواتر چەند دەوڵەتی دیکەش خۆیان لە

وتارەیە'کە بڕیار وابووە لە ژمارەی داهاتووی درێژەی پێبدرێ، بەڵام هەروەکی دەزانین چونکە گۆڤاری «ئاوات» پتر لە ژمارەیەکی لێ بڵاو نەبۆوە، ئەو وتارەش بە نیوەچڵی ماوەتەوە.

لە پەراوێزی لاپەڕە ١٨دا چاومان بە ئاگادارییەک دەکەوێ کە لە خوێنەران بەو شێوەیە داوایەک کراوە: «تکا» - «ئەو خوێنەرە خۆشەویستانەی کە لە شەرحی حاڵ و ساڵی لەدایکبوونی «وەفایی» ئاگادارن، تکا ئەکەین بۆمان بنێرن.»

لاپەڕە ١٩ و ٢٠ پاشماوەی سەروتارە. لە لاپەڕە ٢٠دا هەڵەیەکی لاپەڕە ١٩ راستکراوەتەوە و لە ئاگادارییەکیشدا هەواڵی دەرچوونی ژمارە ٢ی گۆڤاری «ئاوات» دراوە کە بەو زووانە دەردەچێ.

بەم رستە تەبلیغاتییە گۆڤاری «ئاوات» کۆتایی پێدێ: «ژمارە ٢ی «ئاوات» و لەبیر نەچێ بیخوێننەوە و سوودی لێوەرگرن».

## بۆچی نەگریم!

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لە وتووێژێکدا کە لە ژمارە ١١٩ی ساڵی ١٩٩٤ی «رۆژنامەی کوردستانی نوێ» لەگەڵی پێکهاتووە و بەشێکی ئەو گفتوگۆیە لە لاپەڕە ١٠٢ی کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی»دا کەلکی لێ وەرگیراوە، هۆکاری چاپی گۆڤاری «ئاوات» دەباتەوە سەر گیرانی مامۆستا «زەبیحی». ودەڵێ: «بە دەرفەتم زانی گۆڤارێک بە ناوی «ئاوات» چاپ و بڵاو بکەمەوە. ناوەرۆکی «ئاوات» بریتی بوو لە پارچە پەخشانێکی رەمزی بە ناوی «برای دوورم». لە وتووێژێکی دیکەشدا دەڵێ: «...شتێک دەربارەی ئەدەبی رەمزی و بە یادی «زەبیحی»یەوە شتێکم نووسیوە بە ناوی «دۆستی دوورم» ...»

لە لاپەڕە ١٠ی گۆڤاری «ئاوات» چاومان بەو پەخشانە دەکەوێ کە کاک «محەممەدی شاپەسەندی» باسی دەکا و هەروەکوو بۆخۆشی دەڵێ بە شێوەیەکی رەمزی نووسراوە. پەخشانی «برای دوورم» بە شێوەیەکی شاراوە باس لە گیرانی مامۆستا «زەبیحی» دەکا.

لە گۆشەی راستی نووسراوەکەی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» نووسراوە: «بە یادی تۆ...». ناوی کەس لە پەخشانەکەدا نەهاتووە. لە بەشێک لە نووسراوەکەیدا دەڵێ: «برای خۆشەویستم، گەرچی دەستی زوڵم و گەردوشی رۆژگار تۆی دوور خستۆتەوە، هەرگیز، هیچ توانایيەک ناتوانێ خۆشەویستی تۆم لە دڵ دوور بخاتەوە و وێنەی تۆ بە قەڵەمی خۆشەویستی لە دڵما کێشراوە و لە ژێر خاکیشا مەحو نابێتەوە.» لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «دڵنیابە تۆ لە نەتیجەی ئیفتیخاراتی ئەنجامی وەزیفەدا خۆشبەختی و منیش هەرچەند لە بیابانی دووریدا سەرگەردان و نالانم، دیسان لە خۆشبەختی تۆ و لە ئیفتیخاراتی تۆ و بە یادی تۆوە خۆشبەختم و (بۆچی نەگریم)ت مایەی هیوای دڵ و رووناکیی تاریکەشەوی تەنهاییمە.»

هەروەک دەبینین لێرەدا چەند بابەتێک بە شاراوەیی و بە شێوەی رەمز باسیان لێکراوە:

یەکەم: پەخشانەکە بە رستەی «بە یادی تۆ» دەست پێدەکا کە مەبەستی مامۆستا «زەبیحی»، هاواڵ و دۆستی نیزیکی خودی «کاک محەممەدی شاپەسەندی»یە.

دووهەم: هەر لە لاپەڕەی ١٠دا دەڵێ: «دەستی زوڵم و گەردوشی رۆژگار تۆی لە من دوور خستۆتەوە» لە لاپەڕە ١٧شدا هەروەها باسی گیرانی سێ کەسی مەهابادی کراوە کە لە ورمێ لە لایەن ژاندارمەکانی «بالانیش» گیراون، و نووسراوە کە ئەو سێ کەسە دەسبەسەر کراون و یەکڕاست نێردراونە تاران و ئێستا لە قەسری قەجەرن ( زیندانێکی گرینگ بووە لە تاران). لەو وتارەدا ئەو سێیانە بە عینوانی سێ کەسی ئاسایی خەڵکی مەهاباد کە بۆ کاروباری خۆیان چوونە ورمێ ناسێندراون و نووسەر بە ئانقەست ئەوان وەک سێ کەسی ئاسایی دەناسێنێ و ناوێک لە کۆمەڵەی (ژ.ک) و ئەندامەتییان ناهێنێ.

ئەگەرچی لە لاپەڕە ١٠ و ١٧ی گۆڤارەکە بە شێوەیەکی رەمزی باس لە گیرانی مامۆستا «زەبیحی» کراوە و بە ئاشکرا ناوی ئەو سێ کەسە نەنووسراوە، بەڵام لە بەشی روونکردنەوەی هەڵەی کتێبی «سەرلەشکر زەنگەنە»دا باسی

سێهەم: خاڵی گرینگ لە پەخشانەکەی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» ئەو دوو وشەیەیە کە لە نێو دوو «کەوانە»دا هاتووە. ئەویش ئەو جێگایە کە دەڵێ: «(بۆچی نەگریم)ت مایەی هیوای دڵ و رووناکیی تاریکە شەوی تەنهاییمە.» کە لێرەش‌دا بە هێندێک وردبوونەوە بۆمان دەردەکەوێ کە نووسەر لەم پەخشانەدا رووی قسەی لە یەکێکە و دەیهەوێ بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ نووسراوەیەکی ئەو کەسە وەبیر خۆی بێنێتەوە.

بە ئاوڕدانەوەیەک لە لاپەڕە ٢٤ – ٢٦ی گۆڤاری «نیشتمان»ی ژمارە ٣ و ٤ کە لە سەرماوەز و ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٢ دەرچووە، ئەو ڕەمزەشمان بۆ ئاشکرا دەبێ.

لەو ژمارەیەدا مامۆستا «زەبیحی» بە ناوی نهێنی (ع.بیژەن) پەخشانێکی زۆر بەسۆزی بە ناوی «بۆچی نەگریم!» نووسیوە کە ئەو «بۆچی نەگریم»ەی کە لە گۆڤاری «ئاوات»دا لە «کەوانە»دا هاتووە و دەڵێ «بۆچی نەگریمت...» هەمان «بۆچی نەگریم»ی مامۆستا «زەبیحی»یە کە لە گۆڤاری «نیشتمان»دا بڵاوکراوەتەوە.

لێرەدا دەقی نووسراوەکەی مامۆستا «زەبیحی» بەتەواوی و بێ دەسکاری دێنینەوە. مەبەستیشم لە نووسینەوەی دووبارەی ئەو پەخشانە دوو شتە: یەکیان ئەوە کە: خوێنەرانی بەڕێز بە خوێندنەوەی نووسراوەکەی مامۆستا زەبیحی بۆیان ئاشکرا بێ کە کاک «محەممەدی شاپەسەندی» بە هۆی خۆشەویستی لە ڕادە بەدەری مامۆستا «زەبیحی» تا چ ڕادەیەک کەوتۆتە ژێر کاریگەری پەخشان و نووسراوەکانی مامۆستا «زەبیحی» و نووسراوەکانی ناوبراو چەندەی شوێن لە سەر بەرهەم و بیری کاک «محەممەدی شاپەسەندی» داناوە. بە هێندێک سەرنج‌دان بە پەخشانی «برای دوورم» بۆمان دەردەکەوێ تەنانەت زۆر وشەی ئەم پەخشانە لە پەخشانی «بۆچی نەگریم»ی مامۆستا «زەبیحی» وەرگیراوە.

دووهەم هۆ ئەوەیە: دەقی ئەو نووسراوەی مامۆستا «زەبیحی» لە شانۆی «دایکی نیشتمان» (کە لە سەردەمی دەسەڵاتی کۆمەڵەی (ژ.ک)دا لە مەهاباد و چەند شوێنی دیکەدا بەڕێوە چووە) خوێندراوەتەوە، کاریگەرییەکی زۆری لە

سەر هەستی بینەران داناوە. ئەوانەی شانۆی «دایکی نیشتمان»یان دیوە دەڵێن کاتێک ئەو پەخشانە لە لایەن ئەندامانی لاوی کۆمەڵەی (ژ.ک) خوێندراوەتەوە، زۆربەی بەشداربووان وەگریان کەوتوون.

ئەوەش دەقی نووسراوەکەی مامۆستا «زەبیحی»:

بۆچی نەگریم!

هەرچی سەر هەڵئەبڕم و چاوم بەم ئاسمانە شینە جوانەی کوردستان ئەکەوێت، ئەوەندی دەچمە سەر کانیاو و شەتاو و جۆبار و رووبارەکانی کوردستان، هەر کە شینایی دەشت و کێو و مێرگ و چیمەنەکانی وڵاتەکەمم دێتە بەر چاو، لە باتی شایی و شای لۆغان لە سەر ئەم دڵە بچکۆلە گۆشتینە ساوا و ناسکەم، کۆسپەیێکی سەخت و گرێیەکی توند پەیدا ئەبێت کە تا سەرچاوەی چاوم فرمێسک هەڵنەکولێ و بە سەر ئاگری دەروونما هەڵنەپرژێت، بڵێسە و گڕی کوورەی دەروونم دانامرکێتەوە.

توخوا چۆن نەگریم! چۆن خوێنی جەرگم بە جۆگەی چاوما بەرنەدەمەوە سەر چیمەنە بێناز و بێخاوەنەکەی کوردستان؟! تا بەڵکوو گوڵاڵە سوورەیەکی جوانی پێبگەشێتەوە و منیش بە ناڵەی زار و هاواری زاری نەخۆشی لە گیان بێزار، وەک بولبول و قومری و هوزار، نەک جاروبار، رۆژێ هەزار جار بە دەوری ئەم گوڵە ئاڵە جوانەدا بێم و بچم و بڵێم:

گوڵێکی خۆم بدادمم پێچەوتاوەش بە ئاوی دیدەکانم دادمم ئاوەش
بە دەرگاهی ئیلاهی کەی رەوا بوو گوڵ ئەز مەن دیگەری گیرەد گوڵاوەش

کە خاکی پیرۆزی و پڕ رۆزی و ئاخی بێ ئاخ و داخی وەک میسک و عەنبەری، دار و بەردی زێڕ و زێو مانەندی بەشبەش و لەتلەت کراوە و هەر پارچەی بە دەست یەکێکەوە دەناڵێنێ.

من چۆن دڵ بە گیتی خۆشکەم، چۆن چاوم بەرایی بدا لە دونیا بنۆڕم؟ تا ببینم کە لە سەر سفرەی رەنگین و رازاوەی خواکردی جیهان هەموو کەس

داخ و حەسرەت و کڵۆڵێوە چاوی بڕیوەتە شایی و زەماوەندی دراوسێکان کە بەشەکەیان لێئەستاندووە و ئێستاش کە داوایان لێئەکاتەوە گاڵتەی پێدەکەن.

توخوا براگەل وەرن تا لەسەر کانیاوێکی سارد و جوان کۆڕێک ببەستین تێرتێر بۆ حاڵی زار و ژیانی نەزای نیشتمانە جوانەکەمان بگرین، بەڵکوو فرمێسکی دایکی نازدار و بێچارەی نیشتمانمان کە بە چاوی کانیاوا دەڕژێتە سەر گۆنای دەشت و دەری کوردستانی بێناز، بە دیتنی گریانی بەپەرۆش و ئەسرینی بە جۆشوخرۆشی ئێمە وشک بێتەوە و تۆزێ دڵی بکرێتەوە و ئەم گڕ و کڵپەی دەروونی دامرکێتەوە.

نا! نا! براکان، خۆشەویستەکان، وا گوێم لە ئاە و ناڵەی نیشتمانە کە بە کڕوزانەوە پێم ئەڵێ رۆڵەگیان گریان کاری پیرێژنانە! تا دەرگای مردن و مراندن لە سەر پشتانە، شیوەن و زاری ئیشی ناپیاو و پەستانە! خۆ ئێمەش خۆمان بە لاوێکی ئازا ئەزانین و مەعنای بەزین نازانین، کەوابوو با بچینە سەر چیا بڵیندەکانی نیشتمانمان بە گەوایی ئەوان پەیمانێکی برایەتی ببەستین کە وەکوو ئەم چیایانە رەنگین و سەنگین و بە خوێنی جەرگمان رەنگین بێ، بۆ گەلی هەژاری کورد دواییهێنی ژیانی نەنگین بێ، ببێتە یارمەتیدەری ئێمە بۆ مردن و مراندن لە رێگای رزگاریدا.

## گەنجینەی ئەدەبیات

بەشێکی گرینگی گۆڤاری «ئاوات» گۆشەی «گەنجینەی ئەدەبیات»ە. گۆڤاری «ئاوات» ٤ لاپەڕە لە سەر جەم بیست لاپەڕەی خۆی بۆ شێعر تەرخان کردووە. شێوەی داڕشتنی ئەو گۆڤارە زۆر وەک شێوەی داڕشتنی گۆڤاری «نیشتمان» دەچێ. کاک «نوشیروان مستەفا ئەمین» لە لاپەڕە ٤٩ی کتێبی «چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی رۆژنامەوانی کوردی»دا دەڵێ:«نیشتمان بایەخێکی زۆری داوە بە شێعر، بە تایبەتی بە شێعری سیاسی، رەنگە هۆی ئەمەش ئەوە بێ کە: یەکەم، دوو کەس لە نووسەرە سەرەکییەکانی شاعیری هەڵکەوتووی بەتوانا

بوون و، «زەبیحی» خۆیشی جار و بار شێعری داناوە. دووهەم، رادەی نەخوێندەواران لە ناو دانیشتوانی ئەو سەردەمەی کوردستاندا زۆر بەرز بووە. لە ناو کۆمەڵی نەخۆیندەواردا شێعر، بە تایبەتی بۆ مەبەستی سیاسی لە پەخشان ئاسانتر و زووتر بڵاو ئەبێتەوە و لە بەر ئەکرێ.»

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لەگەڵ مامۆستا «زەبیحی» دۆستایەتییەکی زۆر نزیکی هەبووە. ئەو دۆستایەتییەش کاتێک پێک هات کە مامۆستا «زەبیحی» و کاک «محەممەد» هەر دووک لە تەوریز بوون، پاش ماوەیەک مامۆستا «زەبیحی» لە کاک «محەممەد» داوا دەکا بۆ چاپی «نیشتمان» یارمەتی بدا. ئەوە بوو کاک «محەممەد» بۆ یەکەم جار چووە نێو کاری چاپ و بڵاوکراوەکان. کار کردن دەگەڵ مامۆستا «زەبیحی» لە پیت رێکخستن و رازاندنەوە هەتا چاپی گۆڤاری «نیشتمان»، کاریگەرییەکی زۆری لە سەر کاک «محەممەدی شاپەسەندی» دانا. بە چەشنێک کە شوێنی ئەو کاریگەریە لە گۆڤاری «ئاوات»دا رەنگی داوەتەوە و ئەو گۆڤارەش بە شێوەی «نیشتمان» ئامادە کراوە و لە شێعر وەک کەرەسەیەک بۆ بووژاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی و وشیار کردنەوەی گەلی کورد کەلکی وەرگرتووە. گۆشەی «گەنجینەی ئەدەبیات»ی گۆڤاری «ئاوات» وەک گۆڤاری «نیشتمان» بایەخێکی زۆری بە شێعر داوە. جگە لە شێعری سیاسی و هەست بزوێن، شێعری ئایینیشی تێدا بڵاو کراوەتەوە.

شێعرەکان بریتین لە: «ئەی میللەتی ئاوارە» لە (ر.م) یا (ر.ه)، «لە سەر ئەم بەخشیش و رەحمە» (ئەشکەیی)، «باڵی کێشاوە بە سەر حوسنا برۆ» (حەمدی)، «کچە لادێیی و لاوی ...» هەر دووک لە (مامۆستا هێمن). شێعری «ئەی میللەتی ئاوارە» تەنیا شێعری سیاسی گۆڤاری «ئاوات»ە کە تا رادەیەکی زۆر هەستی نەتەوایەتی کورد دەبزوێنێ. لە لاپەڕە دوودا شاعیری ئەو شێعرە بە ناوی (ر.ه) خۆی ناساندووە، بەڵام لە لاپەڕە ١١ بە ناوی (ر.م) ناسێندراوە. مامۆستا «حەسەنی قزڵجی» لە ژمارە ٣ی گۆڤاری هەڵاڵە کە لە بانەمەڕی ١٣٢٥ (ئاوریلی ١٩٤٦) چاپ کراوە. لە وتارێکی خۆیدا کە لە ژێر ناوی «شاعیری میللی و

ناوەتە عالەمی شێعرەوە و لە ماوەی ئەم سێ ساڵەشدا دووهەزار شێعری زیاتر گوتووە. شێعرەکانی لە گۆڤاری «نیشتمان» و «هاواری کوردستان» (= هاوار= هاواری کورد) و «ئاوات» و رۆژنامەی «کوردستان»دا چاپ و بڵاو کراوەتەوە...» وەکی لێرەدا هاتووە و بە پێی قسەکانی مامۆستا قزلجی بۆی هەیە ئەو شێعرە، شێعری مامۆستا هەژار بێ کە بە ناوی نهێنی «ر.ه» واتا کورتکراوەی ناوی خۆی (رەحمان) و ناسناوە شێعرییەکەی (هەژار) چاپ کرابێ. بەڵام ئەوەش بۆچوونێکە و رەنگە واش نەبێ.

شاعیر بۆ بە هێز کردنی هەستی نەتەوایەتی و ئاگادار کردنەوەی گەلی کورد لەو چارەڕەشی ونەهامەتیانەی تێیدا دەژی، بەو پەڕی هونەرمەندیەوە قسەکانی خۆی لە قالبی شێعردا نووسیوە و دەڵێ:

ئەی میللەتی ئاوارە لە نێو دەشت و بیابان
وەی میللەتی بێ بەش لە هەموو حەق و حیسابان
میللەت هەموو بێ نازو هەموو بێ دەسەلاتن
کەوتوونەوە بێچارە لە نێو دەشت و بیابان

پاشان شاعیر لۆمەی هێندێک کەسان دەکا کە بۆ بەرژەوەندی کاتی خۆیان لە پێناوی وە دەست هێنانی ماڵی دنیا یان خۆشخزمەتی بە داگیرکەران بایەخێک بۆ کەسایەتی خۆیان و گەلەکەیاندا نانێن، بۆیە دەڵێ:

هۆش و دڵ و ئیمان و رەگ و مەعریفەتو بێ
چی دیکە مەدەن حاسڵی عومرو بە جەنابان
هەر تۆ بە ئومێدی من و هەر من بە ئۆمێدت
چۆن دێینە دەرێ ئێمە لە ژێر دەستی کەلابان

هەر لە بەر ئەوە خەڵک هان دەدا چاوەڕێی موعجیزە نەبن و تێبکۆشن و لەو رێگایەشدا ورە و هیوایان لە دەست نەدەن. چونکە چی وای نەماوە لە دەست

ئەو زوڵم و چارەڕەشییە رەهاییمان بێ. بۆ ئەوەی هێز و ورەیەکیشی دابێ بە گەلەکەی، دەڵێ: گەلی ئێمە ئەگەر لە زۆر گەلی دیکە گەورەتر و بە هۆش تر نەبن، کەمهۆشتریش نین. بۆ ئەو مەبەستەش کەلکی لە مەسەلێکی فارسی وەرگرتووە کە دەڵێ:«نابرده رنج گنج میسر نمی شود» واتە ئەوەی تێنەکۆشێ و زەحمەت نەکێشێ و خۆی ماندوو نەکا بە گەنج واتە ئامانج و ئاواتەکانی ناگا:

نەوبیستووە کە نابێت و بە بێ گەنج و بە بێ رەنج
بێ رەنج و عەنا چۆن دەکرا شا بکرابان
مەئیووس و پەریشیدە مەبن وەختە رەها بن
میللەت هەموو ئەورۆ لە سوئال و لە جەوابان
ئەورۆکە هەموو میللەتی دونیایە دەزانێ
ئەو میللەتە باهۆشە دەبوو سەروەر و شا بان

شاعیر لە وەڵامی هێندێک لە خەڵکدا کە پێیان وایە بە دەستی بەتاڵ چمان پێ ناکرێ و دوژمن تەیارە و... هەیە، دەڵێ:

تەیارە چییە؟ قووەتی روح و بەدەن بێ
عیلم و هونەر و مەعریفەت و لوببی لوبابان

شاعیر هۆی سەرکەوتنی گەلەکەی بە نەمانی نەخوێندەواری و فێر بوونی زانست دەزانێ و ڕێگاکەشی لە تێکۆشانی بێ وچاندا دەبینێ. جا ئەو کاتەیە کە خەرمان و بەرهەمی شیرینی ئەو کارە دەبینین و بە بیرێکی نوێوە داوای مافی خۆمان دەکەین و دەبینە خاوەنی ئەو شتانەی کە دوژمن هەیبوو و ئێمە نەمان بوو. بۆ لە نێو بردنی دوژمنەکانمان کەلکیان لێ وەردەگرین:

بێ عیلمی و بێ مەعریفەتی بێت و نەمێنێ

بــۆ تەربیــــەتی فیکـــری جــــەوانانی مــــەداریس
باســــی وەتـــــەن و میللەتــــە، داوێنــــە کیتابــــان
بــۆ تەوسـیعەیی عـیلم و هونــەر، هــەرچی بکۆشــن
هێـشتا کەمــە، گــەر بێــت و بپرســن بــە حیـسابان
نامێنــێ ئەگــەر عیلمــو هــەبوو، بــۆغز و عــەداوەت
بۆ یــەک هــەموو کــەس دەبنــە بـرا، میـسلی سـەحابان
ئــەوجارە دەکــەن فیکـــری بــەرەو ژوور هــەمومان
ئــــازادیتەڵــەب دێنــــەوەڕوو، رەوشــــەن و تابــــان
تــــەییارە دەبــــێ، مەرکــــەب و ئەســبابی شــەڕێتان
بــۆ کوشــتنی ئەعــدا، لــە بــۆ ئێعــدامی ســەبابان

هەر وەکوو پێشتر گوتمان شاعیری ئەو شێعرانەمان بۆ نەناسرا. بەڵام لە بەر گرینگی ناسینی ئەو شاعیرە، چەند نموونە شێعر لەو شاعیرانەی شـێعری لەو جۆرەیان بۆ خەڵک داناوە، لێرەدا دەهێنینەوە. ئەگەرچی دوای هێنانـەوەی نموونە شێعری شاعیرانی دیکەش ناتوانین بە تێـڕادیوی بـڵێین شـاعیری ئـەو شێعرە فلان کەسە، بەڵام هــەر نــەبێ دەرگایــەک بـۆ شــارەزایانی ئــەو بــوارە دەکەینەوە، بەڵکو بە لێکۆڵـینەوە و شــارەزایی ئــەوان نــاوی ئــەو شــاعیرە و شاعیرانی نەناسراوی دیکەشمان بۆ ئاشکرا بێ:

«مەلا مـارفی کۆکـەیی» شـاعیری گــەورە و هەسـتناسـک لــە گۆڤـاری «نیشتمان» - ژمارە یەک - پووشپەڕی ١٣٢٢، لە شێعرێکدا دەڵێ:

ئــەی میللــــەتی مـــەزلووم و فـــەقیر و دەستەوەســـتان
بـــێ عــیلم و مـــەعاریف، وەکـــوو ئـــەتفالی دەبــستان
ئیقـــــدام و قیـــــامێکی بکـــــەن، مـــــەوقیعی کــــارە
هــــەر بــۆ مەیــە تــەنها کــە بــەهار بۆتــە زمــستان

لە کۆتاییشدا دەڵێ:

بــۆ ئاتیـــە فکریکـــی بکـــەن، فورســـەتە ئـــەورۆ
تـــا کـــەی دەبنـــە چـــاو لـــە بـــەر و ئالـــەتی دەســـتان

«سەیفولقوزات» کە بە پیرەمێردی سابلاغی مەشهوور بووە، یەکێکی دیکە لەو شاعیرانەیە کە شێعری لەو جۆرەی داناوە:

کوردینـــە تـــا کـــەی ئێمـــە لـــە کێـــوان میـــسالی دێـــو
بـــێین و بچـــین و بـــۆ ئێمـــە نـــەبێ قـــەت خـــودان و خێـــو
خەڵـکی هـــەموو لـــە بـــاغ و لـــە شـــاران کـــەیف خـــۆش
ئێمـــە بـــڵاو و بـــێ ســـەر مـــاوین لـــە دەشـــت و کێـــو

شاعیر هەر لەو شێعرەدا کوردان ئاگادار دەکاتەوە کـە فکـرێ لـە حاڵـی خۆیان بکەنەوە:

فکـرێ لـە حاڵـی خـۆ کـەن و بگـرین بـە حاڵـی خـۆو
هـــەر بـــێ ســـەری و عـــەداوەتی خۆتانـــە دێتـــە رێـــو
لا هەڵـــــدڕاو و جـــــەرگ بـــــڕاو و فڕێـــــدراو
ڕامـــان دەدەن بـــە جـــارێ لـــە هـــەوراز بـــۆ نـــشێو

لە کۆتاییشدا دەڵێ:

هـــەر میللـــەتێ لـــە لاوە حـــەقی خـــۆی بـــە دەســـتەوە
کوردێک ئەگەر سـەری هەڵـێنێ دەڵـێن بۆتـە سـەربزێو

«قازی هەڵەبجەیی»ش یەکێکی دیکە لەو شاعیرە گەورە و بەناوبانگانـەی ئەو مەیدانەی شێعری کوردییە.

مەلا «حەسەنی قازی»، کوڕی «مەلا عەبدولقادری کانی کەوێ» بووە، لە شێعردا نازناوی «شاهۆ» بووە. لە لاپەڕەی ٨٣ تا ٨٧ی بەشی سێهەمی کتێبی «دیاری کۆمەڵەی ژ.ک»دا شێعرێکی ئەو شاعیرەش بڵاو کراوەتەوە کە ئەوە نموونەی پێنج خشتەکییەکی مەلا «حەسەنی شاهۆ» (قازی هەڵەبجە)یە:

ئەی کوردی ستەمدیدەیی مەزلوومی سییە چار
وەی میللەتی مەعسوومەیی بەدبەختی گرفتار
تا کەی لە خەوان ئێوە و دوژمن هەموو بێدار؟
تا چەند ئەبێ هەر مەست بن و خەلق هەموو هوشیار؟
خۆتان ئەکەنە مەزحەکەیی مەحرەم و ئەغیار

ئەوجار گەلەکەی هان دەدا کە وەخۆ بێنەوە و دەڵێ:

ئەو میللەت و قەومانە لەمەو پێش کە زەبوون بوون
ئەو تایفە و تاقمە، ئەوساکە کە دوون بوون
ئەو خەڵقە لە بەر جەهل و نیفاق غەرقەیی خوون بوون
هەڵسان لە خەوی غەفڵەت و دارای فنوون بوون
ئێستێکە هەموو بەگ لەگن و شاه و حوکمدار!

لە جێگایەکی تردا کوردان هان دەدا یەکێتی‌یان هەبێ و دەڵێ:

وا چاکە هەموو موتتەحید و یەک دڵ و چا بین
بۆ یەک نە وەکوو دەستەبرا، عەینی برا بین
مەردانە لە بۆ مەقسەدی یەک پشت و پەنا بین
بەو شەرتە هەموو تابیعی ئەحکامی خووا بین
تا جوملە رەها بین لە دەسی دوژمنی خونخوار

لە کۆتاییدا دەڵێ:

ئێــوە بــن و خــوا، وەرنــەوە گــشت گــەورە و گچکــان
دەرکـــەن لـــە دڵا جوملـــە خـــەیاڵاتی پەرێـــشان
چەنــد چــشتێ هەیــە واسـیتە بــۆ نەگبــەتی کــوردان
وەک کیبر و حەسەد، بـوغزی یـەک و قیللـەتی عیرفـان
ئیـــسلاحی بکـــەن تـــا کـــوو بکۆشـــین بـــە هـــاوار

یەکێکی دیکە لەو شاعیرانە کە شێعری لەو جۆرەی داناوە کاک «محەممەد ڕەسووڵی میکایلی» بووە. کاک «محەممەد ڕەسووڵی میکایلی» شێعری بە فارسی و بە کوردی لە ڕۆژنامە و گۆڤـارەکانی سـەردەمی دەسـەڵاتی کۆمەڵـەی(ژ.ک) و تەنانەت بەر لە دامەزراندنی کۆمەڵەی(ژ.ک)یـشدا بـڵاو کردۆتـەوە. ئەوەنـدەی زانیاری لە سەر ئەو شـاعیرە هەیـە ئەوەیـە کـە ئـەویش شـێعری سیاسـی و نەتەوایەتی زۆر هەبووە و ئەگەرچی تا ئەو جێیـەی زانیاریمـان لـە سـەر ئـەو شاعیرەش هەبێ، ناوبراو بە ناوی نهێنی (م.م. هووشەنگ) نووسراوەکانی بـڵاو دەکردەوە، بەڵام وێشدەچێ ئەو ناوە ڕەمزییەی ناو گۆڤاری ئـاوات واتـا (ر.م)، هەر کورتکراوەی ناوی ئەو شاعیرە بێ. ئـەوەش چەنـد نموونـە شـێعری ئـەو شاعیرەیە کە لە لاپەڕە ٩و١٠ی ژمارە یەکی گۆڤاری «نیشتمان»دا لـە پووشـپەڕی ١٣٢٢ (جـوولای ١٩٤٣) بـە نـاوی (م.م. هووشـەنگ، ئەنـدامی ژمـارە ١٦) بـڵاو کراوەتەوە:

تـــا دەبیـــنم میللـــەتی کـــوردی فـــەقیر و ســـەرهەژار
بـــێزمـــان و بـــێکـــەس و بـــێ کۆمـــەگ و بـــێ کاروبـــار
ژێرچـــەپۆکی میللـــەتی دی، ڕادەبـــوێرن ڕۆژگـــار
ئاوی چاوم هەر وەکوو گـۆزەی سـەرەوژێر دێتـە خـوار

لە بەشێکی دیکەی شێعرەکەیدا شاعیر میللەتەکەی وشیار دەکاتەوە و پرسیاری لێدەکا بۆچی تێنافکری بۆ تۆ چیت لە میللەتەکانی دیکە کەمترە. پاشان دەڵێ مایەی ئەو پاشکەوتووییەش، دووبەرەکایەتییە:

میللەتی دی چییە ئەگەر کردی تەڕەققی، عیللەتی؟
بۆچی تێنافکری کورد؟ ئاخر ئەتۆش خۆ میللەتی
شد نفاق تو سبب، گر تا کنون در ذلتی
بیوەتەن وەک جوولەکەی دایم هەتیو و سەر هەژار

دوای ئەوە باسی غیرەتی کوردی دەکا کە بۆتە ویردی زمانی خەڵکی و میللەتەکانی دی و غیرەتی بە نموونە دێننەوە. بۆیە دەڵێ: ماکەی پێگەیشتن بە هەر جۆرە سەرکەوتن و شانازییەک یەکێتییە. ئەگەر یەکێتی هەبوو ئەوجار پێویستە زانست و سەوادتان هەبێ، دەنا پێشکەوتنتان نابێ:

مایەیی هەرجۆرە عیزز و ئیفتیخارە، ئیتتیحاد
میللەتی دی بەم تەریقە لادەبەن ریشەی فەساد
ئیتتیحادو گەر ببێ، جا لازمە عیلم و سەواد
چونکە بێ عیلم و هونەر ناکا تەڕەققی هیچ کار

ئەو چەند نموونە شێعرەمان لەو چەند شاعیرە کە لەو سەردەمەدا شێعریان داناوە هێناوە، بەڵام ناتوانین بڕیاری لە سەر بدەین کە بە روونی و بێ شک یەکێک لەو شاعیرانە، ئەو شێعرەی «گۆڤاری ئاوات»ی دانابێ. ڕەنگە یەکێک لەوانە شاعیری مەبەستی ئەو بەشەی وتاری ئێمە بێ، لەوانەشە هیچ کامیان نەبن. با ئەوە بمێنێ بۆ لێکۆڵەر و ئەدیبێک کە وەڵامی دروستمان بداتەوە.

لە لاپەڕە ١٢ و ١٣ی گۆڤاری «ئاوات»دا شێعرێک لە ژێر ناوی «لە سەر ئەم بەخشیش و ڕەحمە خودا ئەلحەمدولیلا» هاتووە. لەو شێعرەشدا شاعیر بە

شێوەیەکی زۆر جوان دوو سووڕەتی «فاتیحە و تەوحید»ی کردۆتە نێوئاخنی شێعرەکەی کە ئەوجۆرە شێعرە لە ئیستلاحی ئەدەبیدا «تەزمین»ی پێ دەڵێن.

بۆ ئەو بەشە لەو شێعرانە بە هۆی ئەوەی کە زۆر وشەو ئیستلاحی عەرەبی و ئایەتی قورئانی تێدا بوو لە زانیاری چەند مامۆستایەکی عەرەبی زان کەلکم وەرگرت و بەو جۆرە زۆر هەڵەی ئەو شێعرەمان راست کردەوە. ئەگەر چی روون نییە هەڵەکانی شێعرەکە هەڵەی خودی شاعیرەکەن یان هەڵەی چاپی، بەڵام هەرچی بێ، ئایە و وشە عەرەبییەکانم لە دووکەوانە هاویشتن کە لە نووسخەی ئەسڵیدا کەوانەیان نییە. ئەوەشم بە مەبەستی جودا کردنەوەی وشەی عەرەبی لە کوردی و هەروەها پاراستنی شێوەی درووستی رێنووسی شێعرەکە، لە کەوانەدا دیاری کردووە.

شاعیری ئەو شێعرە بە ناسناوی «ئەشکەیی» ئەو شێعرەی داناوە کە بە داخەوە ناوی دروست و تەواوی ئەو شاعیرەشمان هەر وەک شاعیری پێشوو بۆ روون نەبۆوە. ئەو شێعرە تەنیا شێعری ئایینی ئەم گۆڤارەیە.

لە خوار لاپەڕە ١٣ چەند بەیت شێعری شاعیرێک بە ناوی «حەمدی» چاپ کراوە کە لە بەیتێکدا دەڵێ:

روتبەیی باڵا بە ئینسانی بچووکی قەت مەدەن
چون لە رووی رۆژا بزانە تیغی کێشاوە برۆ

وێدەچێ مەبەستێکی تایبەت لە هەڵبژاردنی ئەو شێعرە بۆ چاپ لە گۆڤاری «ئاوات»دا هەبێ و بەرپرسانی گۆڤارەکە لە قالبی شێعردا گلەیی خۆیان لە هێندێک لە بەرپرسانی کۆمەڵەی(ژ.ک) کردبێ. لە بەر ئەوەی کە هێندێک کەسی ناشارەزا و ناشیاو پۆستی گرینگیان پێ سپێردرابوو، بە تایبەت کە لەو دوایانەدا مەرجی ئەندامەتی لەو کۆمەڵەدا زۆر هاسان ببۆوە. سەبارەت بە ناساندنی شاعیری ئەو چەند دێڕە شێعرەش ئەوەندەی بۆمان روون بۆتەوە، تەنیا شاعیرێک کە ناس ناوی «حەمدی» بێ و لەو سەردەمی ژیابێ و شێعری

دوو شاعیری پێشوو ناتوانین بڕیاری تەواوی لەسەر بدەین. بەڵام بۆ زانیاری خوێنەرانیش بێ، ئەو چەند دێڕە لە سەر ژیان و بەرهەمی شاعیر دەنووسین:

«مەلا حەمدوون» بە ناسناوی «حەمدی» لە شاری سولەیمانی کوردستانی باشوور بە کوێری لە دایک بووە و لە تەمەنی ٦٥ساڵیدا لە ئەستەمبوڵ کۆچی دوایی کردووە.

ئەوەش چەند نموونەیەک لە شێعری «حەمدی» کە لە کتێبی «گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم» وەرگیراوە:

ئەم دینە لە پێشا وەکوو زەمزەم بوو بە روونی
هیچ غەششی نەبوو، ئێستە دەڵێی لێڵی قوڕاوە
یارەببی لە بەر خاتری پێغەمبەرەکەی خۆت
رەحمێ بکە بەم کۆمەڵی ئیسلامە کە ماوە
لەت لەت بووە بەم چەکوشە، سەعاتی دڵی عالەم
ڕەققاس و جەڕ و زەمبەرەک و چەرخی سوواوە
«حەمدی» دڵی یەخسیری فەڕەنگی غەمە ئەمڕۆ
بەربوونی بە بەربوونی گرۆی بەسرە و فاوە

لە لاپەڕە ١٤شدا چاومان بە دوو شێعری (م. هـ) مامۆستا «هێمن» دەکەوێ. لەو لاپەڕەیەدا دوو شێعری شاعیر بڵاو کراوەتەوە. یەکەم شێعری بە ناوی «کچە لادێ یی» لە دیوانی «تاریک و روون»ی مامۆستا هێمندا بە ناوی «کیژی لادێ» چاپ کراوە و جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ چاپ کراوەکەی گۆڤاری «ئاوات»دا هەیە.

بەڵام شێعری دووهەم بە ناوی «لاوی...» لە هیچ کام لەو بەرهەمانەی مامۆستا «هێمن»دا کە تا ئێستا چاپ کراون، بڵاو نەکراوەتەوە. مامۆستا «هێمن» بۆ خۆی لە پێشەکی دیوانی «تاریک و روون»دا دەڵێ: «کۆمەڵە، گۆڤاری ئاواتیشی چاپ کرد و من لەویشدا نووسیم». کە دیارە مەبەستی ئەو دوو شێعرە بووە. شێعری دووهەم دوای پتر لە شێست ساڵ بۆ جاری دووهەم سەرلەنوێ لەو کتێبەدا بڵاو دەبێتەوە.

## گۆڤاری «ئاوات» سەربەخۆ بووە یا درێژەپێدەری گۆڤارێکی دیکەیە؟

گۆڤاری «ئاوات» بە پێچەوانەی بیروڕای زۆربەی ئەو نووسەرانەی کە ناویان لەو وتارە و بەشەکانی دیکەدا هاتووە، تەنیا یەک ژمارەی لێ چاپ و بلاو کراوەتەوە.

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لە وتووێژ لەگەڵ چەند ڕۆژنامە و گۆڤاردا، سەبارەت بە ژمارەکانی «ئاوات»، زانیاری جۆراوجۆری داوە بە خوێنەرانی. ئەگەرچی زانیارییەکانی لەگەڵ یەکتر جیاوازییان هەیە، بەڵام لەسەر ئەوەشڕا نابێ بێ ئینساف بین، لە بەر ئەوەی کە ئەگەریش هەڵەیەک لە قسەکانی کاک محەممەددا هەبێ، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ماوەی پتر لە شێست ساڵ بە سەر چاپ و بلاوکردنەوەی ئەو گۆڤارەدا تێپەڕ بووە. هەر بۆیە زۆر ئاساییە کە هێندێک لە وردەکارییەکانی لە بیر چووبێتەوە. کاک محەممەد لە یەکێک لە وتووێژەکانی‌دا دەڵێ: «ئەوەی ماوە بیڵەین دەرکردنی ژمارە ١٠ تا ١٢ی «نیشتمان»ە. لەو کاتەدا چاپخانەیەکی بچووکی پیت ڕێکخستنمان پەیدا کرد، هێنامانەوە سابلاغ تا لە وێ خۆمان چاپی بکەین، ئەوە بوو «زەبیحی» لە کاتی گەڕانەوە لە ورمێ بەسەرداگیرا. سووندم لەو چاپخانەیە وەرگرت و بە تەنیا گۆڤارێکم دەرکرد بە ناوی «ئاوات»، ئێستا کچێکم ناو ناوە «ئاوات» بە یادی ئەم گۆڤارە کە تەنیا یەک ژمارەی لێدەرچووە. شایانی باسە هەموو نووسینەکانی هی خۆم بوون، جگە لە چەند پارچە شێعرێک. ناوی نووسینەکانیش تا ئەو جێیەی لە یادم بێت ئەمانەن:«مەحاکەمەی هیتلەر، سواری ڕەش پۆش (لە فارسیەوە وەرم گێڕابوو)، شتێک دەربارەی ئەدەبی ڕەمزی و بە یادی «زەبیحی»یەوە، شتێکم نووسیبوو بە ناوی دۆستی دوورم. نزیکەی ٣٠ لاپەڕە دەبوو... .» (مەبەستی لە تێکڕای گۆڤارەکەیە.)

کاک دوکتور «همیدادی حوسێن» لە لاپەڕە ٢٧٠ی کتێبی «ڕۆژنامە نووسی کوردی لە سەردەمی کۆماری دێموکراتی کوردستان ١٩٤٢ - ١٩٤٧»دا، دوای ناساندنی کەسایەتی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» دەڵێ:«... هەر وەکوو خۆی دەڵێ هەوڵی داوە و گۆڤاری «ئاوات»ی دەرکردووە و بە نازناوی ڕەمزی نووسیوێتی و سێ ژمارەی لێ چاپ کردووە کە بە داخەوە ئێمە ئەسەرێکی ئەو

هەر وەک دیتمان لە جێیەک دەڵێ یەک ژمارە و لە جێیەکیش دەڵی سێ ژمارەی لێ چاپ کراوە. قسەکانی کاک محەممەدی شاپەسەندی سەبارەت بە گۆڤارەکانی «نیشتمان» و «ئاوات» جێگای سەرنجن. سەبارەت بە گۆڤاری «ئاوات» لە چەند وتووێژی دیکەدا گوتوویەتی یەک ژمارەی لێ چاپ کراوە. بەڵام سەبارەت بە گۆڤاری «نیشتمان» دەڵێ:«ئەوەی ماوە بیڵەین دەرکردنی ژمارە ١٢ - ١٠ی «نیشتمان»ە کە گۆڤاری «ئاوات»یشی لەگەڵ خستووە. وا دیارە چونکە بۆخۆی لە ژمارە (٩ و ٨ و ٧) ی «نیشتمان» نووسراوەی هەیە، ژمارە، (١)ی «ئاوات»ی بە ژمارە ١٠ی «نیشتمان» داناوە.

کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» لە لاپەڕە ١١٦ی کتێبی «ئاوڕێک لە مێژووی مەهاباد» لە وتووێژێکدا کە لەگەڵ «مەلا قادری مودەڕڕیسی» پێکیهێناوە دەڵێ:«مەلا قادری مودەڕڕیسی» لە یادداشتێکی خۆیدا نووسیوێتی [گۆڤاری «نیشتمان»]، ١٠ ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە». لە درێژەی ئەو باسەدا دەڵێ: «لە حاڵی حازردا ٩ ژمارەی ئەو بڵاو کراوەیە لە کتێبخانەی شەخسی ئاغای «ئەییووبیان»دا هەیە و بۆ خۆم دیتوومن.» هەر لەو لاپەڕەیەدا دەڵێ:کاتێک لە تەورێز گۆڤاری «نیشتمان» چاپ دەکرا، کاک «عەلی ئەنوەری» (میر مەحموودی) بە نهێنی ئەو گۆڤارانەی لە تەورێز دەهێناوە بۆ مەهاباد. پاشان لە زمان کاک «عەلی ئەنوەری»یەوە دەڵێ:«ژمارەکانی ١١ و ١٢ی گۆڤارەکە لە شاری مەهاباد بە یارمەتی لاوە بارهاتوو و شارەزاکان لە چاپ درا.»

کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» لە نامیلکەیەکدا کە لە پاییزی ساڵی ١٣٦٣ (١٩٨٤) لە ١٧ لاپەڕە و لە ژێر ناوی «ئاوڕێکی دیکە لە ژ.ک» بڵاوی کردۆتەوە، لە زمان «مەلا قادری مودەڕڕیسی» لە لاپەڕە ١٣دا دەنووسێ: «زۆربەی نووسراوەکان[ی نیشتمان] بە قەڵەمی «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» بوو کە بەڕاستی نووسەرێکی لێهاتوو بوو. وتارەکانی ئەو بە زمانی تورکی لە گۆڤاری (وەتەن یۆڵندا)ی لە تەورێزیش چاپ دەبوو. زەبیحی لێهاتووییەکی سەیری هەبوو، زاراوە جۆراوجۆرەکانی کوردی دەزانی و زمانەکانی فەڕانسە و ئینگلیسیشی دەزانی. هەرچۆنێک و بە هەر زەحمەتێک بووبێ ‹دوازدە› ژمارەی گۆڤاری «نیشتمان»ی چاپ و بڵاو کردەوە و گەیاندییە هەموو جێیەکی کوردستان

و زۆر پەسەند کرا و پێشوازی لێ کرا. دوای بڵاوبوونەوەی گۆڤارەکە دەوڵەتی ئەوکات کەوتە جموجۆڵ کە شوێنی چاپی گۆڤارەکە ببینێتەوە. چاپخانەی خەلیفەگەری ئەرمەنییەکانی تەورێز پشکێندرا، هیچ چەشنە بەڵگەیەکیان وەدەست نەهێنا بەڵام چاپخانە ئەوجار ئامادە نەبوو چاپی ئەو بڵاوکراوانە قەبووڵ بکا. دوای ماوەیەک ئەوجار «چاپخانەی سەعادەت» لە تەورێز ئامادەی هاوکاری بوو بەڵام بە نرخێکی گرانتر. بە تێکۆشانی لە رادەبەدەری ئاغای زەبیحی و چەند کەسێکی دیکە وەک ئاغای «مەحموودی وەلیزادە» بڕیار درا کە پیتەکان، کادر، کاسەی پیتەکان و... بدەن بە ئاغای زەبیحی کە شەوانە بیباتە ماڵە خۆی و ئامادەی بکەن و شەوێکی دیکە بۆ چاپکردن بیبەنە چاپخانە. هەر چۆنێکی بوو چاپخانەیەکی چکۆلە کڕدرا و هێنرایە مەهاباد و ژمارەکانی ١١ و ١٢ی گۆڤاری لە مەهاباد و بە یارمەتی لاوانی دەورەدیتوو پێ چاپ کرا. بەکورتی بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ژ.ک لە ماوەی سێ ساڵدا بریتی بوون لە: یەکەم، دیاری [کۆمەڵەی ژ.ک بۆ لاوانی کوردی ١و٢و٣] بوو. پاشان رۆژمێری ساڵی ١٣٢١ و ١٣٢٢ و ١٣٢٣ی هەتاوی و ١٢ ژمارەی گۆڤاری نیشتمان».

کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان»یش لە بڕوایە دایە کە گۆڤاری «نیشتمان» سەرجەم ٩ ژمارەی لە ٦ بەرگدا لێ چاپ کراوە. بەڵام لە سەروبەندی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک) و پێکهاتنی (ح.د.ک) گۆڤاری «هاواری کورد» لە رەزبەری ١٣٢٤ چاپ کرا لە جێی ژمارە ١٠ی گۆڤاری «نیشتمان» چاپ بوو. هۆی ئەوەش کە ئەو ژمارەیەی بە ژمارە ١٠ داناوە ئەمەیە کە هەڵەکانی چاپی ژمارە (٧ و ٨ و ٩ )ی گۆڤاری «نیشتمان» لە ژمارە ١ی گۆڤاری «هاوار» (= هاواری کورد)دا راست کراونەتەوە. مامۆستا «ئەییووبیان» لە یادداشتێکی خۆی‌دا نووسیویەتی: «هاواری کورد لە جێی گۆڤاری «نیشتمان» و لە پاش ژمارە (٧ و ٨ و ٩)ی «نیشتمان» چاپ و بڵاو کراوەتەوە. «هاواری کورد» تەنیا یەک ژمارەی لێ چاپ کرا؟! دوا بە دوای ئەو، گۆڤاری «ئاوات» چاپ کرا و بە جێگای ژمارە ١١ی گۆڤاری «نیشتمان» داندرا.»

سەبارەت بە گۆڤاری «ئاوات»یش دەڵێ:«ئاوات (نیشتمانی ژمارە ١١)

ژمارە ١١ لە رۆژانی هاڵۆزی و تێک دانی کۆمەڵەی (ژ.ک) و سەرەتای پێش سازبوونی «حیزبی دێموکڕاتی کوردستانی ئێران» لە مەهاباد و لە لایەن کاک «محەممەدی شاپەسەندی» چاپ و بڵاو کراوەتەوە.»

هەر لە سەر ئەو بۆچوونە «هاواری نیشتمان»یشی بە ژمارە ١٢ی گۆڤاری «نیشتمان» داناوە. هەڵبەت سەرەڕای ئەو بۆچوونەش مامۆستا «ئەییووبیان» سەبارەت بەو ژمارەی «نیشتمان» کە لە «سیتەکی شارباژێڕ» چاپ کراوە، دەڵێ: کە ئەو ژمارەیە ژمارە ١٠ی «نیشتمان»ە، کە ئەو بۆچوونە لەگەڵ بۆچوونەکانی پێشتری یەکتر ناگرنەوە.

ڕەنگە «مەلا قادری مودەڕڕیسی و کاک محەممەد شاپەسەندی و کاک عەلی ئەنوەری»ش بۆچوونەکانیان هەر وەک بۆچوونی مامۆستا «ئەییووبیان» بووبێ، واتە گۆڤارەکانی «هاواری کورد» و «ئاوات» و «هاواری نیشتمان»یان بە ژمارە ١٠ و ١١ و ١٢ی گۆڤاری «نیشتمان» دانابێ.

هەر بۆیە بە پێویستم زانی بۆ روون کردنەوەی ئەو بۆچوونانە چەند خاڵێکی گرینگ بخەمە بەر باس و لێکۆڵینەوە کە پێم وایە بەم شێوەیە بەشێک لە مێژووی رۆژنامەنووسی کوردیمان بۆ ساغ دەبێتەوە.

١- گۆڤاری «ڕێگا» لە یەکی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٢٧ (١٩٤٨) ساڵێک پاش رووخانی کۆماری کوردستان لە گوندی «سیتەکی شارباژێڕ»ی سولەیمانی چاپ کراوە. لاپەڕەی ٢ی ئەم گۆڤارە باس لە پەرە سەندنی چاپ و بڵاوکراوە کوردیەکان دەکا و سەبارەت بە گۆڤار و رۆژنامەکانی ماوەی یەک ساڵ تەمەنی کۆماری کوردستان، کە چاپ و بڵاو کراونەوە دەڵێ:«ڕۆژنامەی «کوردستان»، گۆڤاری «کوردستان»، «نیشتمان»، «هاواری نیشتمان»، «‹ئاوات›»، «گڕوگاڵی منداڵان» [ی کورد] لە مەهاباد. «هەڵاڵە» لە بۆکان، «راوێژ» لە سنە... بە چاپەمەنی و بڵاوکراوە کوردیەکان زیاد بوون.»

لێرەدا دوو بابەتمان بۆ دەردەکەوێ:

یەکەم: گۆڤارەکانی «نیشتمان»، «هاوار» (= هاواری کورد) (کە لە ریزی گۆڤارەکاندا ناوی لە بیر کراوە)، «ئاوات»، «هاواری نیشتمان»، «گڕوگاڵی منداڵانی کورد»، هەموویان ناویان بە جودا هاتووە و سەربەخۆن. واتە خولی دووهەمی هیچ گۆڤارێکی پێش خۆیان نین.

دووهەم: ئەو کاتی کە «گۆڤاری ڕێگا» چاپ کراوە و ئەو شتانەی نووسیوە، مامۆستا «زەبیحی» سەرنووسەر و بەرپرسی گۆڤاری «نیشتمان» لە گوندی «سیتەک» لە لای «شێخ لەتیف» بووە. ئەگەر ئەو بۆچوونانەی پێشتر باسمان کردن بەم شێوەیە بایە کە (مامۆستا ئەییووبیان و...) باسی دەکەن، ئەوە ئەو کات لە نووسراوەی گۆڤاری «ڕێگا»دا ڕەنگی دەدایەوە و دەنووسرا. بەڵام هەر وەک دەزانین ئەو گۆڤارانە هەموو سەربەخۆن و جیاوازن لە یەکتری، دیارە مامۆستا «زەبیحی»ش ئەو نووسراوانەی گۆڤاری ڕێگای پەسەند کردووە.

٢- دوکتور «عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ» لە وتووێژێکدا کە نووسەری کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی» لەگەڵی پێک هێناوە، لە لاپەڕە ٢٣٦ و ٢٣٧ باسی هەوڵ و تێکۆشانی مامۆستا «زەبیحی» دەکا و سەبارەت بە چاپ و بڵاو کردنەوەی ژمارە ١٠ی گۆڤاری «نیشتمان» دەڵێ: «ئەمن ئاگاداری ئەو شتانەم، مامۆستا زەبیحی ئەو ژمارەیەی «نیشتمان»ی لە سیتەک دەرکردووە و هێرشی بۆ سەر پارتی و کاک «هەمزە عەبدوڵڵا» و ئەوانە تێدابووە.... بەڕێوەڵڵا لە بیرمە ژمارە ١٠ی دەرکرد، لێم پرسی باشە چیت لە سەر نووسیبوو خۆ ژ.ک نەمابوو! وتی لێم نووسیبوو «ئۆرگانی نەهزەتی مقاومەت» ئەمن خۆم دیبووم، بەڵام ئەو شتانەم لە بیر نەمابوو لە سووریا لێم پرسی. بەو حیسابە کە ئەوە مقاومەت هەیە و شۆڕش درێژەی هەیە لە کوردستانی ئێران، بەس کۆمەڵێک پلاریشی بۆ سەر پارتی تێدا بووا!». « دوکتور عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ» لە درێژەی ئەو باسەدا دەڵێ کە پارتیش لە بڵاوکراوەیەکی خۆیدا کە ناوی «مرۆڤ» بوو وەڵامی ئەو هێرشەی گۆڤاری «نیشتمان»ی داوەتەوە و نووسیوێتی:«نیشتمان لە دەوری دووەمیدا ئەبێتە زمان حاڵی کۆمەڵێک ئاژاوەچی.»

دوکتور «جەماڵ نەبەز»یش لە کتێبی «گۆڤاری نیشتمان - تەمووزی ١٩٤٣ - مایسی ١٩٤٤ زمانحاڵی کۆمەڵەی ژێکاف و ئیدیۆلۆژی هوردەبورژوازی ڕۆشنبیری ناسیۆنالیست لە کوردستاندا» لاپەڕە (٢٨) دەنووسێ:«... هەر وەک «زەبیحی» خۆی گوتی ژمارە ١٠ی «نیشتمان» پاش ڕووخانی کۆماری کوردستان دەرچووە. ئەم ژمارەیە لە «شارباژێڕ» دەرچووە لە کاتێکدا «زەبیحی» لە لای «شێخ لەتیفی شێخ مەحموود» پەنابەر بووە.» دوکتور «کەماڵ مەزهەر ئەحمەد»یش لە لاپەڕە ٨٠ و ٨٨ی کتێبی «تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی

لە ڕۆژنامەنووسی کوردی»دا، سەبارەت بە ژمارەی (٧ و ٨ و ٩)ی گۆڤاری «نیشتمان» کە لە یەک بەرگدا بلاو کراوەتەوە دەدوێ و سەبارەت بە ژمارە ١٠ش لە لاپەڕە ٢٣٨دا دەڵێ:«دوای ڕووخانی کۆماری [کوردستان لە] مەهاباد، مامۆستا زەبیحی بە نهێنی ساڵی ١٩٤٨ ژمارەیەکی تری «نیشتمان»ی لە عێراق دەرکرد... .»

لە قسەکانی کاک دوکتور «عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ» دوو خاڵمان بۆ دەردەکەوێ. یەکەم:«ژمارە ١٠ی گۆڤاری «نیشتمان» لە لایەن مامۆستا «زەبیحی»یەوە لە «سیتەکی شارباژێڕ» چاپ کراوە. دووهەم: بلاوکراوەیەکی پارتی بە نێوی «مرۆڤ» وەلامی هێرشی «نیشتمان»ی ژمارە ١٠ی بە عینوانی «نیشتمانی دەوری دووەم» داوەتەوە.

جا قسەکانی دوکتور «کەمال مەزهەر ئەحمەد» و دوکتور «جەمال نەبەز» بێنینە سەر قسەکانی دوکتور «عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ» (کە هەموویان لە زمان مامۆستا «زەبیحی»یەوە ئەو زانیاریانەیان وەرگرتووە) ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە و هێچ شکمان نامێنێ کە گۆڤاری «نیشتمان»ی ژمارە ١٠ لە کوردستانی باشوور و لە گوندی «سیتەک» چاپ کراوە و دەوری دووهەمی گۆڤارەکەش بووە.

واتە دوای ژمارە (٧ و ٨ و ٩)کە بەشێکی لە تەورێز و بەشێکی لە مەهاباد چاپ کرا، ژمارە ١٠ی ساڵێک دوای ڕووخانی «کۆماری کوردستان» بە عینوانی «دەوری دووەمی گۆڤاری نیشتمان»، لە لای «شێخ لەتیف» چاپ کراوە.

ئەگەر ئەو ژمارەی کە مامۆستا «زەبیحی» لە سیتەک چاپی کردووە ژمارە ١٠ی گۆڤاری «نیشتمان» بێ، بۆچی دەبێ «هاوار» (= هاواری کورد) لە جێی ژمارە ١٠ی «نیشتمان» چاپ کرابێ؟! ئەگەریش دایبنێین «هاوار» (= هاواری کورد) ژمارە ١٠ی «نیشتمان» بێ، ئەو کات ئەو ژمارەی مامۆستا «زەبیحی» لە «سیتەک» چاپی کردووە بۆ چی ناو نراوە ژمارە ١٠ی «نیشتمان»؟!

نووسراوەکەی بلاوکراوەی «مرۆڤ» و قسەکانی خودی مامۆستا «زەبیحی» ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە ژمارە ١٠ی گۆڤاری «نیشتمان» بە مەعلوومی لە لایەن مامۆستا «زەبیحی»یەوە چاپ کراوەو لە سەر گۆڤارەکەش نووسراوە «گۆڤاری «نیشتمان» دەوری دووهەم - ئۆرگانی نێهزەتی مقاومەت». ئێستا کە بۆ هەمووومان ئاشکرا بوو ئەو «نیشتمان»ەی لە «سیتەک» چاپ کراوە

دەوری دووهەمی گۆڤارەکەیە و خودی مامۆستا «زەبیحی»ش ناوی ژمارە ١٠ی گۆڤاری «نیشتمان»ی لە سەر داناوە. ئەو کات هەر گۆڤارێکی دوای ژمارە (٧ و ٨ و ٩)ی «نیشتمان» چاپ کرابا دەبوو بە دەوری دووهەم و...، واتە بۆ نموونە دەبوو بۆ گۆڤاری «هاوار» (= هاواری کورد) کە دوای وەستانی چاپی «نیشتمان» چاپ و بڵاو کرایەوە، نووسرابایە: گۆڤاری «هاواری کورد» - ژمارە ١٠ - دەوری دووهەمی گۆڤاری «نیشتمان»، کە ئەو بۆچوونە لەگەڵ ئەو قسانەی پێشتر باسمان کردن یەکتر ناگرنەوە. بۆ «گۆڤاری ئاوات» و «هاواری نیشتمان»یش هەروەها دەبوو نووسرابایە ژمارە ١١ و ١٢ی دەوری سێهەم و چوارەمی گۆڤاری «نیشتمان».

گۆڤاری «مرۆڤ» ساڵی ١٩٤٨ بڵاو کراوەتەوە، هەتا ئەو جێیەی زانیاریمان لە سەر ئەو گۆڤارە هەیە دەزانین کە لە «سیتەک» چاپ کراوە. ئەگەر ئەوەشمان قەبووڵ بێ کە گۆڤارەکانی «هاوار» و «ئاوات» و «هاواری نیشتمان»، ژمارە ١٠ هەتا ١٢ی دەوری دووهەم هەتا چوارەمی «نیشتمان» بن، ئەو کات لە نووسراوەکەی گۆڤاری «مرۆڤ» وە شک دەکەوتین کە دەڵێ:«نیشتمانی دەوری دووهەم!» ئەگەر ئەو بۆچوونەی گوتمان دروست بایە، دەبوو لەو «نیشتمان»ەی مامۆستا «زەبیحی» کە لە «سیتەک» چاپی کرد، نووسرابا:«گۆڤاری نیشتمان دەوری پێنجەم.» ناویشی نابایە ژمارە ١٣، کە ئەوەش راست دەرنەدەهات و دەبووە هەڵەیەکی زەق و بەرچاو و جێگای شک و گومان.

٣- کاک «محەممەدی شاپەسەندی» هەروەک پێشتر باسمان کرد دەڵێ:«نیازمان وابوو (نیشتمان) لە مەهاباد چاپ بکەین، مەکینەیەکی «نییۆ فۆلسکاب» و هێندێک حەرفمان دەست کەوت و گویستمانەوە بۆ مەهاباد، پێش ئەوەی دەست بکەین بە چاپی ژمارەیەکی نوێ، «زەبیحی» بە سەردا گیرا، پێم خۆش نەبوو چاپخانەکە بێ ئیش بمێنێتەوە بە دەرفەتم زانی گۆڤارێک بە ناوی «ئاوات» چاپ و بڵاو بکەمەوە...»

لێرەدا بەڵگەیەکی دیکەشمان دێتە دەستی، ئەویش ئەوەیە ئەگەر بڕیار بایە لە مەهاباد درێژە بە چاپی «نیشتمان» درابا، ئەو کات هەرچی لە مەهاباد دوای ساڵێک و چەند مانگ وەستانی چاپی گۆڤاری «نیشتمان» چاپ و بڵاو

خودی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» ناوی گۆڤارە تازەکەی ناوە «ئاوات»، کە چی روون نییە بۆ چی دەڵێ:«ئەوەی ماوە بیڵێین دەرکردنی ژمارە ١٠ تا ١٢ی «نیشتمان»ە؟!

٤- کتێبی «جنبش چپ بە روایت اسناد ساواک» (حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران) بەرگی یەکەم کە لە لایەن «ناوەندی لێکۆڵینەوەی بەڵگەکانی مێژووی وەزارەتی ئیتلاعات» چاپ کراوە لە لاپەڕە ١٧٦دا دەڵێ:«لەو دوایانەدا رۆژنامەیەک بە ناوی «کوردستان ئاوات» بڵاو بۆتەوە و لە تەواوی ناوچەکان بڵاو دەکرێتەوە...» لە پەراوێزەکەشیدا و هەر لەو لاپەڕەیەدا نووسیویەتی: «ئەو رۆژنامەیە ئۆرگانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە و یەکەمین ژمارەی لە ٢٠ی بەفرانباری ١٣٢٤ چاپ کراوە و تێکڕا ١١٣ ژمارەی لێ چاپ کراوە...»

لێرەدا دوو شتی گرینگ ئاماژەی پێ کراوە:

یەکەم: ئەوەی کە دەڵێ رۆژنامەی «کوردستان» ١١٣ ژمارەی لێ چاپ کراوە. کە ئەگەر بێتوو ئەو زانیارییە لە رووی بەڵگەنامەکانی ئەو ناوەندە بووبێ واتە هەموو ژمارەکانی رۆژنامە و گۆڤارەکانی سەردەمی «کۆماری کوردستان»یان لە بەر دەستیدا بووبێ، ئەوە زانیارییەکی باش دەبێ بۆ ئەو کەسانەی لە سەر «رۆژنامەی کوردستان» خەریکی لێکۆڵینەوەن.

دووهەم: وا وێدەچێ هەموو بڵاوکراوەکانی سەردەمی «کۆماری کوردستان» لە ناوەندی ناوبراو دەست بکەون. بۆیە دەڵێ:«رۆژنامەیەک بە ناوی «کوردستان ئاوات» بڵاو بۆتەوە. بەڵام وێدەچێ هەڵەیەک لە نووسراوەکانی ئەم کتێبەدا هەبێ، ئەویش ئەوەیە کە لە نێوان «رۆژنامەی کوردستان» و «ئاوات»، «ویرگوول»ێک لە بیر کراوە. ئەوەش کە رۆژنامەی کوردستان وەپێش «ئاوات» کەوتووە هەڵەیە. رەنگە ئەو هەڵەیەش بگەڕێتەوە سەر ئەو ماوە کورتەی نێوانی چاپی گۆڤاری «ئاوات»، (ای خەزەڵوەری ١٣٢٤) هەتا چاپی ژمارەی یەکەمی «رۆژنامەی کوردستان» کە لە رێکەوتی ٢٠ی بەفرانباری ١٣٢٤ بڵاو کراوەتەوە و کەمتر لە دوو مانگیان مەودا بووە.

بەو حیسابە نووسراوەی کتێبی «چپ در ایران...» دەبێ بەم شێوەیە راست بکرێتەوە:«لەو دوایانەدا [گۆڤارێک] بە ناوی «ئاوات» و رۆژنامەیەک بە ناوی «کوردستان» چاپ کراون و لە تەواوی ناوچەکان بڵاو دەکرێنەوە.»

یەکێک لە هۆیەکانی بڵاو نەبوونەوەی گۆڤاری «ئاوات» ئەوەیە کە ئەم گۆڤارە هەروەک لە لاپەڕەی ٢دا نووسیویەتی:«ئابوونە پێشەکی وەردەگیرێ»بە هۆی نەبوونی ئیمکانات و بودجەیەکی تایبەت بووە. جا هەر لە بەر ئەوە ڕەنگە تیراژی چاپی گۆڤارەکە وەک «ڕۆژنامەی کوردستان» نەبووبێ و زۆر کەمی لێ چاپ کرابێ. ڕۆژنامەی «کوردستان» بەرپرس و بودجەی تایبەتی بۆ دانراوە و تیراژی هەر ژمارەیەکی بە پێی قسەی کاک «سەعید ناکام» ٦٠٠ دانە بووە و بە تەواوی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی کۆمار و تەنانەت دەرەوەی کۆماریشدا بڵاو بۆتەوە. بەڵام «ئاوات» لە لاپەڕە دوودا نووسیویەتی: «چوون ئەو مجەللەیە پووڵی ئابوونە نەبێت هیچگوونە دەرامەدێکی نییە، تکا لە خوێنەرانی خۆشەویست ئەکەین بە گەیشتنی ئەو ژمارەیە پووڵی ئابوونەمان بۆ بنرێرن.»، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر نەبوونی دەزگایەکی چاپی پێشکەوتوو و هەروەها جەخت و فشارێکی زۆری رووسەکان بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک). هەر وەک دەزانین دەگەڵ دامەزراندنی «کۆماری کوردستان» بڵاو کراوەو چاپەمەنی کورد بە هۆی هاتنی چاپخانە لە رووسیەوە بۆ کوردستان، پەرە دەستێنێ و ئەو کەم و کوڕیانەی پێشووی تا ڕادەیەکی زۆر لە سەر لادەچێ. تەنانەت کاغەز و پێداویستییەکانی دیکەشی بە هۆی دڵسۆزی و بە دوادا چوونی «پێشەوا قازی محەممەد» بۆ دابین دەکرێ.

بە لە بەر چاو گرتنی تەواوی ئەو قسە و بیر و بۆچوونانەی سەبارەت بە «ئاوات» باسی لێوە کرا، گۆڤاری «ئاوات» دەناسێنین:

گۆڤاری «ئاوات»، تاقە یەک ژمارەی لە یەکی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٢٤ (٢٣ ئۆکتۆبری ١٩٤٥) واتە ساڵێک و چوار مانگ دوای دەرچوونی ژمارە (٧ و ٨ و ٩)ی گۆڤاری «نیشتمان» چاپ کراوەو گۆڤارێکی سەربەخۆ بووە و خولی دووهەم و سێهەمی هیچ گۆڤارێکی پێش خۆی نەبووە. لە لایەن چەند ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک) و بە بەرپرسێتی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» چاپ و بڵاو کراوەتەوە.

تەنیا خاڵی پەیوەندی لەگەڵ گۆڤاری «نیشتمان» و گۆڤارەکانی پێش خۆی ئەوە بووە کە درێژە پێدەری بیری کارگێڕانی کۆمەڵەی (ژ.ک) بووە کە ئەمەش بە چاوخشاندنێکی خێرا بە سەر بەڵگەکانی ئەودەم، بۆ هەمووومان ڕوون دەبێتەوە، چونکە تا ئەوە کات هێشتا «حیزبی دێموکراتی کوردستان»

دانەمەزرابوو و «کۆماری کوردستان»یش ڕانەگەیەندرابوو. بەڵام زەختێکی یەکجار زۆر لە لایەن ڕووسەکانەوە خرابووە سەر بەرپرسانی کۆمەڵەی (ژ.ک) کە ناوی حیزبەکەیان بگۆڕن. جیا ڕەنگە هەر بەو زەختە ناڕاستەوخۆ و ڕاستەوخۆیانە بێ کە دوای دەرچوونی ژمارە (٧ و ٨و ٩)ی «نیشتمان» چی دی ماوە نەدرا «نیشتمان» چاپ بکرێتەوە. بە تایبەتی کە بە ئاشکرا لە لاپەڕەی یەکەمی هەموو ژمارەکانی «نیشتمان»دا ئارمی کۆمەڵەی (ژ.ک) بە درووشمی «بژی کورد و کوردستانی گەورە» وەبەر چاو دەکەوت.

گۆڤارەکانی «هاوار» (= هاواری کورد) و «ئاوات»یش چونکە درێژە پێدەری بیری ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوون ماوەیان پێ نەدرا پتر لە یەک ژمارەیان لێ چاپ و بڵاو بکرێتەوە. دەرچوونی تەنیا یەک ژمارەی گۆڤاری «هاواری نیشتمان»یش کە دوو مانگ دوای ڕاگەیاندنی «کۆماری کوردستان» بڵاوکراوەتەوە، هەر دەگەڕێتەوە سەر ئەو هۆیانەی کە بۆ گۆڤارەکانی دیکە باسمان کرد. ئەگەرچی لە سەر گۆڤاری «هاواری نیشتمان» نووسراوە «بڵاوکەرەوەی بیری یەکێتی جەوانانی دێموکڕات» بەڵام بە کردەوە درێژە پێدەری بیری ئەندامانی کۆمەڵەی(ژ.ک) بووە. چونکە بڕوای زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵەی(ژ.ک) وا بووە کە پەیڕەوی ناوخۆ و بەرنامە و ئامانجەکانی کۆمەڵەی(ژ.ک) زۆر بەرتەسک کراوەتەوە. هەر بۆیە ئەو کارانەی لە سەردەمی دەسەڵاتی کۆمەڵەی(ژ.ک) و دوای دامەزراندنی کۆمار و تەنانەت دوای ڕووخانی کۆماریش (وەک کارەکانی مامۆستا «زەبیحی» لە سیتەک) هەموو بۆ زیندوو ڕاگرتنی ئامانج و بەرنامەکانی کۆمەڵەی(ژ.ک) بووە.

## وێنە

خاڵێکی گرینگ لە کاری ڕۆژنامەگەری و چاپەمەنی و بڵاوکراوەکاندا وێنەیە. وێنە دەبێتە هۆی دەوڵەمەند کردنی نووسراوە و بڵاوکراوەکان. هەم خوێنەر لە خوێندنەوە ماندوو ناکا و هەم بەشی خۆشی قسەی پێیە. «چینی»یەکان گرینگی وێنەیان زۆر چاک هەست پێکردووە بۆیە دەڵێن: «وێنەیەک بەرامبەر بە هەزار وشەیە». یەکەم وێنە لە مێژووی

ڕۆژنامەگەری کوردیدا لە ڕۆژنامەی «کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی»دا بڵاو کراوەتەوە کە ئەویش وێنەی دیمەنی شاری ئەستەمبوڵ بووە.

دیارە ڕۆشنبیر و گەورەپیاوەکانی کوردیش زوو هەستیان بە گرینگی وێنە کردووە. ئەگەرچی زۆر گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی دیکە وێنەیان تێدا بڵاو نەکراوەتەوە، بەڵام ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی بڵێین بەرپرسان و نووسەرانی ئەو بڵاوکراوانە بایەخی وێنەیان هەست پێنەکردووە.

دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان هیچ کات بە دەرچوونی بڵاوکراوەیەک بە زمانی کوردی چاویان هەڵنەهاتووە. ئەگەریش شتێک بڵاو کرابێتەوە یا لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بووە، یا لەبەر زەخت و فشارێک بووە کە گەل خستوویەتە سەریان و ئەوانیش ناچار بوون ئیزن بدەن بڵاو بکرێتەوە.

گەلی کورد و گەورەپیاوانی کورد کاتێک خەریکی کاری بڵاوکردنەوە و چاپی ڕۆژنامە یا بڵاوکراوەیەکی دیکە دەبوون، لە گیان وماڵی خۆیان مایەیان دادەنا. باری ئابووری و گوزەرانی خەڵک زۆر خراپ بوو و لە زۆربەی هەرەزۆری پێشکەوتنەکانی سەردەمی خۆیان بێبەش کرابوون. جا هەر لەبەر ئەوانە بووە کە ئەگەریش گرینگی وێنە و کاری ڕۆژنامەگەری هەست پێکرابێ، لەبەر نەبوونی ئیمکانات و باری خراپی ئابووری خەڵک، یا کارەکە نەکراوە یا زۆر بە کەمی کراوە.

کاک «عەبدوڵڵا زەنگەنە» لە لاپەڕە ٨١ی کتێبی «ژیانەوە و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردی‌دا» دەڵێ: «(گۆڤاری دیاری کوردستان)... ناچار بوو بۆ کێشانی وێنەیەکی «سەلاحەددینی ئەییوبی» بنێرێ لە «قاهیرە»ی «میسر» بە ڕەنگوغراف وێنەی بۆ بکێشن، بۆیە تا ئەو کاتی هەر بڵاوکراوەیەکی کە لە کوردستان دەرچووە تاقە وێنەیەکیان تیا بڵاو نەکراوەتەوە.»

کاک «فوئاد عەلی ئەحمەد» لە وتارێکدا بە ناوی «مێژووی وێنە لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا» کە لە ژمارە (یەک)ی گۆڤاری «ڕۆژنامەنووس»دا بڵاو کراوەتەوە دەڵێ: «هەرچەند ئەگەر بمانەوێت باس لە چاپ و ڕۆژنامەوانی کوردی بکەین، دەبێت باس لەوە بکەین کە کوردستان بە درێژایی مێژوو داگیر کراوە و نەتەوە و خاکەکەی دابەش و پارچەپارچە کراوە و... دوژمنانی کورد هەر زوو بڕکیان بەوە کردووە کە دەرمانی ئەوان بۆ کوردان نەخوێندەواری و دابڕانە

لە هەموو پێشکەوتنێک، بەڵام ڕۆشنبیرانی کوردیش لە هەمبەردا زانیویانە کە دەرمانی کوردان خوێندەوارییە و تەنها قەڵەم ئەو چەکەیە کە کورد بە جیهان بناسێنێت. نزیکەی سەدەیەک زیاترە ڕۆشنبیرانی کورد چەکیان بە دەستێک و قەڵەمیان بە دەستەکەی دیکە کردۆتە هێمای سەرکەوتن.»

کاک «فوئاد عەلی» لە درێژەی وتارەکەیدا دەڵێ: «کاربەدەستان و حوکمڕانانی قاجاری و عوسمانییە، بۆ کاری ڕۆژنامەگەری و بڵاوکراوەکان بیانووی جۆراوجۆریان دەدۆزییەوە، دەمێک بیانووی ئەوەیان دەگرت کە ئەمانە کاری شەیتانن و بیروباوەڕی مەسیحی و جوولەکە بڵاو دەکەنەوە. [وێنە]. دەمێکیش دەیانوت ئەمە کوفر و گوناهە و بە ناوی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە ڕێگایان لێدەگرت. کوردیش بە درێژایی مێژوو، ژێردەستەی ئەو داگیرکەرانە بووە و هەرچەندە میللەتێکی موسڵمان بووە و ئایینی ئیسلامی زۆر لەوان بەڕشتتر وەرگرتووە و زانیوە، زیاتر کەوتۆتە ژێر کاریگەری و فشار و پڕوپاگەندەی ئەو وڵاتانەوە. هەر بۆیە دەبینین سەرەتا بەکارهێنانی وێنە لە کاری ئاسایی خەڵکدا بە کارێکی گوناه دادەنرا، بەمەش ئامێرەکانی کامێرای وێنەگرتن و ستۆدیۆ و تاقیگەی شتنەوەی فیلم و چاپکردن لە کوردستان زۆر دەگمەن بوون، سەرەڕای کۆمەڵێک هۆکاری سیاسی و ئابووری ئەو سەردەمەی ژیانی کورد.»

هەر بەو هۆیانەی لە سەرەوە باسمان کردن، تەنانەت لە سەردەمی دەسەڵاتی ژ.ک و کۆماری کوردستانیش بارودۆخێکی هێندە ڕەخساو و باش بۆ کاری چاپەمەنی نەبووە. حکوومەتی ڕەزاشا و کوڕەکەشی ئەگەر لە حکوومەتەکانی بەر لە خۆیان خراپتر و بەرچاوتەنگتر نەبووبن، چاکتریش نەبوون. جا هەر بەو هۆیە لە گۆڤاری «ئاوات»یشدا تەنیا چاومان بە وێنەیەک دەکەوێ کە ئەویش وێنەی «شێخ عەبدولقادری شەمزینی»یە. دوای شۆڕشی «شێخ سەعیدی پیران» لەبەر کەمتەرخەمی و بێئیحتیاتی کوردان شۆڕشەکە بەرەو شکست ڕۆیی و لە ئاکامدا «شێخ سەعید» و «شێخ عەبدولقادری شەمزینی» گیران و لە لایەن حکوومەتی تورکیا مەحکەمەی ئیستقلال سازکرا و هەردووکیان وێڕای زۆرێک لە لایەنگران محاکمە کران و پاشان لە سێدارە دران و بوونە شەهیدی ڕێگای سەربەستی کورد.

ئەو وێنەیە لە رووبەرگی گۆڤارەکە چاپ کراوە و لە ژێر وێنەکە نووسراوە: «جەنابی شێخ عەبدولقادر» و لە خوار ویش شێعرێک نووسراوە. ئەو شێعرە وێڕای وتارێک لە لایەن مامۆستا «هێمن»ەوە نووسراوە و پێشتر لە گۆڤاری «نیشتمان»ی ژمارە ٢ی ساڵی ١٣٢٢ (١٩٤٣)دا چاپ کراوە.

شێعرەکە بە ناوی «مەحکەمەی مەنحووسی ئیستقلال» لە لاپەڕە ١٢ تا ١٤ی ئەو ژمارەیەی «نیشتمان»دا چاپ کراوە و لە لاپەڕە ٢٨٢ی کتێبی «بارگەی یاران - سەرجەمی شێعری هێمن» بەرگی یەکەمیشدا لە لایەن دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی «ئاراس» بۆ جاری دووهەم چاپ کراوەتەوە. لە بەشێک لەو شێعرەدا مامۆستا هێمن دەڵێ:

دوێشەوێ گریام هەتا رۆژ، پێت بڵێم بۆچی برا
مەحکەمەی مەنحووسی ئیستقلال وەبیرم هاتەوە
ریزەیان بەستبوو لە پێش چاوی منا گشتی هەموو
ئەم شەهیدانەی کە خنکاون بە سەد ئاواتەوە

کە ئەو بەیتەی دووهەم لە ژێر وێنە و ناوی «شێخ عەبدولقادری شەمزینی»دا لە گۆڤاری ئاوات چاپ کراوە و لە کۆتاییشدا دەڵێ:

(هێمنا) پێت وانەبێ یەزدانی بێ هاواڵ و فەرد
کەیفەری ئەو زوڵم و زۆرە، بێحیساب ناداتەوە

لە کۆتایی ئەو بەشەدا ئەوەی سەبارەت بە وێنە ماوە باسی بکەین ئەوەیە کە ئەگەر گۆڤاری «کوردستان مسیۆنەری» کە لە راستیدا لە شیکاگۆ چاپ کراوە و لە مەهاباد بڵاوکراوەتەوە و وێنەیەکی لە سەر رووبەرگی چاپ کراوە، بە یەکەم گۆڤاری وێنەداری رۆژهەڵاتی کوردستان دابنێین. ئەوە گۆڤاری «ئاوات» دوای گۆڤاری «نیشتمان»، سێهەم گۆڤاری رۆژهەڵاتی کوردستانە کە وێنەی تێدا بڵاو کراوەتەوە.

## زاراوەی نووسراوەکانی گۆڤاری ئاوات

لە زۆربەی وتارەکانی گۆڤاری «ئاوات»دا شێوە زاراوەی موکریانی زاڵە. هۆیەکەشی ئەوەیە کە زۆربەی وتارەکان و تەنانەت شێعرەکان لە لایەن نووسەرانی ناوچەی موکریان و «مەهاباد»ەوە نووسراون.

دەکرێ بڵێین گۆڤاری «ئاوات» لە باری زمان و رێنووسەوە، شێوەی زاراوە و رێنووسی گۆڤاری «نیشتمان»ی رەچاو کردووە. هەروەک دەبینین چوار وتار لە سەرجەم پێنج وتاری ئەو گۆڤارە لە لایەن کاک «محەممەدی شاپەسەندی» و دوو شێعر لە لایەن مامۆستا «هێمن» نووسراوە و تەنیا نووسەری دوو شێعری «ئەی میللەتی ئاوارە» و «لەسەر ئەم بەخشیش و رەحمە» روون نییە خەڵکی چ ناوچەیەکن، هەرچەند تا رادەیەک وێدەچێ ئەوانیش هەر خەڵکی ناوچەی موکریان بن.

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» بۆخۆی بەرپرس و مەسئوولی گۆڤاری «ئاوات» بووە، بەر لەویش لەگەڵ مامۆستا «زەبیحی» لە گۆڤاری «نیشتمان» کاری کردووە و پیتچن بووە و وتاریشی نووسیوە، هەر بۆیە شێوەی نووسین و رێنووسی گۆڤاری نیشتمان، شوێنی لەسەر داناوە و گۆڤاری «ئاوات»ی بە شێوەی رێنووس و زاراوەی گۆڤاری «نیشتمان» چاپ کردووە.

سەرەڕای ئەوانەش گۆڤاری «ئاوات» بە زمان و زاراوەیەک نووسراوە کە هەموو کەس پێی دەدوێن. بە چاوخشاندنێک لەو گۆڤارە بۆمان دەردەکەوێ بێجگە لە دوو شێعر کە وێدەچێ لە لایەن چەند ئەدیبێکی حوجرەدیتووی مەدرەسە ئایینییەکانەوە نووسرابێ، نووسراوەکانی دیکە وشەی عەرەبییان کەمتر پێوە دیارە و بە زمانێکی سادە و رەوانی کوردی کە هەموو خەڵک لێی تێدەگەن، نووسراون.

رێنووسی «ئاوات» وێکچوونێکی کەمی لەگەڵ رێنووسی ئێستای کوردی هەیە. چەند پیت کە ئێستا دەکار ناکرێن لە نووسراوەکانی ئەو گۆڤارە وەبەرچاو دەکەون وەک: (ض، ص، آ، ث، ر، ط، ظ). ئەو پیتانە لەو وشانە (آوات، نثار، آذر، اشکەیی، ایمە، ضرار، صلیب، اطلاعات، صبر، ظلم، وظیفە، ثواب، عذاب، طیارە) و چەندین

وشەی دیکەدا کەلکیان لێوەرگیراوە و دەکار کراون. نیشانەی (٧) لە گۆڤاری «ئاوات»دا کەلکی لێ وەرنەگیراوە، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی: ١- گۆڤارەکانی پێش «ئاوات» ئەو نیشانەیان بەکار نەهێناوە. ٢- دەزگای چاپی ئەو سەردەم، ئەو ئیمکاناتەی ئێستای نەبووە. ٣- تا کاتی دەرچوونی «ئاوات»، بیر لە رێنووسی زمانی کوردی نەکراوەتەوە و تەنیا لە ژمارە ٣ و ٤ی گۆڤاری «نیشتمان»ی سەرماوەز و رێبەندانی ١٣٢٢ لاپەڕە ٥ تا ٩ چاومان بە وتارێک دەکەوێ لە ژێر ناوی «کوردی دەبێ چۆن بنووسرێ؟» کە لەویشدا تەنیا باسی ئەو پیتانە کراوە کە لە عەرەبی و فارسیدا بە چەند جۆر دەنووسرێن بەڵام لە زمانی کوردیدا هەر بە یەک پیت دەنووسرێ. هەروەها لە ژمارە ١ هەتا ٣ی گۆڤاری «گڕوگاڵی منداڵانی کورد» چاومان بە وتاری «دەستووری زمانی کوردی» دەکەوێ کە لەودا لە رێنووسی کوردی قسە کراوە کە ئەویش دوای دەرچوونی گۆڤارەکانی «نیشتمان»، «هاوار (= هاواری کورد)» و «ئاوات» چاپ کراوە و نە نیشتمان و نە گڕوگاڵی منداڵانی کورد هیچکامیان بە بەربڵاوی باسی رێنووس و نیشانەکانیان نەکردووە بەڵام بە شێوەیەکی گشتی و بە کورتی لەسەر رێنووسی کوردی دواون.

ئەوەی ماوە سەبارەت بە گۆڤاری «ئاوات» و هێندێک لە وردەکارییەکانی باسی بکەین ئەوەیە کە لەو گۆڤارەدا هەڵەی چاپی زۆر وەبەرچاو دەکەوێ کە بەپێی توانا لە بەشی ساغکراوەکەی ئەم گۆڤارەدا، هەڵەکان راستکراونەتەوە و لە نێو کەوانە( )دا دیاری کراوە. هەڵەی رێزمانیشی زۆر تێدابوو کە لەبەر تێکنەچوونی چوارچێوەی کاری ساغکردنەوەکە، لە راستکردنەوەی ئەوان چاوپۆشی کراوە. ئەو جێگایانەی بە وشەیەک رستەکە رەوانتر و دروستتر دەبوو، وشەکەم لە نێو دوو قولاپە[ ]دا هێناوە و نوسخەی ئەسڵیم پاراستووە.

لە شێعری لاپەڕە ١٢ و ١٣ی گۆڤاری «ئاوات»دا، بۆ ئەوەی شێوەی نووسینی سووڕە و ئایەکانم وەک خۆی پاراستبێ، لەو جێگایانەی لە ئایەتێک کەلک وەرگیراوە لە نێو دوو کەوانەم هاویشتوون کە لە نوسخەی ئەسڵیدا ئەو کەوانەی تێدا نییە. ئەو نوسخەی «ئاوات» کە لەبەر دەستمان بوو، مۆر و

نیشانەی زۆری بەسەرەوە بوو، بەڵام لەبەر گرینگی خاوێنڕاگرتنی کارەکە و ڕواڵەتی گۆڤارەکە، هەمووم لابردن.

لە کاتی ساغکردنەوە لە تایپەکانی ئەوەڵدا لە جیاتی ئەو گوڵ و ئەستێرە و نیشانانە کە لە گۆڤارەکەدا بەکار هاتوون، شتی دیکەمان دانا، بەڵام لە تایپەکانی دواییدا هەوڵمدا تا ئەو جێیەی دەست دەدا گۆڤارەکە بە نیشانەکانی نوسخەی ئەسڵی چاپ بکەمەوە. هەر بۆیە لاپەڕەی ئەسڵی گۆڤارەکە چۆن بووە، بە چ وشەیەک دەستی پێکردووە و بەچی کۆتایی هاتووە وەک خۆی تایپ کراوەتەوە. تەنیا جیاوازییەکی لە نوسخە ساغکراوەکەدا بەدی دەکرێ، ڕێنووسی گۆڤارەکەیە کە بە ڕێنووسی ئێستای زمانی کوردی نووسراوەتەوە کە بۆ ساغکردنەوەی ئەو بەشەش لە ڕووی نوسخەی ئەسڵی کە بۆخۆم دیومە بەراوەردم کردووە و وشە بە وشەییم لەبەر یەک ڕاناوە. چونکە لە نوسخە سەرەکییەکەی بەردەستمدا زۆر وشە هەبوو کە نەدەخوێندراوە. بۆ کەلکوەرگرتنی زیاتری خوێنەرانیش لە هەموو بەشەکانی گۆڤاری «ئاوات»، وتارەکەی «سەید محەممەدی حەمیدی» کە بە زمانی فارسی نووسرابوو، وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی.

ئەوەی پێویستە سەبارەت بەو وتارە بیزانین ئەوەیە کە دەقی وتارەکە پێشتر لە ژمارە ١ی گۆڤاری «هاوار» (= هاواری کورد) لە ڕەزبەری ١٣٢٤ (١٩٤٥) بێهەڵە چاپ کراوە و مانگێک دواتر بۆ جاری دووهەم لە یەکی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٢٤ لە گۆڤاری «ئاوات»دا سەرلەنوێ چاپ کراوەتەوە:

**نووسەرە فارسەکان بیخوێننەوە!**

بەشێک لە کوردەکان چوار هەزار ساڵ بەر لە دایک بوونی مەسیحەوە تا ئێستا، هەمیشە خۆیان بە کورد ناساندووە و مێژوو ناسان ئەوانیان بە کورد ناو بردووە. ئەوانە ئەو کوردانەن کە لە لای «ئارارات»، واتە چیای (گودی، جودی، ئاگری)یەوە هاتوون و لە کەنارەکانی «دیجلە» و «فورات»، لە ڕۆژئاواوە هەتا «سووریا» و «شامات» و بەستێنەکانی دەریای «مەدیترانە»، و لە ڕۆژهەڵاتیشەوە تا «کەنداوی فارس» و بەستێنەکانی دەریای «عوممان» بە پرژوبڵاوی نیشتەجێن. بەشێکی دیکەش لە کوردەکان چوار هەزار ساڵ بەر لە زایین، دەگەڵ هیندییەکان و ئورووپایی و پارسەکان لە یەک شوێندا ژیاون کە لەو شوێنە سەرەکییە بۆ لای ڕۆژهەڵاتی ئێران، و لەوێشەوە بە لای باشووری «بەحری خەزەر» و هەرێمی «ئازەربایجان» و ناوچەی «ئیسفەهان»

و «هەمەدان» و «لۆڕستان» بلاو بوونەوە. بەو ولاتە بەر بلاوەیان گوتووە «مادایا» یان «مێدیا». وشەی «مادا» لە سەردەمی نۆهەمی پێش زایین بە پێنج هۆزی «کورد»، «لۆڕ»، «خەزەر»، «دەیلەم» و «گیل» گوتراوە. وشەی «کورد» بەر لە هەموان هاتووە.

بەو شێوەیە کوردەکان لە ئێرانی ئەوڕۆییڕا هاتوونەتە کوردستانی ئێستا و ئەوە ڕێگەمان لێ ناگرێ کە بلێین لە کاتی هاتنی ئەوان، تاقمێکی دیکە یان چەند تیرەی دیکەی تێکەلاو بە ناوی «کاردۆ» لە کوردستانی ناوەندی‌دا نەژیابن و لەگەڵ تاقمی تازەدا تێکەلاو نەبووبن.

## مافی سیاسی و پەیوەندی نێوان کورد و پارس

بە پێی بەڵگە مێژووییەکان و بیروڕای ڕۆژهەلاتناسان، ڕوون و ئاشکرایە کە کورد و پارس هەردووکیان لە ڕەگەزی «ئاری»ن و پێکەوە بران و لە یەک باوکن. کوردەکان کە بە شەڕکەر و بوێر ناوبانگیان دەرکردووە. هەندێ جار لەگەڵ پارسەکان و هەندێ جاریش بە تەنیایی، سەر بە خۆیی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی سەقامگیرو دیاری کراویان هەبووە.

ئەو کاتەی کورد هێز و دەسەلاتی بە دەست بووە، پارسەکان لە ژێر حوکمی ئەواندا ژیاون. وەک: «حکومەتی گوتی، کاسی، کیان، ماد، ئەشکانیان...» و ئەو کاتەش کە پارس حوکمدار بووە، کورد لە ژێر دەسەلاتی ئەواندا ژیاوە. وەک: «حکومەتی پێشدادیەکان، هەخامەنیشییەکان و...»

## خەتی کوردی

کوردەکان لە سەروبەندی سەدەی دەیەمی پێش زایین هەتا ئەمڕۆ خاوەنی خەت و نووسین و ئەدەبیات بوون و بۆ نووسین کەلکیان لە پیتی «ماسی سوراتی» و «یۆنانی» و «ئارامی» و «سوریانی» و «بزماری» وەرگرتووە. دوای زاڵبوونی ئیسلام، شێوە نووسینی «کوفی» جێگای ئەوانی گرتەوە. ئێستاش نووسینی باو لە ناو کوردەکان دا، خەتی «نەستعلیق» و پیتی «لاتینی»یە.

## زمان و ئەدەبیاتی کوردی

کوردەکان بە زاراوەی جۆراوجۆر دەدوێن و دەچنەوە سەر ڕیشەیەک بە

[نەژادی] «ماد»، زمانی «ئەوێستا» بووە. «ئێسترابۆن»ی یۆنانی دەڵێ ماد و پارس، زمانی یەکتریان بە باشی زانیوە و ئەوەش بۆ خۆی بەڵگەیەکە دەیسەلمێنێ کە ئەو دوو زمانە لە یەکتر جیاوازن. زۆربەی مێژوو ناسان لەو بڕوایە دان کە زمانی مادەکان هەمان زمانی «کوردی موکری» بووە یان هەمان زمانی کوردی موکرییە. ئەو بۆچوونە لە لایەن «هێپۆرات» و «دارمەستەتەر» و هێندێکی دیکە لە کارناسان سەلمێنراوە و ئاکامەکەی ئەوەیە کە زمانی« ئەوێستا ی زەردەشت» و زمانی کوردی «مادی»ن. زمانی «پارسی»ش لەو سەردەمەدا هەر ئەو زمانە بووە کە ئاسەواری «ئیستەخری فارس»ی پێ نووسراوە. تەنیا جیاوازییەکی کە لە لێکۆڵینەوەکانی ئەو دواییانەدا وەدەست کەوتوون ئەوەیە کە کوردەکان وشەی عەرەبییان زۆر نەهێناوەتە نێو زمانی خۆیان و هەتا ئەو جێیەی بۆیان لواوە قەوارەی کردارەکانیان پاراستووە. بەڵام بە پێچەوانەوە، زمانی فارسی لەو بابەتەوە زێدەڕۆیی کردووە و پێوەندی خۆی لەگەڵ فارسی پەتی نەپاراستووە. ئێستا نووسین بە زمانی کوردی، سادە و بگرە یەکجار هاسانە. بەڵام بە زمانی فارسی سادە و ئەوەندە هاسان نییە. ئەگەریش بنووسرێ ناچارە لە وشەی نالێک و داتاشراو کەلک وەربگرێ. تەنانەت کوردانی «هەورامی» کە لە کوێستانەکانن باشتر توانیویانە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ زمانی کوردی بپارێزن و کردارە ڕێزمانیەکان بۆ نێر و مێ جیاوازن. بۆ وێنە دەڵێن «فەرهاد ئاما» و «شیرین ئامانی» واتە فەرهاد هات و شیرین هات. «فەرهاد لوا» و «شیرین لواینی» واتە فەرهاد ڕۆیشت و شیرین ڕۆیشت کە زمانی فارسی ئەو تایبەتمەندییانەی نییە.

سەرچاوەی دیجلە و فورات هەتا کەنداوی فارس لە ژێر دەسەڵاتی زمانی کوردیدا بووە و ناوەندی ئەو زمانەش دوابەدوای یەک «ئاراڕات»، «زاگرۆس»، «ئیسفەهان»، «نەهاوەند» و«هەمەدان» و سەردەمێکیش «مەداین» بووە. جا هەر لە بەر ئەوە دەتوانین بڵێین کە وشەی کوردی بە گشتی لە تەواوی ویلایەتەکانی ئێرانی کۆندا باو بووە. فارسی کۆن و زمانی ئەوێستایی واتە زمانی کوردی مادی و «سانسکریت»، هەرسێک

لە زمانی هاوبەشی ئاری (ئاریایی) بەدیهاتوون. بە رای هەندێ کەس زمانی کوردی لکێکە لە زمانی فارسی.

«سێرسیدنی سمیس» دانەری کتێبی «مێژووی ئاشوور» دەنووسێ کە ئەوە بۆچوونێکی هەڵەیە، چونکە زمانی کوردی پێشینە و مێژووی خۆی هەیە و لە زمانی فارسی کۆن (لەوحەی داریوش) زۆر کۆنترە. هەر بۆیە زانایان دەتوانن بڵێن کە زمانی کوردی لە سەدەی شەشی پێش زاییندا، زمانێکی سەربەخۆ بووە. ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە وەدیهاتنی زمانی «پەهلەوی». (بە هەندێک دەستکاریەوە لە کتێبی مێژووی کورد و کوردستانی ئایەتوڵلا مەردووخ)

لەم دواییانەدا لە هەندێک رۆژنامەکانی تاراندا کۆمەڵە وتارێک بە قەڵەمی جەنابی ئاغای دوکتور «سەنجابی»، مامۆستای زانکۆی تاران و هێندێکی دیکە لە زمانلووسانی بە کرێگیراو و چلکاوخۆری ئێرانی بە رواڵەت کورد، بڵاو بۆتەوە و گەلێکیان بوختان و درۆ و دەلەسە بۆ کوردەکانی ئێران هەڵبەستووە:

١- زۆریان خۆ ماندوو کردووە کە بیسەلمێنن کوردەکان ئێرانین.

٢- کوردەکان جیاوازیخوازن.

٣- کوردەکان سەربزێون و سەر بۆ یاسا و فەرمانەکانی دەوڵەت دانانەوێنن.

٤- لە مێژوودا کوردەکان هەرگیز بە تەنیا سەربەخۆییان نەبووە!

٥- زمانی شیرین و بە هێزی کوردی، کورتەیەک یا تێکەڵاوێکی ئاڵۆزی زمانی فارسییە.

ئەگەر چی لە پێشەکیدا وەڵامی هەر یەک لەو بوختانانە درایەوە، بەڵام دیسانیش بە تێکڕایی (ئیجمال) و بە درێژی دەمانهەوێ وەڵامی ئەم پێنج خاڵە بدەینەوە و بۆ رەتکردنەوەی هەر یەک لەوانە بەڵگە بێنینەوە. بەڵام بەشی یەکەم و دووهەم و سێهەم: ئێمە پێمان وایە ئاغای دوکتور سەنجابی و کەسانی وەکوو ئەو کە لە رەگەزی پاکی کوردانن، لەوە تێگەیشتووترن درۆ و بوختانی لەم چەشنە بۆ گەلی خۆیان هەڵبەستن. رەنگە ئەوەی نووسیویانە

بووبێ کە هێندێکیشیان خۆیان بە کورد دەناسێنن و هێندێکیشیان خۆیان پێ ڕۆژنامەنووس و نووسەرە و دەیانهەوێ لەو ڕێگایەوە پلە و پایەیەک وەدەست بێنن، یا ڕەنگە ویستبێتی رای خۆی دەرببڕێ. هەڵبەت دەربڕینی بیر و را جێگای ڕێزە و هەر کەسێک مافی هەیە بیر و رای خۆی لە شوێنی خۆی دەرببڕێ، بەڵام ئێمە دەڵێین ئاغایانی بەڕێز: کوردەکانی ئێران بە گشتی لەو بڕوایەدان کە کورد لە ژێر ئاڵای ئێران یا هەر ئاڵایەکی تردا بژی، لە خاوێنترین ڕەگەزەکانی ئێرانە و ئەو خاکە پاکە، لانکەی باب و باپیرانێتی. نیشتمان و زێدی خۆشەویستیان هەر ئێرانە. ئێمە کوردەکان بە درێژایی هەزاران ساڵ، سەرجەم خاکی ئێرانمان لە مەترسی جیهانگیران و دەسدرێژکەران پاراستووە و لە پێناو سەربەستی و ئاگاداریکردنەکەی فیداکاری و گیانبازیمان کردووە و خوێنێکی زۆرمان بۆ ڕشتووە و وەکوو شێری تووڕە، لەشی خۆمان لە بەرامبەر گوللەی دوژمن ڕاگرتووە و نەمانهێشتووە بێگانە پێ بنێتە ئەو خاکە پیرۆزەی و هەتا زیندوو بین بۆ پاراستنی ئەو تێدەکۆشین. ئێران و پاشای ئێران بە هی خۆمان دەزانین و خۆمان بە هی ئەو دەزانین. چونکە یەکەمین زنجیرە شایەکانی ئێران «ماد» یا «کورد» بوون، دوای مردنی «ئەسکەندەری مەقدوونی» کە وڵات تووشی پشێوی و ناکۆکی نێوخۆیی بووە، فەرمانڕەوا گەورەکانی «ئەشکانی»یەکان کە کورد بوون، ناکۆکییەکانیان لە ناو برد و بۆ ماوەی پێنج سەدە ئیمپراتووری و دەسەڵاتی ئێرانیان پاراست و گەیاندیانە ئەوپەڕی گەورەیی. دوای زاڵبوونی ئیسلام کە سەربەخۆیی ئێران لە بناغەوە هەڵوەشا چەند سیلسیلە لە [فەرمانڕەواکانی کورد] تێکۆشان کە سەرلەنوێ ئێرانی گەورە لە دنیادا زیندوو بکەنەوە. کوردەکان بۆ قانوونی بنەڕەتی ئێران ڕێز دادەنێن و فەرمانبەری لە شا و دەوڵەت بە ئەرکی خۆیان دەزانن.

بەڵام ئەوانەی کە ئێستا جڵەوی کارەکانی دەوڵەتی ئێرانیان بە دەستەوەیە، بە ڕواڵەت بۆ فریوی خەڵک خۆیان بە ئێرانی و ئێران دۆست دەناسێنن. لە کاتێکدا کە ئەوانە دوژمنی ئێران و قانوونی بنەڕەتی و بە کرێگیراوی بێگانەن. ئەو ئاغایانە «سەرتیپ هوشمەندی»یەکانی بێ ئەسڵ و

نەسەب و فاشیستیان لە گیان و ماڵ و نامووسی خەڵکی کورد بەرداوە. لە هیچ نامرۆڤایەتییەک دەرهەق کوردان درێخی ناکەن. دوو ساڵ لەوە پێش سەرتیپ «هوشمەندی ئەفشار»، دوای وێران کردنی سەقز، بوو بە سەبەبکاری سووتاندنی شاری بانە. ئێستا خەڵک و زۆربەی بەگزادەکانی [بانە] ئاوارەی هەندەرانن.

چەند مانگ لەوە پێش بۆ دامرکاندنی رق و تووڕەیی خۆی بە تانک و تۆپ و موسەلسەل و فرۆکە بۆمبهاوێژەکان هێرشی بردە سەر هەورامان و مەریوان، ژن و پیاو و پیرێژن و منداڵی وە بەر گوللە و بۆمب دا و ماڵ و حاڵی کردنە ئامانجی بۆمبەکانی و لە بناغەوە هەڵیتەکاندن. چەند کەس لە بەگزادەکانی لە ئوتۆمبیل بەستن و لە ناوی بردن. جەنابی شێخ محەمەد کوڕی خوالێخۆشبوو «شێخ حیسامەددین» کە بۆ هێور کردنەوە و بەرگری لە خوێن رشتن چوو بووە لای «هوشمەند»، لە دار درا. هەر چەندی تێلێگرافیان بۆ شا و رۆژنامەکان و گەورە بەرپرسانی دەوڵەت لێدا و داوای دادپرسیان کرد، هیچ کەس وەڵامی نەدانەوە. تا وای لێهات هیچ بنەماڵەیەک نەما کە زیانی وێ نەکەوتبێ یا کەسێکی لێ نەکوژرابێ. ئەو جار «سەرلەشکر جەهانبانی»یان نارد کە کۆتایی بە ئاڵۆزییەکە بێنێ. ئەو دوای پێداچوونەوەیەک دەستووری دا ئەو ئەفسەر و سەربازانەی کە خەڵکی هەورامان و مەریوانیان زۆرتر کوشتووە، میداڵیان بدرێتێ. سەربازە تێداچووەکان بە شەهید ناو دەبەن. زۆریان جەخت هێناوەتە سەر کوردەکانی «قووچان» و «بجنورد». روون نییە چ رۆژێکی رەشیان بەسەر دێنن. ئاغایان، ئێوە لە نووسراوەو بڵاوکراوەکانی خۆتاندا، دەڵێن کورد رەسەنترین رەگەزی ئێرانییە، لە بابەت دین و ئەخلاق و داب و نەریت و پیاوەتی و بوێری پێیان هەڵدەڵێن، بەڵام لە کردەوەدا بە جەزرەبەی وا کە لە چاخی بەردینیشدا شتی وا نەدیتراوە، لە ناویان دەبەن و جنێو بە دین و پێشەوایانی ئایینیان دەدەن.

ئێوە تەواوی ئاسەوارەکانی فەرهەنگی کوردستانتان لە ناو برد و لە

دیکەی فێری منداڵانی کورد نەکرد. بە هیچ شێوەیەک ئاسەوارێک لە بێهداشت و لەشساغی نییە. خەڵک لە ئاگری نەخۆشییە جۆراوجۆرەکاندا و لە نێو نەداری و ناعیلاجیدا دەسووتێن و تێدادەچن. سێ کەس لە خەڵکی مەهاباد کە چەند مانگ لەوە پێش لە بەر کاروباری خۆیان چووبوونە رەزاییە (ورمێ) [لە لایەن] ژاندارمەکانی «باڵا نیش»ەوە هەر سێک دەگیرێن و یەکراست بەرێدەکرێنە تاران و ئێستا لە قەسری قەجەرن. تا ئێستا پرسیاریان لێنەکراوە. روون نییە لە سەر چ تاوانێک گیراون.

ئێوە پێتان وایە کە مەئموورەکانی (راسپێردراوەکان) تەواوی کوردستان هەر دەبێ لە تارانەوە بنێردرێن و هیچ چەشنە ماف و قازانجێک بە کوردان رەوا نابینن. بەوەش رازی نین و دەڵێن کوردەکان جیاوازیخوازن. تکایە پێمان بناسێنن ئەو کوردانەی دەیانەوێ لە ئێران جیا ببنەوە کێن و خەڵکی کوێن و بەڵگەتان چییە؟ ئێوە پێتان وایە ئەگەر راسپێردراوێکتان ناردە شوێنێک، هەر چەندی بتوانێ خەڵکی ئەو ناوچەیە لە بەر چاوی دەوڵەت خراپتر بکا، باشتر ئەرکی خۆی بە جێ هێناوە؟

بۆ نایەنەوە سەر خۆ و فکرێکی بنەرەتی بە حاڵی خۆتان و کۆمەڵ ناکەنەوە؟ دەوڵەت دەبێ لە سەرخۆ بێ، خەڵکی بار بێنێ [و فێری هەموو شتیان بکا] و ژیانیان مسۆگەر بکات. لەخۆبردوویی هەبێ و بە خۆشەویستی و هەست و سۆزەوە چاو لە خەڵک بکا، هەتا خۆشەویستی نیشتمان و دەوڵەت بکەوێتە ناو دڵی خەڵک. ئێوە و خودا، ئەوە خوو و خدەتانە. هەرگیزا و هەرگیز بەهرەیەکتان لە ئەخلاق و گەلدۆستی نەبردووە، کەچی هەر دەڵێن کورد سەربزێون.

بەڵام سەبارەت بە بەشی چوارەم کە کورد سەربەخۆییان هەبووە یان نەیان بووە؟

پێویست بە هۆ و بەڵگەهێنانەوە نییە کە کوردەکان پێش زایین «حکومەتی کیان و ماد و...» و دوای زایین «حکومەتی ئەشکانیان» و دوای ئیسلامیش لە حکوومەتی ئەخشیدییە و رەوادییەکان و پێشدادییەکان و ئەییووبییە و زەندییە و... و...» پاشایەتی و بگرە ئیمپراتوورییان هەبووە. ئەو کاتەی

جڵەوی کاروباری پاشایەتی و دەسەڵات بە دەست کوردەکانەوە نەبووە، دیسانیش لە ئازادی نێوخۆیی و خودموختاری (مافی چارەی خۆ نووسین) بێبەش نەبوون.

بەڵام سەبارەت بە بەشی پێنجەم کە ئاخۆ زمانی کوردی کورت کراوە یا وەرگیراو و شێواوی زمانی فارسییە یا زمانێکی سەربەخۆیە؟ لە پێشەکی‌دا بە کەلک وەرگرتن لە قسە و بیروڕای رۆژهەڵاتناسان، روونمان کردەوە کە زمانی کوردی پێشینە و مێژووی خۆی هەیە و لە زمانی فارسی زۆر لە مێژینەتر و کۆنترە و پەیوەندی خۆی، لەگەڵ سەرچاوە رەسەنە مێژووییەکەی باشتر لە فارسی پاراستووە. بێتوو کەسێک بە باشی زمانی کوردی بزانێ و بیهەوێ بە زمانی کوردی پەتی نامیلکە یا کتێبێک بنووسێ بیست لە هەزار پێویستی بە دەکارکردنی وشەی بێگانە نابێ. ئەوانەی لە نێو خێڵەکان گەڕاین و شارەزاییشیان لە سەر زمانی کوردی بووبێ، دەزانن کە وشە راست و دروستەکانی کوردی هیچ پەیوەندییەکیان بە فارسی نوێوە نییە و رەگ و ریشەیان ناچێتەوە سەر زمانی فارسی. ئەدەبی کوردی سەرەڕای ئەوە هەمووە ئاستەنگ و گرفتە هێشتا پلە و پایەیەکی وەها بەرزی هەیە کە زمانی فارسی بەو هەموو پێشکەوتنەوە هێشتا نەیتوانیوە ئەو پلەیە وەدەست بێنێ. ئەو وشە فارسیانەی کە لە زمانی کوردی‌دا وە بەر چاو دەکەون لە بەر ئەوەیە کە لەو چەند سەدەیەی دوایی‌دا کوردەکان بە ناچاری خوێندەوارییان تایبەت بە عەرەبی و فارسی بووە، بەتایبەت کە دە کارکردنی وشەکانی بێگانە لەو ساڵانەی دوایی‌دا شانازیەک بوو. کەچی لە سەر ئەوەش را وشەکانی کوردی ئێستاش هەر ماون و لە نێو نەچوون.

هێندێک لە نووسەران باسی «ئیمپراتوورییەتی زمانی فارسی» دەکەن. کەس نازانێ ئەو رستەیە چ مانایەکی هەیە؟ ئیمپراتوورییەتی زمانی فارسی یانی چی؟ ئەوە جگە لە گومان و خەیاڵاتی شاعیرانە شتێکی تر نییە. گریمان تەواوی دنیا بە فارسی بدوێن، بەڵام فارس زمانەکان ئەو جۆرەی پێوستە سەربەخۆیی سیاسی و ئابووریان نەبێ یا لە ژێر چەپۆکی بێگانە دا، داماو و

بێ دەسەڵات بن، چ بەهرەیەکیان پێ دەگا؟ ئایا زمانی ئەوان دێنێتە ڕیزەی وڵاتانی زیندووی دنیا؟

نووسین و خوێندنی دەوڵەتەکانی یەکگرتووی ئامریکای باکوور بە زمانی ئینگلیسی‌یە و لە روانگەی ئەدەبیات ناگاتە پلەی زمانی فارسی، کە وایە بۆ چی تەواوی فارس زمانەکانی دنیا لە ژێر دەستی ئەوان‌دا دەناڵێنن؟!

لە یەکێتی سۆڤیەت‌دا لانی کەم بە بیست زمانان دەنووسن و دەخوێننەوە و هەمووشیان رەسمین. زمانی فەڕانسە لە دنیادا رەسمییەتی هەیە یا بە قسەی ئێوە ئاغایان، ئیمپڕاتوورییەتی هەیە. سەرەڕای ئەوە دەوڵەتی فەڕانسە لە بەرامبەر ئەڕتەشی ئاڵمان‌دا هەر زوو بە چۆکدا هات. بەڵام دەوڵەتی یەکێتی سۆڤیەت دوای چوار ساڵ شەڕی خوێناوی، ئاڵمانی بەو هەمووە دەسەڵات و چەک‌وچۆڵەوە تێکشکاند و ناوی نازی و فاشیستی لە سەر رووی دنیا پاک کردەوە و وڵاتی رووسیا و هەموو وڵاتە داگیرکراوەکانی ئورووپای لە ژێر چەپۆکی خوێنمژان رزگار کرد. دەوڵەتی ئێران کە نووسەرەکانی خەیاڵی دامەزراندنی ئیمپڕاتوورییەتی زمانی فارسیان لە سەردایە، نەیتوانی سێ رۆژ لە بەرامبەر هێرشی موتتەفیقین‌دا خۆڕابگرێ! کە وایە لە سەر ئێمە پێویستە لەو خەیاڵات و خەونە بێ سەروبەرانە، دەست هەڵگرین. کورتترین رێگا بگرینە بەر، کە زووتر بە ئامانج بگەین. ئەورۆ سەردەمی بەرق و کارەبایە، دەبێ کورتترین رێگا هەڵبژێرین. کورد و ئەرمەنی ئەگەر بە زمانی زگماک فێرە زانین بن، پێنج ساڵ لە خوێندن وە پێش دەکەون. مەجبوور کردنی وڵاتە غەیرە فارسەکان بە ئەوەی کە بە زمانی فارسی بخوێنن و بنووسن، وەک ئەوە دەچێ کە شەڕکەران ناچار بکەی لە بەرامبەر تانک و تۆپ و فڕۆکەو... کە چەکی دنیای نوێن، بە شیر و تیر و کەوان کە چەکی چاخی کۆنن، لە خۆیان بەرگری بکەن.

ئەگەر لە بەشی خۆیان‌دا ئازاد بژین چ زیانێک وە ئیمپڕاتوورییەتی خەیاڵیی زمانی فارسی دەکەوێ؟ ئێمە ئەگەر لە راستییەکانی مێژوویی و

وشەکانی کوردی و فارسی ئەورۆکە کە بە ئاشکرا لە یەک جیاوازن و بگرە هیچ پەیوەندیەکیشیان بە یەکەوە نییە، چاو بپۆشین و بیسەلمێنین کە زمانی کوردی کورتکراوە یا وەرگیراو لە زمانی فارسییە، دەڵێین کە زمانی فارسی لە ژێر کارتێکردنی زمانی عەرەبی لە رادەبەدەر وەپاش کەوتووە و زۆربەی وشەکانی تایبەتی خۆی لە دەست داوە. بەڵام زمانی کوردی پوخت و پاراویی خۆی پاراستووە و وشەی بێگانە کاری تێنەکردووە.

ئەگەر هەندێ وشەی بێگانەش ئاوێتەی زمانی شارنشینەکان بووبێ، ئەوە هیچ جێگای مەترسی نییە. چونکە زمانی هۆز و گوندەکان، وەکوو خۆی ماوەتەوە.

کە وایە وەرن پیاوانە [خوێندن و نووسینی] زمانی کوردی ئازاد بکەین هەتا ئەدبییاتەکەی پەرە بستێنێ، [وای لێبێ] کە ئێوەش بتوانن وشە لە دەستچووەکانی زمانی فارسی لە نێو [زمانی] کوردیدا بدۆزنەوە و بە کاری بێنن. ئەو کات دەتوانن بڵێن ئێرانییەکان زمانێکیان هەیە کە بە تەواوی مانا ئێرانییە.(١)

(١) - روونکردنەوە: لە لاپەڕەی پێشوو، دێڕی ٢٧، دوای وشەکانی «ئەمریکای باکووری؟ بە زمانی ئینگلیسییە.»، دروستەکەی ئەوەیە: «نووسین و خوێندنی دەوڵەتەکانی یەکگرتووی ئەمریکای باکووری بە زمانی ئینگلیسییە و... .»

## نوسخەی ساغکراوەی گۆڤاری ئاوات

لەو بەشەدا نوسخەی ساغکراوەی گۆڤاری ئاوات لەسەر رێنووسی ئێستای زمانی کوردی دەخەینە بەرچاوتان. نوسخەی ئەسڵی گۆڤارەکەش لە بەشی

گۆڤارێکی ئەدەبی و تاریخی و کۆمەڵایەتی کوردییە

ژمارە ١ ساڵی یەک ای خەزەڵوەری ١٣٢٤-٢٣ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥



جەنابی شێخ عەبدولقادر

رێزەیان بەستبوو لە پێش چاوی منا گشتی هەموو
ئەو شەهیدانەی کــە خنکــاون بــە ســەد ئاواتــەوە

[وێنەی ژمارە ١]

***************************************************

ئــا و ا ت

خۆزگە رۆژیـە هاتبـا تـا ئیمـە گیـانی خۆشەویـست * کردبامانـــە (نیـــسار)ی نیـــشتمانی خۆشەویـــست
هەستنە پێ، دەس دەنە یـەک بـۆ نـەجاتی نیـشتمان * خـــوێنی خـــاوێن و بـــڕێژن لاوەکـــانی خۆشەویـــست



پەراوی ژ – ک پێشکەوتن

***************************************************

[وێنەی ژمارە ٢]

خاوەن ئیمتیاز و مودیری مە سئول: محەممەد ئازەر

ئاوات مانگێ دوو جار بلاو ئەکرێتەوە

ئـــابـــو و نـــە

| | |
|---|---|
| ئابوونەی ٢٤ ژمارە | ٢٢٠ ریاڵ |
| بۆ مەلا و قوتابییەکان | ١٨٠ ریاڵ |
| هەر دانەی بە | ١٠ ریاڵ |

ئابوونە پێشەکی وەردەگیرێ

لەم ژمارەیەدا:



چون ئەو مجەللەیە پووڵی ئابوونە نەبێت هیچگوونە دەرامەدێکی نییە، تکا لە خوێنەرە خۆشەویستەکان ئەکەین بە گەیشتنی ئەو ژمارەیە، پووڵی ئابوونەمان بۆ بنێرن.

---

لە ژمارە ٢[ی] ئاواتدا، مقالاتی چاک و ئەشعاری شیرین و ئاودار دەخوێننەوە.

[وێنەی ژمارە ٣]

**پەنا بە خوای مەزن**




**ئامانجی ئێمە**
**«کۆشیش لە پێناو سەرخستنی کورد»**
**«و ژیاندنەوەی فەرهەنگی کوردە»**

## گۆڤارێکی ئەدەبی و تاریخی و کۆمەڵایەتی کوردییە

**ژمارە ١ ساڵی یەک ی خەزەڵوەری ١٣٢٤-٢٣ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥**

### نویسندگان فارسی بخوانند !

م٠ح

قسمتی از اکراد از چهار هزار سال پیش از میلاد مسیح تاکنون همیشه خود را کرد معرفی کرده و مورخین آنها را بلفظ کرد یاد نموده‌اند. و این قسمت کردهای[ی] هستند که از طرفی (= طرف) آرارات یعنی کوه (گودی- جودی- آگری) آمده‌اند. و در امتداد دجله و فرات غرباً تا سوریه و شامات و سواحل دریای مدیترانه و شرقاً تا خلیج فارس و سواحل دریای عمان پراکنده‌اند. قسمتی از اکراد نیز در چهار هزار سال پیش از میلاد با هندوها، اروپائیها [و] پارسها در یک جا بوده‌اند. که ازاین محل اصلی به سمت خاور ایران، و از آنجا هم به جنوب بحرخزر و تا منطقه آذربایجان و نواحی اسپهان و همدان و لرستان پراکنده شده‌اند. و این کشور پهناور را «مادایا» یا «میدیا» گفته‌اند. وکلمه «مادا» در قرن نهم پیش از میلاد بر پنج قبیله کرد، لر،خزر، دیلم [و] گیل اطلاق شده و کلمه کرد مقدمتر برآن است. به همین ترتیب گروه کرد از ایران امروزه به کردستان کنونی آمده‌اند و این مانع از این (= آن) نیست، که درهنگام آمدن ایشان یک گروه دیگر هم و یا چند تیره دیگر مختلط بنام کاردو در کردستان مرکزی زندگانی کرده و با گروه جدید امتزاج یافته باشند.

### حقوق سیاسی ومناسبات کرد با پارس

از سوابق تاریخی و آراء خاورشناسان روشن است که کرد و پارس هردو آری‌نژاد و باهم برادر و از یک پدرند. کردها که همیشه به سلحشوری و شجاعت معروف بوده‌اند، گاهی با پارس مشترکاً و گاهی به تنهائی دارای استقلال سیاسی و اقتصادی و اجتماعی ثابت و معین بوده‌اند.

هنگامی که کرد اقتدار یافته پارس تابع او بوده است. (حکومت گوتی، کاسی، کیان، ماد، اشکانیان و...) و د رهر زمان که پارس مقتدر شده کرد مطیع او بوده است. (حکومت پیشدادیان، هخامنشی و ...)

## خط کردی

کردان از حدود قرن دهم پیش از میلاد تا امروز دارای خط و کتابت و ادبیات بوده‌اند. و افکار خود را با حروف (ماسی سوراتی) و یونانی و آرامی و سریانی و میخی نوشته‌اند. پس از غلبه اسلام به جای آنها حروف کوفی معمول گردید و اکنون نیز به جای حروف کوفی، خط نستعلیق و حروف لاتینی در کردی معمول است.

## زبان و ادبیات کردی

اکراد با لهجات متعدد تکلم کرده و میکنند و تمام آن لهجه‌ها را زبان کردی می‌گویند و جملگی از یک ریشه سرچشمه گرفته‌اند. بعضی از مستشرقین میگویند که زبان اکراد ماد، همان زبان اوستا بوده است. (استرابون) یونانی می‌گوید که ماد و پارس، زبان همدیگر را به خوبی می‌دانستند و این خود دلیل است بر اینکه، این دو زبان با هم فرق داشته و ا ز یکدیگر متمایز بوده‌اند.

اکثر مورخین مصرحند به اینکه، زبان مادها همین زبان «کرد مکری» بوده است. چنانکه «زند واوستا» که به زبان مادی نوشته شده، خیلی نزدیک به لهجه مکری است، و یا همان زبان مکری است. این نظریه از طرف «هپورات» [؟] و « دارمستتر» و بعضی دیگر از متخصصین تایید شده است. و نتیجه این است که زبان اوستای زردشت و زبان کردی مادی است.

زبان پارسی هم در آن دوره همان زبان بوده که در آثار «استخر فارس» نوشته شده است. تفاوتی که در اکتشافات اخیر حاصل شده، همین است که کردها کلمات زیادی از عربی داخل زبان خود نکرده‌اند و شکل افعال خود را حتی‌المقدور حفظ نموده‌اند، اما بعکس زبان فارسی که در این قسمت به سر حد افراط رسیده است و رابطه خود را با اصل فارسی قدیم سست کرده، چنانکه حالا نوشتن کاغذ به زبان کردی ساده و خیلی آسان است، اما به زبان فارسی ساده چندان آسان نیست. و اگر نوشته شود غالباً از کلمات نامربوط و خوددرآورد تشکیل خواهد یافت. حتی در کردی اورامی که در کوهستان واقعند و بهتر توانسته‌اند رابطه خود را با اصل زبان کردی حفظ کنند؛ برای زن و مرد افعال متفاوت دارند. مثلاً می‌گویند «فرهاد آما» و «شیرین آمایني» یعنی فرهاد آمد وشیرین آمد. «فرهاد لوا» و «شیرین لوایني» یعني [فرهاد رفت و شیرین] رفت، که زبان فارسی فاقد این امتیاز است. از منابع دجله [و] فرات تا خلیج فارس در قلمرو زبان کردی بوده است. و مرکز این زبان، اول «آرارات» بعد «زاگروس» بعد از آن «اسپاهان» سپس «نهاوند» بعد «همدان» یک وقتی هم «مداین» بوده است. بنابراین می‌توانیم بگوئیم که لغت کردی

در تمام ولایات ایران قدیم عمومیت داشته است. فارسی قدیم و زبان «اوستائی» یعنی زبان کردی مادی و «سانسگریت»، هر سه از زبان مشترک آری متولد شده است (= شده‌اند). بعضی گمان کرده‌اند (= می‌کنند) که زبان کردی یک لهجه مشتق از فارسی است. سر «سیدنی سمیث» مؤلف کتاب تاریخ آشور مینویسد که این گمان اشتباه است. زیرا زبان کردی دارای تطورات حقیقی و قدیمی است واز زبان فارسی قدیم، «لوحه داریوش» خیلی قدیم‌تر است. به همین دلیل علما می‌توانند بگویند که زبان کردی در قرن ششم قبل از میلاد، یک زبان مستقلی بوده [وقتی] که هنوز زبان پهلوی به وجود نیامده است (= بود). (با بعضی تصرفات از تاریخ کرد و کردستان جناب آقای آیت‌الله مردوخ استفاده شده است). این اواخر در بعضی از روزنامه‌های تهران مقالاتی بقلم جناب آقای دکتر سنجابی استاد دانشگاه تهران و بعضی دیگر از چاپلوسان مزور و مزدور ایرانی و کردنما، انتشار یافته و افتراءآت و اکاذیبی با شاخ و برگ را به اکراد ایران نسبت داده‌اند:

۱- خیلی زحمت کشیده‌اند که اثبات کنند اکراد ایرانی هستند.

۲- اکراد خیال تجزیه ایرانرا در سر میپرورانند.

۳- اکراد متمرد هستند، وبقوانین و اوامر دولت سر فرونمی‌آورند.

٤- اکراد هیچوقت منفرداً دارای استقلال نبوده‌اند!

٥- زبان شیرین و نیرومند کردی مخفف و یا مشوش زبان فارسی است.

هر چند در ضمن مقدمه جواب هر یک از این افتراءآت داده شد، ولی باز میخواهم (=می‌خواهیم) بطریق اجمال و تفصیل به این پنج فقره جواب داده و بر بطلان هر یک اقامه برهان نمائیم: اما قسمت اول و دوم و سوم : ما امثال آقای دکتر سنجابی را که یکی از شخیصترین نژاد پاک اکراد است، بالاتر از آن می‌دانیم که به او نسبت افتراء یا کذب بدهیم و آنچه نوشته‌اند، شاید تحت تاثیر بعضی از هوچیگران و قلدران پست فطرت، که بعضیها خود را کرد هم معرفی میکنند و بعضیها خود را روزنامه‌نویس و مجله‌نویس ومؤلف به شمار آورده‌اند و می‌خواهند با این هوچیگریها مقام و منزلی (= منزلتی) بدست بیاورند، واقع شده باشند و یا واقعاً خواسته است اظهار عقیده بکند. و البته عقیده محترم است، و هر کسی عقیده خود را باید بموقع اظهار کند؛ ولی میگوئیم ای آقایان محترم : اکراد ایران عموماً معتقد هستند که اکراد کلیتاً خواه در زیر پرچم ایران زندگی کنند یا در زیر پرچم دیگران، از پاکترین نژادهای ایران هستند و این خاک پاک مهد نیاکان آنهاست. ایران میهن و زادگاه عزیز و ارجمند آنهاست. [ما] اکراد، ایران را از هزارها سال پیش از تعدی جهانگیران و متعدیان نگهداری و در راه سربستی و تمامیت ارضی ایران،

[دەقی ساغکراوەی لاپەڕەی ٥ - وێنەی ژمارە ٦]

فداکاریها و جانبازیها و خونریزیها کرده‌ایم، و مانند شیر ژیان پیکر خود را هدف تیر دشمن قرار داده و نگذاشته‌ایم بیگانه به این زمین مقدس پا بگذارد. و تا جان داریم در نگهداری آن میکوشیم.

ایران و سلطنت ایران را، ازآن خود و خود را ازآن او می‌دانیم. زیرا اولین سلسله شاهان ایران « ماد » یا « کرد» بوده‌اند، و پس از مرگ اسکندر مقدونی که کشور دچار هرج و مرج و اختلافات داخلی گردید، سلاطین بزرگ اشکانیان کرد، اختلافات را ریشه‌کن کردند و مدت پانصد سال امپراطوری و شوکت ایران را نگهداری و به اوج عظمت رسانیدند، پس از غلبه اسلام که بنیاد استقلال ایران از هم پاشیده شد، سلسله‌های[ی] از اکراد در ایران کوشیدند که از نو ایران بزرگ را در عالم زنده کردند (= کنند). اکراد به قانون اساسی ایران احترام و ارج میگذارند. اطاعت شاه و دولت را برخود واجب میشمرند. اما کسانی که اکنون مصدر امور دولتی ایران هستند بظاهر برای عوام‌فریبی، خودشان را ایرانی و ایران دوست معرفی می‌کنند، در صورتیکه اینها دشمن ایران و قانون اساسی و مزدور بیگانه هستند. این آقایان « سرتیپ هوشمند »های بی اصل و نسب و فاشیست را به جان و مال و ناموس اکراد انداخته‌اند. از هیچگونه نامردی در حق به اکراد دریغ نمی‌کنند. دو سال قبل سرتیپ هوشمندافشار پس از تخریب شهر سقز، سبب شد که قصبه بانه را طعمه آتش نمودند (= نمایند) و اکنون اهالی و عدّهٔ زیادی از بیگزادگان آنجا در خاک بیگانه بسر میبرند، وچند ماه قبل با تانک و توپ و مسلسل و هواپیماهای بمب‌افکن به اورامان و مریوان، برای فرونشاندن آتش کینه‌اش، تاخت. زن و مرد و پیرزن و بچه را از دم تیغ و گلوله و بمب گذرانید. و خانه و کلبه محقر آنها را هدف بمب قرار داد و همه را از بنیاد درآورد. و چند نفر از بیگزاده گان را به اتومبیل بست و نابودشان کرد.

یک خلیفه جناب شیخ محمد فرزند مرحوم شیخ حسام‌الدین که برای اصلاح و جلوگیری از خونریزی به نزد هوشمند رفته بود، به دار کشید. هر چند به شاه و روزنامه‌ها و اولیای دولت تلگراف نمودند و دادرسی خواستند، کسی به آنها جواب نداد. تا ایکه خانواده[ای] نماند که آسیبها و کشته‌ها به خود ندید (= نبیند). آنوقت سر لشکر جهانبانی را فرستادند که کار آنها را اصلاح کند. و او پس از مراجعت دستور داد به افسران و سربازانی که اورامانی[ها] و مریوانی[ها] را بسیار کشته‌اند، مدال بدهند. سربازان به هلاک رفته را شهید می‌نامند. به اکراد قوچان [و] بجنورد فشارهای سخت آورده‌اند که معلوم نیست که روزگارشان به چه روزسیاهی سر میکشد.

آقایان شما در نوشته‌ها و انتشارات خودتان، اکراد را اصیلترین نژاد ایرانی می‌نامید و از حیث دین واخلاق و آداب و سخاوت و شجاعت، به نیکی یاد می‌کنید ولی در عمل آنها را به فجایعی که در دوره حجر سابقه ندارد، نابود می‌کنید و به دین و پیشوایان دینی آنها فحش می‌دهید.

بقیه در صفحه ۱۷

[دەقی ساغکراوەی لاپەڕەی ٦ - وێنەی ژماره ۷]

## سواری رەشپۆش

م.ئازمر«١»

«تا نیقابی لە سەر ڕۆو بوو گە ورەترین قارەمانی
شەڕی دیمەشق و، وەختێکی نیقابی لادا هاتە ناو
ژماری گەورەترین ژنانی گیتی.»

وەختێکی«خالید ئیبنی وەلید» سەرداری بە ناو و «ئەبووعوبەیدە» سەرلەشکری بەتەدبیز، لەشەڕی ڕۆمیان، دیمەشقیان دەورە دابوو، خەڵکی شار کە خۆیان دەورە دراو و ئەمیرەکانی خۆیان بە دیل دیت؛ خەبەریان لە خالید نارد کە لە موقابیل وەرگرتنی مەبلەغێکی زۆر، دەس لە شار هەڵگرێ؛ بەڵام خالید وەرامی دانەوە: «من لێرە ناڕۆم تا وەختێکی موسوڵمان دەبن، یا قەبووڵی جزیە وماڵیات دەکەن، یاخود بۆ شەڕ حازر دەبن.»

لەو وەختەدا، لە لایان «هێرقێل»ەوە لەشکرێکی گەورە بۆ یاری ئەهلی شار، گەییشت. خالید فەرمانی خۆ ساز کردنی بە لەشکرەکەی خۆی دا و «زیرار ئیبنی ئەزوور»ی بە فەرمانـدەییی پێنج نەفەر سواریٚ شەڕکەر، بۆ شەڕ لەگەڵ نەیرووی تازەنەفەس و تازەگەیشتووی ڕۆم، نارد. زیرار ئامادە بوو و لە سەر ئەمەشڕا کە ئەیزانی ڕۆمییەکان لە هەژماردا لە لەشکرەکەی ئەو زۆرترن سوێندی خوارد نەگەڕێتەوە و شەڕ بکات.

موسوڵمانەکان چون سوێندی زیراریان بیست، یەکجاری دڵیان هاویشتە سەر شەڕ [و] فەرمانـدەی عەرەب لەشکرەکەی لە بۆسە دانا. وەختێکی لەشکری ڕۆم نزیک بوونەوە، زیرار لە بۆسە هاتە دەر و نێزەیەکی گرتە دەست و پەلاماری برد و نێزەیەکی وەهای لە ئاڵاهەڵگری سوپای ڕۆم دا، [کە] لە ئەسپەکەی کەوتە خوار و سەلیبەکەی لە دەس بەربۆوە. زیرار وەک بریسکە خۆی لە ڕۆمیان دا و چەند کەسی لێخستن، لەو وەختەدا چاوی بە فەرمانـدەی لەشکر کەوت کە لە ژێر سێبەری سەلیبێکدا دەڕوا و پیاوێکی چوارشان و قەوی سەلیبەکە[ی] بە دەستەوەیە؛ زیرار تەمای لەو کرد و بە پەلامارێک سەلیبەکەی سەرەوژێر، و فەرماندەکەش کە «وردان»ی ناو بوو، هەڵات. لەو بەینەدا کوڕی وردان باسکی چەپی زیراری بە تیر بریندار کرد، زیراریش بیٚ [ئە]وەی دەربەندی برینەکە بێت؛ وەک پڵینگی بریندار خۆی گەیاندیٚ. ئەوجار کە کوڕیوردان، مەرگی هاتە پێش چاو و تەمای بوو ڕا بکا، بەڵام زیرار ماوەی نەدا و گەیشتیە سەری؛

«١» لە مجەللەی ئیتلاعاتی هەفتەگیەوە وەرگیراوە.

و نێزەیەکی وەهای لە پشتی کوتا کە لە سینگی دەر کەوت. زیرار کۆشیشی کرد نێزەکە لە پشتی بێنێتەوە دەر، وەلی نووکی نێزەکە لە پشتیدا بە جێ ما و نێزەکە بێ نووک هاتەوە دەر.

لەشکری ڕۆم چون دیتیان نێزەی زیرار بێ نووک ماوە و چ ئەسبابێکی شەڕی تریشی پێ نییە، لە هەموو لایەکەوە دەورەیان دا [و] ئەسیریان کرد.

موسوڵمانەکان کە ئەوەیان دیت بە دڵشکاویەکی زۆر، خەیاڵی ڕاکردنیان هەبوو، کە «ڕافیع ئیبنی عومەیرە» (یەکێک لە سەردارەکان) هاواری کرد «ئەی لەشکری ئیسلام دەس لە داوێنی سەبر بەرمەدەن و پایەداری بکەن، خۆ ئەگەر سەرداری ئێوە ئەسیر یا کوژرابێت، خوا زیندووی هەتا هەتائیە.»

ئەوجار خالید لەگەڵ لەشکرەکەی، خۆی بۆ کۆمەگی ئەو لەشکرە چوو[ە] ناو مەیدانی شەڕ و پەلامارێکی سەختی بۆ سوپای ڕۆم برد.

لەو وەختەدا سەربازە عەرەبەکان چاویان بە سوارێکی ڕەشپۆش کەوت کە نێزەیەکی درێژی بە دەستەوەیە و مەردانە شەڕ دەکات. سواری ڕەشپۆش، سەرپێچێکی سووری بە سەرەوە بوو لە پێشاپێشی موسوڵمانەکان وەک بریسکە پەلاماری دەبرد. ڕیزی ڕۆمیانی تێکدەشکاند، پیاو و ئەسپی دوژمنی سەرەوژێر دەکرد، کەسیش ئەوی نەدەناسی.

سواری ڕەشپۆش لە ناو لەشکری ڕۆمدا ون بوو، بەڵام هێندەی پێنەچوو وەدەر کەوتەوە و هێندەی کوشتار کردبوو، تەواوی کراسەکەی شەتڵی خوێن [ب]بوو.

ڕافیع خۆی گەیاندە خالید و لێیپرسی: «ئایا دەزانی ئەو سوارەی لە پێش لەشکرەوە شەڕ دەکات، کێیە؟ کە لە ڕێی جیهاددا نرخێکی بۆ گیانی خۆی دانانێ» خالید کوتی: منیش لە فکری ناسینی ئەودام، و سەر لێسوڕماووی ئازایی ئەوم.

خالید شەڕێکی سەختی کرد و بەڵام لە هەموو جێگەیەکیش چاوی لەو سوارە هەڵنەبڕی تا نیزیکی بۆوە و لێیپرسی: «ئەی سوار تۆ کێی و خەڵکی کوێی؟.» جوابێکی نەبیستەوە. موسوڵمانەکان کوتیان ئەی سوار، ئەوە خالید ئەمیری لەشکرە، کە پرسیارت لێدەکا. نیقابت لادە تا بتناسین و بۆ پاداشی ئەو ئازاییە ئیحترامی گەورەییت بگرین.؟ وەرامێکیان نەبیستەوە. خالید خۆی هاتە پێش و کوتی:«ئەی سوار تا کەی خۆت دەشارێوە، ڕووت دەرخە، تا بتناسین.

ئەوجار سوار هاتە قسە و کوتی:«شەرم دەکەم خۆم بە ئێوە بناسێنم، چۆن من ژنێکی دڵسوتاوم. من «خەولە» خوشکی زیرارم، کە بۆ ڕزگاری برای خۆم شەڕ دەکەم.»

خالید لە بیستنی ئەم قسەیە فرمێسکی هەڵوەراند و کوتی : «ئەوا من بە تەواوی لەشکرەوە پەلامار ئەبەم، شایەد برای تۆ نەجات بدەم.»

خەولە کوتی : «منیش هەروەها لە پێش لەشکرەوە شەڕ دەکەم.»

[دەقی ساغکراوەی لاپەڕەی ٨ - وێنەی ژمارە ٩]

لە پاش ئەم قەرارە؛ خالید لە لایەکەوە و رافیع ئیبنی عومەیرە لە لایەکی ترەوە؛ پەلاماریان برد.

خەولە ئەوجاریش لە مەیدانی شەڕدا بوو و هاواری دەکرد: «زیرار لە کوێیە کە نایبینم، کەس‌وکارم نایبینن؛ ئەی تاقە برای من، ئەی کوڕی دایکی من، لە دووری خۆت، [خەو]یشت لە من هەڵگرتووە.!»

کاتی نیوەڕۆژ (- نیوەڕۆ)، هەر دوو لەشکر دەستیان لە شەڕ هەڵگرت و گەڕانەوە جێی خۆیان؛ ئەوجار خەولە دەستی کرد بە پرسیار. چون لە هیچ کەس خەبەری زیراری نەبیست؛ گریا و کوتی: «ئەی برا، بریا دەمزانی لە کوێستانانیان راگرتووی؛ یا بە بەندی ئاسن ماندوویان کردووی. بریا دەمزانی ؛ لە چاڵاویان هاویشتووی یا بە خوێنی خوشکتیان سوور کردووی. ئایا بە نێزە کەلەکەی تۆیان بڕیوە یا بەتیغ سەرتیان بڕیوە.؟

بریا خوشکت فیدای تۆ و تۆ[ش] لە بەند رزگار بایت؛ ئەگەر چوویە دونیای تر، لە منەوە رەسوڵی خوا سەلام بگەیەنە.

لەو بەینەدا هێندێک لە رۆمیان بە دیل گیران، خالید لە قسەی ئەوان تێگەیشت کە زیراریان لەگەڵ سەد سوار ناردۆتە «حیمس» تا لە وێرا بۆ لای ئیمپراتۆری بەرن.

*************************

چەند سوار لە نەیرووەکانی رۆمی پیاوێکیان سواری ئەسپ کردووە، لە هەموو لایەکەوە دەورەیان گرتووە. ئەم پیاوە عەرەبە، بێ [ئە]وەی چاو لە تەماشای رقاوی ئەوان بکات؛ ئەڵێ: ئایا کەس هەیە لە منەوە بە کەس‌وکار و خەولەی خوشکم خەبەر بگەیەنێ، بڵێ من ئەسیر کراوم و دەستیان بەستووم، کافرەکانی رۆم لە دەورم دەڕۆن و ئەیانەوێ بەو حاڵە بۆ رۆمم بەرن.؟ کە وا بوو، ئەی دڵ بمرە لە خەم و حەسرەتی خەم. ئەی فرمێسکی گەرم بە سەر گۆنەما وەرە خوار. ئایا دەبێ جارێکی تر چاوم بە کەس‌وکار و خەولەی خوشکم بکەوێتەوە.؟!

لە ناکاو، لە پەناگایەک ئەسپێک دەرپەڕی، سواری رەش‌پۆش پەلاماری بۆ رۆمیان برد و دەنگی رافیع بەم جۆرە بە گوێی زیرار گەییشت:

خوا دوعای تۆی قەبووڵ کرد. ئەو خوشکەت، ئەو سوارە رەش‌پۆشە، بۆ ئازادی تۆ شەڕ دەکات.

رۆمیان شکان و زیرار ئازاد بوو، و ناوی خەولەش «خۆشکی زیرار» هاتە ناو ناوی گەورەژنانی گیتی.

*******

**قسەی نەستەق**

هەمیشە کار بکەن و بکۆشن تا کراسی ئیفتیخار و گەورەیی بپۆشن، هەمیشە لە پێش چاوتان بێت کە ئیفتیخاراتێکی تازە وەدەس بێنن. چون، ئیفتیخاراتی رابردوو، وەکو شمشێرێکی ژەنگاوییە؛ لە ڕەونەق کەوتووە «شکسپیر»

بەیادی تۆ...

## برای دوورم....

م. ئازمر

هەرچەنـد سـەر هەڵـدێنم و دەر و پـشتی خـۆم تەماشـا دەکـەم و تـۆ نـابینم؛ هەرچەند، لە کۆمەڵـی برایانـدا جێگـات خاڵـی و قـسە خۆشـەکانت، کـە نموونـەی ئیحساساتی نیشتمانپەروەری و خوێنگەرمی بوو، نابیسم؛ دوو تکە فرمێسک لە جۆگەی چاو و سەرچاوەی دڵم دێتە خوار؛! دوو تکە فرمێسک، دوو تکە خوێن، لە ناو پارەی دڵ و چاوی کەمنوورم هەڵدەقوڵێ.!

برای دوورم، وەختێکی بەسەرهاتی ژیان، لە چاڵاوی بەدبەختی و سـەرگەردانی هاویشتبووین، وەک دوو لەش و یەک گیان لە خەم و شادی‌دا شـەریک و بـێبـەش لـە تەماشای گەردوشی رۆژگار و [لە] بەدبەختی خۆمان [بیرمان] دەکرد[ەوە]؛ خۆمان چەنـد بە خۆشبەخت دەزانی. ئەو رۆژە کە لە عەینی بەدبەختی‌دا لەبەر بێکەسـی پـەنامان بُـۆ سێبەری دارێک بردبوو سەرگەرمی خاتراتی پێشوو و دڵگەرمی هیوا و ئـارەزوو بـووین؛ چەند شاد بووین.

برای دوورم، بیری ئەو رۆژانە کە سەنگی چارەڕەشی و تاڵی ژیـان نەیـدەتوانی سەری پڕشوور و دڵی پڕ هیوامان بشکێنێ و ناهومێد بکا، چەنـدە خـاتراتێکی شـیرینە؛ هەرکە ئەو رۆژانەم وەبیردێتەوە، و خۆشەویستی تۆ دێنمە پـێش چـاو، ئـەو دوو تکـە خوێنە بە سەر گۆنە[ی] زەردما دێتە خوار.

بـرای خۆشەویـستم، گـەرچی دەسـتی زوڵـم و گەردوشـی رۆژگـار تـۆی دوور خستۆتەوە، هەرگز؛ هیچ توانایەک ناتوانێ، خۆشەویستی تۆم لـە دڵ دوور بخاتــەوە. وێنەی تۆ بە قەڵەمی خۆشەویستی لە دڵما کێشراوە و لە ژێر خاکیشا مەحو نابێتەوە.

دڵنیا بە؛ تۆ لە نەتیجەی ئیفتیخاراتی ئەنجامی وەزیفەدا خۆشـبەختی؛ و منـیش هەرچەند لە بیابانی دووری‌دا سەرگەردان و ناڵانم، دیـسان لـە خۆشـبەختی تـۆ و لـە ئیفتیخـاراتی تۆ، و بە یادی تۆووە خۆشبەختم و (**بۆچی نەگریم**)ت مایەی هیـوای دڵ و رووناکی تاریکەشەوی تەنهاییمە.



[ دەقی ساغکراوەی لاپەڕەی ١٠ - وێنەی ژمارە ١١]

# گه نجینەی ئەدەبییات

## ئەی میللەتی ئاوارە!

ر.م

ئــەی میللــەتی ئــاوارە لــە نێــو دەشــت و بیابــان
ئەی بێدەسەڵاتی هەموو بــێ دەسـت و سـەر و پــێ
بــێ عــیلم و سەراسـیمە هــەتا کــەنگێ دەمێــنن؟
میللــەت هــەموو بێنــاز و هــەموو بێدەســەڵاتن
هــۆش [و] دڵ [و] ئیمــان و رەگ و مەعریفــەتو بــێ
بۆ عیززەت و بۆ شــەوکەت و بــۆ میللــەتی خۆتــان
بێ زەحمەت و بێ دەردی سەری، زەحمەتە چا بوون
هەر تۆ بــە ئومێــدی مــن و هــەر مــن بــە ئومێــدت
نەوبیستووە کە نابێت و بە بێ گەنج و بە بێ رەنــج
مەئیووس و پەریـشیدە مــەبن، وەختــە رەهــا بــن
ئەورۆکــە، هــەموو میللـــەتی دونیایـــە دەزانـــێ
تـــەییارە چییـــە؟ قـــووەتی رۆح و بـــەدەن و بـــێ
زۆر میللەتی وەک ئێمـە هەبوو، ئـەورۆ لــە دونیـا
بـــێ عیلمـــی و بـــێ مەعریفـــەتی بێتـــوو نـــەمێنێ
بـــۆ تەربییـــەتی فیکـــری جـــەوانانی مـــەداریس.
بۆ تەوسیعەیی عیلم و هونــەر، هــەر چــی بکۆشــن
نامێنێ ئەگەر عیلم[و] هــەبوو، بــوغز و عــەداوەت
ئەو جارە دەکەن، فیکـری بــەرەو ژوور هــەمووومان
تـــەییارە دەبـــێ، مەرکـــەب و ئەســـبابی شــەڕێتان

وەی میللەتی بێبەش لە هەموو حــەق و حیـسابان
وەی عەبد و عەبیدی هــەموو بــێ خێــر و ســەوابان
هەستن لە خەوی بــێخەبــەری، زۆر لــە عــەزابان
کەوتوونــەوە بێچــارە، لــە نێــو دەشـت و بیابــان
چــی دیکــە مــەدەن حاسـڵی عــومرو بــە جــەنابان
هەروا نەدەبوو، بەڵکی دەبوو جــان بــە فیـدا بــان
چاو، میللەتی دی بۆ حەقی خۆ، چۆن لە شـیتابان
چۆن دێینــە دەرێ ئێمــە لــە ژێـر دەسـتی کــەلابان
بــێ رەنـــج و عــەنا چــۆن دەکــرا، شــا بکرابـــان
مللیەت هەموو ئــەورۆ لــە سـوئال و لــە جــەوابان
ئەو میللەتە باهۆشە، دەبــوو ســەروەر و شــا بــان
عــیلم و هونــەرو، مەعریفــەت و لــوببی لوبابیــان
تاقن بــە هونــەر دەچنــە سـەر و ژێــری ســەحابان
هــەر نێــوی وەتــەن دێ، لــە مــەقالات و خیتابــان
باســی وەتـــەن و میللەتـــە، داوێنـــە کیتابـــان
هێشتا کەمــە، گــەر بێتــوو بپرســن بــە حیـسابان
بۆ یەک هەموو کەس دەبنە برا، میـسلی سـەحابان
ئـــازادی تەڵـــەبدێنـــەوە روو، رەوشــەن و تابــان
بــۆ کوشــتنی ئەعــدا، لــە بــۆ ئیعـدامی سـەبایان

## لەسەر ئەم بەخشیش و رەحمە خودا (الحَمدُلِله)

ئەشکەیی

رەفیقـــان چۆنـــە رازی خـــۆم لـــە خزمـــەت ئێـــوە ئیفـــشا کـــەم
بـــە تەســـویبی (وَشـــاوِرهُم) ئومـــووری دیـــن پەیـــدا کـــەم
بـــە یـــەک (وَجهَـــتُ وَجهـــی) دڵ خـــەریکی زاتی والا کـــەم
تەمامـــە بـــێم بـــە (بـــسمِاللـــە) لـــە (الـــرَحمن) دەعـــوا کـــەم
(رەحـــیم) ئیمرۆکـــە، بـــۆ ســـبحەی، لـــە جەننـــەتدا تەمـــەننا کـــەم

بـــە جـــان و دڵ بـــەجێدێـــنم سپاســـی میننـــەتی شـــاهی
هـــەتا ئـــاخر نەفـــەس شـــوکرانە ئـــەبژێرم بـــە (ذیجـــاهی)
کـــە بەنـــدەی کـــردە ئیـــسلام و، دەری کـــردم لـــە گومـــڕاهی
لـــە ســـەر ئـــەم بەخـــشیش و رەحمـــە خـــودا (الحَمدُلِلـــە)ی
کـــە (رَبُالعـــالمین)ە رێ دەدا ســـووڕەت لـــە مـــەعنا کـــەم

ئـــەزەل قیـــسامی رزقـــی کـــە داوینـــێ، بـــە لا دادا
لـــە (یـــرزُقُ مَـــن یـــشاء)دا دەدا دەیـــدات و لا نـــادا
منـــیش هـــەر چەنـــد کـــە نائـــەهلم لـــە جـــوودی ئـــەو بـــە هـــەر لادا
بـــە(الـــرَحمن)ە ئومێـــدم هەیـــە، تـــا هـــەم لـــە دونیـــادا
کـــە بمریـــشم (رەحـــیم)م بـــەس، بەشـــەرتێ روو [لـــە] مـــەولا کـــەم

ئەگـــەر یـــاریم بکـــەی یـــارەب بـــەرەو میحرابەکـــەی خۆشـــبووت
لـــە راوەســـتانی نـــوێژم، دڵ بـــە زاتی تـــۆ دەکـــەم مـــەربووت
زمـــانی خـــۆم لـــە ئـــالایش وەپچـــڕێنم ئیتـــر مـــەزبووت
دەڵـــێم تـــۆی (مالـــک)ی یـــارەب (لـــە یـــومِالـــدین) خـــۆت فـــەرمووت
ئەســـەح (ایـــاکَ نعبُـــدُ) ئیتاعـــەی غـــەیری تـــۆ ناکـــەم

ئەگـــەر ئـــەم تینەتـــەم، تـــینی خـــەیالاتی لەســـەر لاچـــێ
قیـــام و ئیعتیـــدال، ئـــەقوال و ئـــەفعالم خەتـــەر ناچـــێ
لـــە تیکـــراری قیـــرائاتم ئیجـــاب ئومیـــدە، ئینجـــا چـــی
و (ایـــاکَ) بـــە لـــەفزی (نـــستعین) دەبمـــە دەعـــواچی
بـــە قـــەولی (اهـــدِنا) کـــاری (صـــراطالمـــستقیم) چـــا کـــەم

ئـــەبێ سەربەســـتی پەیـــدا بـــێ لـــە ئەکمـــەلت و عـــەلیهیمدا
حیجـــابی گومـــڕەهی لادەم لـــە ئەرحـــەمەت و عـــەلیهیمدا
لـــە پاشـــان بـــێم تجَـــرُ[ع] کـــەم لـــە ئەتمـــەمت و عـــەلیهیمدا
(صـــراطالـــذین)ە بـــڵێم لـــە (انعمـــتَعلـــیهم)دا
بـــە (غـــیر) ئینـــشاد و نەفـــسی خـــۆم لـــە (مغـــضوب)ی تـــەوەللا کـــەم

[دەقی ساغکراوەی لاپەڕەی ١٢ - وێنەی ژمارە ١٣]

لە تەکبیری تەحەرروم تا سەلامی فەرزی پڕ مەندووب
بەتەعقیبی رەزای غەففارییە، دەعوا بە حەق مەنسووب
ئەگەر لێمت قەبوولە یا نە هیچە، پێی ئەبم مەحبووب
خوا نەمکەی بەمەرجەع بۆ (عەلیهم)، دوایی مەغزووب
بە شەدد و حەددی، تەجویدی (ولاالضالین) گۆیا کەم

بەنای چاک «ئەشکەیی» غیفلەت هەبێ، راجیع بە پێنجینە
بە خشتی دیقەتی وەستا، هەیلالی تاقی تامینە
کەوا بوو دەستی ئیخلاست بە ریشی حەمد، دابێنە
لە پاش ئایاتی سەبعەی فاتیحە، لازم بە ئامینە
تەرەحوم کە، بە حالی «ئەشکەیی» بۆ هەر دوناکەم (- هەر دوو دونیاکەم)

••••••✻••••••

ڕۆژی ئەمری (کُن) لە ڕێگەی (قُل هواللّهُ اَحَد)
شارەزا بووم زۆر بە چاکی تا بە (اللّٰهُ الصَمَد)
(لَم یلِد) یا خوا[دا] (وَ لَم یولَد) هەموو کەس حالّییە
تێگەیشتووم بۆ (و لم یکُن لَهُ کُفُواً احَد)

(واجِبُ التعظیم)ی فەردی، بێ میسال و بێ موعین
قەت شەریکی نەبووە، نابێ هەی ئەزەل هەر تا ئەبەد
هەرچی مەیلت بێ کراوە، هەرچی مایل بێ ئەبێ
(ماتشاأ)ت (=ماتشاء)ە جێبەجێیە، بێ دەبیر و بێ بەلەد

دووزەخ و جەنەتەت مەکان، لامەکان ما فیها
ناتیق و ناهیق نەباتات، ئاسمانی بێ عەمەد
«ئەشکەیی» با بەس بێ لاچوو، زۆر مەخووفە، مەنزڵست
تا لە خزمەت مەتزڵی قورئانەوە بۆت دێ مەدەد

---

حەمدی

| | |
|---|---|
| باڵی کێشاوە بە سەر حوسنا لە دوو لاوە برۆ | وەک هوما گەییە مەقامێک پێی لەسەر چاوە برۆ |
| روتبەیی باڵا بە ئینسانی بچووکی قەت مەدەن | چون لە رووی ڕۆژا بزانە تیغی کێشاوە برۆ |
| رەنگە قەت ئەهلی موحیببەت یەک کەسی لێدەرنەچێ | تیغی راکێشاوە ئەمری کوشتنی داوە برۆ |

✻✻✻✻✻✻✻

## کچە لادێیی

کچە لادێیی نەشمیلی، جوان‌چاک     بێ فرۆفێڵ و، هێدی و داوێن‌پاک
ئەتۆ هەر زگماک، وەها جوانی     نێوی توالێت، هێشتا نازانی
ناکەی سووراو و سپیاو، چون دووری     لە شار، دەگەڵ وەش، هەر سپی و سووری
بێ فڕ بسکەکەت، لوول و چین‌چینە     بڕۆت کەوانی و چاوت نەخشینە
بێ رۆژ، لێوەکەت، سوورە وەک یاقیق     هەر کەس بیبینێ، لە بۆی دەکا دیق
کوڵمەکەت گیانا، وەک گوڵی گەشە     خاڵی سەر کوڵمەت وەک زیلی رەشە
بەژن و بالاکەت، باریک و شووشە     سینەکەت شووشە، هەر وەکوو شووشە
ئەو کەزیە درێژەی گەییە رەفیسکە     رەش و بۆنخۆشە، هەر دەڵێی میسکە
وەکوو فریشتە، پاک و خاوێنی     چەند هەزار بانووی شاران دەهێنی
«هێمن»ت کردووە، شێت و وێتی خۆت     وەختە گیانەکەم، گیانی دەرچێ بۆت

## لاوی...

م. ھ

لاوی وەک من بێ نیشات و مات و خەمگین، کەم هەیە     ساڵ دوازدە مانگە، دڵخۆش نیم، هەمیشەم خەم هەیە
چوومە لای زۆر دوکتوران بۆ مەڵهەمی زامی دڵم     کشتیان پێیان کوتم بۆو زامە، مەڵهەم کەی هەیە
گەندوومی خاڵی ئەتو، نادەم بە توویایی بەهەشت     ناخەلەف نیم، من ئەوەندەم ئیرسی باب ئادەم هەیە
با بناسێنین بە خەڵکی، ئێمە خۆمان چاوەکەم     تا بزانن خەڵکی ئێستاش، خاتوزین و مەم هەیە
من دەبێ سەد هێندی پەروانە بسووتێم لائەقەل     چونکە روخساری تۆ نووری سەد ئەوەندەی شەم هەیە
باسی جام و دڵبەر و عیشق و شەرابم بۆ بکە     من چ کاریکم بە کاوە و، کەیقوباد و جەم هەیە
ئەشکی چاوی ئەشکباری «هێمن»ی بێچارەیە     هەرچی لەم گوڵزار و باغ و مێرگەدا، شەونم هەیە

[دەقی ساغکراوەی لاپەڕەی ١٤ – وێنەی ژمارە ١٥]

## مەحاکەمەی هیتلێر؟!

«ئەمە سەرگوزەشتی هیتلێرە لە ناو جەهەننەمدا کە بە وەسیلەی بێسیم بۆ ئێمەیان موخابەرە کردووە، وە ئەوا ئێمەش بۆ خوێنەرە خۆشەویستەکانی دەرج ئەکەین تا نەتیجەی بەدکرداری کەسانێکی فکری جیهانداریان لەسەردا بێت: لە هەموو کەس مەعلووم بێت.»

**بە قەڵەم[ی]: م. ئازەر**

ڕۆژێ... لەناو جەهەننەمدا دەگەڕام، بەڵکو خەبەرێکی تازەم دەس کەوێت و بۆ موجەللەکەمی موخابەرە بکەم.

لەنەکاو دیتم لە لایەکەوە کارکەرانی جەهەننەم یەکێکیان دەورە داوە و ڕەکێشی دەکەن بۆ لای تەبەقەی هەرە ژێرووی جەهەننەم، کە ئەوەم دیت پرسیم چ باسە؟ کوتیان گۆیا هیتلێرە، منیش بە دەم هەراکەوە ڕۆیشتم. ، دیتم لە پێشاپێشی مەئموورەکان جەنابی مالیکی دووزەخ بۆ لای تەبەقەی هەرە ژێروو تەشریف ئەبا، هیتلێریش بە حاڵێکی پەرێشان و پەشۆکاو، هەر پیلەی بە دەس یەکێکەوە، بە دوای مالیکدا ڕایدەکێشن، چوومە پێش و سڵاوم کرد. مالیک جوابی دامەوە و کوتی: جەنابی هیتلێر بۆ ئەوەی لە دەس موتتەفیقین ڕزگار بێت، لە بێرلەن خۆی کوشتووە، بێ [ئە]وەی بزانێ ڕزگاری لە دەس خوای گەورە غەیرەمومکینە، و نیک و بەدی گیتی پاش مردن پاداشی دەدرێتەوە.

بەڵێ بە کورتی جەنابی سەدری ئەعزەم ئادۆڵف هیتلێر: تەشریفی هێنا ناو تەبەقەی ژێروو و لەسەر کورسییەکی ئاگرین کە لە پێشدا بۆی ئامادە کرابوو قەراری گرت و من و مالیک لە تەنیشتی و چەند نەفەر بە گورزی ئاگرینەوە، لە دەوری ڕاوەستابوون. پاش تاوێک سەری هەڵێنا و دەور و پشتی خۆی تەماشا کرد و چون منی وەک ئەهلی گیتی هاتە پێش چاو، ڕووی تێکردم و پێش هەموو شتێک لێیپرسیم :لێرەدا پەناگای هەوایی هەیە؟ کوتم پەناگات بۆ چییە؟ کوتی ئەمەوێ لە وەختی حەملەی هەوایی موتتەفیقیندا خۆم بشێرمەوە (=بشارمەوە)!، جوابم داوە:لە موتتەفیقین مەعلووم بووە کە تۆ تەسلیمی دیوانی عەداڵەت کراوی و ئەزانن خوا جەزای نیک و بەدت دەداتەوە، ئیتر بە شوێنتا نایەن، خاترجەم بە.

ئەوجار کە لە ترسی خەتەری هەوایی! ڕزگار بوو لێیپرسیم، تۆ کێی؟ چۆنە کە خەمگین نیت؟ مەگە تۆش وەک من لە ناو ئاگر نیت و ناسووتێی؟ کوتم: خێر، ئاگر کار لە من ناکات، کوتی: چۆن دەبێت کەسێک لە ناو جەهەننەمدا بێت و ئاگر کاری لێ نەکا؟ جوابم

داوە: چونکە من لە گیتیدا وەک تۆ هەوای جیهانگیریم نەبوو و، نەبوومە باعیسی خوێنڕێژی میلیۆنەها ژن و پیاو، حەقی کەسم پامال نەکردووە، بەڵکو «حەقی من لە ژێر پێی، دەسپەروەر[د]ەکانی تۆدایە.» گوناهکار نیم، تا وەک تۆ ئاگر کارم لیٚبکات.

- ئەدی تۆ چکارەی، کە وایە بۆچییان هێناویە ئێرە؟

- من یەک نەفەر «کورد»م و بە ئیختیاری خۆم هاتوومە ئێرە، و لە لایەن موجەللەیەکەوە مەئموور کراوم تا ئەخباری جەهەننەم بۆ موجەللەکە موخابەرە کەم.

ئەو جار رووی لە مالیک کرد و پرسی ئەوە کێیە[؟] ئەو مەئموورانە بۆ لە دەورم راوستاون؟ مالیک کوتی: من مالیکی جەهەننەم و مەئمووری پەزیرایی لە میوانانی جەهەننەمم؛ و ئەو گورز بەدەستانەش پاداشی کردەوەی گیتی تۆ دەدەنەوە.

- بۆ مەگەر بێ [ئە]وەی مەحاکەمە بکرێم موجازاتم دەکەن. گوایە ئێرەش وەک دونیای دەرەبەگی و بگرە لێنیشە بێت، پێش مەحاکەمە موجازات چلۆن دەبێت و کێ بیستوویەتی؟

- ئەگەر چی موجازاتی تۆ ئەبوایە پێش مەحاکەمە بێت، چون تۆ لە گیتیدا نەتەوە چووکەکانت پێش خەتا و بێ گوناه پامال کردووە و ئەبوایە مەعامەلە بە میسلت (= موقابیلە بە میسلت) لەگەڵ بکرێ؛ بەڵام لەسەر ئەمەشا، ئێمە تۆ مەحاکەمە ئەکەین، ئینجا پاش مەحکووم بوونت، جەزات دەدرێتەوە.

من کە زانیم ئەگەر هیتلێر سەرگەرمی مەحاکەمە بێت، وەختی وەرامی پرسیاری منی نابێت؛ بە جەنابی مالیکم عەرز کرد: تکات لیٚدەکەم چەند سەعاتێک لە مەحاکەمەی دەس راگرە، تا من چەند پرسیارێکی لیٚبکەم.

- لەبەر خاتری تۆ و چون دەزانم کە تۆ پرسیارەکانت بۆ گیتی موخابەرە دەکەی و ئەهلی گیتی دەیبینن؛ لەبەر ئەوە ئەوا دوو سەعات دەس رادەگرم، تا ئەهلی گیتی خەبەرەکانی تۆ بخوێننەوە و بزانن نەتیجەی بەدکاری و زۆر چییە و ئینسان پاش مردن بە چ سەرنیویشتێک گرفتار ئەبێ؟.

ئەوجار رووم لە جەنابی هیتلێر کرد و پرسیم ئایا دەتوانی وەرامی چەند پرسیاری من بدەیەوە؟

- هەرچەند لە بێرلەن ئیجازەی ملاقاتی خەبەرنیگارانم نەدەدا، بەڵام لێرە چارەم نییە و هەرچی [ب]پرسی جوابت دەدەمەوە.

- ئەو هەمووە بگێر و بکووژە کە تۆ لە گیتیت خست و هەزاران ئاواتی گەنجانت لە بن خاک پونهان و رۆڵەڕۆت لە ناو دایکانی جیهان خست؛ چ نەتیجەیەکت لیٚ دەسکەوت؟

- پاش ئەو هەمووو[ە] گێرە و کێشەیە لێم مەعلووم بوو کە «زۆرەملی، مل شکانی لە دوایە.»!

- کەی لێت مەعلووم بوو لە شەڕدا سەر ناکەویت.؟

- وەختێکی نیشتمانپەروەری و گیانبازی و ئازایی «سوپای سوور»م چاو پێکەوت.

- بۆچی پە لامارت بۆ «رووسیە»برد؟

[دەقی ساغکراوەی لاپەرەی ١٦ - وێنەی ژمارە ١٧]

**- لە نەتیجەی خەیانەتی هاوکارەکانم بوو، چون منیان وا حاڵی کردبوو کە نەیرووی ئاڵمان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دەتوانێ رووسیە داگیر بکا و پاش داگیرکردنی رووسیە، ئەوجار کاری ئینگلیس و ئەمریکاش زوو دەبڕێتەوە. وا بوو کە فەرمانم دا لە ماوەی چەند حەوتوودا ئەبێ رووسیە داگیر بکرێ.!!**

**- جگە لەوە ئایا شتێکی تر نەبوو بە هۆی شکستی تۆ.؟**

**بەڵێ بۆمباهاوێژەکانی مووتتەفیقین کە هەموو جار لە ئاسمانی بێرلەن وەدەر دەکەوتن و وەک گامێشی شێت حۆقەیان دەهات؛ ئەوانیش بە جارێک رووحییە[ی] میللەتی ئاڵمانیان مووتەزەلزیل و، پشتی منیان شکاند.**

**- تۆ کە دەتزانی ئاخری کار لە مردن زیاتر نییە، بۆچی خۆت کوشت و تەسلیم نەبووی؟**

**- مردنم لە دیلی پێ چاتر بوو. ! ئاغای خەبەرنیگار وەک بۆخۆت دەزانی ئێستا فکرم بلاوە و چون چەند دەقیقەیەک زیاتر نەماوە بۆ وەختی مەحاکەمە؛ تکات لێدەکەم دەستم لێهەڵگری.**

**ئەوجارجەنابی هیتلێر لەبەر خۆیەوە کوتی : خوایە لە دەس سوپای سوور و حەملەی هەوایی رزگار بووم، بەڵام لە دەس خەبەرنیگار رزگار نەبووم و لە جەهەننەمیش برینم دەکولێننەوە.**

**«خوێنەرە خۆشەویستەکان؛ چون مەحاکەمەی هیتلێر دەس پێنەکرابوو، خەبەرنیگارەکەمان، ئەوەندەی ئاگایی حاسڵ کردبوو، بۆی موخابەرە کردین، و لە ژمارەی دوایی‌دا جەریانی مەحاکەمەکەشی دەنووسین.»**

---

بقیه از صفحه ٦

### نویسندگان فارسی بخوانند

شما تمام آثار فرهنگی کردستان را نابود کردید و در عوض چند باب دبستان را باز نمودید که جز سوء اخلاق، چیزی را به بچه‌های اکراد نیاموخت. از بهداری بهیچوجه اثری نیست. مردم در آتش امراض گوناگون جان می‌دهند و در فقر و بیچارگی می‌سوزند. سه نفر از اهل مهاباد که چند ماه قبل برای امورات شخصی به رضائیه می‌رفته‌اند ژاندارمهای «بالانیش» هرسه را دستگیر، و یکسره به تهران فرستاده، و اکنون در قصر قاجار به سر می‌برند. و تاکنون از آنها سئوالی نشده، معلوم نیست به چه گناهی زندانی شده‌اند. شما معتقد هستید که باید مأمورین تمام نقاط کردستان را از تهران بفرستید و هیچگونه حق و مزایا را برای اکراد قائل نمی‌شوید. به این هم راضی نیستید میگوئید، اکراد خیال تجزیهٔ ایران را در سر می‌پرورانند ؛ خواهش می‌کنم معرفی فرمائید، اکرادی که خیال تجزیهٔ ایران را در سر دارند، کیستند و کجائی هستند و مدرکتان چیست [؟] شما خیال می‌کنید که اگر مأموری را به جائی فرستادید هر قدر توانست مردم آن سامان را در نظر دولت بدتر جلوه دهد بهتر انجام وظیفه کرده است[؟] چرا هوشتان را جمع نمی‌کنید و فکر اساسی به حال خود و جامعه نمی‌کنید [؟] دولت باید بردبار باشد ؛ مردم را تربیت کند و زندگیشان را تأمین نماید، صرف نظر داشته باشد و با محبت و عاطفه به مردم بنگرد تا حب میهن و دولت در قلوب افراد جایگزین گردد. بقیه در صفحه ۱۹

## کورتە مێژووی جەنگی گەورەی رابردوو«١»

م. ئازەر

رۆژی ٢٧ی (=٢٨ی) مانگی ژوئەن[ی] ساڵی١٩١٤، «ئارشیدۆک فرانسوا فریناند» (=فێردیناند) وەلیعەهدی ئۆتریش لە شاری «سراژۆ» (= سرایوۆ) بە دەس قوتابییەک بە ناوی «گاریلۆ پرێنزیت» خەڵکی «بۆسنی» بە کوشت چوو، کە لە نەتیجەدا ئاورێکی هەڵایساند، چوار ساڵ و سێ مانگ ئاییسا.

دەوڵەتی ئۆتریش و هەنگری رۆژی ٢٣[ی] مانگی ژووئییە ئیعترازیان لە دەوڵەتی سێربێستان گرت و دەوڵەتی ناوبراویان مەسئوولی کوشتنی وەلیعەهد و خانمەکەی دانا و دەوڵەتی سێربێستانیش رۆژی ٢٥[ی] ژووئییە ئەو ئیعترازەی رەد کردەوە ولە وەرامێکی کە داینەوە، حەقی حاکمییەتی خۆی مەحفووز کرد.

دەوڵەتی ئۆتریش بە پشتگەرمی دەوڵەتی ئاڵمان بەو وەرامە رازی نەبوو؛ شەوی ٢٩[ی] ژووئییە، بێلگرادی بۆمباران کرد. سێربێستانیش دەستی لەگەڵ کردەوە، ئەوجار دەوڵەتی رووسیە «شوورەوی» مەجبور بوو لەسەر سێربێستان بکاتەوە و دەستی بەسەردا بکێشێ، ئاڵمانیش رۆژی ٣١[ی] مانگی ژوئییە، ئاخرین ئیختاری بۆ رووسیە نارد، بەڵام «تێزاری رووسیە» نیکۆلای دووەم بەو هیوایە کە دەتوانێ لە عەقڵ و دۆستایەتی «گیوم» پادشای ئاڵمان ئیستفادە بکات و پێیڕابگەیەنێ کە ئیختلافاتی ئۆتریش و سێربێستان بە کونفرانسی «لاها»ی بسپێرێ: تێلێگرافێکی بەو مەزموونە بۆ موخابەرە کرد: «قەولی شەرەفی (= شەرەف) دەدەم، تا هەر وەختێکی گفتوگۆ لەگەڵ ئۆتریش توول و تەفسیلی بێت، لەشکری من دەس بەهیچ کارێکی جەنگی ناکەن.»

دەوڵەتی فەرانسەش بە حەرارەتێکی زۆر کۆشیشی دەکرد، پێشگیری لە خوێنڕێژی بکات و پشتیوانی لە فیداکاری و کۆشیشی ئینگلیس و رووسیە دەکرد. لەو مەملەکەتەدا تەواوی موباریزاتی سیاسی و گەلی و مەزهەبی خرابوو[ە] لایەکەوە و، هەموو کۆمەڵەکان پاڵیان رێکدابوو نیشانە و ئامانجێکیان، لە نەزەر گرتبوو (سولح): «حیفز و پاراستنی فەرانسە لە جەنگ.»

ئێوارەی رۆژی ٣١[ی] ژوئییە «ژان ژۆرس» سەرۆک[ی] کۆمەڵەی سۆسیالیستی فەرانسە کوژرا. بۆ سبەینێ فەرمانی لەشکر کردنی گشتی «بسیج عمومی» وەدەرکەوت، دیسان تەواوی رۆژنامەکان هاواری «وەتەن لە خەتەر دایە»یان بڵیند کرد.

رۆژی ٣[ی] مانگی ئووت؛ ئاڵمان کە دوو رۆژ بوو ئیعلانی جەنگی بە رووسیە دابوو؛ لەگەڵ فەرانسەش ئیعلانی جەنگی دا. ماویەتی...

---

(١) وەرگیراوە.

## تکا

لەو خوێنەرە خۆشەویستانە کە لە شەرحی حاڵ و ساڵی لە دایک بوونی «وەفایی» ئاگادارن تکا ئەکەین بومان بنێرن.

[دەقی ساغکراوەی لاپەڕەی ١٨ - وێنەی ژمارە ١٩]

بقیه از صفحهٔ هفده

## نویسندگان فارسی. ..

ترا به خدا شما این اخلاق را دارا هستید؛ حاشا و کلا شما از کلیهٔ مزایای اخلاقی و ملت‌پروری محروم هستید باز هم می‌گوئید اکراد متمرد هستند.

اما راجع بقسمت چهارم که اکراد دارای استقلال بوده‌اند یا نه ؟ محتاج به اقامهٔ دلیل و برهان نیست که اکراد پیش از میلاد «حکومت کیان و ماد و... و...» و بعد از میلاد «حکومت اشکانیان» و بعد از اسلام «حکومت اخشیدیه و روادیان و پیشدادیان و ایوبیه و زندیه و... و...» سلطنت و بلکه امپراطوری نیز داشته‌اند و در هنگامیکه رشتهٔ امور سلطنتی در دست اکراد نبوده است، باز از آزادی داخلی و خودمختاری محروم نبوده‌اند.

اما راجع بقسمت پنجم، که آیا زبان کردی مخفف و یا مشتق از فارسی است یا اینکه زبان مستقلی است؟ : در مقدمه از اقوال و آراء مستشرقین، روشن کردیم که زبان کردی دارای تطورات قدیمی و حقیقی است و از زبان فارسی خیلی قدیم و کهنه‌تر است. و رابطهٔ خود را با اصل کردی قدیم بهتر از فارسی حفظ کرده است. اگر کسی به خوبی زبان کردی بداند و بخواهد به زبان کردی ساده رساله‌ها و بلکه کتابها بنویسد، بیست در هزار، محتاج استعمال واژهٔ بیگانه نخواهد شد. کسانی که در میان عشایر سیاحت کرده‌اند و زبان کردی را هم دانسته باشند، می‌دانند که واژه‌های صحیح کردی هیچ‌گونه مناسباتی با فارسی امروزه ندارد و میسر نیست ریشهٔ آنرا در فارسی پیدا کنند. ادبیات کردی با این عقب‌افتادگی، دارای علو و پایه‌ایست که هنوز زبان فارسی با این پیشرفتی که کرده است، فاقد آنست. و این لغات فارسی که در زبان کردی دیده می‌شود در اثر این است که در این چند قرن اخیر تحصیلات اکراد منحصر به عربی و فارسی شده بود. به ویژه که استعمال واژه‌های بیگانه در سالهای پیش، یک افتخار شمرده می‌شد و با این حال واژه‌های کردی هنوز به جای خود برقرار و از بین نرفته‌اند.

بعضی از نویسندگان دم از « امپراطوری زبان فارسی » می‌زنند ؛ دانسته نیست که این جمله یعنی چه ؟ امپراطوریت زبان فارسی چه معنی دارد؟ این جز اوهام و خیالات شاعرانه چیزی دیگر نیست؛ به فرض اینکه تمام دنیا به فارسی حرف بزنند، ولی فارسی‌زبانان بطوریکه لازم است استقلال سیاسی و اقتصادی نداشته باشند و یا در زیر چنگال بیگانه زبون باشند، چه سودی عاید آنان می‌شود. و آیا زبان آنها را، در ردیف ملل زنده قرار می‌دهد؛ نوشتن و خواندن دول آمریکای شمالی و زبان بومی آنها از حیث ادبیات به پایهٔ زبان فارسی نمی‌رسد. پس چرا تمام فارسی‌زبانان دنیا در زیر دست آنها می‌نالند؛ ؟! در اتحاد جماهیر شوروی حداقل به بیست زبان می‌نویسند و می‌خوانند و همگی رسمیت دارند؛ زبان فرانسه در دنیا رسمیت دارد و به قول آقایان دارای امپراطوریت است معهذا دولت فرانسه در برابر ارتش آلمان در مدت کمی از پا درآمد، ولی دولت اتحاد جماهیر شوروی پس از چهار سال جنگهای خونین آلمان را با این عظمت و اسلحه و مهمات که داشت از پا درآورد، و نام نازی و فاشیست را در عالم محو و نابود کرد.

بقیه در صفحهٔ بعد

بقیه از صفحهٔ قبل

## نویسندگان فارسی

و سرزمین روسیه و سایر دول اروپائی متصرفی آلمان [را] از چنگال خونخواران نجات دادند (= داد). و دولت ایران که نویسندگانش خیال تشکیل امپراطوری زبان فارسی را در سر می‌پروراننـد، نتوانست سه روز در برابر حملهٔ متفقین مقاومت کند!؛ پس بر ما واجب است از این خیالات و اوهام بی سر و ته، دست بکشیم و کوتاه‌ترین راه را در پیش گیریم ؛ که زودتر به سر منزل مقصود برسیم. امروز روزگار برق است، باید هر کاری را از کوتاه‌ترین راه آغاز کنیم ؛ کرد و ارمنی اگر به زبان مادری دانش بیاموزند، پنج سال در تحصیل پیش می‌افتند. مجبور کردن ملل غیر فارسی را، به اینکه به زبان فارسی بخوانند و بنویسند، به این می‌ماند که جنگاوران را مجبور کنند که در مقابل تانک و توپ و هواپیما و غیره که اسلحهٔ دنیای تازه می‌باشند، با شمشیر و تیر و کمان که اسلحهٔ عصر کهن می‌باشند، به دفاع برخیزند. اگر در این قسمت آزاد باشند چه زیانی به امپراطوریت خیالی زبان فارسی می‌رسد؟ ما اگر از حقایق تاریخی و از واژه‌های کردی و فارسی امروزه که علناً از هم جدا و بلکه مناسبت با هم ندارند، چشم بپوشیم و قبول کنیم که زبان کردی مخفف یا مشتق از فارسی است، خواهیم گفت که زبان فارسی در اثر نفوذ زبان عربی بی‌اندازه عقب و اکثر واژه‌های ویژهٔ خودش را از دست داده است. ولی زبان کردی به سادگی خود برقرار و واژهٔ بیگانه در آن نفوذ نکرده است. اگر هم کلمات بیگانه در زبان شهرنشینها استعمال شود، باکی نیست. زیرا که زبان عشایر و دهاتی‌ها به حالت خود پایدار است. پس بیائید مردانه زبان کردی را آزاد کنید، که ادبیاتش ترقی کند که شما نیز بتوانید واژه‌های از دست رفتهٔ زبان فارسی را در کردی جست‌وجو کرده و مورد استعمال قرار دهید. آن وقت می‌توانید بگوئید که ایرانیها دارای زبانی هستند که به تمام معنی ایرانی است.« ۱»

---

«۱» توضیح : در صفحهٔ قبل سطر ۲۷ بعد از کلمات «آمریکای ش مالی به زبان انگلیسی است» و صحیحش این است «نوشتن و خواندن دول متحدهٔآمریکای شمالی به زبان انگلیسی است و...»

به بۆنەی نەواقیساتی چاپی، ئەگەر کەموکورتییەکو چاو پێبکەوێ، لێمان ببوورن؛ خوامان پشتیوان بێت لە ژمارە ۲دا ڕەزایەتی خاتری خوێنەرە خۆشەویستەکان بەجێدێنین.

**ژمارە ۲[ی] ئاواتو لەبیرنەچێ بیخوێننەوە و سوودی لێوەرگرن.**

[دەقی ساغکراوەی لاپەڕەی ۲۰ - وێنەی ژمارە ۲۱]

## چاپخانەی (ژ.ک)، گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و تێبینییەک لە سەر ژمارەی کۆتایی گۆڤاری نیشتمان

لە بەشێک لە وتوویژ و نووسراوەکانی کاک «محەممەدی شاپەسەندی»دا، هۆی بنەڕەتی چاپ و بلاوکردنەوەی گۆڤاری «ئاوات»، بە گیرانی مامۆستا «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» داندراوە. کاک محەممەد دەڵێ: «ویستمان دوای ژمارە ٧ و ٨ و ٩ی گۆڤاری «نیشتمان» کە لە«تەورێز» چاپ دەبوو ، ژمارەکانی دوایی لە «مەهاباد» چاپ بکەین.»؛ پێشتریش دەڵێ: «مەکینەیەکی «نییۆ فۆلسکاب» و هێندێک «حەرف» (پیت)مان دەستکەوت و گوێستمانەوە بۆ «مەهاباد». پێش ئەوەی دەستبکەین بە چاپی ژمارەیەکی نوێ (لە گۆڤاری نیشتمان)، «زەبیحی» بەسەردا گیرا، پێم خۆش نەبوو چاپخانەکە بێئیش بمێنێتەوە، بە دەرفەتم زانی گۆڤارێک بە ناوی «ئاوات» چاپ و بلاو بکەمەوە».

لێرەدا منیش بەپێویستم زانی چەند بابەتی گرینگ روون بکەمەوە کە هەر کامیان بەچەشنێک گرێدراوی رووداوەکانی سەردەمی کۆمەڵەی ژ.ک و کۆماری کوردستانن.

یەکەم: هێنانی ئەو چاپخانەی کە کاک محەممەد باسی دەکا.

دووهەم: راستکردنەوەی هەڵەیەکی مێژوویی کە لە زۆر کتێب و سەرچاوەدا دووپات دەکرێتەوە، ئەویش رێکەوتی گیرانی مامۆستا «زەبیحی»یە. گرینگی ئەو روونکردنەوەش لە وەدایە کە بەشێک لە گرێ کوێرەکانی مێژووی سەردەمی دەسەڵاتی کۆمەڵەی (ژ.ک) و دامەزراندنی کۆماری کوردستان، بە گیران و تێکۆشانی بێوچان و ماندوویی‌نەناسانەی مامۆستا «زەبیحی»یەوە گرێدراوە. هۆیەکەش ئەوەیە کە مامۆستا «زەبیحی» کەسی دووهەمی ئەو کۆمەڵەیە بووە و زۆربەی هەرەزۆری کارەکانی ئەو کۆمەڵەیە بەتایبەت لە باری چاپەمەنییەکانەوە بە دەست و بیر و فکری ئەو جێبەجێ کراون.

سێهەم: روونکردنەوەیەک و تێبینییەک لە سەر گۆڤاری «نیشتمان»ی ژمارە ٧و٨و٩.

**هێنانی چاپخانە**

دوای ئەوەی کە بە ئاشکرا و بە نهێنی بڕیار درا کۆمەڵەی (ژ.ک) لاواز بکرێ، فەرمان درا چی دیکە ماوە بە کۆمەڵەی (ژ.ک) نەدرێ کە درێژە بە خەباتی نهێنی و ئاشکرای خۆی بدا. ئەو زەخت و فشارەش ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ لە لایەن رووسەکانەوە بە سەر کوردان دادەسەپێندرا. هۆیەکەشی ئەوە بوو کە کۆمەڵەی (ژ.ک) بۆ ئازادی و سەربەخۆیی کوردستانی گەورە خەباتی دەکرد و چالاکییەکانی زۆر بە دروستی و ڕێکوپێکی بۆ بووژاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد بەڕێوە دەبرد. بەرنامە و ئامانجەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە هەموو ژمارەکانی گۆڤاری «نیشتمان»دا بە ئاشکرا لە سەرووی گۆڤارەکەدا بە دروشمی «بژی کورد و کوردستانی گەورە» چاپ کراوە.

ساڵی ۱۳۲۳ بەرامبەر دەگەڵ ساڵی ۱۹٤٤ی زایینی، مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی لە«تەورێز» بە نهێنی خەریکی چاپی گۆڤاری «نیشتمان» بوون. لە بەهاری ساڵی ۱۳۲۳ کاک «سەدیقی حەیدەری» ڕادەسپێردرێ چاپخانە و هەموو کەلوپەلەکانی، تەنانەت «ئارم» و «کلیشە» و «پیت»ەکانی چاپی کۆمەڵەی (ژ.ک) وێڕای مامۆستا «زەبیحی» کە بەرپرس و نووسەر و هەمەکارەی گۆڤاری «نیشتمان» بوو، دەگەڵ خۆی بێنێتەوە «مەهاباد». مامۆستا «زەبیحی» بۆ ماوەی چەند ڕۆژان لە لایەن کۆمەڵەی (ژ.ک) دەسبەسەر دەکرێ؛ پاشان بە یارمەتی چەند کەس تا ڕوونبوونەوەی وەزعەکە، لەو جێگا تایبەتەی کە ئەوی تێدا دەسبەسەر کرابوو، نەجاتی دەبێ. مامۆستا «زەبیحی» بە ڕۆژ دەچووە باغی «سەعیدی حەمەقالە»ی تێکۆشەری بەناوبانگی کۆمەڵەی (ژ.ک) و شەوانەش دەچووە ماڵە «مەلا عەبدوڵڵای داودی» کە زەمانەتی کردبوو.

مامۆستا «زەبیحی» لەو ماوەیەدا کە لە «تەورێز» خەریکی چاپی ژمارە ۷ و ۸ و ۹ی گۆڤاری «نیشتمان» بوو، توانی ۱۲ لاپەڕە لە ۳۲ لاپەڕەی ژمارەی دوایی گۆڤاری «نیشتمان» لە ژێر چاوەدێری خۆیدا چاپ بکا. ئەو ۱۲ لاپەڕەی مامۆستا «زەبیحی» چاپی کرد لە هەموو بابەتێکەوە دەگەڵ ئەو ۲۰ لاپەڕەی کە لە «مەهاباد» چاپ کرا جیاوازی هەیە. ئەو ۲۰ لاپەڕەی دوایی کە لە «مەهاباد» چاپ کرا دەگەڵ ئەو ۱۲ لاپەڕەی چاپی «تەورێز» پێکەوە لە یەک بەرگدا بە ناوی ژمارە (۷ و ۸ و ۹) بە ۳۲ لاپەڕە بڵاو کرایەوە. دوای ئەو ژمارەیە مامۆستا «زەبیحی» بۆ

ماوەیەک لە لایەن کۆمەڵەی ژ.ک و ماوەی شەش مانگیش لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە دەگیرێ و چی‌دی ماوەی پێنادرێ «نیشتمان» چاپ و بڵاو بکاتەوە.

یەکەم گۆڕانکاری لەو ژمارەیەدا لە رووبەرگی گۆڤارەکەوە دەستی پێکرد. ئارمی تایبەت بە کۆمەڵەی (ژ.ک) کە بە پیتی «لاتین»ی «J.K» لە نێو هەتاوێکدا کە تیشکەکانی دەرخستووە چاپ کراوە، لابردرا و پاشان ناوی گۆڤارەکەش کە لە هەموو ژمارەکانی پێشوودا بە پیتی درشت چاپ دەکرا، چکۆلە کراوەتەوە. لە جیاتی ئەو نیشانە تایبەتەی کە باسمان کرد وشەی «الله» هاتووە و پاشان دوو پیتی «ژ»ێ و «ک»ێ بە پیتی عەرەبی لە نێو دوو ئەستێرەدا نووسراوە و رستەی «بژی کورد و کوردستانی گەورە»ش کە بە هەڵە وشەی «کورد» و «کوردستان»ەکەی بە دوو «و»ێ نووسراوە، لە ژێر دوو پیتی «ژ»ێ و «ک»ێدا چاپ کراوە. لە رووبەرگی ئەو نوسخەی کە لە تەورێز چاپ کرابوو ئەو رستەیە لە لای راست، لە سەرووی گۆڤارەکەدا بە شێوەی دروستی خۆی چاپ کراوە.

ئەگەرچی باسی ئێمە لەم بەشەدا تایبەت بە گۆڤاری «ئاوات»ە و لاوازکردنی کۆمەڵەی (ژ.ک) وتارێکی دووردرێژی تایبەتی پێویستە کە تا رادەیەک لە سەری دەدوێین، بەڵام لێرەدا هەر ئەو لایەنانەی باس دەکەین کە پێوەندیان بە دەرچوونی گۆڤاری «ئاوات»ەوە هەیە.

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» دەڵێ: «چاپخانەیەکمان وەدەستکەوت و...» لە کۆتاییش‌دا دەڵێ: «گۆڤاری «ئاوات»م پێ چاپ کرد» بەڵام وەکوو بۆمان دەرکەوێ ئەو چاپخانە هەمان چاپخانەیە کە گۆڤاری «نیشتمان» و «هاوار»(= هاواری کورد)ی پێ چاپ کراوە.

بە چاوخشاندنێک بەسەر لاپەڕەکانی ٧ و ٨ و ١١ و ١٨ی گۆڤاری ژمارە ٧ و ٨ و ٩ی «نیشتمان» و لاپەڕەکانی ١ و ١٥ و ١٧ی گۆڤاری «هاوار»(= هاواری کورد) و بەراوەردێکی نێوان ئەو لاپەڕانە دەگەڵ لاپەڕەکانی ٩ و ١٠ و ١٣ و ٢٠ی گۆڤاری «ئاوات»، بۆمان دەردەکەوێ وێکچوونێکی زۆر لە لاپەڕەی هەرسێک گۆڤاردا، بەتایبەتی لە بابەت رازاندنەوەی گۆڤارەکاندا بەدی‌دەکرێ. ئەو گوڵ و ئەستێرە و تەنانەت ئەو «پیت»انەی کە گۆڤاری «نیشتمان»ی پێ رازێندراوەتەوە و پێی چاپ کراوە، دروست هەمان شتە کە گۆڤاری «ئاوات» و «هاوار»(=هاواری کورد)ی

پێ چاپ کراوە. کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لە وتووێژێکدا کە رۆژنامەی «ئاڵای ئازادی» لەگەڵی پێکهێناوە، لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە: «یادگاریتان لەگەڵ «پێشەوا قازی محەممەد»دا هەیە؟» دەڵێ: «جارێکیان لەگەڵ قازی لە تەورێزەوە دەهاتین بۆ سابلاغ «مەنافی کەریمی»شمان لەگەڵ بوو. مەناف وەزیر بوو، لەو سەفەرەی کە «چاپخانەی کوردستان»مان لە «تەورێز»ەوە هێنا بۆ سابلاغ، لە رێگا ئوتۆمۆبیلەکەمان وەرگەڕا بەڵام بێزیان بووین».

کاک محەممەد لەو وتووێژەدا دەڵێ لەگەڵ [پێشەوا]قازی محەممەد و [کاک] مەنافی کەریمی «چاپخانەی کوردستان»مان لە تەورێزەوە هێناوە مەهاباد و هەروەها دەڵێ مەناف وەزیر بوو. هەر لە قسەکانی کاک محەممەد بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو چاپخانەی گۆڤاری «ئاوات»ی پێ چاپ کراوە، چاپخانەی کوردستان نەبووە، بەڵکوو هەر ئەو چاپخانە بووە کە کۆمەڵەی (ژ.ک) لە مەهاباد دایمەزراندبوو. بە هێنانەوەی ئەو کەرەسانەی کە لە «تەورێز» گۆڤاری «نیشتمان»ی پێ چاپ دەکرا، ئەو چاپخانە ئەوەندەی دیکەش بەهێز کراوە. بە چاوخشاندنێک بە سەر «رۆژمێری تایبەتی کۆمەڵەی (ژ.ک)» کە بۆ ساڵی ١٣٢٣ ئامادە کراوە، ئەو راستییەشمان بۆ روون دەبێتەوە.

لە رۆژمێری ئەو ساڵەدا ١٦ی رەشەمەی ١٣٢٣ بەرامبەر دەگەڵ رۆژی چوارشەممە ٧ی «مارس»ی ١٩٤٥ی زایینی بە «رۆژی بنیادی چاپخانەی ژ.ک» دیاری کراوە. کەوایە بە روونی بۆمان دەردەکەوێ کە گۆڤاری «ئاوات» هەر بە چاپخانەی کۆمەڵەی (ژ.ک) و ئەو کەرەسانەی لە «تەورێز»ەوە راگوێزرانە مەهاباد، چاپ کراوە. چونکە وەکی پێشتر گوتمان ئاوات لە ١ی خەزەڵوەری ١٣٢٤ چاپ کراوە و چاپخانەی ژ.ک هەشت مانگ بەر لە چاپکردنی «ئاوات» لە مەهاباد بنیاد نراوە.

ئەو چاپخانەیەش کە لە «تەورێز»ەوە بە یارمەتی شەخسی «پێشەوا قازی محەممەد» هاتۆتە مەهاباد، رووسەکان پێشکەشی حکوومەتی کوردستانیان کرد و یەکەم «رۆژنامەی کوردستان»ی لە ٢٠ی بەفرانباری ١٣٢٤ پێ چاپ کراوە.

مامۆستا هەژار سەبارەت بەو بابەتە لە لاپەڕە ٨٧ی «چێشتی مجێور»دا دەڵێ: «لە سەرەتای کۆمەڵی ژ.ک چاپخانەیەکی دەستی چکۆلەی هەرزانمان

کرێبوو. رووسان بە ناوی یارمەتی فەرهەنگی، چاپخانەیەکی گەورەیان داینێ کە رۆزنامەی پێ چاپ بکەن و بۆ هەر کارێ دەکاری بێنن. چاپخانە چکۆلەکە درا بە بۆکان. دەگەڵ «کاک حەسەنی قزلْجی» چەند نەشرە و نووسراوەمان پێ چاپ کرد و گۆڤاری هەڵاڵەمان دەرخست و هەوەڵ ژمارەمان بۆ پێشەوا برد. تۆنێک کاغەزی خەڵات کردین.»

**گیرانی مامۆستا «زەبیحی» لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە**

سەبارەت بە گیرانی مامۆستا «زەبیحی»، هەروەک لە نووسراوەکەی کاک «محەممەدی شاپەسەندی»دا هاتووە دەڵێ: «دوای گیرانی «زەبیحی» پێم خۆش نەبوو چاپخانەکە بێئیش بمێنێتەوە، بە دەرفەتم زانی گۆڤارێک بە ناوی «ئاوات» چاپ و بڵاو بکەمەوە.»

لەبەر ئەوە منیش بە دەرفەتم زانی ئەو هەڵەیەی کە لە زۆربەی کتێب و نووسراوەکاندا سەبارەت بە گیرانی مامۆستا «زەبیحی» وەبەر چاو دەکەوێ و زۆربەیان لە کتێبەکەی «سەرلەشکر زەنگەنە» وەرگیراون، راست بکەمەوە. هۆی ئەو روونکردنەوەش لەبەر ئەوەیە کە پێوەندی راستەوخۆی لەگەڵ دەرچوونی گۆڤاری «ئاوات» و مێژووی (ژ.ک) و لەپاشان هەڵەی نووسراوەکەی «سەرلەشکر زەنگەنە»وە هەیە.

سەرلەشکر زەنگەنە لە لاپەڕە ٦١ و ٦٢ی کتێبی «خاطراتی از مأموريت‌هاى من در آذربايجان از شهريور ١٣٢٠ تا دى‌ماه ١٣٢٥»دا دەڵێ: «لە سەرەتای مانگی خەزەڵوەریساڵی ١٣٢٤ پێیان راگەیاندین کە لێژنەیەکی تەبلیغاتی حیزبی کۆمەڵە [ی ژ.ک]ی مەهاباد و قازی محەممەد بەرەو ورمێ بەڕێوەن تا لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەی ورمێ پێوەندی بگرن و وتووێژ بکەن و ئەوانیش وەک خۆیان بۆ سەرەڕۆیی هان بدەن. لەقسان بەڵگە و سەنەدێکی زۆریشیان پێیە و بڕیار وایە لێژنەکە بچنە ماڵە «زێڕۆ بەهادوری» و (لە کوردە تێکدەرەکانی عێراقی) لە «کۆکیا» دانیشتنەکە لە ماڵە ئەو بکرێ... (کۆکیا ناوی گوندێکە لە مەحاڵی «باڵانیش» کە زێڕۆ بەهادوری لەوێ نیشتەجێیە)». پاشان دەڵێ: «ئەوان

نادەنێ و لە نێو ماشێنەکەوە تەقە لە ژاندرمەکان دەکرێ. بە بەرزبوونەوەی دەنگی تەقە، ماشێنەکە گەمارۆ دەدرێ و دانیشتووانی نێو ماشێنەکە خۆ بەدەستەوە دەدەن. دانیشتووانی نێو ماشێنەکە بێجگە لە دوو چەکدار کە لە لایەن ئەوانەوە تەقە کرابوو، سێ کەس لە تێکۆشەرانی حیزبی کۆمەڵەی مەهاباد بوون کە بریتین لە: عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی و دڵشادی ڕەسووڵی و قاسمی قادری. («عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» و «دڵشادی ڕەسووڵی» کە هەڵاتوون و ئێستا لە عێراقن).

لە نێو ماشێنەکە چەمەدانەکانیان و هەشت نامە وەدەست کەوت کە دەبوو نێوانی «قازی محەممەد» و «میرجەعفەر باقرۆف»، سەرۆککۆماری «ئازەربایجانی شووڕەوی» بە هۆی کۆنسوولی شووڕەوی لە «ورمێ» بگۆڕدرێنەوە. نامەکان بە زمانی کوردی نووسرابوون. لە یەکێک لە نامەکاندا کە کرا بە فارسی، قازی محەممەد باسی ئەو سەفەرەی «باکۆ» و هەروەها دیداری لەگەڵ گەورە بەرپرسانی شووڕەوی و وتوویژی دۆستانەی نێوانیان دەکا و لەبەر ئەو وەعدانەی کە دابوویانێ و هیچیشیان وەدینەهاتن، داخ و کەسەری خۆی دەربڕیوە. لە نامەکانی دیکەدا داوای چەک و تەقەمەنی بۆ ڕاپەڕینی کوردەکان بە دژی دەوڵەتی ناوەندی «ئێران» دەکا و داوای تەواوکردنی دەزگاکانی بەهێزکردنی رادیۆ و ناردنی کاغەز بۆ ڕۆژنامە و تەبلیغات و دامەزراندنی چاپخانە و شتی دیکە دەکا.

گیراوەکانم لە ژێر چاوەدێریدا ناردنە ورمێ و ڕووداوەکەم بە بنکەی «ئەڕتەش» ڕاگەیاند و داوای کەرەسەی پێویستم بۆ ڕاگوێستنیان لە بەندەری «شەڕەفخانە» کرد هەتا بێڕاوەستان بیانبەنە «تەورێز» و لەوێشەوە بۆ ناوەند. (چونکە ئەگەر هاتباو وەدرەنگێ کەوتبا، «شووڕەوی»یەکان دەیانزانی چ ڕووی داوە و بێشک خۆیان تێهەڵدەقوتاند و نەیاندەهێشت بەڕێ بکرێن.) گیراوەکانم بەپەلە ناردە بەندەری «گوڵمانخانە» و لەوێشەوە بە کەشتی ناردمنە بەندەری «شەڕەفخانە» و لەوێشڕا بە کەرەسەیەک کە لە لایەن بنکەی ئەڕتەش دابین کرابوو، ناردمنە تاران و بە بنکەی ئەڕتەش ئەسپێردران؛ بەڵگە و سەنەدەکانیشم بە «ئیستوار»ێکدا کە جلی کۆنی شوانانی دەبەر کردبوو، لە ڕێگای مەهابادەوە ناردە تاران. دوای ٤٨ سەعاتان گەیشتبووە بنکەی ئەڕتەش. بەڵگە ناوبراوەکان

دواتر لە «شووڕای پاراستنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان» بە قازانجی ئێران کەلکی لێوەرگیرا»

لاپەڕە ١٧ی گۆڤاری «ئاوات» لە بەشە فارسییەکەیدا دەنووسێ: «چەند مانگ لەوەپێش سێ کەسی خەڵکی مەهاباد کە بۆ کاری خۆیان دەچوونە ورمێ، لە لایەن ژاندرمەکانی «باڵانیش» دەگیرێن و یەکسەر دەیاننێرنە تاران و ئێستا لە «قەسری قاجار» زیندانین و پرسیاریان لێنەکردوون کە بە چ تاوانێک زیندانی کراون.» نووسەری ئەو بەشەی گۆڤاری «ئاوات» بەئانقەست نایهەوێ بڵێ ئەوانە ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوون هەتا بۆ دەوڵەت ئاشکرا نەبێ و وابزانن خەڵکی ئاسایین، بەڵام ئەوان لەمێژ بوو بۆ دەوڵەت ناسرابوون.

وەک دەزانین گۆڤاری «ئاوات» لە یەکی خەزەڵوەری ١٣٢٤ چاپ کراوە و سەبارەت بە گیرانی ئەو سێ نەفەرە دەنووسێ «چەند مانگ لەوەپێش لە «باڵانیش» گیراون.» مانگی خەزەڵوەر بەرامبەرە لەگەڵ مانگی «ئابان». لێرەدا هەڵەیەکی کتێبەکەی سەرلەشکر زەنگەنە ئاشکرا دەبێ. چۆن دەکرێ سێ نەفەر بە قسەی «سەرلەشکر زەنگەنە» مانگی «ئابان»ی ساڵی ١٣٢٤ گیرابن، گۆڤاری «ئاوات»یش کە دروست لەو مانگەدا و هەر لەو ساڵەشدا دەرچووە، هەواڵی گیرانی ئەوان بە ‹چەند مانگ لەوەپێش› بڵاو بکاتەوە؟!

کاک «عەلی کەریمی» لە لاپەڕە ٢٩ی کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی»دا دەقی ڕۆژنامەی «کوردستان»ی ژمارە ١٤ی ساڵی یەکەم، چوارشەممە ٢٤ی ڕێبەندانی ١٣٢٤، کە مزگێنی هاتنەوەی ئەو سێ کەسەی داوە، بەو شێوە نووسیوەتەوە:

«مزگێنی!! وەڵام گەیشتووە کە سێ کەس ئازادیخوای ئێمە: «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» و «دڵشاد [ڕەسووڵی] » و «قاسم قادری» کە هەشت مانگ لەمەوبەر لە لایەن کاربەدەستانی فاشیستمەئابی ئێرانی بەناحەق بە دیل گیران و یەکسەر بردنیانە تاران، لە حەمدی خودا دەگەڵ ئازادی ئێمە ئەوانیش ئازاد کراون و ئەم ڕۆژانە خزم و کەس و برایان بەوان شاد دەبن.»

دیسان لە لاپەڕە ١٠٦ی سەرچاوەی پێشوو، دەقی ڕۆژنامەی «کوردستان»ی ژمارە ١٩ - ڕۆژی ٦ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ی هێناوە کە دەنووسێ: «...

«عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» و «دڵشاد» کە لەپێش‌دا وەڵامی ئازادبوونی ئەوانمان دابوو، بە شانازییەکی زۆر شەوی ٣ی ١٢ی ١٣٢٤ واریدی ماڵە خۆیان بوون و چاوی برا و ئازادیخوایەکان و کەس‌وکاریان پێڕوون بوو. برا «قاسمی قادری» لەبەر زەعفی میزاج چەند ڕۆژێک لە بیمارستانی شووڕەوی لە تەورێز دەمێنێتەوە ئەم ڕۆژانە بە هومێدی خودا دەگەڕێتەوە. لە خودا دەخوازین برا و کەس‌وکاری ئەم خۆشەویستانە هەمیشە بە یەکتر شاد و دڵخۆش بن.»

مامۆستا «هەژار»یش لە ڕۆژنامەی «کوردستان»ی ژمارە ٢٦ی ساڵی یەکەم، دووشەممە ٢٧ی ڕەشەمەی ١٣٢٤دا بەبۆنەی ئازادبوونی ئەو چەند کەسە شێعرێکی نووسیوە کە دوای تاریف‌کردنی مامۆستا «زەبیحی» و کاک «دڵشادی ڕەسووڵی» و کاک «قاسمی قادری» دەڵێ:

«ئێوە خۆتان نا لە پێناو میللەت — بۆ ئێمە دیتوو ئازار و زیللەت
پێتان دڵخۆشە دایکی نیشتمان — ڕووسوورن لە ڕاست ناموس و ویجدان
کۆتاییو نەکرد بۆ سەربەرزی گەل — بەڵان ڕووی ڕەش‌بێ لێی‌قرانەدن قەل
قڕەی قەل ئێوەی خستە زیندانێ — ئەوەش ئینتیقام دەردی دەزانێ»

کە ئەو شێعرەش بەشێک لە نووسراوەی کتێبی «سەرلەشکر زەنگەنە» دەسەلمێنێ کە دەڵێ: «پێیان‌ڕاگەیاندین کە لێژنەیەک لە کۆمەڵەی (ژ.ک) بەرەو ورمێ بەڕێوەن... .»

وادیارە مامۆستا «هەژار» ئەگەر دەڵێ «قڕەی قەل ئێوەی خستە زیندانێ» هەر مەبەستی لەوەیە کە گیرانی ئەو چەند کەسە بەهۆی ڕاپۆرت بووە، لەپاشان دەڵێ: «ئەوەش ئینتیقام دەردی دەزانێ»، لە کتێبی «چێشتی مجێور» لاپەڕە ٦٨یش‌دا دەڵێ: «عیسازادە ناوێک بوو کە لە زەمانی «پەهلەوی» شەیتانی لە خەڵک دەکرد و «زەبیحی» و «فاڕووقی» بەگرتن دا... بە ئەمری حیزب کتێبخانەکەی تالان کرا.» ڕۆژنامەی کوردستان دەڵێ: «زەبیحی و دڵشادی ڕەسووڵی و قاسمی قادری هەشت‌مانگ لەمەوبەر...» یانی هەشت مانگ پێش دەرچوونی ڕۆژنامەی کوردستان گیراون؛ کە هەشت مانگ پێش دەرچوونی ژمارە

١٤ی رۆژنامەی «کوردستان» کە لـە ٢٤ی رێبەنـدانی ساڵـی ١٣٢٤ چـاپ کـراوە، دەکەوێتە مانگی سێهەمی بەهار واتە جۆزەردانی ساڵی ١٣٢٤.

بە بەراوەردێکی نێوان نووسراوەی رۆژنامـەی «کوردسـتان» و قـسەکانی «سەرلەشکر زەنگەنە» چەند هەڵەی زەق وەبەر چاو دەکەون:

یەکەم: «سەرلەشکر زەنگەنە» دەڵێ: «بێجگە لـە «زەبیحـی» و «دڵـشادی رەسووڵی» و «قاسمی قادری»، ماشێنەکە دوو چەکداری دیکەشی تێـدا بـوو کـە تەقەیان لێکردین.» کەچی تەنیا سێ نەفەریان رادەستی بنکەی ئەرتەش لە تاران دەکا و باسی چارەنووسی دوو چەکدارەکەی دیکە ناکا.

کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» سەبارەت بەو دوو نەفـەرەی دیکـە دەڵـێ: «ئەو دوو نەفەرە یەکیان «قادری تەوەککول» و ئەوی دیکەشیان «سەعیدی قۆپی» بوو. ئەگەرچی ئەو دووانەش هەر ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوون، بـەڵام چونکـە بەڵگەکان بەوان نەبووە یا مامۆستا «زەبیحی» و هاورێیانی پێـشتر وەئەسـتۆی خۆیان گرتووە، ئەو دوو نەفەرەیان ئازاد کـردووە.» جـا مـەعلووم نییـە چـۆن دەکرێ ئەو دوو نەفەرە تەقەشیان کردبێ و ئازادیش کرابن؟! لێرەدایـە کـە روون دەبێتەوە مەبەستی سەرەکی راپۆرتدەر و ژاندرمەکان هەر ئەو سێ نەفەرە بن کـە رۆژنامەی «کوردستان» هەواڵی ئازادبوونیانی داوە، دەنا بەو حیسابە دەبوونـە پێنج کەس.

دووهەم: دیارە ئەو نامانەی «سەرلەشکر زەنگەنە» باسـیان دەکـا هـەموو ساختەگین. بۆ نموونە دەڵێ: «هەشت نامە وەدەست کەوت کە دەبوو نێوانی قازی محەممەد و میرجەعفەر باقرۆف و... بە هۆی کۆنـسوولی شـوورەوی لـە ورمـێ بگۆردرێنەوە. نامەکان بە زمانی کوردی نووسرابوون.» کە ئەوەش دیـارە راسـت نییە چونکە ئەگەر بریار بایە نامەیەک راستەوخۆ بدرابا بە کۆنسوولی رووسـیا لە ورمێ یا لە هەر کوێیەک، بە کوردی نەدەنووسرا یا بـە کـوردیش نووسـرابا دەقی وەرگێردراوی رووسی یا تورکییەکەی دەگەڵ دەبوو. نووسەر لە جێگایـەکی دیکەدا دەڵێ: «لە نامەیەکیاندا «قازی محەممەد» داوای چاپخانەی لـە دەوڵـەتی

«سەرلەشکر زەنگەنە» دەبێ هاوکات بێ لەگەڵ گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی لە ئابانی ١٣٢٤، کە ئەو بابەتەش بە ئاوڕدانەوەیەک لە ڕۆژنامەی «کوردستان»ی ئەوسەردەمی روون دەبێتەوە.

کاک «نەوشیروان مستەفا ئەمین» لە کتێبی «حکوومەتی کوردستان» لاپەڕە ١٥٤دا دەقی رۆژنامەی ٢٠ی ١٠ی ١٣٢٤ی هێناوە کە دەڵێ: «رۆژی ٢٠ی ١٠ی ١٣٢٤، سەعات ٥ی پاشنیوەڕۆ ئیدارەی رۆژنامە و گۆڤاری «کوردستان» بە موناسەبەتی کردنەوەی ئیدارە و بلاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی «کوردستان» جێژنێکی بەشەوکەت گیرا...»

پرسیارەکە لێرەدایە کە ئایا دەکرێ مانگی ئابان (خەزەڵوەر)ی ١٣٢٤ مامۆستا «زەبیحی» نامەیەکی پێبووبێ کە لەودا داوای ناردنی چاپخانە کرابێ و بڕیاریش بێ ئەو نامە و چەند نامەی دیکەش بیگەیەنێتە دەستی کاربەدەستانی شووڕەوی لە کۆنسوولخانەی ورمێ و لەوێشەوە بیگەیەنێتە شووڕەوی، نامەکە و هەڵگری نامەکەش هەشت مانگ گیرابن و دوای گیران و نەگەیشتنی نامەکەش بۆ شوێنی مەبەست، چاپخانەکە گەیشتبێتە مەهاباد؟!

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لە بەشێکی دیکە لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێ: «دوای ئەوەی گۆڤاری «ئاوات»م چاپ کرد، هەر دوای بلاوبوونەوەی لە لایەن (ژ.ک) بە هۆی کاک محەممەدی یاهوو کە یەکێک لە دامەزرێنەرانی (ژ.ک) بوو، داوایان لێکردم بچمە لایان. لەوێ لێیان پرسیم بۆ بێپرسی ئەوان «ئاوات»م بلاو کردۆتەوە و نەدەبوو بلاوم کردباوە.» پاشان دەڵێ: «هێندەی پێنەچوو بانگیان کردم بۆ ناوەندی (ژ.ک) و گوتیان «چاپخانەی کوردستان» گەیشتووە و داوایان لێکردم دەست لە هەموو شتێک هەڵبگرم و خۆم تەرخان بکەم بۆ «چاپخانەی کوردستان» کە لە سۆڤیەتەوە بۆمان هاتبۆوە؛ لەم کاتەدا هێشتا حیزبی دێموکڕات دانەمەزرابوو.» کە ئەو قسانەی کاک «محەممەد» دەگەڵ ئەو وتووێژەی کە دەگەڵ رۆژنامەی «ئالای ئازادی» پێکی هێناوە، یەکتر ناگرنەوە، چونکە لەوێ دەڵێ: «ئەمن و «قازی» و «مەنافی کەریمی»، چاپخانەی «کوردستان»مان لە تەورێزەوە بە ماشێنی خۆمان هێنا و ئەوکات «مەنافی کەریمی» وەزیر بوو.» کەچی لێرە دەڵێ: «دوای چاپی گۆڤاری «ئاوات» هێندەی

پێنەچوو بانگیان کردم بۆ ناوەندی (ژ.ک) و گوتیان «چاپخانەی کوردستان» گەیشتووە و... .» کە ئەوەش ئەو قسەیەمان دەسەلمێنێ کە دەڵێین «ئاوات» لە چاپخانەی کۆمەڵەی (ژ.ک)دا چاپ کراوە. کاک حامیدی گەوهەری لە لاپەڕە ١٤٧ی کتێبی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان»دا پاش ئەوەی باسی گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی دەکا دەڵێ: «ڕەحیمی زێهتابفەر لە لاپەڕە ٢٠٧ی کتێبی خۆیدا بە ناوی «خاطرات در خاطرات» نامەیەکی ڕۆژی ٥ی سەرماوەزی - ٢٦ی «نوامبر»ی ١٩٤٥، «زەبیحی» و هاڤاڵانی چاپ کردووە کە بۆ «قازی محەممەد»یان نووسیوە: «نەمانتوانی لەگەڵ سەرتیپ درەخشانی پێکبێین و یەکێتی لەگەڵ دامەزرێنین.» کە ئەوەش وێناچێ ڕاست بێ چونکە هەر بەپێی قسەی «سەرلەشکر زەنگەنە»ش بێ، مامۆستا «زەبیحی» و دوو هاوڕێیەکەی لە مانگی خەزەڵوەر گیراون نەک سەرماوەز، کەوایە چۆن دەکرێ مانگێک دوای گیرانی بڵێ نەمانتوانی فڵانە کارەی بکەین؟! دوکتور «عەزیزی شەمزینی» لە لاپەڕە ١٦٢ی کتێبی «جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان»دا دەڵێ: «دوای ئەو گۆڕانکارییانە ڕووداوی تر هاتە پێش، دەوڵەت «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» و «محەممەد دڵشاد»ی گرت و بە دەسبەسەری ڕەوانەی تارانی کردن. ئەوان تا ساڵی ١٩٤٦ لەوێ مانەوە؛ کۆمەڵانی خەڵکی مەهاباد بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە بڕیاریاندا پەلاماری فەرمانبەرە ئێرانییەکانی ناو شار بدەن و وەک بارمتە ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن و بەمجۆرە دەوڵەت ناچار کەن «زەبیحی» و «دڵشاد» ئازاد کا، بەڵام قازی دەرفەتی ئەم کارەی نەدا و فەرمانبەرە ئێرانییەکانی بێزیان لە مەهاباد دەرباز کرد. ئەو دەیویست مەسەلەکە بە بێ زەبروزەنگ چارەسەر بکرێ.» «سەرلەشکر زەنگەنە»ش سەبارەت بە ڕووداوی هێرش کردنە سەر دامودەزگاکانی دەوڵەت لە لاپەڕە ٥٩ و ٦٠ی کتێبەکەیدا دەڵێ: «لە مانگی خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ پادگانی نیزامی لە مەهاباد نەبوو، شەڕخوازەکانی مەهاباد بە پشتیوانی شووڕەوی سەربزێوییان دەسپێکرد، تا ئەو جێیەی کە ڕۆژی ٢٦ی١١ی١٣٢٣ هێرشیان کردە سەر شارەوانی مەهاباد و چەند پاسەوانیان کوشت و شارەوانی مەهابادیان بە تالان برد.» بەڵام وا دیارە ئەو ڕووداوە

رووداوە گێراون. ئەوانە هەموو لە لایەک و راپۆرتێکی کتێبی «چپ در ایران بە روایت ساواک» بەرگی یەکەم کە لە لایەن ناوەندی لێکۆڵینەوەی بەڵگە مێژووییەکان لە «وەزارەتی ئیتلاعات» چاپ کراوە لە لایەک، هەڵەکانی «سەرلەشکر زەنگەنە» ئاشکرا دەکەن. لاپەڕە ٤ و ٥ی ئەو کتێبە گێرانی مامۆستا «زەبیحی» و دوو هاوڕێیەکەی بەو چەشنە باس کردووە و دەنووسێ: «راپۆرتی ٨ی١٠ی١٣٢٦ - لە ٢٧ و ٢٨ی ئابانی ئەمساڵ [خەزەڵوەری ١٣٢٦] دوو نەفەر «زەبیحی» و «ئەفشاری رەسوولی» (دڵشادی رەسوولی) چوونە مەهاباد و ماوەیەک لەوێ لە گەڕەکی «ڕزگەیان» نیشتەجێ بوون. تێکۆشانی ئەوان بەو جۆرە بووە کە لە تەواوی لێژنەی لاوەکانی مەهاباد و هێندێک لەو کەسانەی ناسیویانن و بڕوا و متمانەیان پێیان بووە، بەڵگەیەکیان وەرگرتووە کە ناوەرۆکی لاپەڕەکە لە ژێر ناوی رێکخراوەی وڵاتانی یەکگرتوو بووە. تێبینییەکی تێدا نووسراوە کە ئەوە دەگەیەنێ کە «محەممەدعەلی نیک»ناوێک لە هەمان کاتدا کە لە رێکخراوەی وڵاتە یەکگرتووەکاندایە بۆ تەواوی ئێمە و گەلی کورد نوێنەری راستەقینەیە و ئەگەر دژی ئەو تێلگرافێک لێدرابێ لە لایەن ئێمە ئازادیخوازان نەبووە. لە راستیدا هۆیەکەی ئاشکرایە، ناوبراوان دوای وەرگرتنی ئەو لاپەڕە لە مەهاباد وەدەرکەوتوون. بابەتێکی دیکە کە لێیان دەگێڕنەوە ئەوەیە کە لەقسان بۆخۆیان گوتوویانە کە ئێمە ئەو تێکۆشانە بە یارمەتی بریتانیا دەکەین و پارەیەکیشمان دەدەنێ... ئەوان کەسانێکن کە لە دامەزرێنەرانی حیزبی کۆمەڵەی پێشوو [ژ.ک] بوون و لە ساڵی ١٣٢٤ کە بەڵگەیەکی زۆریان پێبووە و ویستوویانە بڕۆنە تورکیا لە لای مەئموورانی لەشکری ٤ی «ورمێ»وە دەگیرێن و دەنێردرێنە تاران و ماوەیەک لە تاران زیندانی دەبن هەتا دوایە لە کاتی دەسەڵاتی دێموکراتەکان ئازاد دەکرێن و دەچنەوە مەهاباد و دیسان لە کاتی چوونەوەی هێزی حکوومەتی ناوەندی بۆ مەهاباد، رادەکەنە عێراق، بەڵام بێگومان لەگەڵ کۆنسوولگەری شووڕەوی پێوەندی راستەوخۆیان بووە...» لە لاپەڕە ٤ و ٥یشدا لە پەراوێزی ئەو راپۆرتەی کە لە دژیان دراوە دەڵێ: «راپۆرتی شارەوانی ئەوکات سەبارەت بەو کەسانەی لەو بەڵگەدا باسمان کردن بەو جۆرەیە: بەرنووس: راپۆرتی کۆتایی ورمێ.

ڕێکەوتی ٥ی١٢ی٢٦ ژمارە ٣٧١٠ - شارەوانی گشتی وڵات بە ژمارە ٢٦٨٥ ڕێکەوتی ٢٦ی١١ی١٣٢٦ بە پشکنینی دەفتەرەکانی خۆی هیچ ئاسەوارێکی لەسەر پێشینەی «زەبیحی» و «ئەفشار» (دڵشاد)ی ڕەسووڵی وەدەست نەهێنا. بەپێی نامەی بنکەی لەشکری ٤، سەبارەت بە گیرانی ناوبراوان لە ساڵی ١٣٢٤، لە سنووری تورکیا هیچ پێشینە و بەڵگەیەک نییە؛ بەڵام لە سەروبەندی ساڵی ١٣٢٤ دوای کوشتنی چەند کەس و تاڵانی شارەوانی مەهاباد دوو کەسی ناوبراو بە هۆی پێوەندی گرتن بە «زێرۆ بەهادوری» و سەرۆک عەشیرەکانی دەوروبەری «ورمێ» و گەیاندنی فەرمانی «قازی محەممەد» و گەیاندنی چەند پاکەت، بەچەکەوە لە مەهاباد بەرەو دەوروبەری ورمێ هاتوون، ‹کاتی گەڕانەوە› لە ڕێگادا بە هۆی مەئموورەکانی ژاندەرمەرییەوە دەگیرێن و لە خەتی «تەورێز»ەوە دەنێردرێنە تاران و بەینێک زیندانی دەکرێن و لە ئاکامی هەوڵەکانی «سەدری قازی» ئازاد دەکرێن. بەپێی زانیاری «زەبیحی» لە سەرماوەزی ١٣٢٥، کاتی هاتنەوەی هێزی حکوومەتی ناوەندی ڕادەکاتە عێراق و جارێ لەوێیە، بەڵام لە شوێنی ئێستای ئەفشار (دڵشاد)ی ڕەسووڵی زانیارییەک وەدەست نەکەوتووە.»

هەروەک دەزانین ئەو کتێبەش چەند خاڵی گرینگی ئاماژە پێکردووە کە پوختەی ڕاپۆرتەکە ئەویە: لە سەروبەندی ساڵی ١٣٢٤ ‹کاتی گەڕانەوە› لە ورمێ ئەو چەند کەسە دەگیرێن، (هەڵبەت ناوی کاک «قاسمی قادری»ش لەبیر کراوە) پاشان بە هەوڵەکانی «سەدری قازی» ئازاد کراون.

کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» سەبارەت بە گیرانی ئەو سێ کەسە دەڵێ: «دوای ئەوەی بۆ ماوەیەک لە لایەن (ژ.ک)ەوە مامۆستا «زەبیحی» دەسبەسەر دەکرێ هەر دوای چەند ڕۆژ کە لەو بارودۆخە ڕزگاری دەبێ، مەئموورییەتێکی دەدرێتێ کە لەگەڵ کاک «قاسمی قادری قازی» و کاک «دڵشادی ڕەسووڵی» بۆ تەبلیغات و ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) بچنە ورمێ و دەوروبەری؛ بەڵام لە پۆستی «زێرۆبەگی بەهادوری» لە «باڵانیش» لە لایەن «سەرلەشکر زەنگەنە»وە دەگیرێن. هەر دوابەدوای گیرانی ئەو چەند کەسە، «قازی محەممەد» سێ کەسی لە لایەن شووڕای ناوەندی کۆمەڵەی (ژ.ک) ناردە لای «سەرلەشکر زەنگەنە» کە ئەو سێ کەسە بریتی بوون لە: ١- «مامەغەنی خوسرەوی» (سەرۆکی

«ئەوقاف» ٣- «مەلا قادری مودەڕڕیسی» (مامۆستا و بەرپرسی ئیدارەی غەللـە». ئەو سێ کەسە هەرسێک ئەندامی رەسمی، بەڵام نهێنی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوون کـە بە ئامانجی رزگارکردنی ئەو چەند کەسە، چوونـە لای «سەرلەشکر زەنگەنـە»؛ ئەو چوونەش بۆ دوو ئامانج پێکهات، یەکەم: ئەوە کە رەنگبوو کۆمەڵـەی (ژ.ک) و خەڵـکی مـەهاباد دژکردەوەیـەک لـە خۆیـان نیـشان بـدەن، بـۆ نموونـە کارمەندەکانی ئێرانی بە بارمتە بگرن کە هێشتا هـەر لـە نێـو شـاری مـەهاباد مابوون، دووهەم: ئازادکردنی ئەو سێ کەسە گیراوە. پێشەوا قازی محەممەد لـە نامەیەکی تایبەتدا کە بۆ «زەنگەنە»ی نووسیبوو، ئەو سێ کەسەی بـە عینـوانی هەیئەتی خێرخوازی (حوسنی نییەت) مەهاباد ناساندبوو و داوای لە سەرلەشکر زەنگەنە کردبوو رێگایەک بۆ چارەسـەری گـرفتی گـیرانی ئـەو چەنـد نەفـەرە بدۆزێتەوە. ئەویش لە وەڵامێکی تەشریفاتیدا بە نوێنـەرەکانی پێـشەوا دەڵـێ: «بەداخەوە درەنگ هاتوون، چونکە ژاندەرمەری بـە بـێ پرسـی ئـەو، ئـەوانی رادەستی تاران کردووە.» لەقـسان نامەیەکیـشی بـۆ پێـشەوا قـازی محەممـەد نووسیوە کە لـەودا دوای تـاریف و پێداهەڵـگوتنێکی زۆر بەسـەر کـوردانDا کـە «ئاریایی» رەسەنن و مـەهابادیش زۆر «شاپەرەسـت» و گـەلدۆسـتن، تـاریفی کەسایەتی قازی محەممەدی کردووە و هیواداری کردووە کە بەپەلـە کارێـک بـۆ ئازادکردنی ئەو چەند کەسە دەکا. بەڵام لە دواییدا روون بۆوە کـە هـەموو ئـەو قەول و قەرارانەی «زەنگەنـە» درۆ و دەلەسـە بـوون و هـەر بۆخۆشـی ئـەوانی ناردبوونە تاران و بە ستادی ئەرتەشی ئەسپاردبوون.» مامۆسـتا «ئـەییووبیان» لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «پاش ماوەیەک کۆماری کوردستان راگەیەندرا. لـە بەرەی شـەڕی نێـوان ئەرتەشـی ئێـران و کۆمـاری کوردسـتان لـە سـەقز کـە بارزانییەکان سەنگەریان گرتبوو، شەڕێک روویدا کـە لـە ئاکـامدا دیلێکـی زۆر کەوتە بەر دەستی ئەرتەشی کوردستان. لە دواییدا مامۆستا «زەبیحـی» و کـاک «دڵشادی رەسووڵی» و کاک «قاسمی قادری قازی»دەگەڵ ئەو دیلانە ئاڵوگۆڕیـان پێکرا و ئازاد کران.»

خەریکی تایپی ئەو نووسراوانە بووم کە خودا یار بوو و بە پرسـیار کـاک «قادری تەوەککول»م پەیدا کـرد و چوومـە خزمـەتی. کـاک قـادر یـەکێک لـەو کەسانەیە کە ئەو رووداوەی ئاگا لێیە و زانیاری وردیشی لەو بارەوە هەیـە. بـۆ

ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەو باسانە و وەدەسهێنانی زانیاری زیاتر ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ١٦ی٢ی١٣٨٥ (٦ی مەی ٢٠٠٦) ئەم وتووێژەم لەگەڵ پێکهێنا کە لێرەدا دەقی تەواوی بە بێدەسکاری دەنووسمەوە.

چۆنیەتی مەئموورییەتەکە: «بە هۆی کابرایەک کە بە «وەهابی شیرنێ» مەشهوور بوو و لە ناو کۆمەڵەی (ژ.ک)دا کاری دەکرد، خەبەرم پێدرا بچمە دەفتەری (ژ.ک). لەوێ گوتیان دەبێ لەگەڵ مامۆستا زەبیحی و کاک قاسمی قادری و محەممەد دڵشاد و برایەکی کاک سەعیدی قۆپی کە ناویم لە بیر نەماوە، بچمە مەئمووریيەتێک. کاتێک خەبەرەکەیان پێڕاگەیاندم لە ماڵێ کەس نەیزانیبوو، پووڵ و پارەشم پێنەبوو. هەر زوو چوومە کووچەباغی عەزیزئاغا و لە کاک قاسمی قادری ئیجازەم وەرگرت و گوتم مامە قادر ئیزنم بدە بچمەوە ماڵێ ، هیچ پووڵم پێ نییە. کاک قاسم گوتی باشە بڕۆ بەڵام لای کەس باس مەکە. منیش گوتم ئێوە بڕۆن من بە ماشێنێکی دیکە خۆم دەگەیەنمە ئێوە. ئەو چوار کەسە ساز بوون، ماشێنێکی فۆڕدی ڕەشیان پێبوو. ئەوان ڕۆیشتن و من چوومەوە ماڵێ و پاشان بە سواری ماشێنێکی گەورە کە باری پێبوو وەڕێکەوتم و لە سەربانەکەی دانیشتم. گەیشتمە قاوەخانە (چایخانە)ی «شیرینبلاغ» و دابەزیم. لەوێ رابیتێکمان هەبوو ناوی «شۆشۆ» بوو، شکاک بوو. ئەو گوتی ڕەفیقەکانت هاتن و تێپەڕین، زوو بیانگەیە. هەر بەو ماشێنەی پێشوو تا «دزە»ی ڕۆیشتین، لەوێشڕا بە قاوەخانەی «دزە»دا (نیزیک ورمێ) وەڕێکەوتم، گەیشتمە شوێنێک بە ناوی «پۆلاتدی» کە مەودایەکی کەمی دەمێنێ بگەیە «بالانیش». لە نیزیک بالانیش پۆستی ژاندەرمەری لێبوو، لەوێ گرتیانم.

هەر لە مەهاباد کە وەڕێکەوتین هەر کەسەی ئەرکێکی پێئەسپێردرابوو، ئەرکی من گەیاندنی نامەیەک بوو بۆ کۆنسوولی رووسیا لە ورمێ. نامەکە لە ناو قوتوویەکدا بوو، بۆخۆشم هەمیشە ئالایەکی چکۆلەی کوردستانم پێبوو. بەڵام باش بوو پێش ئەوەی بگیرێم، نامەکەم لە قوتووەکە دەرهێنا و لەگەڵ ئالاکەی لە رانم بەست.

بەڵێ لە «پۆلاتدی» نیزیک «بالانیش» گرتیانم. ڕەئیسی پۆستی ژاندەرمەری ناوی «حاجیلوو» بوو، هەر لە زووەوە نێوانناخۆشی لەگەڵ من

دانیشتبوون، دوو نەفەری لێبوو لە ناو خەڵکەکەدا دەمناسین، رابیتی کۆمەڵـەی (ژ.ک) بوون. ئەوان بە چاو تێیانگەیاندم کە رەفیقەکانم گیراون. لە خوار جادەش لە پەنا چۆمێک بنکەیەکی سەربازی ئەرتەشی لێبوو، جوان دەدیترا. بەهەڵکەوت «زەبیحی»م دیت، دیار بوو ئەویش منی دیتبوو. زەبیحی بە بیـانووی ئاودەسـت هاتە خوار، سەربازێک بە چەکەوە لە پشتی دەرۆیشت. مەبەستی زەبیحی ئـەوە بوو کە بەو شێوەیە من تێبگەم کە ئەوان گیراون.

«حاجیلوو» بەرپرسی پۆستەکە دەستی کرد بە پرسیار و جـلوبەرگـەکانی پێداکەندم. هەر مابوو پانتۆڵەکەم دانێم. لـەو کاتـەدا خوداوڕاسـتان کابرایـەکی عەجەمی ئەرتەشی کە پێشتر لە مەهاباد و دۆستی برازایەکی خـۆم بـوو، پەیـدا بوو، هەر دیتمی ناسیمییەوە. هات گوتی بۆ لێرەی؟ گوتم گرتوویانم. ئەوجار لە حاجیلووی پرسی ئەوەتان بۆ گرتووە؟ حاجیلوو لە وەڵامـدا گـوتی: خراپکـار و ئاژاوەچییە. عەجەمەکەی ناسیاوی من گوتی: ئەلعان ئەمن درێژکەن لاقم لە سەر زگی دانێن نانی ماڵە ئەوانەم لە زاری دێتەدەرێ. ئەوانە زۆریان خزمەت بـە مـن کردووە و شتی وانابێ. بەو چەشنە من ئازاد کرام.

زەبیحی و هاوڕێیانیشی هەریەکـەی مەئموورییـەتێکیان هـەبوو. بـڕیار وابوو هەمووومان بچینە باڵانیش. لەوێشەوە درێژە بە کارەکانمان بدەین و بەرەو شوێنەکانی دیکە بڕۆین. داستانی گیرانی ئەوانیش بـەو شـێوەیە بـوو کـە بـە ماشێنەکەیان رۆیشتبوون. بەڵام چونکە بە چ'کی شـارەزای رێگاکـە نـابن و لـە لایەکیش هەر رۆژێک بەر لەوەی ئێمە بچینە باڵانیش لە وێ نێوان ژاندەرمەری و پیاوەکانی زێڕۆبەگ شەڕ کرابوو و برایەکی زێڕۆبەگ لـەو شـەڕەدا کوژرابـوو، بڕیار بوو بچینە «کۆکی». ئەوان بۆ ئەوەی تووشی بۆسـەی ژاندەرمـەری نـەبن رێگاکەیان دەور لێدابوو و تەنانەت لە دێی «باڵانیش»یش تێپەڕ ببـوون. دوایـە دەزانن بە هەڵە رۆیشتوون، دەگەڕێنەوە کە ‹لە گەڕانەوەدا› بەر لـەوەی بتـوانن بچنە کۆکی و «زێڕۆبەگ» ببینن لە بۆسەی ژاندەرمەری دەکەون و دەگیرێـن. مـن دوای ئازادبوونم نەگەڕامەوە مەهاباد و درێژەم بە رێگاکە دا و رۆیشتمە ورمێ. لە ورمێ یەکێکی لێبوو پێم خۆش نییە ناوی بێنم دوایە بوو بـە وەزیـر، ئەنـدامی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوو، ئەویش لە ورمێ بوو. رووداوەکەم بۆ گێڕاوە. گوتی دەچـم بە کۆنسوولـی رووس دەڵێم ئازادیان بکەن. من چوومە لای «کامان دوکتـور» کـە

ئیدارەیەکی سیاسی بوو. لە قونسوولخانەی ورمێ بڕیار بوو نامەکەی بدەم بە «جەعفەرۆف» کە ئەفسەرێکی کورد بوو. چونکە ڕۆژی پشوودان بوو بەزۆری ڕێگایان دام و چوومە ژوورێ. بەڵام «جەعفەرۆف» لەوێ نەبوو، ئەفسەرێکی تورکی دیکە لەوێ بوو کە زۆر تووڕە و تۆسن بوو، ناویم لە بیر نەماوە بەڵام لە بیرمە ئەفسەری بەشی زانیاری بوو. نامەکەم دایە و ڕووداوەکەم بۆ گێڕاوە، ئەو گوتی مەئموورەکانی خۆمان لەوێن ناهێڵن بیانگرن، ئازادیان دەکەین.

هەر دوای ئەوەی لەوێ خەلاسیم هات، چوومە خزمەت «سەید ئەحمەدی گەیلانیزادە» و ڕووداوەکەم بۆ ئەویش گێڕاوە. هەر ئەو ڕۆژە بەیەکەوە چووینە لای «سەرلەشکر زەنگەنە». ناوبراو گوتی: ئەمن کوردم بەڵام لە نەوعی ئەوان نیم. مەبەستی ئەوە بوو کە ئەوانەی گیراون وێڕای بەرپرسانی دیکەی کورد، پشتیان بە ڕووسەکان بەستووە؛ پاشان گوتی: خراپیان لەگەڵ ناجووڵێینەوە.

لەو ماوەیەدا کاری من ئەوە بوو دەچوومە قۆنسوولخانەی ڕووسەکان بۆ ئەوەی بزانم بۆ ئازادکردنی ئەو چەند کەسە چیان کردووە. ڕۆژێک کابرایەک هات گوتی: فلانەکەس زیندانییەکانیان لە ڕێگای دەریاوە بە گەمی بەڕێ کردن. وەخت درەنگ بوو، چوومە قۆنسوولخانە، «هاشمۆف» لەوێ بوو، دوای ئەوەی پێکەوە قسەمان کرد گوتی: «بە قازی بڵێ کاری وا نەدا بە هەموو کەس؟!» مەبەستی ئەوە بوو کە ئەوانەی قازی محەممەد ئەو ئەرکەی پێئەسپاردوون، بۆ ئەو چەشنە مەئمووریيەتانە نابن!

کاک قادری تەوەککول لە کۆتایی قسەکانیدا گوتی: «کاتێک زەبیحی و هاوڕێیانی بە گەمی بەڕێکرابوون، ئەو ئەندامەی کۆمەڵەی (ژ.ک) کە گوتم پاشان بوو بە وەزیر، دیتبوونی! بەڵام هیچ هەڵوێستێکی لە خۆی نیشان نەدابوو!».

پرسیارم لە کاک قادر کرد کە دوای گیرانی ئەو چەند کەسە، ئایا هیچ کەس لە مەهابادەوە بۆ ئازادکردنیان هاتە ورمێ و هەوڵێک درا یان نا؟ کە لە وەڵامدا دەقی قسەکانی کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان»ی سەلماند، بەڵام گوتی ئەو نەفەرەی کە کاک عوبەیدیللا دەڵێ، «سەعیدی قۆپی» بوو و وێڕای مامۆستا زەبیحی گیرا، دروست نییە، بەڵکوو برایەکی ئەو بوو کە من ناویم لە بیر

رەحیمی لەشکری» و «مامە غەنی خوسرەوی»، پێم وابێ نەفەرێکی دیکەشیان لەگەڵ بوو کە بۆ ناوبژیگەری هاتبوونە لای سەرلەشکر زەنگەنە. سەبارەت بە مامۆستا «زەبیحی»ش گوتی: «ئەو بەڕاستی تێکۆشەر بوو، زۆر زانا بوو و تەنیا کەسێک بوو زمانی ئینگلیسی زۆر بەباشی دەزانی و ئەندامێکی هەڵسووڕاو و چالاکی کۆمەڵەی ژ.ک بوو.»

«رەعنا خانمی زەبیحی» خوشکی مامۆستا زەبیحی لە وتووویژێکدا کە کاک عەلی کەریمی لە کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی»دا لەگەڵی پێکهێناوە لە لاپەڕە ١٤٣ تا ١٦١، باسی کەسایەتی و بەسەرهاتی براکەی خۆی دەکا کە ئەو چەند دێڕەی خوارێ، کورتەیەک لەو وتوویژەیە: «نیزیک دە تا پازدە رۆژ کاکم لە قاوەخانەی «کەریم جووجوو»ی گیرا. پاشان لەوێ ئازاد کرا بەڵام بۆ ماوەیەک نەهاتەوە ماڵە خۆمان و چووە ماڵە «کەریمی یاهوو». [دیارە نەیانویستووە زیندانی بێ بەڵام دەسبەسەریان کردووە] پاش ماوەیەکی لە وێش رۆیی و چووە ماڵە «مەلای داودی» مەشهوور بە «مەلای حەجۆکێ». پاش چوارپێنج رۆژان، رەمەزان بوو بەیەکجاری ئازاد کرا.» دیسان لە مەئمووریيەتێکدا مامۆستا زەبیحی وێڕای چەند هاوڕێی کۆمەڵەی ژ.ک لە ورمێ دەگیرێنەوە. لە لاپەڕە ١٤٦ و ١٤٧، رەعنا خانم سەبارەت بە گیرانەوەی دووبارەی مامۆستا زەبیحی دەڵێ: «پاش بیستوچوار سەعاتان گوتیان وەڵلا دیسان گرتوویانەوە و «میرزا رەحمەتی شافیعی» راپۆڕتی لێداوە و گوتوویەتی ئەگەر ئەوانە بێنەوە، ئێران کوردستانی لە دەست دەچێ، بەخسووس رەحمانی زەبیحی. ئیدی کاکم زیاتر لە ٨ مانگ گیرا... گۆیا کاکم لە زیندانەوە خەبەری بۆ قازی ناردووە کە ئەگەر بێتوو شتێکی نەکا و رزگارمان نەکا، خراپی دەبینێ! دوایە گوتیان عرووسان [(سەربازی رووسەکان)] پووڵیان داوە و نازانم چبووە و ئەوانە بەربوون، هەتا پووڵێکیان بۆ ئێمە هێنا ماڵێ...» پاشان دەڵێ: «میرزا قاسم لە تەورێزێ نەخۆش دەبێ و کاکم و دڵشاد دێنەوەمیاندواوێ و بە هۆی سێچوار ئەفسەری عورووس کە لەوێ دەبن، بە جیبێکی هێنایانەوە ماڵە خۆمان.» لە کۆتاییشدا دەڵێ: «عالەمێکی زۆر هاتن، قازی محەممەد هات، مەلامستەفا بارزانی هات و... ژوورەکەشمان زۆر بچووک بوو و عالەم زۆر بوو...»

ڕۆژی یەکشەممە ڕێکەوتی ٤ی٤ی١٣٨٥ بەرامبەر دەگەڵ ٢٥ی ژانوییەی ٢٠٠٦ چوومە خزمەت «ڕەعناخانمی زەبیحی» و سەبارەت بەو بابەتانە پرسیارم لێکرد کە ئەو چەند دێڕەی خوارێ پوختەی ئەو وتووێژەیە: «وەختێک کاکم لەگەڵ هاوڕێکانی لە «باڵانیش»ێ گیرا، پاش ماوەیەکی گوتیان ئازاد کراون بەڵام دیسان گرتوویاننەوە (هەر ئەو ڕۆژە)، چونکە «میرزا ڕەحمەتی شافیعی» نامەی بۆ کاربەدەستانی ئێران نووسیبوو و گوتبووی کە ئەگەر ئەوانە ئازاد بکرێن، بەتایبەت زەبیحی، کوردستان لە ئێران جودا دەبێتەوە و لە دەست دەچێ. ئەو دەمەش کە کاکم لە تارانێ زیندانی بوو، لەوێڕا نامەیەکی بۆ قازی محەممەد ناردبوو و گوتبووی لە زیندانێ نەجاتم دە، دەنا ئەمنیش زۆر کارم لە دەست دێ! پاش ماوەیەک قازی محەممەد لەگەڵ ڕووسەکان لە بەرامبەر ئازادی کاکم و ئەو دوو ڕەفیقەی دیکەی، سێزدە دیلی ئێرانییان ئازاد کرد و وێڕای بڕێک پووڵ و پارە دایاننەوە بە ئێران. ئەو پووڵە بە مەعلوومی هیچ قسەی لە سەر نییە کە ڕووسەکان دایان بە ئێرانییەکان و ئەو معامەلەیان ڕێکخست. هەر دوای گیرانی کاکم و کاک قاسم و کاک دڵشادی ڕەسووڵی، هەرماڵەی ١٥٠٠ تمەنی ئەودەمیان وەک حقووقی (مووچە) ئەو گیراوانە بۆ بەڕێوەچوونی بنەماڵەکانیان داینێ.» قسەکانی ڕەعنا خانم لێرەدا تەواو دەبێ. بەڵام بەو پێیەی دەوڵەتی ئێران لە جموجۆڵی کۆمەڵەی ژ.ک و چالاکییەکانی، بەڕاستی ترس و خۆفێکی زۆری ڕێنیشتبوو و هەروەها زانیاری باشیشی لە سەر ئەندامە چالاکەکانی ئەو کۆمەڵەیە هەبوو، لە لایەکیش ڕاپۆرتێک لەسەر ئەو ئەندامە چالاکانە پێشتر بەدەستی ئەڕتەش گەیبوو، من لەو بڕوایەدا نیم کە بە قسەی کەسێک ئازادیان بکەن (کە دیارە کە ئەگەر ئەو قسەوباسە ڕاست بێ، ئەوە بە قسەی پێشەوا قازی محەممەد ئازاد کراون) و لە دواییشدا بە قسەی میرزا ڕەحمەتی شافیعی بیانگرنەوە. چونکە ئەندامەتی و چالاکییەکانی ئەو سێ گیراوە لە نێو کۆمەڵەی (ژ.ک)دا لەمێژ بووە کە بۆ کاربەدەستانی ئێران ڕوون و ئاشکرا بووە. ئەو جێیەش کە ڕەعنا خانم دەڵێ هەر ماڵەی پووڵێکیان وەک یارمەتی بۆ بەڕێچوونێ داینێ، بەپێی هەواڵ و مزگێنییەک کە لە ڕۆژنامەی «کوردستان»ی ژمارە ١٧ی ڕۆژی چوارشەممە ١ی ڕەشەمەی ١٣٢٣ چاپ کراوە،

لایەن خودی «پێشەوا»وە بەر لە هاتنەوەیان بۆ مەهاباد و دوای ئازاد بوونیان وەک مزگێنی دراوە بە کەس‌وکاری ئەو سێ ئەندامە. رۆژنامەی «کوردستان» بۆ ئەم هەواڵە نووسیویەتی: «... سوپاس بۆ خودا هەرسێکیان چەند رۆژە گەیشتوونە تەورێز، پێشەوای خۆشەویست یەکی دوو هەزار تمەنی خەڵات کردوون.»

ئەگەر بمانەوێ رێکەوتی دروستی گیرانی ئەو سێ کەسە روون بکەینەوە، دەبێ ئاورێکیش لە کاتی دەرچوونی گۆڤاری «نیشتمان» بدەینەوە. گۆڤاری نیشتمانی ژمارە ٧ و ٨ و ٩ بەسەر یەکەوە بۆ سێ مانگی سەرەتای بەهاری ساڵی ١٣٢٣، واتا خاکەلێوە، بانەمەڕ و جۆزەردان چاپ کراوە. دوای دەرچوونی ئەو ژمارەیە هەتا ساڵێک دوای رووخانی کۆماری کوردستان یانی ساڵی ١٣٢٧، ژمارەی دیکەی لێ چاپ نەکراوە، ئەو ژمارەیەش بە ناوی «نیشتمان»ی ژمارە ١٠، بە یارمەتی مامۆستا «زەبیحی» لە «سیتەک»ی کوردستانی باشوور چاپ کراوە. دوابەدوای هێنانەوەی مامۆستا «زەبیحی» لە «تەورێز» و راگواستنی کەرەسەکانی چاپی گۆڤاری «نیشتمان»، لە تەورێزەوە بۆ مەهاباد و دەسبەسەربوونی مامۆستا «زەبیحی» بۆ ماوەیەکی کورت، مامۆستا «زەبیحی» لە مەهاباد دەمێنێتەوە. واتا لە جۆزەردانی ساڵی ١٣٢٣ هەتا کۆتایی پووشپەڕ یا یەکەم رۆژەکانی مانگی گەلاوێژی ساڵی ١٣٢٤، خەریکی کاروباری دیکە و تێکۆشانەکانی لە کۆمەڵەی (ژ.ک)دا بووە.

بۆ روونکردنەوەی بەشێکی گرینگ لە مێژووی تێکۆشانی کۆمەڵەی (ژ.ک) بە بیانووی باسکردن لە چۆنیەتی گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و هاورێیانی، بێجگە لەو بابەتانەی باسمان کرد، هێنانەوەی ئەو چەند خاڵە گرینگەش وەک کورتەیەک لە باسەکەمان بە پێویست دەزانم:

١- رۆژنامەی «کوردستان» ژمارە ١٤، رێکەوتی ٢٤ی رێبەندانی ١٣٢٤ دەڵێ هەشت مانگ لەمەوبەر ئەو سێ کەسە گیراون کە هەشت مانگ پێش ئەو رۆژە، دەکەوێتە کۆتایی مانگی جۆزەردان یان یەکەم رۆژەکانی مانگی پووشپەڕی ساڵی ١٣٢٤.

کاک «عەلی کەریمی» لە لاپەرە ١٠٣ی کتێبەکەی‌دا دەڵێ: «هەروەک ئاگادارن بەدوای دەرچونی «نیشتمان»ی ژمارە ٧ و ٨ و ٩ یانی لە هاوینی ساڵی

١٣٢٤ (١٩٤٤)، «زەبیحی» لەگەڵ دوو نەفەر لە ئەندامانی چالاک و هەڵسووڕاوی کۆمەڵە، «قاسمی قادری» و «دڵشادی رەسووڵی» لە ورمێ بە دەستی حکوومەتی شای ئێران دەگیرێن.» کە ئەو قسەی کاک عەلی لەگەڵ ئەو روونکردنەوەی کە باسمان کرد، واتە رۆژنامەی «کوردستان» ساڵێک و چەند مانگیان نێوانە.

٢- گۆڤاری «ئاوات» کە لە یەکی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٢٤ دەرچووە، دەڵێ چەند مانگ لەوە پێش سێ کەس لە خەڵکی مەهاباد لە «بالانیش» گیراون کە ئەگەر ساڵی ١٣٢٣ بووبا دەینووسی ساڵێک و چەند مانگە ئەو سێ کەسە گیراون؛ کەچی نووسیویەتی چەند مانگ لەمەوبەر گیراون. بۆ ئەو جێگایەش کە کاک «محەممەدی شاپەسەندی» دەڵێ «زەبیحی» بەسەردا گیرا، نەمویست چاپخانە بێئیش بمێنێتەوە. دەبێ بڵێم کە ئەو چاپخانەی کە لە «تەورێز»ەوە بۆ مەهابادیان هێناوە هەر ئەو چاپخانەیە بووە کە «هاوار» (= هاواری کورد)ی لە رەزبەری ساڵی ١٣٢٤ پێ چاپ کرا و بێئیش نەماوەتەوە. رەنگە مەبەستی کاک محەممەد ئەوە بووبێ کە دوای ئەوەی «هاوار(ی کورد)» رێگای پێنەدرا زیاتر لە ژمارەیەکی لێ چاپ بکرێ، بۆخۆی شتێکی پێ چاپ بکا و چاپخانەکە بێئیش نەمێنێتەوە.

٣- کاک «عەلی کەریمی» لە لاپەڕە ١٠٩ی کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی»دا دەڵێ: «کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لە رۆژنامەی «کوردستانی نوێ» ژمارە ١١٩ یەکشەممە ١٤ی ٤ی ١٩٩٤ دەنووسێ: «بە پێچەوانەی سەرلەشکر زەنگەنە، «زەبیحی» و هاوڕێکانی ‹کاتی گەڕانەوە› لە پەیمانی «سێ سنوور» گیران» دوابەدوای ئەو قسەی کاک «محەممەدی شاپەسەندی»، «کاک عەلی کەریمی» دەڵێ: «لەسەر پەیمانی «سێ سنوور» قسە و باس زۆرە و تا ئێستاش بەتەواوی ساغ نەکراوەتەوە کە پەیمانێکی ئاوا و کۆبوونەوەیەک بە بەشداری نوێنەرانی هەموو بەشەکانی کوردستان لە چیای «دالانپەڕ» کراوە یان نا؟! وە یان ئایا «زەبیحی» بەشداری ئەو کۆبوونەوەی کردووە یان نا؟! بەڵام لەسەر گیرانی «زەبیحی» و «قادری» و «دڵشاد» کە هەرسێکیان ناویان لەولا و ئەولا هاتووە کە گۆیا لە گەڕانەوە لە پەیمانی «سێ سنوور» گیراون شک و گومان

کاک عەلی دیسان لە لاپەڕە ١١٤ی سەرچاوەی پێشوو دەڵێ: «(مەک داوڵ)یش لە کتێبە ئینگلیزییەکەی خۆیدا کە لەو ئاخرییانەدا بڵاو بۆتەوە، ناوی «زەبیحی» دەبا کە لە گەڕانەوەی پەیمانی «سێ سنوور»دا لە ورمێ گیراوە.» هەر دوابەدوای قسەکانی «مەک داوڵ»، کاک عەلی کەریمی دەڵێ: «تا ئێستا بەوە گەیشتووین و شکمان لەوەدا نەماوە کە «زەبیحی» و هاوڕێکانی «سێ کەڵەپیاوی کۆمەڵە» بە دوای دەرکردنی «نیشتمان»ی ٧ و ٨ و ٩دا دەگیرێن.»

لاپەڕەی ١٠ی نوسخەی ئەسڵی گۆڤاری «نیشتمان» وتارێکی تێدا بڵاو کراوەتەوە بە ناوی «لە ناو کۆمەڵەدا» کە لەو لاپەڕەیەدا زۆر بە روونی باسی بەشدارانی کۆنفرانسی نێوان کۆمەڵەی «هیوا» و کۆمەڵەی «ژ.ک» دەکا کە ناویان ناوە «پەیمانی سێ سنوور»، ئەو وتارە لە لایەن مامۆستا «زەبیحی»یەوە نووسراوە.

باسی پەیمانی «سێ سنوور» جارێ وەلا دەنێین چونکە وتارێکی تایبەت و دوورودرێژمان لە سەر نووسیوە. بەڵام هەر لەو چەند دێڕەدا بابەتێکی زۆر گرینگمان بۆ روون دەبێتەوە ئەویش ئەوەیە کە مامۆستا «زەبیحی» بۆخۆی یەکێک لە بەشدارانی پەیمانی «سێ سنوور» بووە و بۆخۆشی نوسخەی کۆبوونەوەکەی ئەو پەیمانەی لە گۆڤاری «نیشتمان»ی ژمارە ٧و٨و٩دا بڵاو کردۆتەوە. کەوایە لە ‹کاتی گەڕانەوە› لە پەیمانی «سێ سنوور» نەگیراوە، دەنا ئەگەر بەوجۆرە نەبایە ئەو زانیارییانەی رۆژنامەی «کوردستان» و گۆڤاری «ئاوات» و سەرچاوەکانی دیکە باسی دەکەن، دەکەوتنە بەر شک و گومانەوە. بەپێی ئەو بەڵگە و سەرچاوانەی کە دەبەر دەستماندایە بێ هیچ شک و گومان دەتوانین بڵێین کە یەکێک لەو کەسانەی لە پەیمانی «سێ سنوور» دەگەڵ مامۆستا «زەبیحی» بووە مامۆستا «هەژار»ە. ئێستا کە بۆ هەموومان ئاشکرا بوو کە مامۆستا «هەژار»یش لەو پەیمانەدا بەشدار بووە، پرسیارێک دێتە گۆڕێ ئەویش ئەوەیە کە: لە کاتێکدا یەکێک لە بەشدارانی ئەو پەیمانە مامۆستا هەژار بووە، چۆن دەکرێ بۆ هاتنەوەی مامۆستا «زەبیحی» و دوو هاوڕێکەی دیکەی بەپێی ئەو قسەی کە دەڵێن لە کاتی گەڕانەوە لە پەیمانی «سێ سنوور» گیراون، شێعری دانابێ؟

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە بڵێم کە راستە مامۆستا «هەژار» ئەو شێعرەی بۆ هاتنەوەی ئەو سێ کەسە داناوە، بەڵام هیچ شکمان نییە کە رێکەوت و کاتی دانانی ئەو شێعرە ئەو کاتە نەبووە کە پەیمانی «سێ سنوور» پێکهاتووە. بەپێی تەواوی ئەو بەڵگە و سەرچاوانەی باسمان کردن، بەوە گەیشتین کە ئەو سێ ئەندامەی کۆمەڵەی (ژ.ک) ساڵێک و نیزیک دوو مانگ دوای پەیمانی «سێ سنوور» و دەرچوونی ژمارەی کۆتایی گۆڤاری «نیشتمان» واتا رۆژەکانی سەرەتای مانگی گەلاوێژی ساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥) گیراون.

### بەڵگەکانی ناو کتێبی «رۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا» سەبارەت بە گیرانی مامۆستا زەبیحی

تا ئێستا سەبارەت بە گیرانی ئەو چەند کەسەی کە لەگەڵ مامۆستا «زەبیحی» بوون، تەنیا قسەکانی «سەرلەشکر زەنگەنە» و وتارەکانی گۆڤاری «ئاوات» و ئەو چەند کتێبەمان باس کرد کە هەر یەکەی بە چەشنێک باسیان لەو رووداوە کردووە. لە وتووێژ لەگەڵ کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» و کاک «قادری تەووەککول» و «رەعنا خانمی زەبیحی»یش زۆر شتمان بۆ روون بۆوە، بەڵام هیچ کامیان بە روونی باسی رۆژی گیرانەکەیان نەکردووە. گرینگی ئەو دوو بەشە لەوەدایە کە بە روونبوونەوەی رێکەوتی گیرانی ئەو چەند کەسە زۆر هەڵەی ناو کتێبەکانیش راست دەبێتەوە. بۆ نموونە کاتێک هەتا ئێستا بۆمان روون بۆتەوە مامۆستا «زەبیحی» و دوو هاورێکەی لە سەرەتاکانی مانگی گەلاوێژی ساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥) گیراون ئەوە ئەو کات ناتوانین بڵێین لە دوای دەرچوونی ژمارە (٧و٨و٩)ی گۆڤاری «نیشتمان» (کە بۆ سێ مانگی سەرەتای وەرزی بەهاری ساڵی ١٣٢٣ چاپ کراوە)، ئەو چەند کەسە گیراون.

بۆ روونکردنەوەی کۆتایی و بێهەڵە و پڕ لە زانیاری ئەو رووداوە لەو دواییانەدا کتێبی «رۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا»م پەیدا کرد. ئەو کتێبە وەرگێڕاوی ١٣٠ بەڵگەنامەی بریتانیای تێدا چاپ کراوە و لە لایەن کاک «ئەنوەری سوڵتانی» کۆ کراوەتەوە و کراوەتە کوردی و لە لایەن «بنکەی ژین» لە سلێمانی چاپ کراوە و بەڵگەنامەکانی ساڵی ١٩٤٢

ئەفسەرانی بەشی زانیاری بریتانیا و بەخۆشییەوە رووداوی «بالانیش»ی زۆر بە وردی تێدا تۆمار کراوە. پێش ئەوەی نووسراوەکانی بەلگەنامەکان شی بکەینەوە و لەگەڵ ئەو زانیارییانەی پێشتر باسمان کردن، لە بەر یەکیان رابنێین، دەقی نووسراوەکان بێ دەستێوەردان وەک خۆی دەنووسینەوە کە لە لاپەڕە ١٤٧ تا ١٦٧ی ئەم کتێبەدا باسی ئەو رووداوە کراوە و هەر جارەی زانیارییەک بە زانیارییەکان زیاد بووە.

لە لاپەڕە ١٤٧ دەڵێ: «عەلی ئەکبەرۆف سکرتێری کۆنسۆلی رووسیا و میجەر جەعفەرۆف ئەفسەری سیاسی رووس لە ورمێ بوون». لە لاپەڕە ١٤٧ و ١٤٨ بەلگەنامەی ژمارە FO371/43478 ژمارە ٢٨، ١٣ی جوولای تا ١٥ی ئۆگۆستی ١٩٤٥ دەنووسێ: «رێبەرانی کۆمەڵە، لە عەینی کاتدا توانیویانە سیاسەت تێکەڵاو بە مەسەلەکە بکەن. لە ٤ی ئۆگۆستدا پیاوانی زێڕۆبەگ هەوڵیان لە پێناو کۆکردنەوەی باجی حاسڵی گوندی بالانیجدا تووشی بەربەرەکانی هاتبوو، هێرشیان کردە سەر پێگەی جەندرمەری کە لایەنگری وەرزێرەکانی دەکرد. کورد پاشەکشەی پێکرا و لە لایەن هێزی یارمەتیدەری [جەندرمە]وە، گەڕێنرانەوە شوێنی سەرەکی زێڕۆ لە کووکیا... جێگری کونسوولی رووس لە ورمێ ناوبژیچیەتی کردووە و ئاشتی دامەزراوەتەوە...» هەر لە لاپەڕە ١٤٨دا دەڵێ: «١٦٣) کاروباری دیکەی کورد - رۆژی پێنجەمی ئۆگۆست، پێنج رێبەری کۆمەڵە و خەڵکی مەهاباد لە ورمێ گیران و نێررانە تەورێز. دەگوترێ ئەوان کەسانێک بوون کە لە بەغدا دەرسیان خوێندووە و جگە لە کوردی و تورکی و فارسی، ئینگلیزی و عەرەبیشیان زانیوە.»

لە لاپەڕە ١٥٠ تا ١٦١ بەلگەی ژمارە FO371/43478 پاشکۆی راپۆرتی رۆژی ٢٥ی٨ی١٩٤٥ی بالوێزی بریتانیا لە تاران - راپۆرتی سەفەری جێگری کۆنسوولی بریتانیا لە تەورێز بۆ ئازەربایجانی رۆژئاوا، دەقی ئەو راپۆرتە کە باسی ٤ تا ٨ی ئاگۆستی ١٩٤٥ی لە خۆ گرتووە، بۆ وەزارەتی دەرەوە لە لەندەن نێردراوە.

لاپەڕە ١٥٠ دەڵێ: «شاری تەورێزم لە بەیانی رۆژی چواری ئۆگۆستدا بەجێ هێشت.» لاپەڕە ١٥١ دەڵێ: «سەعات ٨ی ئێوارە بە بێ هیچ رووداوێک گەیشتمە ورمێ و چاوم بە سەرهەنگ زەنگەنە - جێگری ئوستاندار کەوت.»

لاپەڕە ۱٥۲ دەڵێ: «لە سەرهەنگ زەنگەنەم بیست، گوتی زێڕۆبەگی هەرکی خەڵکی [گوندی] کۆکیا لە باراندووز، لە کاتی خەرماندا بە گوێرەی رەسمی خۆی داوای باجی لە وەرزێرانی گوندی «باڵانیج» کردووە. ئەوانیش پەنایان بردۆتە بەر پێگەی جەندرمەری لە گوندەکە. زێڕۆ گوتوویە دەبێ پێگەی جەندرمە لە گوندەکە هەڵبگیرێت کە بە قسەیان نەکردووە. ئینجا ئەویش بە رواڵەت لە دوانیوەڕۆی رۆژی چوارەمی ئۆگۆستدا، هێزێکی سی کەسی کوردی ناردۆتە سەر پێگەی ناوبراو. چەند سەعاتێک شەڕەتفەنگ کراوە، کوردان شکاون و لە دەوروبەری سەعات ٦دا کشاونەتەوە بۆ لای «کۆکیا» و جەندرمە کەوتوونەتە شوێنیان. درەنگتر یارمەتی گەیشتۆتە جەندرمە و بۆ هەموو ماوەی شەو، شەڕەکە درێژەی هەبووە، زەنگەنە دەیگوت ئێستاش هەر درێژەی هەیە.»

هەر لە لاپەڕە ۱٥۳دا دەڵێ: «زێڕۆبەگ و رەشیدبەگی هەرکی... پڕوپاگەندەکەرێکی بەهێز و هەواڵبەری نێوان کوردانی ئێران و عێراقن، پێوەندێکی زۆر لە نێوان هەر دوو بەری سنووردا هەیە... بە ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی من بچمە ورمێ، قازی محەممەد خۆی سەردانێکی سێ رۆژەی شارەکەی کردووە. پێوەندی نێوان ئەو و مێجەر جەعفەرۆف ئەفسەری سیاسی رووس، شێوازێکی ئاسایی هەیە. پێیان گوتم کە مەلا مستەفای بارزانیش پێوەندی لەگەڵ جەعفەرۆف هەیە.»

لە لاپەڕە ۱٥٤دا، سەرلەشکر زەنگەنە باسی رەنگەکانی ئاڵای کوردستانی بۆ جێگری کۆنسوولی بریتانیا لە تەورێز کردووە و پاشان راپۆرتەکە دەڵێ: «زەنگەنە لای وایە کوردی ناوچەی مەهاباد، سەرجەم پشتیوانی کۆمەڵە بن بە هەموو ئێلخانیزادەکانەوە کە سەرۆکی هۆزی بەهێزی دێبوکرین...» لە لاپەڕە ۱٥٥ جێگری کۆنسوولی بریتانیا لە تەورێز دەڵێ: «بەیانی ئەو رۆژە وا دەمویست ورمێ بەجێ بێڵم، سەرهەنگ زەنگەنە هاتە دیتنم بۆ ئەوەی وەڵامی چاوپێکەوتنی من بداتەوە...» پاشان دەڵێ: «لە لایەکی دیکەوە پێنج مەئمووری کۆمەڵە، کە لەم دواییەدا لە مەهابادەوە هاتوونەتە نێو شار [ی ورمێ]، لە لایەن دەسەڵاتداریەتی ئێرانەوە گیراون و بە گەمی [لە رێگەی گۆلی ورمێوە] نێردراونەتە تەورێز. سێ کەسیان گەنج بوون و لە بەغدا دەرسیان خوێندووە،

جگە لە کوردی و فارسی و تورکی، بە ئینگلیزی و عەرەبیش قسە دەکەن. دووانەکەی دیکەیان عەشیرەت بوون و دەوری پاسەوانی ئەوانیان بینیوە.»

لاپەڕە ١٥٦ دەڵێ: «چوومە چاوپێکەوتنی (تەلعەتبەگ ئاچارە) - کۆنسوولی تورکیا لە ورمێ. ناوچەی ئیداری تەلعەتبەگ تا کرماشان و هەمەدان دەگرێتەبەر و وادەرکەوت کە دوو بابەتی سەرەکی سەرنجی ئەو رابکێشن: مەسەلەی کورد و پێوەندی رووس و تورک. ناوبراو زانیارییەکی زۆری لە سەر کەسایەتییە کوردەکان و هەڵسوکەوتیان هەبوو، بەڵام دڵنیا نیم زۆربەیان راست بن. تەلعەتپاشا بەگشتی پەسەندی بۆچوونی منی دەکرد کە چالاکی کۆمەڵە روو لە زیادبوونە و ئەوەی کە هەوڵی ئەندامانی ئێرانی و عێراقی رێکخراوەکە، یەکی گرتووە، رووسەکانیش هانیان دەدەن و یارمەتییان پێ دەگەیەنن. مەئمووری ئەسڵی رووس لە مەسەلەی کورددا، مێجەر جەعفەرۆفە کە خۆی کوردە. تەلعەتپاشا دڵنیای کردم کە دەسەڵاتداریەتی سۆڤیەت دەستی لە مەسەلەی بالانیجدا هەبووە. (پاراگرافی ٩) و جێگری کۆنسوول خۆی سەردانی گوندی کووکیانی کردووە و مەسەلەکەی داکووژاندووە. دواتریش چوار کورد گیراون و هێناویاننەتە ورمێ کە ئەم مەسەلەیە، جێگری ئوستاندار پێی نەگوتم. لە تەلعەتپاشام پرسی ئایا چالاکییەکانی کۆمەڵە لە نێو کوردی تورکیاشدا پەرەی سەندووە؟ ناوبراو لای وا نەبوو ئەو مەسەلەیە تا رادەیەکی جیددی راست بێ، بەڵام وا هەیە جاروبارە پڕوپاگەندەچی سنوور ببەزێنن.» لە لاپەڕەکانی ١٣٧ و ١٣٨دا دەڵێ: «ترۆمبێلی سینەمای «پێوەندییە گشتییەکانی بریتانیا» لە ٢٥ی مانگی جووندا، [چونکە راپۆرتەکە لە ساڵی ١٩٤٥ رووی داوە، ٢٥ی جوون یا ژووئەنی ١٩٤٥ بەرامبەرە دەگەڵ رۆژی دووشەممە ٤ی پووشپەڕی ١٣٢٤] سەردانی مەهابادی کردووە و لە گۆڕەپانی شارەکەدا، فیلمی هەواڵ و دۆکیۆمێنت و گاڵتەجاڕی نیشانی خەڵک داوە. فیلم نیشاندانەکە بە پشتگیری قازی محەممەد بەڕێوە چووە و خەڵکێکی زۆر بەشداریی نومایشەکەیان کردووە، بەڵام کەسانی ناحەز لەو کاتەدا خۆپێشاندانێکیان بەڕێوە بردووە و سەرەوخوار، بە نیزیک سینەماکەدا تێپەڕ بوون و تەپڵیان کوتاوە و وێنەی مارشاڵ ستالینیان بەرز کردۆتەوە. لە ماوەی فیلمەکەدا دوو جار وایەری پرۆژێکتۆرەکە هەڵبڕاوە و کەسێکیش خشتێکی بە ئامپلیفایرەکەدا داوە... قازی محەممەد، کە بەڵێنی

پاراستن و پشتگیری دابوو و هێندێک لە پاسەوانەکانی خۆشی ناردبوو شوێنەکە، بەو سابۆتاژە دڵگیر بووە و نارەزایی خۆی دەربڕیوە...»

لە لاپەڕە ۱٤۳شدا دەڵێ: «ئەرمەنییەک کە ژنی رووسی هەیە و وێدەچێ رێبەری خۆپێشاندانەکە بووبێت، نێردراوەتە ورمێ و شەش کەسیش بۆ ماوەی چەند رۆژ زیندانی کراون» [؟!!]

لە لاپەڕە ۱٥۸دا دەڵێ: «جەنابی هاشمۆف گوتی هەواڵی رووداوەکەی بەرگوێ کەوتووە و پێی ناخۆش بووە [؟!!] هەروەها ۱٥ رۆژێک دوای رووداوەکەش سەردانی مەهابادی کردووە و بە توندی لۆمەی قازی محەممەدی کردووە و [گوتوویەتی]: «ئێوەی کورد داوای سەربەخۆیی دەکەن و دەڵێن توانای ئەوەتان هەیە خۆتان نەتەوەی خۆتان بەڕێوە بەرن، بەڵام ئەوەتا ناتوانن بۆ تاقە شەوێک نەزم و نیزامی گوندێک بپارێزن. [مەبەستی لە گوند، مەهابادە و بە تەشەر وای گوتووە؟!] من گوتم دوور لە ئینسافی دەبینم ئەگەر [بۆ ئەم مەسەلەیە] سەرکۆنەی قازی محەممەد بکەین: ناوبراو هەموو هەوڵێکی خۆی داوە و لە دڵەوە نارەحەتی خۆی بە «مستەر لانگ» دەربڕیوە (لە راستیشدا بە مستەر لانگی گوتبوو، رووسەکان خۆیان رووداوەکەیان رێک خستووە). من خۆم وەک کارێکی ئاسایی تێکدەرانە سەیری مەسەلەکە دەکەم و هیچ سەرنجێکی رەسمی پێنادەم.»

لە کۆتایی لاپەڕەی ۱٥۸یشدا دەڵێ: «ناوبراو [هاشمۆف] باسی رووداوەکەی «باڵانیج»ی بە شێوەیەک کرد کە جیاوازی ئەوتۆی لەگەڵ قسەی جێگری ئوستانداردا [سەرلەشکر زەنگەنە] نەبوو، گەرچی کورتتری بڕیوە.»

لە لاپەڕە ۱٥۹دا دەڵێ: «بەیانی رۆژی ۷ی ئۆگۆست ورمێم بەجێ هێشت.»

لاپەڕە ۱٦۱یش ناوی راپۆرتدەری ئەو سەفەرەی هاتووە کە (جی.دابلیو.واڵ)ە.

لە لاپەڕە ۱٦٦ بەڵگەی ژمارە ۱٤ - FO371/45478 کە بۆ ۱٦ی ئۆگۆست تا ٦ی سێپتەمبری ۱۹٤٥ ئامادە کراوە، لە بەشی «کاروباری کورد»دا دەڵێ: «کاتێ وەفدی سێ کەسییەکەی کۆمەڵە لە ورمێ (لە پێنجەمی مانگی ئۆگۆستدا) گیران.

ژمارەیەکی زۆر لە ئێرانییانی دیکەیان گرت و داوایان لە قازی محەممەد کرد ئیجازەی کوشتنیان بدات. قازی محەممەد بەرگری کارەکەی لێکردن و کاتێ هەواڵ گەیشت کە سێ کەسیان لێ ئازاد کراون، ئەوانیش بارمتەکانی خۆیان بەڕەڵلا کرد. فەرماندار کە توانای هەڵسەنگاندنی مەسەلەکەی کەم بوو، دەسبەجێ بە سەفەرێکی بێ هەستوخوست چوو بۆ مەراغە.»

لاپەڕە ١٦٧یش دەڵێ: «دوو هەواڵدەر لە مەهابادەوە هەواڵی دووبەرەکی نێوان ریزەکانی کۆمەڵە دەدەن. وا دەردەکەوێ کە کوردێک بە ناوی میرزا «غەفووری مەحموودی» لەگەڵ ئەرمەنییەکدا بە ناوی «ئارام» کە خەڵکی میاندواوە، بناغەی لقی حیزبی توودە لە میاندواویان داناوە و ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی کۆمەڵە بەرەو ئەوان کشاون. دەگوترێ هەڵخەڵە[تا]ندنی خەڵک دژ بە نفووزی سەرەک هۆز و خاوەن مڵکەکان، دەستی پێکردووە و وا هەیە بزووتنەوەکە ئەگەر هیچیش نەکات، نوێنەرایەتی ناڕەزایی لە مەڕ گریمانی دەسەڵاتی زۆری قازی محەممەد دەکات. هەواڵدەرێک لای وایە دۆستایەتی رووس لەگەڵ کۆمەڵە تووشی ساردی هاتووە (و ئەوەش کە کاربەدەستە رووسەکان باسی بێیاسایی کوردان دەکەن، هەندێ راستی بەو بۆچوونە دەبەخشێت). وا دەردەکەوێت کە جێگری کۆنسوولی رووس لە ورمێ داواکاریی قازی محەممەدی بۆ نێوبژێکردن لە مەسەلەی سێ نوێنەری کۆمەڵە داوەتە دواوە. دەگوترێ هۆی ساردیی رووسەکان ئەوەیە کە گومان دەکەن ئینگلیس پشتگیری کۆمەڵە بکات!»

لاپەڕە ١٧٧ پاش ئەوەی باسی چوونی پێشەوا قازی محەممەد بۆ باکۆ دەکا و دەڵێ: «یەکەم بەرهەمی دیارییەکانی رووس بۆ قازی محەممەد کە سەرجەم دەبێ چاپخانەیەک و دوو تەن (٢٠٠٠ کیلۆ) کاغەز بێت، بریتی بووە لە مەرامنامەی حیزبی دێموکراتی کوردستان، بەڵگەنامەکە - کە هاوتەریب لە دوو ستوونی فارسی و کوردیدا چاپ کراوە و...»

لاپەڕە ٢٣٤ و ٢٣٥، بەڵگەنامەی ژمارە FO371/52702 - ٢٦ی ئاپریلی ١٩٤٦ دەڵێ: «قازی محەممەد وا دەردەکەوێ کە تا ئەودەمەی کە بارودۆخ [ی] لە ئێران قایم بێت دژ بە ئاژاوە و هەرای ئەودیوی سنوورە، بەڵام دەگوترێ کە بە لایەنگرانی خۆی گوتووە کە دواتر لە عێراق دەبێ پشتگیری لە مەلامستەفا

بکرێت. دەگوترێ قازی لە پێوەندی کوردی تورکیا و سووریا دایە بە ڕێبەرانی«خۆیبوون»ەوە.»

کاک ئەنوەری سوڵتانی لە خوار ئەو بەڵگە، لەبەر گرینگی هەواڵەکە نووسیویەتی: «ئەم نامەیە بۆ حەقدە دائیرە و شوێن و کەسایەتی بریتانی لە ناوخۆ و دەرەوەی وڵات نێردراوە.»

هێنانەوە و نووسینەوەی دەقی بەڵگەنامەکان کە لە کتێبی «ڕۆژهەڵاتی کوردستان ...»دا هاتووە، لێرەدا کۆتایی دێ. ئەگەرچی ڕەنگە هێندێک هەواڵ دووپات بووبنەوە و خوێنەر لێی ماندوو بێ، بەڵام مەبەستم لە هێنانەوە و نووسینەوەی ئەو بەڵگەنامانە ئەوە بوو کە خوێنەر بە خوێندنەوەی ئەوان بزانێ کە بەڵگەکان تەواوکەری یەکترن و هەروەها لە نێوئاخنی بەڵگەکانیش زۆر لایەنی نادیاری مێژووی گەلەکەمان و لە هەمووان گرینگتر زەخت و فشاری ڕووسەکان بۆ سەر کوردان و بڕواپێنەبوونیان بە کورد و کارکردن بۆ هەڵخەڵەتاندنیان باس کراوە کە تێکڕا پێوەندییەکی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ بابەتەکانی ئەم کتێبەی ئێمەدا هەیە.

## شیکردنەوەی بەڵگەنامەکانی کتێبی «ڕۆژهەڵاتی کوردستان»

یەکێک لە گرینگترین بەڵگەکان، بەڵگەی لاپەڕە ١٤٨ی کتێبەکەیە کە لەودا باس لە ڕۆژی گیرانی پێنج ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک) کراوە و ڕۆژی پێنجەمی ئۆگۆست بە ڕۆژی گیرانیان دیاری کراوە کە بە پێی ڕێکەوتی بەڵگەکە: ئەم ڕووداوە لە ساڵی ١٣٢٤ی کۆچی هەتاوی (١٩٤٥ی زایینی) ڕووی داوە.

لە لاپەڕە ١٥٠، جێگری باڵوێزی ئینگلیس لە تەورێز دەڵێ: ڕۆژی چواری ئۆگۆست تەورێزم بەجێ هێشت. لاپەڕە ١٥١یش دەڵێ: ٨ی ئێواری گەیشتمە ورمێ و چاوم بە جێگری ئوستانداری (پارێزگار) ورمێ، (سەرهەنگ زەنگەنە) کەوت و هەر ئەو ڕۆژە (لاپەڕە ١٥٢) سەرهەنگ زەنگەنە باسی پێکهەڵچوونی نێوان پیاوەکانی زێڕۆبەگی هەرکی و ئەرتەش لە گوندی «بالانیش» دەکا، بەڵام وا دیارە هەر بەو هۆیەی سەرلەشکر زەنگەنە لە کتێبەکەی خۆیدا، بەرامبەر بە

رووسەکان باسی کردووە و دەڵێ لەبەر خۆتێهەڵقوتاندنی رووسەکان زوو ئەو چەند کەسەم بە گەمی بەرەو تاران نارد، زانیارییەکانی خۆی سەبارەت بە گیرانی ئەو چەند ئەندامەی کۆمەڵەی (ژ.ک) بە جێگری کۆنسوولی ئینگلیس لە تەورێزیش رانەگەیاندووە. لە لاپەڕە ١٥٤ دەڵێ: سەرلەشکر زەنگەنە باسی ئاڵای کوردستانی بۆ کردووە کە ئەوە هاوکاتە لەگەڵ گیرانی مامۆستا زەبیحی و هاوڕێیانی کە ئاڵای کوردستانیشیان پێ بووە. لێرە بۆمان دەردەکەوێ کە زانیارییەکانی سەرهەنگ زەنگەنە تازەن و دەگەڕێنەوە چەند رۆژێک دوای گیرانی ئەو چەند ئەندامەی کۆمەڵە. لە لاپەڕە ١٥٥دا باسی گیرانی پێنج مەئمووری کۆمەڵەی (ژ.ک) دەکا و زانیاری باشتر لە زانیاری پێشوو (ل ١٤٨) دەدا بە خوێنەر و دەڵێ: بە گەمی نێردراونەتە تەورێز. هەروەها دەڵێ سێ کەس لەو پێنج کەسە لە بەغدا دەرسیان خوێندووە و جگە لە کوردی، فارسی و تورکی، بە ئینگلیسی و عەرەبیش قسە دەکەن. دوو نەفەریشیان دەوری پاسەوانی ئەوانیان گێڕاوە. سەبارەت بەو کەس یا کەسانە کە دەڵێ جگە لە زمانی کوردی و فارسی و تورکی بە ئینگلیزیش قسەیان کردووە، ئەوە بە روونی یەکیان مامۆستا «زەبیحی»یە کە بە هۆی ئەوەی زۆر لە تەورێز بووە تورکی باش زانیوە و هەروەها بە پێی ئەو بەڵگانەی لەبەر دەستماندایە، زمانی ئینگلیسیشی زۆر باش زانیوە. (بڕوانە وتووێژی کاک عەلی کەریمی لەگەڵ دوکتور عیززەددین مستەفا رەسووڵ لە کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی» و هەروەها وتووێژی نووسەری ئەو بابەتە لەگەڵ کاک قادری تەووەککول و کاک عوبەیدیللا ئەییووبیان و هەروەها لاپەڕەکانی ٣٣ و ٣٤ی بەڵگەکانی کتێبی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان»).

کەسی دووهەم «کاک قاسمی قادری قازی»یە کە ئەویش تورکی و فارسی زۆر بە چاکی زانیوە. مەبەست لەو کەسەش کە عەرەبی زانیوە، کاک «محەممەد دڵشادی رەسووڵی»یە. کاک دڵشاد بە پێی قسەی زۆربەی ئەو کەسانەی لە نیزیکەوە ناسیویانە و بەتایبەتی بەپێی قسەی کاک دوکتور «عیززەددین مستەفا رەسووڵ» کە لە لاپەڕە ٢٥٩ و ٢٦٠ی کتێبەکەی دوکتور «هیمدادی حوسێن»دا هاتووە، ناوبراو لە بنەڕەتەوە خەڵکی مەهاباد بووە بەڵام لە کۆیە گەورە بووە و کاتێ کۆمەڵەی (ژ.ک) دامەزراوە هاتۆتەوە مەهاباد. کاک « عوبەیدیللا

ئەییووبیان» دەڵێ: «عەبدورڕەحمان و دڵشادی ڕەسووڵی هەردووک کوڕی «میرزا غەفووری ڕەسووی وێسنی» بوون.» کاک دوکتور عیززەددین مستەفا ڕەسووڵ دەڵێ: «بەر لە هاتنی بۆ مەهاباد لە عێراق (دارولموعەللیمین)ی تەواو کردووە» هەر بۆیە هیچ دوور نییە مەبەستی ڕاپۆرتدەری ئەو بەڵگەیە هەر کاک «محەممەد دڵشادی ڕەسووڵی» بووبێ کە عەرەبی بە باشی زانیوە.

بە پێی بەڵگەی لاپەڕە ١٥٦ «چاوپێکەوتن لەگەڵ «تەلعەتبەگی ئاچارە» و هەروەها ڕووداوی ئاڵۆزی سازکردنی چەند کەس دژی ئینگلیسییەکان کە چەند فیلمێکیان لە مەهاباد پێشانی خەڵک داوە، وا دەردەکەوێ ڕووسەکان هەموو ئەو هەوڵانەیان بۆ شکاندنەوەی کەسایەتی بەرپرسانی کۆمەڵەی (ژ.ک) و لە سەرووی هەمووانەوە پێشەوا قازی محەممەد بووبێ و بیانوویەکیش بێ بۆ ساردبوونەوە لە یارمەتییەکانیان بە کۆمەڵە. ئەگەرچی ڕێکەوتی ڕووداوەکانیش مەودایەکی چەند مانگیان پێکەوە هەیە، بەڵام بەپێی قسەکانی «هاشمۆف» و «عەلی ئەکبەرۆف»ی هاوڕێی کە دەڵێن «بە دەستووری مۆسکۆ ئێمە لە مانگی «جوون»ییەوە پێوەندی خۆمان لەگەڵ پارتی (ژ.ک) گۆڕیوە...» (بڕوانە ل ٩٤ی کتێبی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان) ڕاستی و دروستی ئەو قسانەمان بۆ دەردەکەوێ، بەتایبەت لەو جێیەی کە لە لاپەڕە ١٤٣دا دەڵێ: «ئەرمەنییەک کە ژنی ڕووسی هەیە و وێدەچێ ڕێبەری خۆپێشاندانەکە [خۆپێشاندانی کاتی هاتنی سینەمای ئینگلیسییەکان] بووبێت.» ئەو جێگایەش کە دەڵێ ئەو ئەرمەنییە و شەش کەسیش بۆ ماوەی چەند ڕۆژان گیراون و بردوویانەتە ورمێ و لەوێ زیندانی کراون، ئەو ڕاستییەمان ئەوەندەی دیکەش بۆدەسەلمێنێ کە هیچ دوور نییە ئەو کارانە بەئانقەست و بۆ سووککردنی پلە و ئیعتیباری بەرپرسانی کۆمەڵەی ژ.ک بە دەستی ڕووسەکان گەڵاڵە کرابێ، بەڵام بۆوەی پەتەیان وەسەر ئاو نەکەوێ، زۆر زوو بەرپرسانی ئەو ئاژاوەیان بۆ ورمێ ڕاگوێستووە. ئەگەرچی پێشەوا قازی محەممەد لە وتوویژی دەگەڵ «مستر لانگ» بەرپرسی «سینەمای پێوەندە گشتییەکانی بریتانیا» ئەو بابەتەی زۆر زوو هەست پێکردبوو و بە ناوبراوی ڕاگەیاندبوو کە ڕووسەکان خۆیان ڕووداوەکەیان ڕێکخستووە. لە لاپەڕە ١٤٨یشدا جێگری کۆنسوولی ڕووس ناوبژیچییەتی

قسەیە دووپات بۆتەوە، کەچی لە لاپەڕە ١٦٧دا هەر هەمان جێگر داوای پێشەوا قازی بۆ نێوبژی‌کردن لە مەسەلەی سێ نوێنەری کۆمەڵە رەت کردۆتەوە!.

لە لاپەڕە ١٥٨دا دەڵێ: «هاشمۆف بە کورتی باسی رووداوی باڵانیشی کردووە.» لێرەشدا بۆمان دەردەکەوێ ئەگەرچی ماوە بۆ ئازادکردنی ئەو نوێنەرانەی کۆمەڵەی (ژ.ک) هەبووە، بەڵام رووسەکان هیچ هەوڵێکیان نەداوە؟!

راپۆرتی ژمارە ١٤ی لاپەڕە ١٦٦ی کتێبەکە، قسەی ئەو کەسانەی کە پێشتر لە وتاری بەشی گیرانی مامۆستا «زەبیحی»دا باسمان لێکردن، دەسەلمێنێ کە یەکێک لە وان گرتنی کارمەندەکانی ئێرانی بوو لە مەهاباد کە بە تۆڵەی گیرانی ئەو چەند ئەندامەی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە لایەن کۆمەڵەوە دەسبەسەر کرابوون کە ئەو رووداوەش بە هۆی حیکمەتی پێشەوا قازی محەممەد و ئازادبوونی بارمتەکانی (ژ.ک) بە بێ‌ئەوەی رووداوێکی ئەوتۆی لێبکەوێتەوە کۆتایی پێدێ. هەروەها ئەو جێیەی کە دەڵێ: «کاتێ هەواڵ گەیشت کە سێ کەسیان ئازاد کران، ئەوانیش بارمتەکانی خۆیان بەرەڵلا کرد» مەبەست لەو سێ کەسە، رەنگە دوو چەکدارەکەی هاوڕێی مامۆستا «زەبیحی» بێ کە دەوری پاسەوانییان گێڕاوە کە تا ئێستا دوو کەس لەو سێ کەسە بۆ ئێمە ناسراون. یەکیان برایەکی کاک «سەعیدی قۆپی»یە و ئەوی دیکەشیان کاک «قادری تەووەککول»ە کە پێشتر باسی چۆنییەتی گیران و ئازادبوونیمان لە زمان خۆیەوە کرد. هەڵبەت وێشدەچێ قسەکانی رەعنا خانمی زەبیحی راست بن و ئەو سێ کەسە یەکیان مامۆستا زەبیحی بێ کە ئازاد کرابن و پاشان دیسان گرتبیانن‌ەوە.

لاپەڕە ١٦٧ باسی دامەزرانی لقی حیزبی توودە لە لایەن «میرزا غەفووری مەحموودی» و ئەرمەنییەک بە ناوی «ئارام» دەکا کە بە هۆی ئەو کارەیان دووبەرەکییان لە ناو ریزەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) ساز کردووە و بەپێی قسەکانی جێگری کۆنسوولی ئینگلیس لە تەورێز، ئەم هەوڵە ئەگەر هیچیشی لێنەکەوتبێتەوە، دژایەتی لەگەڵ دەسەڵاتی زۆری «پێشەوا قازی محەممەد» کردووە کە ئەوکات سەرۆکی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوو.

مامۆستا هەژار لە لاپەڕە ٧٣ و ٧٤ی «چێشتی مجێور»دا بە کورتی باسی گیرانی مامۆستا زەبیحی و هاوڕێکانی و هەروەها باسی ئەو ئەرمەنییە دەکا کە

پێشتر باسمان کرد کە ئەوەش راستی راپۆرتەکەمان تا رادەیەک بۆ دەردەخا. مامۆستا هەژار دەڵێ: «رۆژێک لە میاندواو لە بەر قاوەخانە لە سەر کورسییەک دانیشتبووم، کابرایەکی ئەرمەنی بە ناوی «ئارام کوردیان» هات لە تەنیشتم دانیشت، بە بێ ئەوە روو بکاتە من، لە بەرخۆیەوە گوتی: من ناتناسم، بەڵام ئەگەر تۆ هەژاری هەڵێ. سێ برادەرت: زەبیحی، قاسمی قادری و دڵشاد لە بالانیش گیراون و ئێستا دەیانهەوێ تۆ بگرن...» پاشان مامۆستا هەژار بۆ رێکەوتی ئەو رۆژە لە کتێبەکەی سەرلەشکر زەنگەنە کەلکی وەرگرتووە و دەڵێ «رۆژەکانی هەوەڵی مانگی (ئابان = خەزەڵوەر)ی ساڵی ١٣٢٤ بوو.»

دوکتور «قادری مەحموودزادە» (ئاسۆ)، لە لاپەرە ١٣٩ تا ١٤١ی کتێبی «خاطرات زندگی پر ماجرای دکتر آسو»دا، بەو چەشنە باسی «میرزا غەفووری مەحموودیان» و چارەنووسەکەی دەکا و دەڵێ: «شایعەیەک ساز بیوو کە لە قسان لە مەهاباد حیزبێکی تازە دامەزراوی کۆمۆنیستی بە سەرکردایەتی «میرزا غەفووری مەحموودیان» پێکهاتووە و لە بنەرەتدا دژی دەسەڵاتی قازی محەممەد دامەزراوە و رۆژبەرۆژ تاقمەکەیان لە زیادبووندایە... هەروەها دەیانگوت ئاغای مەحموودیان لەوانەیە لە جیاتی «قازی محەممەد» کاروباری ناوچە وەدەست بگرێ و «نەماز عەلی‌یێف»یش رەزامەندی خۆی دەربڕیوە و لەقسان ناوبراوی بۆ بەرپرسایەتی ئەو ئەرکە قورس و گرانە خستبووە ژێر فشاری خۆیەوە.» دوکتور ئاسۆ لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «لە قسەوباسی نێوخۆیی و خۆمانەی ئەوانەی سەبارەت بە بابەتەکانی رۆژ شارەزاییان هەبوو، باس دەکرا کە میرزا غەفوور ناچێتە ژێر باری قسەکانی «نەماز عەلی‌یێف» و بڕوای بە قسەکانی ناوبراو نییە، کەوایە دەبێ بە سزای خۆی بگا... جا هەر بۆوەی پێوەندی نهێنی ئەو [واتە نەماز عەلی‌یێف] دەگەڵ میرزا غەفوور لە قاو نەدرێ، وای بڵاو کردەوە کە لەقسان میرزا غەفوور لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی پێوەندی هەیە و بۆ ئێران جاسووسی دەکا. کەوایە ئەگەر جاسووسێک لە ناوچەدا هەبێ، بە روونی ئاژاوەچییەتی و دووبەرکی‌نانەوەکانی «نەماز عەلی‌یێف» لە قاو دەدرێ و لە راگەیەنەرە گشتییەکانی دنیا دەکەوێتە بەر گوێی هەموو کەس.» لە کۆتاییشدا

بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی و... بە بێ ئاگاداری پێشەوا تێرۆر دەکرێ.» کە ئەو باسەش ئەو داوایەمان دەسەلمێنێ کە کاربەدەستانی رووسیا، هەموو هەوڵ و تێکۆشانەکانیان بۆ لەناوبردنی ئیعتبار و لاوازکردنی هێزی کۆمەڵەی ژ.ک و ئاژاوەنانەوە بووە. لەو نێوەشدا تەنیا کورد زیانی دەدیت و لە ڕێبازەکەی دوور دەکەوتەوە.

دیسان هەر لە لاپەڕە ١٦٧ی کتێبی «رۆژهەڵاتی کوردستان...»دا هەواڵی ساردی دۆستایەتی نێوان رووسەکان و کۆمەڵەی (ژ.ک) دراوە کە ئەویش لەگەڵ کردەوەی رووسەکان لەو ماوەیەدا و بەتایبەتی یارمەتی نەدانی رووسەکان بۆ ئازادکردنی ئەو چەند ئەندامەی کۆمەڵەی (ژ.ک) یەک دەگرنەوە.

راپۆرتدەری ئەو بەڵگەیەش دەڵێ: «دەگوترێ هۆی ساردی رووسەکان ئەوەیە کە گومان دەکەن ئینگلیس پشتگیری کۆمەڵە بکا!» بە بڕوای من تێکدانی بەرنامەی «ترۆمبێلی سینەمای پێوەندە گشتییەکانی بریتانیا» لە مەهاباد و هەوڵنەدان بۆ ئازادکردنی ئەو سێ ئەندامەی کۆمەڵەی (ژ.ک) هەموو ئەو قسانەی ناو راپۆرتەکە دەسەلمێنن.

لاپەڕە ٢٣٤ باسی پێوەندی «پێشەوا قازی محەممەد» بە ڕێبەرانی کوردی حیزبی «خۆیبوون» لە کوردستانی تورکیا و سووریا دەکا کە رەنگە ئەو پێوەندییانە و راپۆرتەکانی سەبارەت بەو پێوەندییانە راست بن و لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی ئینگلیسییەکان وەرگیرابێ. هەر لەبەر گرینگی راپۆرتەکەیە کە ئەو بەڵگەیە بۆ زۆربەی دائیرە و شوێن و کەسایەتی دەرەوە و ناوخۆی وڵات نێردراوە. دروستی ئەو راپۆرتەشمان کاتێک بۆ دەردەکەوێ کە چاوێک لە یادداشتەکانی رۆژی ١٨ی مارسی ١٩٤٥ی (بەرامبەر لەگەڵ رۆژی یەکشەممە ٢٧ی رەشەمەی ١٣٢٣ی هەتاوی) «هاشمۆف» بکەین کە لە لاپەڕە ١٣٨ و ٢٥٢ی کتێبی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان»دا هاتووە و دەڵێ: «رۆژی ٢٧ی مارسی ١٩٤٥ (٧ی خاکەلێوەی ١٣٢٤ - سێشەممە) چاوم بە کەسایەتی بەناوبانگی کورد «شێخ عوبەیدیللا» [گەیلانی] کەوت کە گوتی: «ئەرکی سەر شانی کورد و سەرکردە ناسراوەکان، ئێستا هەوڵدان بۆ سەربەخۆیی کوردستانە، بۆ ئەم مەبەستەش لە لایەن پارتی ژێکافەوە زۆر هەوڵ دەدرێ کە کوردەکان یەک بگرن.

ئەمڕۆ زۆربەی کوردەکان ئەندامی پارتی ژێکافن. هەروەها کارێکی زۆر بۆ دابینکردنی یەکێتی دەگەڵ کوردی بەشەکانی عێراق و تورکیە دەکرێت. بە فەرمانی ژێکاف چەند کەس لە عێراقەوە بە رێگای سووریەدا نێردراونە تورکیە، تا کوردەکانی تورکیە رێکبخەن و چالاکیان بکەن، بەڵام نێردراوەکان لە لایەن کاربەدەستانی تورکەوە گیراون و تا ئێستا هیچ هەواڵێکیان لێ نەزانراوە.»

کاک عەلی کەریمی لە لاپەڕە ٣٦٣ی کتێبەکەیدا (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی)، لە درێژەی وتووێژێکیدا کە لەگەڵ مامۆستا «ئیبراهیم ئەحمەد» پێکیهێناوە، باسی کۆمەڵەی هیوای کردووە. مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە وەڵامدا سەبارەت بە ئەندامانی لقی ژ.ک لە باشووری کوردستان و رۆژئاوای کوردستان دەڵێ: «هینەکەی [کۆمەڵەی] ئێمە ناوی «لقی کوردستانی عێراق» بوو، نەک لقی سلێمانی، چونکە ئێمە تەنزیمان لە زاخۆ، لە شەقلاوا، لە دهۆک، لە هەولێر، لە جێی وا دووسێ ئەندا[م]مان بوایە، تەنزیمان دروست ئەکرد، (لە سووریا) ئێمە بۆمان کردن. کەسی کە نەیکرد، ئێمە لقی کۆمەڵەی (ژ.ک)مان بۆ دروست کردن لەوێ، فەقەت ئیقتراحە (= داوا)کەی ئێمە ئەوە بوو هی سووریا کوردستان نەبێ، هەر کورد بێ. جا رەئیەکەی ئێمەش ئەوە بوو گۆیا ئەگەر نەڵێین «کوردستان» نەختێک دوژمنایەتییەکە کەمتر ئەبێتەوە لەگەڵ سووریا، یانی ئەبێ بە موشکیلەیەک وەک موشکیلەی ئەقەللیات سەیر بکرێ کە بە ئاسانی حەل کرێ. بەئاسانتر لەوەی «کوردستان» حەل ئەکرێ وە ئێستاش تەقریبەن هەروا مایەوە.» کە ئەوەش بە روونی بۆمان دەردەخا کە ژ.ک لە «کوردستانی سووریا» ش چالاکی هەبووە و تەنانەت لقێکی لەوێش دامەزراندووە.

بەڵام ئەو راپۆرتەی «هاشمۆف» جگە لە وەی راپۆرتی جێگری کۆنسوولی ئینگلیس لە تەورێز دەسەلمێنێ، ئەو راستییەشمان بۆ روون دەکاتەوە کە لە «پەیمانی سێسنوور»، نوێنەری کوردستانی تورکیا و سووریا بەشداری پەیمانەکە و وتووێژەکانی نەبوون، چونکە راپۆرتەکە ١٨ی مارسی ١٩٤٥ نووسراوە و بە گوێرەی هەواڵەکانیش، نێردراوەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) بۆ تورکیا

بۆتەوە، لە جۆزەردانی ساڵی ١٣٢٣ (واتا مانگی مەی یا ژووئەنی ١٩٤٤) پێکهاتووە کە لەگەڵ ئەو بەڵگەنامە نیزیک ساڵێکیان نێوانە.

بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەو زانیارییانەی کتێبی «ڕۆژهەڵاتی کوردستان...» کە هەر جارەی زانیارییەکی نوێی سەبارەت بە گیرانی سێ یا پێنج ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک) داوە، مێژووی دروست و دوور لە هەڵەی گیرانی مامۆستا زەبیحی و دوو هاوڕێیەکەی دیکەی (کاک قاسمی قادری قازی و کاک دڵشادی ڕەسووڵی)، ڕۆژی ٥ی ئۆگۆستی ساڵی ١٩٤٥ بووە کە ئەو ڕۆژە بەرامبەرە دەگەڵ ڕۆژی یەکشەممە ڕێکەوتی ١٤ی گەلاوێژی ١٣٢٤ی کۆچی هەتاوی. بەو پێیە بە ڕوونی دەتوانین بڵێین ئەو ڕۆژە بەپێی هەموو ئەو بەڵگەنامانەی تا ئێستا باسمان لێکردن، ١٤ی گەلاوێژی ١٣٢٤ ڕووی داوە کە بەو حیسابە ئەو ڕوونکردنەوەی ئێمە لەگەڵ هەواڵی ئاگاداری «ڕۆژنامەی کوردستان»ی ژمارە ١٤ی ڕێکەوتی ٢٤ی ڕێبەندانی ١٣٢٤ کە دەڵێ: «ئەو سێ ئەندامەی کۆمەڵەی (ژ.ک) هەشت مانگ لەمەوبەر گیرابوون و ئێستا ئازاد بوون و ...» جیاوازی هەیە و ئەو ماوەیە بەر لە ڕێکەوتی ئازادبوونی ئەو سێ ئەندامە واتا هەشت مانگ بەر لە ئاگاداری ڕۆژنامەی کوردستان، دەکەوێتە ڕۆژەکانی کۆتایی جۆزەردانی ١٣٢٤. کە ئەو ڕوونکردنەوە (واتە ڕوونکردنەوە لە رووی کتێبی ڕۆژهەڵاتی کوردستان...) لەگەڵ ئاگادارییەکەی ڕۆژنامەی کوردستان (مانگ‌ونیوێکیان) مەودا هەیە کە بەو حیسابە ئاگادارییەکەی ڕۆژنامەی کوردستان دەکەوێتە شک و گومانەوە و مەودای گیران هەتا ئازادبوونی ئەو ئەندامانە ناکاتە هەشت مانگ و شەش مانگ دروستتر و نیزیکترە لە ڕاستی ڕووداوەکە. بەکورتی: ئەو سێ ئەندامەی کۆمەڵەی ژ.ک، ڕۆژی یەکشەممە ١٤ی گەلاوێژی ١٣٢٤ بەرامبەر لەگەڵ ٥ی ئۆگۆستی ١٩٤٥ گیراون و بەپێی هەواڵی «ڕۆژنامەی کوردستان»ی ژمارەی ١٩ی ڕۆژی دووشەممە ٦ی ڕەشەمەی ١٣٢٤، ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ٣ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ بەرامبەر دەگەڵ ٢٢ی فێورییەی ١٩٤٥یش ئازاد کراون.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم چەند زانیارییەکی نوێ سەبارەت بە دەرچوونی دوایین ژمارەی نوسخەی ئەسڵی گۆڤاری «نیشتمان» و دوابەدوای ئەویش گیرانی

مامۆستا «زەبیحی» لە مەهاباد بخەمە بەر باس و لێکۆڵینەوە. هەروەک پێشتر باسمان کرد، مامۆستا زەبیحی لە تەورێز خەریکی چاپی ژمارەی نوێی گۆڤاری «نیشتمان» بوو کە لەسەر داوای نێردراوی کۆمەڵەی (ژ.ک) کاک «سەدیقی حەیدەری» پێی رادەگەیەندرێ کە هەموو کەرسەکانی چاپی گۆڤارەکە کۆ بکاتەوە و وێرای ئەو بگەڕێتەوە مەهاباد. گوتیشمان هەر دوابەدوای هاتنەوەی لە تەورێز بۆ ماوەیەک دەسبەسەر دەکرێ. هەتا ئێستا هیچ بەڵگەیەکی نووسراو لە سەر ئەو رووداوە بلاو نەبۆتەوە، بەڵام بە چاوخشاندنێکی ورد و قووڵی ژمارەی کۆتایی نوسخەی ئەسڵی و دەسکارینەکراوی گۆڤاری «نیشتمان»ی ژمارە (٧و٨و٩) زۆر بابەتی گرینگمان بۆ روون دەبێتەوە.

پێش ئەوەی بچینە ناو باسی گۆڤاری «نیشتمان»ەوە، با ئاورێک لە پشتی پەردەی چەند رووداوی سەردەمی دەسەڵاتی کۆمەڵەی (ژ.ک) بدەینەوە کە تا ئێستا بەوردی باسیان لێنەکراوە و بەڵگەیان لەسەر بلاو نەکراوەتەوە. بە شێوەیەکی گشتی و بەپێی ئەو کتێب و نووسراوانەی لەو دواییانەدا بلاو بوونەتەوە، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە، تەواوی ئەو بەربەست و دوورخستنەوە و دەسبەسەریانەی ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە ژێر کاریگەری و فشاری لە رادەبەدەری بەرپرسانی سۆڤیەت بووە کە راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ بۆ لە ناوبردنی ئەو کۆمەڵەیە کاریان دەکرد و نەیاندەویست وەک رابردوو پشتیوانی لێبکەن. تەنانەت لە سەفەری دووهەمی پێشەوا قازی محەممەد بۆ باکۆ، «باقرۆف» سەرۆکی ئازەربایجانی شووڕەوی بەئاشکرا باس لە گۆڕینی ناوی کۆمەڵەی (ژ.ک) و هەڵوەشاندنەوەی ئەم کۆمەڵەیە دەکا.

٢

# چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی ژ.ک

«ویلیام ئیگلتۆن» لە کتێبی «کۆماری ١٩٤٦ی کوردستان» لاپەڕە ٨٩ و ٩٠ باسی سەفەری دووهەمی «پێشەوا قازی محەممەد» و هاوڕێیانی بۆ باکۆ دەکا کە لە سەرەتای مانگی ڕەزبەری ساڵی ١٣٢٤ (کۆتایی سێپتامبری١٩٤٥) پێکهات و لە زمان «باقرۆف»ەوە دەڵێ کە «میر جەعفەر باقرۆف» گوتی: «کۆمەڵەی (ژ.ک) بەو تەشکیلاتەی هەیەتی هیچ کات ناتوانێ قازانجێک [بە کورد] بگەیەنێ... بزووتنەوەی خەڵکی کورد تەنیا لە ژێر ئاڵای «حیزبی دێموکراتی کوردستان» دەتوانێ پێشکەوتنی هەبێ و دواڕۆژێکی باشی هەبێ».

«و.م. مۆلۆتۆف»، کۆمیسێری گەلیی کاروباری دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت لە نامەی ژمارە ١٤٢م - ٣١ی ئاگۆستی ١٩٤٢ بۆ باڵوێزی یەکێتی سۆڤیەت لە ئێران (هاوڕێ سیمیرئۆف) کە لە لاپەڕە ٨٦ تا ٩٠ی کتێبی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان»دا دەقی نامەکەی هاتووە؛ لە نامەیەکی دوورودرێژیدا سەبارەت بە هەڵوێست و سیاسەتی سۆڤیەت بەرامبەر بە کوردان دەڵێ: «بۆ بەرگری کردن لە بەهەڵەداچوونی نوێنەرەکانمان دەبێ بە لێبڕاوی لە هێڵی نادروستی خۆشوبێش کردن لەگەڵ کوردان دووری بکرێ و لە پێناو پتەوکردن و پەرەپێدانی پێوەندییەکانمان لەگەڵ دانیشتووانی خۆجێیی، لە پلەی یەکەمدا ئازەرییەکان، هەنگاو بنرێت... کاربەدەستەکانمان لە ئازەربایجانی ئێراندا نابێ بڕوایان بە

سەرۆکە کۆنەپەرست و خۆفرۆشەکانی کورد هەبێ، بەڵکوو دەبـێ حیـساب بـۆ ماکەی پێشکەوتوو لە نێو دانیشتووانی ئازەربایجاندا بکەنەوە، ئەمە بەو مانایە نییە کە ئێمە لە تەواوی پێوەندییەکانمان لەگەڵ کوردان و کەلکوەرگـرتن لـەو پێوەندییانـە بـۆ بەرژەوەنـدیی خۆمـان چـاو بپۆشـین. بەڵـکوو لـە کـارە سیاسییەکانمان لە باکووری ئێراندا دەبێ لەسـەر ئازەربایجانییـەکان حیـساب بکەین... لە پێناو ئەو مەبەستە دەبێ بە لێبڕاوی لە پـشتیوانی کـردنی کـوردان دوورەپەرێزی بکرێ و هیچ چەشنە کۆسپێک لـە ئاسـت دەسـەڵاتدارانی ئێـرانی سەبارەت بە راگرتنی هێمنایەتی پێک نەهێنرێ.»

لە کۆتایی نامەکەشـدا مۆلۆتـۆف دەڵـێ: «دەبـێ دان بـەوە دابنـێین کـە پشتیوانی کـردن و یارمەتیـدان بـە کـوردان لـە پێنـاو هـەوڵ و تێکۆشـان بـۆ وەدیهێنانی خودموختاری و دامەزرانـدنی کوردسـتانێکی ئـازاد دروسـت نییـە. چونکـە لـە هـەلومـەرجی ئێـستای ئێرانـدا ئـەوە داوایـەکی بـێبناغـە و دواکەوتووانەیە.» مۆلۆتۆف لەو جێیە کە دەڵێ: «هیچ چەشنە کۆسپێک لە ئاست دەسەڵاتدارانی ئێرانی سەبارەت بە راگـرتنی هێمنایـەتی [ناوچـەی کوردەکـان] پێکنەهێندرێ.» مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر دەسەڵاتدارانی ئێرانی، هێمنایـەتی ئەو ناوچانەی کوردی لێ دەژی بپارێزن، ئەوە ئـەوکات کـوردیش بیانوویـەکی نامێنێ کە داوای هەقی خۆی بکا و ببێتـە سـەربزێو کـە ئـەوەش ناڕاسـتەوخۆ تەواوی ئامـانج و بـیروڕا و تێبینییـەکانی مۆلۆتـۆف و بەرپرسـانی رووسـیا جێبەجێ دەکا.

هەر لە سەرچاوەی پێشوودا لە لاپەڕە ٩٤ و ٢٥٤دا کۆنسوولی سۆڤیەت لـە ورمـێ لـە بەشـێک لـە یادداشـتەکانی ١٨ی مارسـی ١٩٤٥ی خـۆی و «عـەلی ئەکبەرۆف»ی هاوڕێیدا دەنووسـێ: «بـە دەسـتووری مۆسـکۆ ئێمـە لـە مـانگی جوونییـەوە (ژووئـەن) پێوەنـدی خۆمـان لەگـەڵ پـارتی (ژ.ک) گۆڕیـوە و لـە دیدارەکانماندا لەگـەڵ ناسـراوەکانی کـورد بـەپارێزەوە تێمانگەیانـدوون کـە بیروباوەڕی «سەربەخۆیی بۆ کوردستان» واقعگەرایانە نییـە و پتـر دوژمنـانی گەلی کورد پشتیوانی لێدەکەن و هەر ئەوانیش کەمتر لە هەموو لایـەک بـیر لـە ئازادی و سەربەخۆیی راستەقینەی گەلی کورد دەکەنەوە. بـە مەبەسـتی باشـتر

کردنی ژیانی گەلی کورد، ئێمە بە ئەندامانی پێشکەوتووخوازی پارتی ژێکاف پێشنیار دەکەین، بۆ مافی یەکسانیی کورد لە چوارچێوەی یاسای ئێراندا لەسەر بنچینەی دێموکراتییانەی ولات هەول بدەن...»

کاک «غەنی بلووریان» لە لاپەڕە ٥٦ و ٥٧ی «ئاڵەکۆک»دا باس لە چوونی «پێشەوا قازی محەممەد» بۆ باکۆ و تەورێز دەکا کە لەسەر داوای رووسەکان پێکهاتبوو و دەڵێ: «دوای هاتنەوەی پێشەوا قازی محەممەد بۆ مەهاباد، رێبەرانی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە ناوەندی کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوە. هەر لە دوای ئەو سەفەرە بوو کە قازی محەممەد باسی لە پێوەندی نێوان ئینگلیس و کۆمەڵەی (ژ.ک) دەکرد و دەگوترا سۆڤیەت لە پێوەندی نێوان کاربەدەستانی کۆمەڵە و ئینگلیس ناڕازییە.»

کاک غەنی لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «من بە نوێنەرایەتی رێکخراوی لاوانی کۆمەڵە بۆ ئەو کۆبوونەوە بانگ کرام. تا ئەو جێیەی لە بیرمە قازی سەر[ی] قسەکانی کردەوە و گوتی: «دروشمی کۆمەڵەی (ژ.ک) بۆ هەموومان جێگەی رێزە و دەزانین بە تەواوی بەرگری لە مافی گەلەکەمان دەکا، بەلام رۆژگار جۆرێکە کە هیچ لایەنێکی جیهان داکۆکی داخوازەکانی ئەمڕۆی (ژ.ک) ناکات. گەیشتن بەو ئامانجە رێگەیەکی پڕ هەوراز و نشێوە و ئەمڕۆکە ئاسۆیەکی روون بۆ ئەو ئاواتە بەدی ناکرێ. کەواتە پێویستە ئێمە چاوێک بە داخوازەکانماندا بخشێنین و لەگەڵ هەلومەرج رێکیان بخەین و لایەنگرییان بۆ بدۆزینەوە. بە رای من داوای ئەمڕۆمان دەبێ لە چوارچێوەی خاکی ئێراندا هەڵسەنگێندرێ و شتێک لە پرۆگرامی خۆماندا بگونجێنین کە دەگەڵ دەقی یاسا و دەستووری ئەمڕۆی دەوڵەتی ئێران بگونجێ. بەپێی ئەو بۆچوونە پێویستە ناوی کۆمەڵەش بگۆڕدرێ و قالبێکی نوێ دانێین کە لەگەڵ دروشمە تازەکانماندا بێتەوە. لە رەنگ و روخسار و شێوەی گوتنی قازی دەردەکەوت کە راگەیاندنەکەی زۆر بە دڵ نییە بەلام وەسەرەخۆی نەدەهێنا. قازی محەممەد لە دەقی گوتنەکانیدا ئاماژەی بە دۆستایەتی ستراتێژی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت کرد و گوتی : «بەداخەوە جگە لەو هیچ دەوڵەتێک لەو دنیا بەرینەدا لانی ئێمەی کورد ناگرێ. دیارە ئەویش بەرژەوەندی خۆی لەم کارەدا دەبینێ کە سووکە چاوێکمان لێ بکات.»

کاک غەنی لە لاپەڕە ٥٨یشدا دەڵێ: «بەمجۆرە لە ڕۆژی ٢ی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٢٤ - ١٩٤٥ (بەرامبەر دەگەڵ ڕۆژی یەکشەممە ٢٤ی ئۆکتۆبری ١٩٤٦) کۆنگرەی یەکەمی حیزبی دێموکڕات بەسترا. لەو کۆنگرەیەدا ناوی کۆمەڵەی (ژ.ک) و دروشمەکانیان گۆڕی. داخی گرانم گۆڕینی دروشمەکانی (ژ.ک) پاشەکشەیەکی نالەبار بوو لە مێژووی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی کوردستاندا کە هەلومەرج بەسەر نەتەوەی ئێمەیدا سەپاند.»

مامۆستا هێمن لە لاپەڕە ٢٢ و ٢٣ی «تاریک و ڕوون»دا و لە پێشەکی دیوانەکەی، لە بەشی لە کوێوە بۆ کوێ؟ دەڵێ: «دەستەیەک لە ڕووناکبیران و ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) هاتنە سەر ئەو بڕوایە کە جێبەجێکردنی بەرنامەی کۆمەڵە لە هەلومەرجی ئێستای جیهان و کوردستاندا کەمە. بۆیە بەرنامەیەکی کورت و نوێیان کە لەگەڵ هەلومەرجی ئەو سەردەمیدا دەگونجا، گەڵاڵە کرد و لە ڕۆژی سێی خەزەڵوەری ١٣٢٤ - ١٩٤٥ یەکەم کۆنگرەی حیزبی دێموکراتی کوردستان هەر لەسەر بناخەی ڕێکخراوی کۆمەڵەی (ژ.ک) دامەزرا و تەنیا لە کادری ڕابەریدا ئاڵوگۆڕێک پێکهات و پێشەوا قازی محەممەد کە ئەندامێکی سادەی کۆمەڵە بوو و ناوی نهێنی «بینایی» بوو بە پێشەوای حیزب هەڵبژێردرا و سەرۆکی کۆمەڵە کە پیاوێکی زۆر تێکۆشەر و ئازا و پاک بوو لە کادری ڕابەریدا نەما.»

کاک دوکتور «عەبدوڵڵا مەردووخ» لە لاپەڕە ٣٣ی ژمارە ١٤ی گۆڤاری «گزینگ» لە بەشی دووهەمی وتاری «کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد و کۆمەڵەی هیوا»دا دەڵێ: «دیارە هەڵوەشانەوەی ژ.ک بە ئاسانی نەدەکرا، لەپێشدا هاتن ڕابەران و بەرپرسانی دڵسۆز و لێهاتووی کۆمەڵەیان یا وەلانا، یا دووریان خستنەوە و لە جێگای ئەوان دیسانەوە چوونەوە لای ئاغا و مەلا و سەرۆکی عەشیرەت کە ئەوەندە بە تەنگ جووڵانەوەکە نەبوون. بۆ نموونە «عەلی ریحانی» بەرپرسی گەڕەکی بازاڕی شاری سابلاغ [بوو]... وەلانا ... یا حاجی عەبدوڕڕەحمانی ئیلخانیزادە (موهتەدی) کە بە نووسین و بە پارە هەوڵی بۆ ژ.ک دەدا... وە بەڕواڵەت کرابوو بە وەزیری ڕاوێژ، بەڵام بەباشی دیار بوو ئەویش لە

ڕەسووڵی و قاسمی قادری قازی، سێ ئەندام و بەرپرسی ماندوویی‌نەناس بە دوای کارێکدا ناردران کە ئەرکی ئەوان نەبوو. کۆمەڵێکیش کە هەر ناڕازی بوون ناچار وازیان هێنا... پۆلێکی زۆر لە دڵسۆزە بەڕاستییەکانی ژ.ک هاتن دە حیزبی تازەوە و تەواوی حەول و تەقەلایان ئەوە بوو کە بەرنامە و پرۆگرامەکانی پێشوو لەو قالبە تازەیەدا بەڕێوە بەرن. داخەکەم هەوڵ و تەقەلای بێخەوشی وانە بەرهەمێکی کە چاوەڕوانی دەکرا، نەیبوو و نەیدا. چەند کەسیش تووڕەبوونی خۆیان لەم کارەساتە بە شێعر و نووسین دەربڕی...»

لە کۆتاییشدا نووسەر شێعرێکی «خاڵەمین»ی شاعیری هێناوە کە وادیارە لەو بارودۆخەی پاش گۆڕینی ژ.ک و دامەزراندنی حیزبی دێموکڕاتی کوردستان تووڕە بووە و ناڕەزامەندی خۆی دەربڕیوە.

کاک «مەحموودی مەلاعیززەت» لە لاپەڕە ١٠٠ و ١٠١ی کتێبەکەیدا (جەمهوریەتی کوردستان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و سیاسییە)، بەبێ ئەوەی سەرچاوەی ئەو قسانەی نووسیبێ کە لە چ کتێبێک کەلکی وەرگرتووە، سەبارەت بە هەڵوەشانی ژێکاف دەڵێ: «قازی محەممەد لە دیدەنییەکی ڕۆژنامەنووسی هەواڵدەری ئاژانسی دەنگوباسی - تاس - ڕاستەوخۆ ئەو ڕاستییە دەدرکێنێت کە چۆن ژێکاف هەڵوەشا و گەلێک شتی تر باس دەکا: «تەورێز ١٧ی ژانوییەی ١٩٤٦ [پێنجشەممە ٢٧ی بەفرانباری ١٣٢٤] ڕۆژنامەنووسی هەواڵدەری تاس لەگەڵ سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دێموکڕاتی کوردستان، «قازی محەممەد» و سەرۆکی ئەنجوومەنی کوردستان، «حاجی بابە شێخ» وتووێژی کرد. قازی محەممەد دوای ئەوەی بەدرێژی باسی گەلێک شۆڕش و ڕاپەڕین دەکات تا داڕووخانی ئیدارەی حکوومەتی و... ئینجا وتی: لەم ماوەیەدا ئێمە پارتی ژیانی کورد (ژیانەوەی کوردستان)مان پێک هێنا کە ڕێکخراوەیەکی نهێنی بوو، بۆچوونێکی ناسیۆنالیستانەی هەبوو، مەبەستی پێک هێنانی دەوڵەتێکی گەورەی کوردستان بوو. دەسەڵاتدارانی ئێرانی بێشک هەوڵی چاندنی دوژمنایەتی نێوان خێڵەکانی کوردیان دەدا. بەڵام بە کۆتایی هاتنی شەڕ هەموو هەوڵەکان بە ڕێگای دێموکڕاتیدا ڕۆیشتنە پێش. پارتی ژیانەوەی کوردستان لە لایەن ئێمەوە هەڵوەشێنرایەوە و حیزبی دێموکڕاتی

کوردستانمان ڕێکخست. بە دروست بوونی «حیزبی دێموکڕاتی کوردستان» ئێمە بە یەکجاری کۆتاییمان بە دوژمنایەتی نێوان خێڵەکان هێنا و داخوازی ڕێبەرایەتی خێڵەکانمان بۆ دەسەڵات وەرگرتن لە ناو برد...»

کاک «عەبدوڵلا ئەحمەد ڕەسووڵ پشتدەری» کە پێشمەرگەیەکی سەردەمی کۆماری کوردستان بووە، لە لاپەڕە ٤٦ و ٤٧ی بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا (یادداشتەکانم)، باسی ڕۆیشتنی نوێنەرانی کورد بۆ باکۆ دەکا کە بۆ جاری دووهەم بە سەرۆکایەتی پێشەوا قازی محەممەد لە مانگی ئەیلوولی ١٩٤٥ (سەرەتای مانگی خەزەڵوەری ١٣٢٤) پێکهات و دەڵێ: «باقرۆف گوتوویەتی سەربەخۆیی تەواو لەو بارودۆخەدا ئیمکانی نییە. بەڵام حکوومەتی ڕووسیە بە مەرجێ کە کورد لە ژێر دەسەڵات و لە ژێر چاوەدێری فیرقەی ئازەربایجانی ئێران بن، پشتیوانی لە مافەکانی کورد دەکا.» هەروەها دەڵێ: «باقرۆف ڕاسپاردەشی کردبوون کە دەبێ ناوی کۆمەڵە بگۆڕن و بیکەن بە حیزبی دێموکڕاتی کوردستان.» کاک عەبدوڵلا ئەحمەد لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «ئەوە بوو نوێنەرانی کورد گەڕانەوە مەهاباد و لە کۆتایی مانگی تشرینی ساڵی ١٩٤٥دا کۆبوونەوەیەکی فراوان پێکهات و ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیران و سەرۆک خێڵەکانی ئێران (= مەبەست خێڵە کوردەکان) لەو کۆبوونەوەدا بەشدارییان کرد. قازی محەممەد کەوتە قسەکردن دەربارەی وەزعی سیاسی کوردستان و ئەنجامی سەفەرەکەیان بۆ ڕووسیا و هەروەها پێشنیارەکانی باغرۆفی لە بابەت خودموختاری و گۆڕینی ناوی (کۆمەڵە) بۆی باس کردن. پاش ئاڵوگۆڕی بیروڕا ئەوە بوو کە وا زۆربەی خەڵک ڕازی نەبوون بە مافی خودموختاری (حوکمی زاتی)یەکەی کە لە ژێر دەسەڵات و چاوەدێری (فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان)دا بێت و لە مافی سەربەخۆیی کەمتر کەس نەئەهاتە خوارەوە. بەڵام دەربارەی گۆڕینی ناوی کۆمەڵە بە حیزبی دێموکراتی ئێران (= مەبەست کوردستان) هەموو کەس پێی باش بوو و بڕیاری لەسەر دا و ئەو ناوە جێگای خۆی گرت و دروشمی حیزبی دێموکڕات بەرز کرایەوە. لەم کۆبوونەوەیەدا قازی محەممەد پێشنیاری کرد کە باشتر ئەوەیە ئێمەی کورد ناوان (نێوان) و پێوەندی خۆمان لەگەڵ (فیرقەی دێموکڕاتی تەورێز) پتەوتر بکەین و ماوە نەدەین کە [illegible]»

کاک عەبدوڵلا ئەحمەد لە لاپەڕە ٦٧ و ٦٨یش باس لە دیدارێکی خۆی لەگەڵ پێشەوا قازی محەممەد دەکا و دەڵێ: «... و هەروەها وتی (مەبەست قازی محەممەد) ئێمە لەگەڵ وەفدی (فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان)دا ئەچینە تاران و داوای ئێمە تەنیا خودموختاری (حوکمی زاتی)یە بۆ هەردوو نەتەوەی کورد و تورک لە ئێراندا و ئەگەر حکوومەتی مەرکەزی ئەم مافەمان بۆ بسەلمێنێت ئێمەش رازی ئەبین هەرچەند کەمیش بێت چونکە بارودۆخی سیاسی ئێمە لەو هەلومەجەی ئێستادا هەر ئەوەندە یارمەتیمان ئەدات و وتی تورکەکانی تەورێز کە خۆیان زۆر لە ئێمە زیاتر سەیر ئەکەن و هێزیشیان لە ئێمە گەلێک زیاترە و [لە]گەڵ ئەوەشا بارودۆخی سیاسی ناچاری کردووین کەوا لەپێش ئێمەدا بکەونە وتووێژ لەگەڵ حکوومەتی تاراندا و بە خودموختاری (حوکمی زاتی) رازی بن و ئەگەر بێت و ئێمەش وا نەکەین و هەر رێگای شەڕ بگرین نەک هەر هیچکەس پشتیوانیمان لێ ناکات بەڵکوو دۆستەکانیشمان لێ ئەبنە دوژمن. ئیتر لە قسەکانی قازی محەممەد زۆر باش دەرکەوت کە وا ئەم وتووێژە لە رووی ناچارییە و لە ژێر گوشاری (زەختی) حکوومەتی رووسیایە و ئەوە بوو قازی محەممەد خواحافیزی لە ئێمە کرا و لەگەڵ حاجی بابەشێخ (سەرەکوەزیری کۆمار) کەوتنە رێگا بەرەو تاران...»

مامۆستا هێمن لە لاپەڕەکانی ٢٠ و ٢١ی پێشەکی «تاریک و روون»دا سەبارەت بە کۆمەڵەی ژ.ک دەڵێ: «کۆمەڵە، بێجگە لەوەی کۆمەڵەیەکی سیاسی بوو، کۆمەڵەیەکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیش بوو. زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵە بڕوایان بەو سوێندە هەبوو کە خواردبوویان و دەستیان لە ئاکاری دزێو هەڵگرتبوو. دزی، خراپە و نێوانناخۆشی لە کزی دابوو و دەتوانم بڵێم لە هێندێک جێگایان هەر نەما. هێندەی پێنەچوو کۆمەڵە سەرانسەری کوردستانی ئێرانی تەنییەوە و پەلی هاویشت بۆ پارچەکانی تری کوردستان، بەتایبەتی لە کوردستانی عێراقدا لکی کۆمەڵە زۆر پەرەی گرت و بەهێز بوو.»

مامۆستا هەژار لە لاپەڕە ٦٠ی کتێبەکەیدا (چێشتی مجێور)، سەبارەت بە کۆمەڵەی ژ.ک دەڵێ: «لە درێژایی تەمەنمدا کە ئێستا لە پلەی حەوتەم و لە شێستوسێ ساڵیدا دەژیم، زۆرم حیزب لە نیزیکەوە دیتوون، باسی رەفتار و

رابردووی زۆریانم خوێندۆتەوە، زۆر چەتوونە هیچ کۆمەڵێک وەک ئەندامانی «ژ.ک» ئاوا فیداکار و دڵگەرم و یەکترخۆشەویست بووبن. دەربارەی ئەسحابەی پێغەمبەر زۆر باسی یەکدڵی و فیداکاری هەیە، وەختە بڵێم ئەندامانی ئەو حیزبەش شتێکی وا بوون. خۆدزینەوە لە فەرمان، درۆ، خۆخوازی، فێڵبازی بەجارێک تەرە ببوو، لە حەوت کێوان ئاوا ببوو. ماڵی دنیا هەر بۆیە مایەی دڵخۆشی بوو کە کۆمەڵە پێی لازم بێ.»

سەبارەت بەوەی کە هێندێک کەس پێیان وایە ژ.ک لە لایان رووسەکان دروست کراوە، دیسان مامۆستا هەژار لە لاپەڕە ٦٥ی سەرچاوەی پێشوودا دەڵێ: «زۆرکەس لایان وایە کە حیزبی ژ.ک رووسان دروستیان کردووە، کە خوا هەڵناگرێ راستی بۆ نەچوون. کاتێک کە حیزب بۆ هەوەڵ جار لە سابلاغ دامەزرا، رووس هیچ ئاگایان لێ نەبوو. دەمانەویست کە بەڕەسمی بمانناسن و یارمەتیمان بکەن، بەڵام هەرچی کۆششمان کرد جوابیان نەدایەوە. لە ئاخریدا کە دیتیان هێزوپێزێکمان پێکەوە ناوە، ئەوانیش لەشکری زۆریان لە وڵاتەکەدا بوو، نەیانویست وڵاتەکە ئەمین نەبێ و نەوەکا ئینگلیس بەهرەمان لێوەرگرێ. گوتیان حیزبەکەتان رەوایە و ئێمە مانعتان نابین و ئێوەش لە نووسراوەی خۆتاندا هەواڵەتی ئێمە بکەن. کوێرە چت دەوێ دوو چاوی ساغ.»

لە لاپەڕە ٧٢ و ٧٣شدا سەبارەت بە گۆڕینی ناوی کۆمەڵەی ژ.ک و دامەزراندنی حیزبی دێموکڕاتی کوردستان و هاتنی ئەندامی خەیانەتکار بۆ نێو ژ.ک دەڵێ: «قازی و هەوالانی کە لە دووهەم سەفەری باکۆ گەڕانەوە، رایانگەیاند: رووس لە ناوی ژ.ک رازی نین چونکە حیزبێکە بۆ ئازادی هەموو کوردستان تێدەکۆشێ و ئینگلیس و تورکان توورە دەکا؛ دەبێ ناوی خۆمان بنێین «حیزبی دێموکڕاتی کوردستان» و داوای خودموختاری لە ئێران بکەین. زۆرمان ئەو خەبەرە لەبەر گران هات، بەڵام چار چییە، قبووڵ کرا. من ئێستاش نەمتوانی ناوی ژ.ک لەخۆم دوور کەمەوە و کارتی حیزبایەتی دێموکڕاتم هەر وەرنەگرت، بەڵام لە چالاکی ناو حیزب کورتم نەهێنا. حیزبی دێموکڕات لە سەر داروپەردووی ژ.ک دامەزرایەوە. بەڵام ئەوجار بە ئاشکرایی کاری دەکرد. ئیتر ئەو

دا. ئەندامی فێڵباز و بەرژەوەندیخوازی زۆری تێهات... ئیتر شیرازەی تەنزیم و تەکووزی پێشوو هەڵوەشا و خزمایەتی و ئاشنایەتی و خۆبەخۆیایەتی کەوتە ناومان و هەی لەوەی زرینگ بێ و خۆی وەپێش خا، لە گوناهی خەیانەت خۆشبوون و نەمانی زەبروزەنگی زەمانی ترساندنی ژ.ک، زۆر کەسی شێلگیر کرد کە خەیانەتیش بکەن و هەر لە ناوماندا بمێننەوە. ئێران و غەیرەئێران دەیتوانی نۆکەرانی خۆیانمان دەناو خزێنن بەجارێک دەرگای حیزب کرابۆوە و هەرکەس دەهات بۆ لێکۆڵینەوە قبووڵ دەکرا. قاسمئاغا [ئێلخانی] هەر بە برا مایەوە و زۆر لە ئاغایانی دیش هاتنەوە ناومان و بەدڵ لەگەڵ دوژمنان بوون.»

دوکتور «عەبدوڕڕەحمانی قاسملوو» لە لاپەڕە ٢٨ی بەرگی یەکەمی کتێبی «چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی» لە بەشی «هەلومەرجی نێوخۆ و نێونەتەوەیی»دا دەڵێ: «دامەزرانی کۆمەڵە لە مێژووی خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا دیاردەیەکی نوێ بوو. چونکە یەکەم ڕێکخراوی سیاسی بوو کە لە لایەن خەڵکی ئاساییەوە پێکدەهات». لە لاپەڕە ٣١یشدا دەڵێ: «بەڵام کۆمەڵەی ژ.ک کە لە لایەکەوە ڕێکخراوێکی ناسیۆنالیست و لە لایەکی دیکەوە ڕێکخراوێکی داخراو و نهێنی بوو کە ڕووی لە کۆمەڵانی بەرینی خەڵکی کوردستان نەدەکرد، وەڵامدەری وەزعی تازەی کوردستانی ئێران نەبوو...» لە درێژەی ئەم باسەدا لە لاپەڕە ٣٢دا دەڵێ: «... تا ساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥) بەرەبەرە بەتەواوی دەرکەوت کە کۆمەڵەی ژ.ک ئیدی ئەو ڕێکخراوە نییە کە بتوانێ جووڵانەوەی ڕۆژبەڕۆژ پەرەگرتووی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی ئێران ڕێبەری بکا... حیزبێکی ئەوتۆ هەم پێویستییەکی مێژوویی بوو، هەم زەمینەی دامەزراندنی ئامادە بوو.» پاشان باس لە دامەزراندنی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢٤ دەکا کە بەرنامەی نوێی خۆی بڵاو کردۆتەوە.

لە لاپەڕە ١٣٧یش لە بەشی «هۆیەکانی تێکچوونی کۆمار»دا دەڵێ: «حیزبی شۆڕشگێڕ نابێ لەوە بترسێ کە گۆیا بە باسی هەڵەی ڕابردوو دوژمنی شاد دەبێ، یا لە ئیعتیباری حیزبەکەی کەم دەبێتەوە... با ئەوەش بڵێین کە ڕەخنە گرتن لە بەڕێوەبەری حیزب لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا نە نرخی کۆمار کەم دەکاتەوە نە ئیعتیباری بەڕێوەبەرانی ئەو وەختەی حیزب دێنێتە خوارێ.»

لە درێژەی ئەو باسە لە لاپەڕە ١٤٣دا دەڵێ: «بێ سەروسامانی، بێنەزمی و بێ دیسیپلینی لە هەموو کاروباری کۆماردا بەرچاو دەکەوت و نوقتە زەعفێکی گەورەی کۆماری کوردستان بوون. نموونەیەک لەو بێسامانییە تێکەڵبوونی حیزب و دەوڵەت بوو...»

هەروەک زانیمان «د. قاسملوو» هەردووک سەردەمی «ژ.ک» و «کۆماری کوردستان»ی زۆر بێلایەنانە هەڵسەنگاندووە. ئەگەرچی لە بەشی «سەرەتا»ی کتێبەکەیدا هەموو لایەنەکانی خەباتی (ژ.ک)ی باس نەکردووە، بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە لاپەڕەکانی دوایی و بەتایبەت لە لاپەڕە ١٣٩، دەبینین کە زۆر بە وردی باسی سەردەمی دەسەڵاتی (ژ.ک)ی کردووە و نرخ و بەها و کەموکوورییەکانی زۆر بە جوانی هەڵسەنگاندووە و دەڵێ: «پەرەئەستاندنی زۆر خێرای جووڵانەوە و پێکهاتنی زۆر خێرای کۆماری کوردستان تەرکیبێکی نالەباری لە بەڕێوەبەری حیزب و کۆماری کوردستاندا پێک هێنابوو. زۆربەی زۆری بەڕێوەبەران بۆ یەکەم جار بوو کاری سیاسی و تەشکیلاتییان دەکرد و تاقیکردنەوەیان نەبوو. <**هەر بەگشتی تاقیکردنەوەی سیاسی و تێکۆشانی حیزبی لە کوردستانی ئێران بێجگە لە سێ ساڵ تێکۆشانی کۆمەڵەی ژ - ک رابردووی نەبوو.**> ناچار بەڕێوەبەرانی ئەوتۆ هاتبوونە سەر کار کە پایەی تێگەیشتن و تاقیکردنەوەی سیاسی و حیزبی، یان دەوڵەتییان لە رادەی ئەو مەسئوولییەتەدا نەبوو کە کەوتبووە سەر شانیان...»

دوکتور «عەزیزی شەمزینی» لە لاپەڕە ١٦٠ تا ١٦٢ی کتێبەکەی «جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان»دا دەڵێ: «لەو کاتەدا کۆمەڵەی (ژ.ک) بەهێزترین گرووپی سیاسی کوردستانی ئێران بوو لە ناو خەڵکدا رێز و نفووزێکی زۆری هەبوو. دوای دامەزرانی حیزبی دێموکراتی ئازەربایجان، قازی محەممەد کە ئەوکات سەرۆکی کۆمەڵە بوو، بیری لە گۆڕینی ناو و پرۆگرامی کۆمەڵە دەکردەوە بەتایبەتی لە هەلومەرجی پاش برانەوەی جەنگ. بۆ ئەم مەبەستە پرسی بە زەبیحی کرد. زەبیحی دەسکاری کردنی پەیڕەوی ناوخۆ و پرۆگرامی بە شتێکی چاک دەزانی بەڵام لەگەڵ گۆڕینی ناوی کۆمەڵەدا نەبوو.»

لە لاپەڕە ٤٧ی گۆڤاری ژمارە ١١ی «ڕوانگە»دا کاک «حەمە ڕەحیم فـەللاح» (جووتیار) لە وتارێک لە ژێـر نـاوی «چەنـد ڕوونکردنەوەیـەک سـەبارەت بـە کۆمەڵەی ژێ.کـاف»دا دەڵـێ: مامۆسـتا «زەبیحـی لـە ژمـارە ١٩٢ی ڕۆژنامـەی «خەبات»دا سەبارەت بە ژ.ک دەڵێ: «حیزبی ئازادیخوازی کوردستان و کۆمەڵەی ژ.ک و حیزبی دێموکڕاتی کوردستان، لە واقیعدا یەک حیزب بوون، بەڵام لە سێ هەلومەرجی جیاوازدا، هەلومەرجی پێش بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهـانی، هەلومەرجی چوونی سۆڤیەت و هاوپەیمانەکان بۆ ئێران و لابردنی «ڕەزاخان» و هەلومەرجی دوای جەنگ، چالاکییەکانیشیان سێ ئەڵقەی پەیوەست بە یەک لـە خەباتی گەلی کورد، دژی داگیرکەران و ئیمپریالیزم پێکدێنێت».

کاک دوکتور «ئەفراسـیاو هـەورامی» لـە لاپـەڕە ١١٩ و ١٢٠ی کتێبەکەیـدا (مستەفا بارزانی لە هێندێک بەڵگەنامە و دۆکیومێنتی سۆڤیەتیدا ١٩٤٥ - ١٩٥٨»دا باسی ئەو بەڵگەنامانە دەکا کە کاتی خۆی کاپیتـان «ئـو.ی.ڤیلچیڤیـسکی» وەک سیخوڕێکی وڵاتەکەی لە ناوچەی موکریانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان فەرمانبـەرانی دیپلۆماسی و سەربازی سۆڤییەتی لە ئێران ئاگـادار کردۆتـەوە. نـاوبراو تاکـە کەسێک بووە کە زۆربەی بەڵگەکانی سۆڤیەت سەبارەت بە کـورد و کوردسـتانی خراوەتە بەردەم. ئەو نووسـینەی خـوارێ ڕوانگـە و بۆچوونـەکانی نـاوبراو و سیاسەتی ڕەسمی سۆڤیەت سەبارەت بە کێشەی کورد دەردەخـات هـەر بۆیـە لـە بەشێک لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێ: «دروشمـی سـەربەخۆیی کوردسـتان لـە لایـەن ئیمپریالیزمەوە خراوەتە سەر زاری کوردان و ئەمە دروشمێکی کۆنەپەرەستانەیە و کوردستانی سەربەخۆ دەبێتە پێگەیـەکی ئیمپریـالیزم و سـەرەنجامی دەبێتـە پردێک بۆ دەستدرێژی بـۆ سـەر وڵاتەکـەی کـە لـە ڕێگـەی قـەفقاز و ئاسـیای ناوەڕاستەوە جێبەجێ دەکرێت. ئێمە (سۆڤیەت) دەبێ بۆ پووچەڵکردنەوەی ئـەو پیلانەی ئیمپریالیزم هەوڵ بدەین.» لە لاپەڕە ١٢٥یشدا کـاک ئەفراسـیاو دەڵـێ: «نووسەر سەبارەت بە کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردسـتان (ژ.ک) دەڵـێت: «ئینگلیـز توانیان ئەم ڕێکخراوە پیس بکەن و بیکەنە ڕێکخراوێکی سەر بـە خۆیـان و هـەر لەسەر ئەم بۆچوونە چەوتە سۆڤیەتییەکان هەوڵی هەڵوەشـانەوەی ژ.ک دەدەن. جگـە لـەوەش وەک لـە ڕاپۆرتەکـەدا هـاتووە، ژ.ک هەڵـگری دروشمـی

کۆنەپەرەستانەی (سەربەخۆیی بۆ کوردستان) بووە.» هەمان سەرچاوە لە لاپەڕە ١٣٢ تا ١٧٥ نامەیەکی ٧٣ لاپەڕەیی تێدا بڵاو بۆتەوە کە لە لایەن سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی بەرزی حەوتەمی دەزگای سیاسی بورتسۆڤ .م، بۆ کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت (بەلشەویک) بەشی سیاسەتی دەرەوە نێردراوە. نامەکە لە ١٩ی نیسانی ١٩٤٦ (= سێشەممە ٣٠ خاکەلێوەی ١٣٢٥) بۆ ناوەندی ناوبراو بەڕێ کراوە و وتووێژەکانی ١٦ تا ١٨ی کانوونی دووەم لە ورمێ و ٢٢ی کانوونی دووەم لە شاری تەورێزی لەگەڵ کەسایەتییەکانی بزووتنەوەی کورددا لە خۆ گرتووە. نووسەری ئەو راپۆرتە کاپیتان «و.ل. ڤیلچیڤسکی»یە؛ ناوبراو لە کاتی شەڕی دووهەمی جیهانی لە رۆژهەڵاتی کوردستان و لە نیزیکەوە شاهیدی رووداوەکانی ئەوسەردەمە بووە. چاوپێکەوتنی لەگەڵ زۆربەی سەرکردەکانی کورد بەتایبەتی قازی محەممەد و مەلامستەفا بووە و وتووێژی لەگەڵ کردوون و کاربەدەستانی سۆڤیەتی لە رووداوەکانی کوردستان ئاگادار کردۆتەوە. زمانی کوردی زانیوە و چەندین بەرهەمی بڵاو کراوەتەوە و چەند بەرهەمیشی دەستنووسن و ئێستا چاپ نەکراون. ناوبراو سەبارەت بە بزووتنەوەی کورد لە باشووری کوردستان لە سەردەمی شەڕی دووهەمی جیهانی باسی کۆمەڵەی هیوا دەکا و لە درێژەی قسەکانیدا لە لاپەڕە ١٤٥ و ١٤٦دا دەڵێ: «میرحاج و خۆشناو لە ریزی ئەندامە چالاکەکانی ئەم گرووپەدا بوون. لەو کاتەدا ئینگلیز دەستیان دایە هەڵبژاردن و بەسەربازگرتنی لاوانی کورد و ناردیانن بۆ بەرەی ئەفریقیا. ئەندامانی ئەم گرووپە لە ژێر کارتێکردن و پەرەسەندنی رۆڵی سۆڤیەت بڕیار دەدەن لەباتی بەشداری لەگەڵ سوپای ئینگلیز لە بەرەکانی شەڕ دژی ئاڵماندا، دەبێ لە بەرەکانی شەڕی سۆڤیەت - ئاڵماندا بەشداری بکەن. بۆ روونکردنەوەی ئەم بڕیارە ئەوانە لە ئابی ١٩٤٣ (لە لاپەڕە ١٣٣دا دەڵێ: ئابی ١٩٤٢) میرحاج بۆ ئێران دەنێرن بۆ ئەوەی لەگەڵ فەرماندەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران باس لەم پرسەدا بکەن. میرحاج توانی بێتە مەهاباد، ئەوە بوو منی لەوێ بینی و ئەم پێشنیازەی بۆ باس کردم، منیش لەو کاتەدا ناوبراوم پەشیمان کردەوە و

دەربڕی و گوتم: گەلی سۆڤیەت ئەوەندە کەس و هێزی هەیە بتوانێت ئالمان تێکبشکێنێت. بە وتەی میرحاج لە گەڕانەوەیدا بۆ عێراق ناوبراو وتوویژەکانی خۆی لەگەڵ مــن بــۆ هاوڕێیــانی خــۆی دەگێڕێتــەوە. وتی ئێمــە زۆر پەرۆشــی چارەنووسی ستالینگراد بووین. هــەروەها وتی قــسەکانی تــۆ (واتــا سۆڤــیەت ئەوەندە هێزی هەیە کە ئالمان بشکێنێت) ئێمــەی هێــور کــردەوە، دواتــر ئێمــە گەیشتینە ئەو ئاکامە کە ئێوە راست بوون.» هەر لە درێژەی ئــەو راپۆرتــەدا لــە لاپەڕە ١٤٦ و ١٤٧ ڤیلچیڤسکی باسی کۆمەڵەی ژ.ک و دامەزرێنەرانی دەکا کە ئــەو چەند دێڕەی خــوارێ بەشــێکە لــەو راپۆرتــە: «لــە کۆتــایی ١٩٤٢دا بــە دەســت پێشخەریی (زەبیحی)ی پیشەسازی مەهابادی و رێکخەری شانەی (پارتی تــوودە) [؟!] لە مــەهاباد کۆبوونەوەیــەک بــۆ رێکخــستنی رێکخراوێــک پێــک دێــت کــە ئەنجامەکەی پارتی گشتیی کوردان (ژێکاف - ژیانەوەی کوردستان) پێکدێت. لــەم کۆبوونەوەیەدا ١١ کەس بەشدار بوون، لەوانە «زەبیحی، زەرگەری، موقەددەسی (= مودەڕڕیسی)، قادری، ئیمامی، تەوحیدی، کیانی و میرحاج». زەبیحــی وەک سکرتێری حیزبەکە و حوسێنی زەرگەری وەک سەرۆکی ئەو حیزبە هەڵبژێردران. پڕۆگرامی حیزبەکە بەپەلە دانرا و شێوا و تێکەڵپێکەڵ و ســەرپچڕ بــوو، تێیــدا دروشمی کۆن و داوخوازی رواڵەتییانە، واتە سەربەخۆیی بۆ کوردســتان لەگــەڵ خەبات دژی کۆنەپەرســتانی کــورد و دەوڵــەتانی ئێــران و عێــراق و تورکیــا و کۆنەپەرەستانی نێونەتەوەیی دانرابوو، لە قۆناغی یەکەمدا دژایــەتی فاشــیزمی تێدا گونجابوو؛ بەڵام لــەم پڕۆگرامــەدا بــەگوێرەی هــاووتوویژەکــانم هەنــدێ بیروڕای باش هەبوون کە پاشان لە پڕۆگرامی پارتە سیاسییەکانی تــری کــورددا جێیان کرایەوە. بە وتەی ئەوانە بەرچاوترینی ئەم بیروڕایانە خەباتی ناوچەیی نەتەوەییی گەلی کورد بــوو لــە چوارچێــوەی ئــەو دەوڵــەتانەی کوردســتانیان بەسەردا دابەش کراوە... لە ساڵی ١٩٤٣ و بەتایبەتیش لــە ١٩٤٤دا ژ.ک لــە نــاو کوردەکــانی ئێــران و عێــراق چالاکییــەکی زۆری نوانــد. زۆربــەی دێموکــرات و پێشکەوتنخوازەکانی کورد دەهاتنە ریزی (ژ.ک)وە، بەتایبەتی ژ.ک چالاکییــەکی زۆری لە ناوچــەی سلێمانی و مــەهابادا هــەبوو، ژ.ک گۆڤــاری (نیــشتمان)ی نیوەنهێنی چاپ دەکرد. لە ساڵی ١٩٤٤دا ژ.ک نیزیکەی ٢٠ بەیاننامە و بانگەوازی

دەرکرد. چالاکی کۆمەڵەی ژ.ک هەندێ جار ناوەرۆکی دژی ئینگلیزی پێوە بوو و ئەوانی سەغڵەت کردبوو، بەڵام ئینگلیس توانیان بەشێکی زۆری باڵی ژ.ک بەرەو لای خۆیان رابکێشن لەبەر ئەوەی پرۆگرامی ئەم پارتییە و تاکتیکەکانی پاش شەڕی جیهانی روون نەبوو، گێرەوکێشەی سەرەکی بە گوێرەی هاووتوویژەکانم لەسەر ئەوە بوو، ئاخۆ ئینگلیز دوژمنی کوردە! ئاخۆ هەڵسوکەوت و سیاسەتی ئینگلیز لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە زیانی کوردە! گێرەوکێشە لەسەر ئەم پرسیارە بوو بە هۆی لێکبڵاوبوونی ژ.ک. ئەوە بوو لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٤٥دا ژ.ک هەڵوەشایەوە. ‹لێکبڵاوبوونی پارتی ژ.ک لە ئەنجامی ئەوەش بوو کە زەبیحی سکرتێری ئەم پارتە لە کاتی سەردانی بۆ لای کوردەکانی باکووری رۆژهەڵاتی ئێران لە نێزیک شاری ورمێ لە لایەن پۆلیسی ئێران دەستگیر کرا. لە کاتی گرتنەکەیدا نووسراو و چاپەمەنیی کۆمەڵەی (ژ.ک)ی پێدەگیرێ.› ئەمە هۆیەکی سەرەکی بوو لە گرتن و تاوانبارکردنی، ئێستە زەبیحی لە زیندانی تارانە.» لە پاش ئەوە ئەوجار نووسەر باسی خزمەتەکانی ژ.ک بە کورد دەکا و دەڵێ: «گەورەترین خزمەتەکانی ژ.ک بە وتەی هاووتوویژەکانم ئەوەیە کە ورەی دێموکڕاتخوازەکانی کوردی بۆ بەشداری لە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد بزواند و نێزیکی کردنەوە و فێری خەباتی سیاسیی لە سەردەمی نوێدا کردن. تەواوی ئەندامان و رێبەرانی حیزبی دێموکڕاتی کوردستان کە لە کۆتایی ١٩٤٥دا پێکهات، لەوانە قازی محەممەد لە رابردوودا ئەندامی پارتی ژ.ک بوون...»

بە ئاوڕدانەوەیەکی دیکە لە کتێبی «رۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا» دوژمنایەتی و دووڕوویی رووسەکان زۆر جوان و ئاشکرا دەردەکەوێ و بۆمان روون دەبێتەوە کە رووسەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان لە «کورد و کوردستان» وەک کارتی قومار و کایەی خۆیان کەلکیان وەرگرتووە. وەکوو پێشتر گوتمان «ڤیلچیڤیسکی» راپۆرتێکی سەبارەت بە هاتنی میرحاج ئەحمەد و مستەفاخۆشناو بۆ مەهاباد و چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ناوبراو بۆ بەرپرسانی سۆڤیەت ناردووە. سەیر ئەوەیە کە دەقی ئەو باسە لە لاپەڕە ٥٣ و ٥٤ی کتێبی «رۆژهەڵاتی کوردستان...»دا بە

زانیارییانەیان داوە بە ئینگلیسییەکان. ئەو راپۆرتە لە ٥ی فێورییەی ١٩٤٣ (= هەینی ١٦ای رێبەندانی ١٣٢١) لە لایەن کۆنسوولی ئینگلیس لە تەورێز بۆ وەزارەتی دەرەوە (باڵوێزخانە)ی بەغدا نێردراوە. نامەکە لە لایەن وەرگێڕی کتێبە (کاک ئەنوەری سوڵتانی) لە نامەی ٢٢ی ژانوییەی ١٩٤٣ (= هەینی ٢ی رێبەندانی ١٣٢١)ی «ە.ب.م» هەڵبژێردراوە و بەم چەشنەیە: کۆنسوولی گشتی، تەورێز - «کۆنسوولی گشتی سۆڤیەت ئەمڕۆ هاتە چاوپێکەوتنی من و گوتی: محەممەد ئەحمەد ئۆغڵوو و عەلی مستەفا ئۆغڵوو - دوو کورد لە هۆزێک کە ئەو بە «شەهربازارلوو» ناوی برد (کاک ئەنوەر لە پەراوێزی لاپەرە ٥٣ نووسیویەتی: محەممەدئەحمەد و عەلی مستەفای شارباژێڕی کێن؟ تۆ بڵێی پێوەندییان بە حیزبی هیواوە نەبووبێت!)، لە دووهەمی مانگی نۆڤامبردا (= یەکشەممە ١٠ای خەزەڵوەری ١٣٢١)، لە هەندێ کاربەدەستی حکوومی رووس نیزیک بوونەتەوە و خۆیان وا ناساندووە کە هاتبێتن بۆ بەڕێوەبردنی خواستی کۆمیتەیەکی کوردی لە سلێمانی. مەئموورییەتیان بەڕواڵەت بریتی بووە لەوەی کە رایبگەیەنن چەندهەزار شەڕکەری کورد ئامادەن یارمەتی رووسەکان بدەن. هەواڵ دراوە کە لە ماوەی وتووێژەکەدا، کوردەکان گوتوویانە لە سیاسەتی ئینگلیز نارازین. مستەر «کۆتزنیتزۆڤ MR. Kutznetzov» دیعایەی ئەوەی کرد کە هەر ئەوەندەی کە نوێنەرانی سۆڤیەت گوێیان لە باسی نارەزایی لە ئینگلیز بووە، کۆتاییان بە وتووێژەکە هێناوە و بە کوردەکانیشیان گوتووە سوپای سۆڤیەت تا ئەو رادەیە بەهێزە کە هەموو ئەرک و کاری بە بێ یارمەتی [لاوەکی] بەڕێوە دەبات و بۆیەش پێویستیان بە خزمەتی ئەوان نییە.»

کاک مەنافی کەریمی کە بۆخۆی ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک و لە دواییشدا وەزیری فەرهەنگی کۆماری کوردستان بووە لە وتووێژێکیدا کە لەگەڵ گۆڤاری روانگەی ژمارە ١١دا لەگەڵ ئەو و چەند کەسی دیکەدا پێکهاتووە لە لاپەڕە ٣٩ سەبارەت بە گۆڕینی ناو و سیاسەتەکانی ژ.ک لە وەڵامی ئەو پرسیارە کە: تاقمێک دەڵێن لە کاتی گۆڕانی ژ.ک بە حیزبی دێموکرات، زەبیحی لەگەڵ دوو کەسی دیکە: دڵشادی رەسووڵی و قاسمی قادری لە زینداندا بوون و ئاگای لە مەسائیلی دەرەوە نەبوو، دەڵێ: «نا وا نەبوو ئێمە لەو کاتەدا لەگەڵ قازی و

سەیفی قازی و چەند نەفەری دیکە چووبووینە باکۆیە. لەوێ کێشە و هەرایەکی زۆر لەسەر ئەو مەسەلەیە ساز بوو. باقرۆف دەیگوت، دەبێ نێوی کۆمەڵە بگۆڕن. بەڵام ئێمە حازر نەبووین بچینە ژێر بار. لەپاشاندا باقرۆف گوتی، ئەوەی ژ.ک دەیهەوێ کوردستانی گەورەیە و ئەو داواکارییەش مەترسی شەڕ لەگەڵ ئێران و عێراق و سووریا و تورکیای بەدواوەیە و بە واتە شەڕی سێهەمی جیهانی رووی دەدا و ئێمەش کە تازە شەڕی دووهەممان تەواو کردووە و هێشتا رۆنی چەکەکانمان خاوێن نەکردۆتەوە، حازر نابین بکەوینە نێو گێژاوی شەڕێکی گەورە. بەڵام ئەگەر ئێوە نێوی کۆمەڵە بگۆڕن و داوای خودموختاری لە چوارچێوەی ئێراندا بکەن، ئێمە وەک یەکێتی سۆڤیەت پشتیوانیتان لێدەکەین. پاش چەند رۆژ کە لە باکۆیە بووین بڕیار درا بچینە تفلیس پێتەختی گورجستان بەڵام شەوی ئەو رۆژەی کە بڕیار بوو لە ئێرەوانەوە سەفەرەکەمان درێژە پێبدەین، جێگری جەعفەر باقرۆف هات و پێی گوتین بەرنامەکە هەڵوەشاوەتەوە و ئێوە هەرچی زووتر دەبێ بگەڕێنەوە بۆ ئێران چونکە مەلامستەفای بارزانی سنووری بەزاندووە و هاتۆتە نێو خاکی ئێران و بە مەعلوومی ئینگلیسی ناردوویانە. ئێوە بچنەوە و ئاگاتان لە بارودۆخەکە بێ. رووسان پێیان وابوو کە مەلامستەفا پیاوی ئینگلیسییانە. پاش وەی کە هاتینەوە بۆ مەهاباد، قازی ئاکامی ئەو سەفەرەی لە کۆبوونەوەی حیزبدا، دایە بەر باس و لێکۆڵینەوە و گوتی، ئێمە هیچ چارەیەکمان نییە و بۆوەی یەکێتی سۆڤیەت یارمەتیمان بدات دەبێ نێوی کۆمەڵە بگۆڕین و بیکەین بە حیزبی دێموکرات. ئەو بڕیارە پەسەند کرا و پاشانیش لە باغی عەزیزئاغا بە بەشداری بەربلاوی خەڵک راگەیەندرا. لەبیرمە سەرەتای پاییز بوو و بە قەرتاڵە ترێیان دەهێنا. مەرحوومی قازی قسەی بۆ خەڵک کرد و تەواوی لایەنە جۆربەجۆرەکانی بۆ روون کردنەوە و دوایەش ئەو بڕیارەی راگەیاند. خەڵکیش هەموو پێشوازییان کرد و گوتیان، ئێمە بە هەرچی پێشەوا بڵێ، رازین.»

هەتا ئێرە بۆ هەموومان روون بۆوە کە دەوڵەتی شووڕەوی بەتایبەت و دەوڵەتە زلهێزەکانی دیکە بەگشتی لەبەر دروشمی «کوردستانی گەورە» کە

نەدەکرد و تەنانەت بەرپرسانی کوردیشیان لە ژێر فشار دەنا کە ناو و دروشمی کۆمەڵەی (ژ.ک) بگۆڕن. لەو سەردەمیشدا تەنیا دەوڵەتێکی جاروبار یارمەتێکی کەمی بە کورد دەگەیاند، یەکێتی سۆڤیەت بوو کە ئەویش لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بوو کە ئەو سووکە یارمەتییانەی بە کورد دەگەیاند. دەوڵەتی سۆڤیەت هیچ کات سەربەخۆیی کوردی لە ناو کار و بەرنامەکانی خۆیدا دانەناوە، ئەوەی لەو ماوەیەشدا کورد و رێبەرانی کورد وەدەستیان هێنابێ ئەوە بە زۆری زۆرداری و بەبێ رەزامەندی رووسەکان بووە. ئەوەتا باقرۆف سەرۆکی ئازەربایجانی شووڕەوی لە دانیشتنێکی لەگەڵ پێشەوا قازی محەممەددا کە دەقی قسەکانی لە لاپەڕە ٨٨ی کتێبەکەی «ئیگلتۆن»دا هاتووە دەڵێ: «ئێستا کە من (باقرۆف) دەگەڵ ئێوە قسان دەکەم، دڵنیاتان دەکەم کە هەر کات خودموختاری ئازەربایجان (مەبەست ئازەربایجانی ئێران) جێبەجێ بوو و پێکهات، ئازادی و رزگاری ئێوەشی تێدا دەبێ.» کە مەبەستی لەوە بوو کە کورد ئەگەریش مافێکی هەبێ ئەوە لە ژێر دەسەڵاتی ئازەربایجانی ئێراندا شتێکی دەدرێتێ. بەڵام لە دواییدا پێشەوا قازی محەممەد لە وەڵامدا گوتوویەتی و بەکردەوەش نیشانی داوە: «ئەگەر قەرار بێ لە ژێر دەسەڵاتی هەر کەسێکی بێجگە لە خۆماندا بین، ئەوە هەر چاکترە لە ژێر دەسەڵاتی ئێراندا بین.» راگەیاندنی کۆماری کوردستان لە ٢ی رێبەندانی ١٣٢٤ تەواو ئەو بۆچوونانەمان دەسەلمێنێ. چونکە بەڕاستی رووسەکان بە راگەیاندنی کۆماری کوردستان تاسان و زۆریان رەخنە لە پێشەوا قازی محەممەد گرت.

ویلیام ئیگلتۆن لە لاپەڕە ١٣٢ و ١٣٣ی کتێبی «کۆماری ١٩٤٦ی کوردستان»دا بەوردی باسی ئەو نارەزایەتییەی بەرپرسانی سۆڤیەت و تەنانەت پیشەوەری «سەرۆکی کۆماری ئازەربایجانی ئێران»ی کردووە و دەڵێ: «پاش ماوەیەکی کەم لە پێکهاتنی کابینەی (حکوومەتی کوردستان) دوو کەس لە ئەندامانی پایەبەرزی حیزب بە ناوەکانی «محەممەدئەمینی شەڕەفی» و «خەلیلی خوسرەوی» هەم بۆ کاروباری خۆیان و هەم بۆ کاروباری حیزبی چوونە تەورێز. لەوێ لە بیمارستانی (نەخۆشخانە) رووسەکان، دوکتور «سەمەدۆف» بە تووڕەییەکی زۆرەوە پێیان دەڵێ: «بۆچی ئێوە بێ رەزامەندی و ئیزنی یەکێتی

سۆڤیەت حکوومەتی خودموختارتان لە مەهاباد ڕاگەیاندووە؟» ئەوانیش وەڵامیان داونەوە، بەڵام ڕووسەکان لە وەڵامەکەیان ڕازی نەبوون و گوتوویانە دەبێ شەخسی قازی محەممەد بێتە تەورێز و لەگەڵ «پیشەوەری» چاوپێکەوتن و وتوویژیان هەبێ.» [؟!] ئیگلتۆن لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «لە تەورێزی جەعفەری پیشەوەری سەرۆکی ئازەربایجان لە هۆتێلێکی قەدیمی بە ناوی «گراند هۆتێل»، سەردانی سەرۆکی کۆماری کوردستانی کرد تا لەوێ باس و وتوویژیان هەبێ. وەڵام و بەرگرییەکانی قازی سادە بوون، نوێنەری سیاسی ڕووسەکان لە تەورێز «یەرماکۆف» لە چۆنیەتی هەستی خەڵک لە پێش ٢٢ی ژانویە ئاگادار بوو، هەروەها لە ناو ماشێنە جیبەکەی خۆیدا لە «چوارچرا»ی مەهاباد شاهیدی بەڕێوەچوونی ڕێوڕەسم و جێژنەکە بوو.»

لە لاپەڕە ١٣٣شدا دەڵێ: «یەرماکۆف سەرەتا زۆر بەتوندی دژی ئەو کارە بوو کە ناوچەیەکی ئازاد بە ناوی کوردستان پێکبێ، بەڵام وتوویژ و قسەکانی قازی تا ڕادەیەکی زۆر «ژێنراڵ ئاتاکچیۆف»ی بەو کارە ڕازی کردبوو و هەروەها بەڵێنییان لێ وەرگرتبوو کە لە کاتی بەڕێوەچوونی ئەو بەرنامەدا «پیشەوەری» هیچ دژایەتییەک نەکا»

دوکتور «عەزیزی شەمزینی» لە کتێبەکەی خۆیدا لە لاپەڕە ١٦٠ و ١٦١ ئەو بۆچوونانەی ئێمە بەو قسەیە دەسەلمێنێ و دەڵێ: «ڕۆژنامەکانی ئێرانی هێرشی توند و تیژیان کردە سەر کورد و بە نۆکەری یەکێتی سۆڤیەتیان دانا. گۆڤاری «سەبا» لە ژمارە ١٠ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥ی [خۆیدا] لەم بارەیەوە نووسیویەتی: «ماوەیەکە کوردەکانی ئێران بیر لە ڕزگاری و پێکەوەنانی کوردستانێکی ئازاد و سەربەخۆ دەکەنەوە. ئەوان دەوڵەتی ئێران بە نۆکەری فاشستەکان دادەنێن. ئەوەی ڕاستی بێ جووڵانەوەی یاخیبووانی کوردستان شتێکی تازە نییە. ئەم جووڵانەوەیە چوار ساڵ لەمەوبەر کوردستانی تەنیەوە... کۆمەڵەی ژ.ک گەورەترین گرووپی کوردستانە و بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی کورد کار دەکا. ئەم حیزبە کە دەیەوێ لە ماوەیەکی کەمدا سەربەخۆیی تەواو وەدەس بێنێ، بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی سەرتاسەری کوردستان تێدەکۆشێ. ئەم جووڵانەوە

ئەرکی تایبەتی بە کۆمەڵە دەسپێرێ.» لێرەدا مەبەستی نووسەر ئەوەیە کە یەکێتی سۆڤیەت کوردەکان هان دەدا داوای مافی خۆیان بکەن و کوردیشی بە «یاخی بوو» داناوە. هەروەک پێشتر باسمان کرد سەرەڕای ئەو هەمووە لەمپەر و کۆسپنانەوە و ناڕەزایەتییەی رووسەکان کە لە بەرامبەر داوا رەواکانی کوردان دایاننناوە، نووسەر لە سەرچاوەی پێشوو و لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «بەڵام خۆ مەسەلەی کورد مەسەلەیەکی راستەقینەیە و پێویستی بە هاندان و تەکان نییە. ئەو جووڵانەوەیە زادەی دەستێوەردانی یەکێتی سۆڤیەت و پڕوپاگەندەی کۆمۆنیستی نییە». لە دوای ئەو قسەش دەڵێ: «تەنانەت «ئەلغنستۆن»ی دوژمنی یەکێتی سۆڤیەتیش دانی بەم راستییە داناوە و بەئاشکرا وتوویە: «لە ماوەی ئەم دواییەدا دەنگوباس بلاو بۆتەوە گوایە رووسەکان لە نێو کوردەکانی ئێراندا پڕوپاگەندە دەکەن. بەڵام ئەوانەی سەریان لە مەسەلەکە دەردەچێ دەڵێن کە ئەم دەنگوباسە زەمینەی پتەوی نییە.»

## هەڵوێستی سۆڤیەت و ئامانجەکانی

بۆ زانیاری پتر و ناساندنی رووی واقیعی دەوڵەتی سۆڤیەت سەبارەت بە چۆنیەتی هەڵسوکەوت و شێوەی بەڕێوەبردن و جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی ئەو دەوڵەتە و سیاسەتە درێژخایەنەکانی سەبارەت بە «کۆماری ئازەربایجان» و دواتریش «کۆمەڵەی ژ.ک» و «کۆماری کوردستان» بەپێویستم زانی چەند بەشێک لە کتێبی «رازهای سر به مهر» (رازە سەربەمۆرەکان) بخەمە بەر دیدەی خوێنەران.

ئەو کتێبە بەڵگە و زانیاری پشتی پەردەی رووداوەکانی ساڵەکانی ١٣٢٣ هەتا ١٣٢٥ی لە خۆ گرتووە و لە لایەن «ئیبراهیم نەورۆزئۆف» لە باکۆ نووسراوە. ناوبراو ئەو نووسراوانەی وەک بیرەوەری خۆی لە رووداوەکانی ساڵی ١٣٢٠ هەتا ١٣٢٥ (١٩٤١ - ١٩٤٦)ی ئازەربایجانی ئێران نووسیوەتەوە و بە تایپ کراوی داوێتی بە ئاغای «حەمیدی مەلازادە» کە لە ئێران چاپی بکا کە ئەویش پێشەکییەکی کورتی بۆ نووسیوە و لە تەورێز چاپی کردووە.

«ئیبراهیم نەورۆزئۆف» ئەفسەری شووڕەوی ڕۆژی دووشەممە ٣ی خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ (٢٥ی ئووتی ١٩٤١) لەگەڵ ئەرتەشی سوور لە ژێر ناوی هەواڵنێری نیزامی(!) هاتۆتە ئێران. بەڵام لە ڕاستیدا ڕابیتی میحوەر (تەوەر)ی مۆسکۆ، باکۆ، تەورێز و تاران بووە و لە لایەن (ک.گ.ب) مەئموورییەتی پێدرابوو کە لە تەواوی وتووێژەکانی بەرپرسانی سیاسی ئەو شارانە، تەنانەت وتووێژەکانی نێوان باقرۆف و پیشەوەری و قەواموسەلتەنەدا بەشداری هەبێ. بەتایبەت مەئمووریەتەکانی بۆ میانە و ورمێ گرینگییەکی تایبەتیان هەبووە. لەو کتێبەدا چەندین بابەتی گرینگ باسیان لێوە کراوە کە بمانەوێ و نەمانەوێ پێوەندییان لەگەڵ بارودۆخی « کۆمەڵەی ژ.ک» و «حکوومەتی کوردستان»ەوە هەبووە کە لێرەدا بەپێی گرینگی بابەتەکان چەند بەشێکی پێشکەش بە خوێنەرانی بەڕێز دەکەین.

## جێگیربوون لە شاری میانە

لە لاپەڕە ٢٤ و ٢٥ی ئەو کتێبەدا نووسەر سەبارەت بە چۆنیەتی جێگیربوون لە میانە بەو جۆرە دەدوێ و دەنووسێ:

«کێشەیەک کە من لە شاری «میانە» هەمبوو ئەوە بوو کە نەدەبوو بە شێوەیەکی دیار و ئاشکرا لەگەڵ ئەوانەی کە دەبوو پێوەندییان پێوەبکەم، پێوەندی بگرم یا یەکتر ببینین. بە زەینمدا هات بە دامەزراندنی «ئەنجومەنی پێوەندییەکانی فەرهەنگی ئێران و سۆڤیەت» لە میانە، کێشەی نهێنیکارییەکان چارەسەر دەبێ، هەر بۆیە زوو قۆڵمان لێ هەڵماڵی و بە یارمەتی چەند کەس، باڵەخانەیەکیان لە ئیختیار ناین، ئێمەش ئەنجومەنمان دامەزراند...»

نووسەر لە لاپەڕە ٢٧ و ٢٨ بابەتێکی لە ژێر ناوی «گەڕان بەدوای سامانەکانی ژێرزەوی لە کێوەکانی میانە» نووسیوە کە لەودا دەڵێ: «ژێنێراڵ کلۆکۆف ئەندامی ڕاوێژکاری نیزامی باکۆ بوو. حەوتوویەک پاش هاتنی ناوبراو بۆ میانە، تاقمێک لە کارناسانی «زەمینناسی» ئێمە بە سەرپەرەستی «میرعەلی قاشقایی» هاتنە میانە. ئەو تاقمە هەموو ڕۆژێ بە کێوەکانی دەوروبەری میانە

دەبوون. ئاڵمانییەکان لە کەنار چۆمی «قزلئۆزون» شارۆچکەیەکی کرێکارانیان ساز دەکرد (= کردبوو)، کە ئەگەر بە نیوەچڵی[نە]ماباوە، لە میانە و فەرهەنگی ئەو شارە کاریگەری دەبوو و شوێنی خۆی دادەنا، چونکە لە نەخشەی ئەو کارەدا بۆ کرێکاران کتێبخانە، حەمام، شوێنی نانخواردن، شوێنی وەرزیش و دیوی خوێندنەوە و شتی دیکە لەبەر چاو گیرابوو. تاقمی دۆزینەوە و پشکنین (ئیکتیشاف)ی ئێمە لە داوێنی کێوەکان بە دوای پاشەکەوتەکانی ژێرزەویدا دەگەڕان و لە هەموو بەردێک نموونەیان هەڵدەگرتەوە. لە رووی نووسراوە بەجێماوەکان زانیمان کە کارناسانی زانستی ئاڵمان چەندە لە کاری خۆیاندا شارەزا بوون.

تاقمەکەمان لە راپۆرتێکدا کە بۆ سۆڤیەتی ناردەوە، ئەنجامی کارناسی زانستی خۆی لە میانە بەباش زانی و رایگەیاند: بە رادەیەکی زۆر مس، سورب (قورقوشم)، قەلایی، ئۆکسیدی ئاڵمینیۆم (فافۆن)، بەردەخەڵووز و خوێ لەو کێوانەدا هەیە.»

لە لاپەڕە ٤٢ لە بەشی «خۆشحاڵی بێجێی ئیستالین» سەرگورد «ئیبراهیم نەورۆزئۆف» لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ: «لە ١٥ی خاکەلێوەی ١٣٢٥ بەرامبەر دەگەڵ ٤ی ئاوریلی ١٩٤٦ بڕیارێک بەسترا کە بەپێی ئەو:

١- ئەرتەشی سوور لە ٢٤ی مارسی ١٩٤٦، یانی رۆژی یەکشەممە ٤ی خاکەلێوەی ١٣٢٥(= بە هەڵە لێکدراوەتەوە٢٤ی مارسی ١٩٤٦ بەرابەرە دەگەڵ رۆژی چوارشەممە ٤ی بانەمەڕی ١٣٢٥) دەبێ لە ماوەی مانگونیوێکدا خاکی ئێران چۆڵکەن...»

لە لاپەڕە ٥٢ وتاری «بەفر و رۆژی هاوین» هاتووە کە لەودا باسی چۆنیەتی لەفشارنانی فیرقەی دێموکڕاتی ئازەربایجان لە لایەن رووسەکانەوە دەکا و بۆ پێکهاتن لەگەڵ تاران هانیان دەدا و دەڵێ: «فیرقەی دێموکڕاتی ئازەربایجان لێک هەڵوەشابوو، پیشەوەری ئەندامی سەرەکی و بلیمەتی فیرقە، خۆی لە سەرۆکایەتی حکوومەت کێشابۆوە دواوە. «حاجی میرزا عەلی شەبستەری» و دوکتور «سەلامو ڵڵا جاوید» دوو مۆرەی جێباوەڕی فیرقە لە تاران بەتەنیا دەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی پێکهاتبوون. رووسەکان هەموو ئەو چەکانەی

دابوویان بە فیرقە، وەریانگرتبۆوە و لە فشاریشیان دەنان کە لەگەڵ تاران پێکبێن و مل بە سازان بدەن.»

لە پاش ئەو قسانە لە لاپەڕە ٥٣ لە خوار وێنەیەکی قەواموسەلتەنە دەڵێ: «ئێمە پیلان و فریوی قەواموسەلتەنەمان بەسووکی چاو لێدەکرد.»

لە لاپەڕە ٥٤ دەڵێ: «تاقمێک لە ئازادیخوازانی ئێران دەهۆ و فریوی قەواموسەلتەنەیان بەهێند نەگرتبوو، ئەوان بە بوونی سێ ئەندامی حیزبی توودە لە کابینەی قەوام و ڕەخنەکانی ناوبراو لە سیاسەتی نێوخۆ و دەرەوەی دەوڵەتەکانی پێشووی ئێران، بەڵێنەکانی سەبارەت بە بنەمای دێموکراسی، بە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە وڵات دەزانی. پڕوپاگەندەی ڕاگەیەنەرە گشتییەکانی وەک ڕادیۆ و ڕۆژنامەکان، ڕووی ڕاستی ئەو سیاسەتمەدارە کۆنەکارە ڕێویکردەوەیان داپۆشیبوو.»

دوابەدوای ئەو قسەوباسە وردەوردە هێرش دەست پێدەکا و زۆربەی خەڵکی ئازەربایجان لە ترسی کوشتن و بڕینی ئەرتەشی ئێران ماڵ و حاڵیان بەجێ دەهێڵن و ڕادەکەن. بەڵام سەرەڕای ئەوەی تا ئێستا بۆ هەمووماں ئاشکرا بوو کە دەوڵەتی سۆڤیەت بە چ ئامانجێک هاتە نێو ئێران و چۆنیش پشتی ئازادیخوازانی بەردا، کەچی «پیشەوەری» سەرۆکی ئازەربایجان لە دوای ڕووداوەکانی ٢١ی سەرماوەزی ١٣٢٥ (١٣ی دێسامبری ١٩٤٧)هێشتا هیوای بە یارمەتی ڕووسەکان بووە.

لە لاپەڕە ٦٢، لە وتارێک لە ژێر ناوی «هەواڵی سنوور چ بوو؟» دەڵێ: «پیشەوەری بۆخۆی لەوبەری سنوور لە باکۆ پێوەندی بە مۆسکۆوە گرتبوو و دوای ڕۆژێک چاوەڕوانی مۆسکۆ ئیزنی دا سنوورەکانی بکرێنەوە و خەڵکێکی زۆر کە نێوان ١٨ تا ٢٠ هەزار کەس دەبوون لە سنوور تێپەڕین. ئەوان لە «نەخجەوان» کە ٣٥ کیلۆمیتری لەگەڵ سنوور مەودا هەبوو کۆ ببوونەوە. لە نەخجەوان پیشەوەری لە ئاخاوتنێکدا دەڵێ: بڵاو مەبنەوە! ئەمن لەگەڵ مۆسکۆ پێوەندیم گرتووە، دەگەڵ وەرگرتنی یارمەتی بەزوویی دەگەڕێینەوە وڵاتی خۆمان، کە ئەو ئاواتە قەت وەدی نەهات.»

## نامەی ئیستالین بۆ پیشەوەری

لە کۆتایی ئەو بەشە لە شیکردنەوەی کتێبی «رازە سەربەمۆرەکان»دا بەشێکی زۆر گرینگی دیکە لەو کتێبە دەخەینە روو کە ئەویش «نامەی ئیستالین بۆ پیشەوەری»یە. ئەم نامەیە لە ٨ی مەی ساڵی ١٩٤٦ بەرابەر دەگەڵ رۆژی سێشەممە ١٨ی بانەمەری ١٣٢٥ لە لایەن «ئیستالین» سەرۆکی دەوڵەتی شووڕەوی بۆ «پیشەوەری» سەرۆک کۆماری ئازەربایجان نێردراوە و کەوتۆتە لاپەڕە ١٢٥ تا ١٢٧ی ئەو کتێبەوە. ئەو نامەیە بۆ یەکەم جار لە رۆژنامەی «مەهدی ئازادی» لە تەورێز بڵاو بۆوە و دەنگدانەوەیەکی بەربلاوی هەبوو. ئەگەرچی روون نییە پیشەوەری لە نامەی خۆیدا بۆ ئیستالین چی نووسیوە، بەڵام بەپێی وەڵامەکانی ئیستالین دەکرێ تا رادەیەک لە ناوەرۆکی نامەی «پیشەوەری»ش ئاگادار بین و سەردەربێنین. لێرەدا لەبەر گرینگی بابەتەکە و پێوەندی راستەوخۆی لەگەڵ «کۆماری کوردستان»، دەقی وەرگێردراوی نامەکە لە زمانی فارسییەوە بۆ کوردی پێشکەشی خوێنەرانی بەڕێز دەکەین:

«بۆ هەڤاڵ پیشەوەری! لەو بڕوایەدام ئێوە بارودۆخی ئێستاتان، هەم لە ناوخۆی ئێران و هەم لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا بەباشی هەڵنەسەنگاندووە.

ئێوە هەر ئێستا دەتانەوێ بەتەواوی دەسکەوتەکانی شۆڕشەکەتان بگەن.

بەڵام ئاگاتان لێ نییە کە لە بارودۆخی ئێستادا وەدیهاتنی ئەو چەشنە داخوازییانە بووز ناخوا و ناگونجێ. من ئاماژەیەک دەکەمە سەر تەجروبەکانی بەکردەوەی لێنین.

ساڵی ١٩٠٥ کە قەیرانی سیاسی رووسیای گرتبۆوە، هەڤاڵ لێنین داخوازە شۆڕشگێڕییەکانی خۆی لە کاتی شەڕی بێئاکامی لەگەڵ ژاپۆن گەڵاڵە دەکا و لە ساڵی ١٩١٧ش هاوکات لەگەڵ شەڕی بێئاکامی لەگەڵ ئاڵمان دەیانخاتە روو. ئێوە لە بارودۆخێکی دیکەدا دەتانەوێ لاسایی لێنین بکەنەوە.

هەڵبەت نییەتی ئێوە راستگۆیانەیە و جێگای رێزلێنانە، بەڵام نابێ لە بیرتان بچێتەوە کە لە بارودۆخی ئێستادا کەش و هەوای ئێران لەگەڵ ئەوەی لە سەرەوە باسمان کرد جیاوازی هەیە. بۆ نموونە ئێستا لە ئێران قەیرانێکی قووڵ وەک هێزێکی بزوێنەری شۆڕش هەست پێناکرێ. کرێکارانی ئێران کەمن، ناکرێ

پێکهاتە سیاسییەکانیان بەهێند بگیرێ. جووتیارانی ئێران لە تێکۆشان و چالاکییەکانی سیاسیدا بەشدارییان نییە. سەرەڕای ئەوانە ئێران لە حاڵی حازردا لەگەڵ دوژمنی دەرەوەی لە شەڕدا نییە.

ئێوەش دەزانن کە [رژیمی] کۆنەپەرەستی ئێران لە وەها شەڕێکدایە کە بێ هێز و لاواز دەبێ و بەچۆک دادێ کەوایە دەبێ ئەوەتان لەبەر چاو بێ کە لە ئێرانی ئەوڕۆکەدا، وەها بارودۆخێک پێک نەهاتووە کە لەگەڵ تاکتیکەکانی ١٩٠٥ و ١٩١٧ی هەڤاڵ لێنین دەقاودەق یەک بگرنەوە و مەرجەکانی بابەتی باسکراوی بۆ دەکار بهێنرێت.

هەڵبەت ئێوە دەتانتوانی لە کاتی جێگیربوونی هێزەکانی شووڕەوی لە ئێران، بۆ وەدیهاتنی داخوازە شۆڕشگێڕییەکانی خەڵکی خۆتان بە سەرکەوتنەکانتان هیوادار بووبان، بەڵام لە بارودۆخی ئێستادا، ئێمە ناتوانین هێزەکانی خۆمان لە ئێران رابگرین، چونکە بوونی ئەرتەشی ئێمە لە ئێران بە بنەمای سیاسەتی رزگاریخوازی یەکێتی سۆڤیەت لە ئاسیا و ئورووپا زیان دەگەیەنێ و لەرزۆکی دەکا.

ئینگلیسییەکان و ئامریکاییەکان بە ئێمە دەڵێن: ئەگەر هێزەکانی ئێوە بۆیان هەیە لە ئێران بمێننەوە، کە وایە بۆچی ئینگلیس لە میسر و سووریا و ئەندۆنێزی و یۆنان و هێزەکانی ئامریکا لە چین و ئیسلەند و دانمارک نەمێننەوە؟

بەو هۆیانە ئێمە سوورین لە سەر کێشانەوەی هێزەکانمان، هەتا بیانوو نەدەینە دەستی ئینگلیسییەکان و ئامریکاییەکان.[ئەوەش بۆوەیە] کە بتوانین تێکۆشانەکانی رزگاریخوازی لە موستەعمەرەکانی ئەواندا پەرە پێبدەین و سیاسەتی رزگاریخوازانەی خۆمان باشتر بەرێوە ببەین.

هەڤاڵ پیشەوەری! ئێوە وەک شۆڕشگێڕێک دەتوانن لێمان تێبگەن کە ئێمە جگە لەوە رێگایەکی دیکەمان لەبەر نییە، کە وایە بەپێی ئەو خاڵانەی سەرێ و بە لەبەر چاو گرتنی بارودۆخی پێکهاتوو لە ئێران بەو ئەنجامانەی خوارێ دەگەین:

١- لە ئێراندا قەیرانی قووڵی شۆڕشگێڕی پێک نەهاتووە.

٣- وەزع و بارودۆخێک کە ببێتە هۆی لاوازکردنی هێزە کۆنەپەرەستەکان، پێک نەهاتووە.

٤ - مەرجەکانی ولاتێکی دۆڕاو لە شەڕدا بە سەر ئێراندا زاڵ نییە.

لە سەر ئەوەشڕا تا ئەو کاتەی ئەرتەشی سوور لە ئێرانە، ئێوە دەتوانن لەوێ خەباتی دێموکراتێک پەرە پێبدەن، بەڵام هەر چۆنێکی بێ هێزەکانی ئێمە دەبێ لە ئێران برۆنە دەرێ و چۆلی بکەن. من لە ئێوە دەپرسم ئێمە لە ئێران چ خێرێکمان پێدەگا و چ بەرژەوەندییەکمان هەیە؟

ئێمە لە ئێراندا خەریکی مشتومڕ و تێکهەڵچوونین لە سەر حکوومەت، مەقام و بەڕێوەبەرایەتی و ڕێکخراوەکانی ئەنگلۆفێل (لایەنگری ئینگلیس) بە لەبەر چاو گرتنی ئەوەی کە قەواموسەلتەنە چەندین جار سیاسەتێکی پاشکەوتووی بە سەر ئێراندا سەپاندووە و ئەورۆ بە مەبەستی پاکانە کردنی سیاسەتی خۆی و دەوڵەتەکەی لێبڕاوە هێندێک هەنگاوی چاکسازی بکا و لە کۆبوونەوەکانی دێموکراتیک سەرکەوتنێک بۆ خۆی وەدەست بێنێ، پرسیار ئەوەیە ئەگەر ئەو جۆرە بێ ئێمە دەبێ چ تاکتیکێکمان هەبێ؟

بە بڕوای من بۆ ئەوەی لەو تێکهەڵچوون و مشتومڕانە کەلک وەرگرین و بزانین پشتی پەردەی ئەو پرسانە چییە، دەبێ یارمەتی قەوام بدەین و «ئەنگلۆفێل» (لایەنگرانی ئینگلیس) گۆشەگیر بکەین و وەلایان بنێین و بۆ پەرەپێدانی دێموکراسی لە ئێران، بنکەیەک ساز بکەین، ئێمە ئەوانە بە سەلاح و مەسڵەحەتی ئێوە دەزانین. هەڵبەت تاکتیکێکی دیکەش هەیە [ئەویش ئەوەیە:] تف لە هەموو شت کردن و هەڵبڕانی پێوەندییە پێکهاتووەکان لەگەڵ قەوام کە ئەوەش زەمانەتی پتەوکردنی هەڵوێستی ئیرتیجاع و مسۆگەربوونی سەرکەوتنی لایەنگرە کۆنەپەرەستەکانی ئینگلیس (ئەنگلۆفێلەکان)ە. هەڵبەت ناکرێ ناوی ئەوە بنێین تاکتیک، بەڵکوو ئەوە گەوجێتییە و لە ڕاستیشدا خەیانەتێکە بە گەلی ئازەربایجان و دێموکراسی ئێران.

هەڤاڵ پیشەوەری! بیستوومە کە ئێوە گوتووتانە[گۆیا سۆڤیەت] سەرەتا دەمانباتە ئاسمان و لە دواییدا لە عەرزێمان دەدا و دەمانگەوزێنێ، پشتمان بەردەدا و ڕیسوامان دەکا. بێتوو وا بێ جێی سەرسوڕمانە، بۆ مەگەر چی رووی داوە؟

ئێمە لێرە شێوەی دیاریکراوی راوێژکارییەکی شۆڕشگێڕانەی تایبەتیمان دەکار کردووە کە بۆ هەر شۆڕشگێڕێک روون و ئاشکرایە. لە هەلومەرجی ئەمڕۆی ئێران و بارودۆخی ئێستادا، بۆ دابین کردنی داخوازییە ناسراوەکانی هێزە شۆڕشگێڕەکان، زێدەڕۆیی لە کەمترین داخوازییەکان مەترسیمان بۆ ساز دەکا (= لە داخوازی کەمەوە دەبێ دەست پێبکرێ).

سەرەڕای ئەوە بۆ هاندانی دەوڵەتی[قەوام] بە دانی ئیمکانات و هاسانکارییەکان، پێویست بوو لە بەرامبەردا ئیمکاناتێک لە بەر دەستی دابنرێ هەتا بتوانێ بە ئامانجەکانی خۆی بگا و کارەکان بەرەو پێش بڕۆن.

ئێوە لە هەلومەرجی ئێستای ئێراندا دەتوانن ببنە خاوەنی ئیمکاناتێک کە حکوومەتی قەوام مل بە رووخان بدا. قانوونی رەوتەکانی شۆڕشگێڕی وا هەڵدەگرێ. بەڵام سەبارەت بە ئێوە، هیچ ریسواییەک رووی نەداوە. زۆر جێی سەرسوڕمانە کە ئێوە وا بیر بکەنەوە کە ئێمە بووبینە هۆکارێک بۆ ئابڕووچوونی ئێوە.

بەپێچەوانەوە ئەگەر ئێوە عاقڵانە و ژیرانە کار بکەن، لە سایەی یارمەتی مەعنەوی دەتوانن لە هەلومەرجی ئێستادا ئازەربایجان رابگرن و پارێزگاری لێبکەن. ئەوکات لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەک پێشەنگی جووڵانەوەی دێموکڕاتیکی خەڵکی ئازەربایجان و ئێران، دۆعای خێرتان بە دیاری بۆ دێ.»

نامەکەی ئیستالین لێرەدا کۆتایی پێهات. لە لاپەڕە ١٠٤ی ئەم کتێبەدا لە بیرەوەرییەکانی دوکتور «جەهانشاهلوو» کە یەکێک لە گەورە بەرپرسانی فیرقەی دێموکڕاتی ئازەربایجان بووە، کەڵک وەرگیراوە. ئەو قسانەی ناوبراو دەگەڕێتەوە رۆژە چارەنووسسازەکانی ساڵی ١٣٢٥ (١٩٤٦) کە دەوڵەتی ناوەندی هێرشەکانی بەرەو ئازەربایجان و کوردستان دەست پێکردبوو.

دوکتور «جەهانشاهلوو» دەڵێ: «سەرهەنگ قولیئۆف ئەفسەری رێکخراوی ئاسایشی سۆڤیەت بوو کە دوای «ئاتاکیشی ئۆف» سەرکۆنسوولی سۆڤیەت لە تەورێز، هەمەکارە و چاوەدێری کاروبارەکانی فیرقەی دێموکڕاتی ئازەربایجان بوو. وێڕای پیشەوەری لە سەر قەرارێکی کە پێشتر دامانناببوو چووینە لای

توورە بوو، بەگژ «قولّی ئۆف»دا چوو گوتی: ئێوە ئێمەتان هێنا ناو مەیدان و ئێستاش کە قازانجتان لەوەدا نییە[بمێنن]، ناجوامێرانە پشتمان تێدەکەن و هەموو ئەو خەڵکەی کە بە بڕوای ئێمە ڕێک خران و لەخۆبردووییان کرد بەکوشت چوون، پێم بڵێ کێ وەڵامی ئەو بێسەرەوبەرەییە دەداتەوە. (کێ بەرپرسە)؟ سەرهەنگ «قولّی ئۆف» کە لە بوێری پیشەوەری تەواو هەڵچووبوو، تەنیا ئەوەندەی گوت: (سنی گتیرن، سنە دییر گیت) واتە: ئەو کەسەی ئەتۆی هێناوە، هەر ئەویش پێت دەڵێ بڕۆ!

ئەوەندەشی لە قسەکانی زیاد کرد و گوتی: ساعەت ٨ی ئەوشۆ هەڤال «گوێزەل ئۆف» لە دەرەوەی شاری لە سێڕای تەورێز - جولفا چاوەڕێتە و لە جێی خۆی هەستا و لە بەر دەرگا ڕاوەستا! بەو مانایە کە خۆتێهەڵقوتاندن لە وە پتر بەسە!...»

لە لاپەڕە ١٠٧یشدا نووسەر دیسان لە زمان دوکتور «جەهانشاهلوو»یەوە دەڵێ: «دوای ئیمزای پەیمانی نێوان «قەواموسەلتەنە» و «سادچیکۆف» سەفیری شووڕەوی لە شوێنی باڵوێزخانە، میوانییەک ڕێکخرابوو کە لە وێ ئاغای سەفیر دەقی برووسکە (تێلگراف)ی «ئیستالین»ی بۆ بەرپرسانی فیرقە خوێندەوە. لەو برووسکەدا هاتبوو: «شۆڕش هەوراز و نشێوی هەیە، ئێستا پێویستە بەو نشێوە مل بدەن و خۆتان بۆ هەورازی داهاتوو سازکەن». بەڵام ئیستالین لە هەڵەدا بوو چونکە قەواموسەلتەنە کڵاوی لە سەر نا و هیچ کام لە خاڵەکانی پەیمانەکەی وەدی نەهێنا و ئەرتەشی شووڕەویشی بە دەرکردن دا. لە کۆتایی کتێبەکەدا نووسەر سەبارەت بەو بابەتە دەڵێ: «ئیستالین بلیمەتی نیزامی، لە قوماری سیاسیدا دۆڕا!»

پێشتر لە بەشی «چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی ژ.ک»دا باسمان کرد کە ڕووسەکان لە بەرامبەر کوردەکان چ سیاسەتێکیان ڕەچاو کردووە، بۆ نموونە باسی بیر و بۆچوونی «و.م. مۆلۆتۆف»مان کرد کە کۆمیسێری گەلیی کاروباری دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت بوو، ناوبراو لەو بڕوایەدا بوو کە بە هیچ شێوەیەک یارمەتی بە کورد نەدرێ و گوتبووی پێویستە بەرپرسانی سۆڤیەت بە پارێزەوە لەگەڵ کوردەکان بجووڵێنەوە و لەو نێوەدا هەموو هێزی خۆیان بۆ

یارمەتی بە ئازەرییەکان تەرخان بکەن. بەڵام لە بەشێک لە نامەکەیدا سەرەڕای ئەو بیر و بۆچوونەی، چونکە نایهەوێ دەوڵەتەکەی لە سامانی زۆر و زەوەندی کوردستان بێبەش بکا دەڵێ: «کاربەدەستەکانمان لە ئازەربایجانی ئێراندا نابێ بڕوایان بە سەرۆکە کۆنەپەرەست و خۆفرۆشەکانی کورد هەبێ، بەڵکوو دەبێ حیساب بۆ ماکەی پێشکەوتوو لە نێو دانیشتووانی ئازەربایجاندا بکەنەوە، ‹ئەمە بەو مانایە نییە کە ئێمە لە تەواوی پێوەندییەکانمان لەگەڵ کوردان و کەلک وەرگرتن لەو پێوەندییانە بۆ بەرژەوەندیی خۆمان چاو بپۆشین...› ئەو بۆچوونە تەواو سیاسەتی رووسەکان بەرامبەر بە هەموو گەلانی چەوساوە و بەتایبەتی بە کوردستان دەردەخا هەروەها قسەکانی کاپیتان ڤیلچیڤیسکی سیخوڕی رووس کە سەبارەت بە ژ.ک دەڵێ: «دروشمی سەربەخۆیی لە لایەن ئیمپریالیزمەوە خراوەتە سەر زاری کوردان و ئەمە دروشمێکی کۆنەپەرەستانەیە و کوردستانی سەربەخۆ دەبێتە پێگەیەکی ئیمپریالیزم و سەرەنجامی دەبێتە پردێک بۆ دەستدرێژی بۆ سەر سۆڤیەت و لە رێگای قەفقاز و ئاسیای ناوەڕاستەوە جێبەجێ دەکرێت. ئێمە دەبێ بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەو پیلانەی ئیمپریالیزم هەوڵ بدەین.» روون نییە کە هاتنی رووسەکان بۆ ئازەربایجان و کوردستان لەسەر چ حیسابێکە و ئایا هاتنی رووسەکان و بیروڕای کارناس و جاسووسەکانیان بۆ یارمەتیدان بە ئازەربایجان و پشتبەردانی کوردەکان پیلان نییە؟ ئاخۆ دەکرێ وڵاتێک نییەتی یارمەتی مەعنەوی و لایەنگری گەلە چەوساوەکانی هەبێ و یارمەتی گەلێک بدا و یارمەتی گەلێکی دیکە کە هەر دراوسێی ئەو گەلەیە نەدا؟ پێکهاتنی ئیستالین و قەوام لەسەر ئیمتیازی نەوتی باکووری ئێران ئەو راستییەی تەواو سەلماند کە رووسەکانیش چەند نیازپاکن!؟ تەنانەت ئەو نیازپاکییە حکوومەتی ئازەربایجان و پیشەوەریشی نەگرتەوە کە بە قسەی سیخوڕەکانیان لە پێناو پتەوکردن و پەرەپێدانی پەیوەندییەکان لە پلەی یەکەمدا دەبوو بۆ لای ئازەرییەکان هەنگاو بنرێت. کردنەوەی «کۆمەڵەی پێوەندییەکانی فەرهەنگی سۆڤیەت» لە مەهاباد کە بەدوای دیداری ۲۱ی بەفرانباری ۱۳۲۳ی چەند ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک لەگەڵ «ماتۆییڤ» کۆنسوولی

مامۆستا زەبیحی و کاک قاسمی ئێلخانیزادە لەگـەڵ «شـەریفۆڤ» لـە تـەورێز؛ ڕۆژی نۆهەمی ئاوریلی ١٩٤٥ (= ٢٠ی خاکەلێوەی ١٣٢٤) لە مەهاباد کـراوە، ئـەو پرسیارە دێنێتە گۆڕێ کە چۆنە ڕووسەکان هەر چەند مانگ دوای داواکارییەکـەی کۆمەڵەی ژ.ک ئەو بنکەیان لە مەهاباد دامەزراند بەڵام سەدان داوای دیکـەی ئـەو کۆمەڵە و دەیان بەڵێنی کە بە کۆماری کوردستانیان دابوو، وەپشت گوێ خـست. بە بڕوای من کردنەوەی ئەو بنکەیە لـە مـەهاباد هـەلێکی زۆر بـاش بـوو بـۆ ڕووسەکان کە لە ژێر سایەی «پەیوەندی فەرهەنگی»دا خـەریکی ئاژاوەنانـەوە و لەرزۆک کردنی بنەماکانی کۆمەڵـەی ژ.ک و لەدواییـشدا کۆمـاری کوردسـتان و کارکردن بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندییـە ئابوورییـەکانی خۆیـان بـن. قسەکانی «ئیبراهیم ئەورۆزئۆف»یش کە دەڵێ: «تاقمێک لە کارناسانی ئێمە هـەموو ڕۆژێ وەکێوەکانی دەوروبەری میانە دەکەوتن بۆ ئـەوەی پاشـەکەوتەکانی ژێـر زەوی بیبیننەوە» ئەو بۆچوونەمان دەسەلمێنێ.

بەشداری سەدان ئەفسەر و کاربەدەستی سۆڤیەت لە هەر دوو حکوومـەتی کوردستان و ئازەربایجان لە ژێر ناوی جۆراوجۆردا هەر بەو ئامانجە بووە کە بە هەر شێوەیەک بێ قازانجێک بۆ خۆیان وەدەست بێـنن، جـا چارەنووسـی ئـەو گەلانەی تا ڕادەیەک یارمەتییان داون بە کوێ دەگا، ئەوە بۆ وان گرینـگ نییـە. گرینگ گەیـشتن بـە ئامانجـە درێژخایەنـەکان و وەدەسـت هێنـانی قازانجـە ئابوورییەکانی خۆیانە. ئەگەریش یارمەتییەک بە کورد گەیشتبێ، لـە پێنـاوی ئەوەدا بووە کە لەو نێوەدا بتـوانن شـتێک بـە شـتێک بکـەن و بـە قـازانجێکی ئابووری بگەن و ئەوەی لەو نێـوەدا بـە بیریانـدا نـەهاتووە «ئـازادی گـەلانی چەوساوە» بووە.

بـە ئاوڕدانەوەیـەکی دیکـە لـە کتـێبی «ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان لـە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا» ئەو ڕاستییەمان زووتر بۆ ئاشکرا دەبێ. لە لاپەڕە ٥٨ و ٥٩ی ئەم کتێبەدا سیاسەتی ڕووسەکان بـەو جـۆرە باسـی لێکراوە: «ماکسیمۆف لە چەند دەرفەتێکدا، یارمەتی کاربەدەستانی ئێـرانی لـە پێناو ڕاگرتنی کوردەکان لە سەر نەزم و نەسەق داوە و، گومانێکی کـەم لـە وەدا هەیە کە ئەم هاوکاری کردنەی ماکسیمۆڤ لەگەڵ ئێرانییەکان شوێنێکی ئەخلاقیی

گرینگ لە سەر کورد دابنێت، گەرچی رووسەکان بەئاشکرا نایانەوێ دەستی ئێرانییەکان ئاواڵە بهێڵنەوە (کە دوور نییە هۆیەکەشی هەر ئەوە بێت وا دەیانەوێ پێشینەیەکی باشیان وەک «پارێزەر»ی کورد هەبێت)، بەلام من لام وا نییە رووسەکان کارێکی لە وە زیاتر بکەن کە داوا لە کورد بکەن ژانەسەر نەخولقێنن».

ئەوانەی ئا ئێستا باسمان کرد، هەموو دەربڕی بیر و بۆچوون و هەڵوێستی رووسەکان بوو. بەلام لە سەر ئەوەشڕا پێم وا نییە رووسەکان لەو بارەوە واتە هەڵخەڵەتاندنی گەلی کورد وەک ئینگلیسییەکانیان پێ‌کرابێ. لە لاپەڕە ٣٣٧ی سەرچاوەی پێشوو گۆشەیەک لە سیاسەتی ئینگلیسییەکانیش سەبارەت بە گەلی کورد بەتایبەت لەو هەلومەرجەی کۆمەڵەی ژ.ک و کۆماری کوردستان تێیدا بووە، دەخەینە روو.

لاپەڕە ٣٣٧ دەڵێ: «کورد خەڵکێکی دواکەوتوو و دەمدەمین و متمانەیان پێ ناکرێ. دایم گیرۆدەی کێشەی ناوخۆیین لەبەر ئەوەی لە شوێنی دوورەدەست دەژین موشکیلەیەکی زۆر ناتوانن بنێنەوە. کەمایەسییەکن کە دەکرێ بەکار بهێنرێن. هەمیشە دژ بە حکوومەتن و ئەگەر رووسەکان بێنە ناو ولات، ئەوان دەتوانن موشکیلەکە زیاتر بکەن، بەلام حکوومەتی عێراق و ئێران ئێستا دەتوانن کۆنترۆڵیان بکەن. هیچ هەنگاوێکی تایبەت پێویست نییە هەڵبگیرێت.» کە لێرەشدا بەوە دەگەین کە کوردی چەوساوە چۆن لە هەردوو دینان بوون، رووسەکان (ژ.ک)یان بە داردەستی ئینگلیسییەکان و ئینگلیسییەکانیش بەپێچەوانەوە «ژ.ک»یان بە دەستکرد و داردەستی رووسەکان زانیوە. کوردی لێقەوماویش هەموو هەوڵ و پێوەندییەکی لەگەڵ ئەو دوو زلهێزە لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی بووە.

٣

# ناساندن و شیکردنەوەی لاپەڕەکانی نوسخەی کۆتایی ئەسڵی گۆڤاری نیشتمان و وەلانانی بەرپرسەکەی

جا ئەوجار با بگەڕێینەوە سەر باسی «گۆڤاری نیشتمان». پێشتر بێجگە لەو گۆڕانکارییانەی کە لە ژمارەی کۆتایی گۆڤارەکەدا لە وتاری «پەیمانی سێسنوور» خستوومانەتە بەرچاو (رووبەرگ و ئەسڵی پەیمانەکە و پێڕستی بابەتەکان کە لە کۆتایی گۆڤارەکەدا هاتووە)، گوتمان کە لە سەرجەمی ٣٢ لاپەڕەی ژمارەی کۆتایی «گۆڤاری نیشتمان» ١٢ لاپەڕەی لە تەورێز لە لایەن مامۆستا «زەبیحی»یەوە چاپ کراوە و ئەو ٢٠ لاپەڕەی دیکەشی لە مەهاباد چاپ کراوە. هەر دوابەدوای هاتنەوەی مامۆستا زەبیحی بۆ مەهاباد کە لەسەر داوای بەرپرسانی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوو، بۆ ماوەیەکی کورت دەسبەسەر دەکرێ و لەو ماوەیەشدا سەرنووسەری و بەرپرسێتی گۆڤارەکەیان لە دەست دەرهێناوە کە بەو لێوردبوونانەی لێرەدا باسیان دەکەین ئەو بۆچوونانەمان بە بەڵگەوە دەسەلمێنن. لە یەکەم وتاری «گۆڤاری نیشتمان»دا چاومان بە وتاری «کوردستان قووت نادرێت» دەکەوێ کە لە لایەن مامۆستا زەبیحی نووسراوە و ئەو وتارە کەوتۆتە لاپەڕە ٢ی گۆڤارەکە. لە بەشی کۆتایی وتارەکەیدا دەڵێ: «ئەگەر هێندێک نەفام دەسخەرۆی (= فریوخواردوو) درۆ و دەلەسەی دوژمنان بووبن،

لازمە بزانن: کۆمەڵانی سیاسی کورد هەر کاتێ ئیرادە بکەن وایان بەسەردێنن وەکوو نەهاتبنە دونیا، ئیتر وەباڵی خۆیان وەئەستۆی خۆیان. «وما علی‌الرسول الاالبلاغ».

لێرە هەست بەوە دەکەین کە کەسانێک هەن کە لە دژی بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد بەگشتی و کۆمەڵەی (ژ.ک) بەتایبەتی خەریکی دوژمنایەتی و ئاژاوە نانەوەن، بەڵام لە وتارەکەدا بە شێوەیەکی سەربەستراو باسی ئەو کەسانە کراوە.

لە لاپەڕە ٨یشدا وتارێکی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» تێدا بڵاو کراوەتەوە کە نووسەر لەو وتارەدا بێجگە لە چەند کەسێک کە وەک دڕک و داڵی نەگبەت بە کوردستاندا بڵاو بوونەوە، گلەیی لە تاقمێک دەکا و بێ ئەوەی ناوی کەسێکی هێنابێ دەڵێ: «بەڵێ هاواری من لە دەست ئەو کەسانەیە کە پەردەی خۆبینی و نەفامی بە سەر چاویان کشاوە و بە ئانتریکاتی (= دنەدان) دوژمنان وەک میکرۆبی تاعوون لە کوردستان خەریکی پێشگیری و بەربەستکردنی فەعالییەتی گەنجانن».

نووسەر لە بەشێکی دیکە لە وتارەکەیدا دەڵێ: «ئەو گلەیی و هاوارەش نابێ ببێتە واسیتەی خۆلێگۆڕانی ئەوانەی رووی قسەیان تێکراوە و وا بزانن کە وجوودیان بۆ ژیانی نەتەوەی کورد و دوارۆژی کوردستاندا چاکە و خراپەی لێدەوەشێتەوە نا نا! هەرگیز نابێ ئەو خەیاڵ و پلاوانە بفەرموون؛ دوارۆژی هەموو میللەتێک مەربووت بە کۆشش و خەباتی لاوانی ئەو قەومەیە. هەروەها موقەددەراتی کورد و کوردستان بە دەست گەنجانی بەغیرەت و ناموسە کە لە هەموو شوێنێکی وڵات پاڵیان رێکخستووە و شێرانە و مێرانە بۆ بەرزێتی قەومی کورد و رزگاری کوردستان بەگیان و دڵ تێدەکۆشن، هەرچی کۆششتێک لە موقابیل خەباتی ئەواندا بکرێت بەفیڕۆ دەچێ و...» لە کۆتاییشدا دەڵێ: «ئێمە لە رووی دڵسۆزی و کوردایەتییەوە ئامۆژگارییان دەکەین کە لەم رێگا خوارەی گرتوویانە بگەڕێنەوە و رێگای راستی بگرنە پێش تا لە دواییدا خەجاڵەت نەبنەوە و پەشیمانی نەکێشن کە بێ کەلک و سوود دەمێنێتەوە».

کورد ئەوەند کوردن بە سەد شەیتان لە کوردی ناکەون
ئەی کە خەڵکی بۆچی؟ بۆخۆ دەردیسەر پەیدا دەکەن

کە بە بڕوای من میسرەعی ئەووەڵی ئەو شێعرە و کاکڵی شێعرەکە، لە شێعرێکی شاعیری گەورەی گەلەکەمان «شێخ رەزای تاڵەبانی» وەرگیراوە کە دەڵێ:

حاجی عەبدوڵلا لە ئادمم فیلترە
با وجوودی مەرتەبەی پێغەمبەری
ئەم بە سەد شەیتان لە کۆیە دەرنەچوو
ئەو بە شەیتانێک لە جەننەت دەرپەڕی

ئەو وتارە بە روونی فشار و کاری بەرنامەداڕێژراوی رووسەکان و چەند دەستێکی دژ بە ئامانجەکانی گەلی کورد بەگشتی و کۆمەڵەی (ژ.ک) بەتایبەتی دەگرێتەوە. بەڵام وا وێدەچێ فشارەکە لە لایەن چەند کەسێک یا چەند لایەنێکی بەهێز بووە کە نووسەر لەبەر چەند هۆیەکی نادیار کە یەکیان رەنگە پاراستنی بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) بێ، بەئاشکرا ناویان ناهێنێ و مەبەستی خۆی بە شێوەیەکی گشتی دەربڕیوە و ناوی کەس یا کەسانێکی تایبەتی نەهێناوە و گلەیی و هاواری خۆی بەو شێوەیە لە دەستیان دەربڕیوە.

بۆ سەلماندنی ئەو رایە و بەڵگەدارکردنی قسەکانمان هەرچەند بەکورتیش بێ با ئاوڕێک بدەینەوە لە سەر یەکێکی دیکە لە گۆڤارەکانی سەردەمی کۆمەڵەی (ژ.ک).

## گۆڤاری «هاوار»

گۆڤاری «هاوار» یەکەم ژمارەی لە رەزبەری ساڵی ١٣٢٤ (سێپتامبری ساڵی ١٩٤٥) چاپ و بلاو کراوەتەوە. دەرچوونی ئەو گۆڤارە هاوکات بووە لەگەڵ هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک) و سەروبەندی کۆنگرەی یەکەمی دامەزراندنی

«حیزبی دێموکراتی کوردستان». بەڵگەشمان بۆ ئەو قسانە ئەوەیە کە کۆماری کوردستان لە ٢ی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٤ (٢٢ی ژانویی‌یەی ١٩٤٦) ڕاگەیەندراوە، کەچی «هاوار» لە مانگی ڕەزبەر واتە چوار مانگ بەر لە ڕاگەیاندنی کۆمار چاپ کراوە و لەبەر فشاری ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆی ڕووسەکان، سەرەڕای هەڵنەوەشاندنەوەی بەڕەسمی کۆمەڵەی (ژ.ک) ماوە و دەرفەتی چاپی ژمارەکانی داهاتووی پێنەدراوە. ڕوونیش نییە بە چ هۆیەک گۆڤارەکەیان ناو ناوە «هاوار» کە بە بڕوای من هۆیەکەی هەر درێژەی ئەو باسانەیە کە لە نیشتمانی (٧و٨و٩)دا شیمان کردنەوە و ئەو هاوارە لە دەست هێندێک لە کاربەدەستانی ناو کۆمەڵەی (ژ.ک)ە کە لە ژێر فشاری ڕووسەکان لە لایەک و بەپێویست زانینی گۆڕینی ناوی کۆمەڵە لە لایەکی دیکەیە. گرینگی ئەو باسەشمان کاتێک بۆ ڕوون دەبێتەوە کە سەرنجێک بدەینە سەر ئەو باسەی کە یەکەم جار ناوی گۆڤارەکە «هاوار» بووە.

کاک عوبەیدیللا ئەییووبیان دەڵێ: «ئەو گۆڤارە کە لە لایەن چەند لایەنگر و تێکۆشەری ناو کۆمەڵەی (ژ.ک) چاپ کرا کە کاک «مستەفا نەژادی» ئەندامی چالاکی کۆمەڵە و کاک «محەممەدی شاپەسەندی» دوو کەس لەو تێکۆشەرانە بوون.» بەڵام بەپێچەوانەی بیروڕای کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» و بەپێی ئەو ژمارەیەی گۆڤارەکە کە لە بەر دەستماندا بوو و هەروەها بە چاوخشاندنێک بە سەر لاپەڕەکانی ئەو ژمارەیەدا ناوێک لەو دوو ئەندامانەی سەروو نابینین و تەنیا ناوی «سەید محەممەدی حەمیدی» (م.ح) وەک سەرنووسەر دەبینین، بەڵام ئەگەرچی ناوێک لەو دوو تێکۆشەرەی (کاک مستەفا نەژادی و کاک محەممەدی شاپەسەندی) لە گۆڤارەکەدا نابینین، ناشتوانین حاشا لە یارمەتی ئەو دوو کەسە بکەین. ڕەنگە لە چاپەکەیدا یارمەتییان دابن و زۆر ماندوو بووبن. ئەو چەند کەسەش وەک شاعیر و نووسەر، شێعر و نووسراوەکانیان بڵاو کراوەتەوە کە زۆربەی ئەو شێعرانە هەستی نەتەوایەتییان تێدا زەق بۆتەوە و گرینگییەکی زۆر بەو بابەتە دراوە. مامۆستا «هێمن» و مامۆستا «هەژار» هەر یەکەی بە چەند شێعر، فانی بە شێعرێک بەشدارییان کردووە. شێعری «ڕەنجبەر»یش لەو ژمارەیەدا هاتووە کە وێدەچێ هۆنراوەی مامۆستا «زەبیحی» بێ، چونکە لە

لەو بڵاوکراوەیەدا بە زمانی فارسی هاتووە لە لایەن (م.ح) «سەید محەممەدی حەمیدی»یەوە نووسراوە (نووسەرە فارسەکان بیخوێننەوە) کە وەکی پێشتر گوتمان دەقی ئەو وتارە بۆ دووهەم جار لە گۆڤاری «ئاوات»دا چاپ کراوەتەوە.

وتارێکیش لە ژێر ناوی «ئازادکەرەکان» لە لایەن «ب.پرشنگ» لە عەرەبی وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی».

کاک عوبەیدیللا ئەییووبیان لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «نموونەی نوسخەیەک لە گۆڤارەکە بە ناوی «هاوار» ژمارە ١ بۆ مانگی رەزبەری ساڵی ١٣٢٤ دەنێردرێتە لای یەکێک لە کاربەدەستانی کۆمەڵەی (ژ.ک). ئەو کەسە کاک «محەممەدی تەهازادە (ئەییووبیان) بوو کە براگەورەی من بوو.» هەروەها لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «کاتێک ئەو نوسخەیە دەگاتە دەستی کاکم، دەزانێ کە ناوی گۆڤارەکە ئاسایی نییە و «هاوار»ێکە لە دەست ئەو کەسانەی بەرگری لە تێکۆشانی گەنج و لاوی ناو کۆمەڵەی (ژ.ک) دەکەن.»

ئەگەرچی هیچ بەڵگەیەکمان بۆ ئەو قسەیەش نییە کە کاک «محەممەدی تەهازادە» ئەم بۆچوونانەی هەبێ و ئەو قسانەی کردبێ، بەڵام هیچ شک لە وەیدا نییە کە لە لایەن ئەندامێکی بەرزی کۆمەڵەی (ژ.ک) ئەو کارە کراوە. هەرچۆنێکی بێ بە قسەی کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» کاتێک گۆڤاری «هاوار» دەگاتە دەستی ئەو بەرپرسەی کۆمەڵەی (ژ.ک)، ناوبراو (؟) بە ئاگاداری لەسەر بارودۆخی ئەو سەردەمی کە پێشتر باسمان کرد دەڵێ: «گەلی کورد زوڵم و زۆرییەکی زۆری لێکراوە، با ئەو «هاوار»ە ببێتە «هاواری کورد» و هەموو کوردێکی کوردستان بگرێتەوە.» هەر بۆیە لەسەر یەکەم لاپەڕەی (رووبەرگ) «گۆڤاری هاوار» وشەی «ی کورد» بە قەڵەمی سەوز لە لای سەرووی وشەی هاوار دەنووسێ و بەو جۆرە ناوی گۆڤارەکە دەبێتە «هاواری کورد».[وێنەی ژمارە ٢٨] ئەمن بۆخۆم ئەو لاپەڕە دەسکاریکراوەم دیوە و لەو کتێبەشدا وەک بەڵگە هێناومەتەوە، بەڵام بە تێڕادیوییەوە ناتوانم بڵێم کێ ئەو وشانەی لێ زیاد کردووە.

دوکتور «کەماڵ مەزهەر ئەحمەد» لە لاپەڕە ٨٢ و ٨٣ی کتێبەکەیدا «تێگەیشتنی راستیی و شوێنی لە رۆژنامەنووسی کوردیدا» دوای ناساندنی

بڵاوکراوەکانی سەردەمی دەسەڵاتی ژ.ک و کۆماری کوردستان، سەبارەت بە گۆڤاری «هاوار» دەڵێ: «گۆڤاری «هاوار» (۱)ی مانگی ڕەزبەری ساڵی ۱۳۲٤ چاپ کراوە. لە سەربەرگی یەکەمی تەنها «هاوار» و لە سەر دووەمی «هاواری کورد» نووسراوە.»

دیسان لە سەرچاوەی پێشوو، لە بەشی «پاشکۆ - چەند تێبینی‌یەک» لە لاپەڕە ۲۳۸یش نووسیویەتی « «هاوار - هاواری کورد» مەهاباد. ژمارە (یەک)ی: ڕەزبەری ساڵی ۱۳۲٤، ئەیلول - تشرینی یەکەمی ۱۹٤٥. لە سەربەرگی یەکەمی تەنها «هاوار» و لە سەربەرگی دووهەمی «هاواری کورد» نووسراوە. ژمارە یەکی ۳۰ لاپەڕەیە (۲۰ × ۱٤ سم)ە.» بە چاوخشاندنێک بە سەر لاپەڕەکانی یەکەم و دووهەمی ئەو تاقە یەک ژمارەی گۆڤارەکە، هێندێک دەکەوینە شک و گومانەوە و دێینە سەر ئەو باوەڕە کە بۆی هەیە ئەم گۆڤارەش بە دەردی ژمارەی کۆتایی «نیشتمان»ەوە چووبێ. هۆکارەکانی هاتنە سەر ئەو باوەڕەشمان یەکەمیان: وەک لە پێشتر باسمان کرد رووبەرگی گۆڤارەکەیە. دووهەمیش: ئەوە کە بەپێچەوانەی هەموو ژمارەکانی گۆڤاری «نیشتمان»، لە گۆڤاری «هاوار»دا پێڕشت (فێهرێست)ی بابەتەکان و ناوی نووسەر و لاپەڕەکانی وەبەر چاو ناکەوێ. جگە لەوانە ئەگەر هێندێک سەرنج بدەینە سەر رووبەرگی گۆڤاری «هاواری کورد» جوان بۆمان دەردەکەوێ کە تەنانەت ئەو پیتانەی بە گۆڤاری «هاوار»ەوە لکێندراون، واتە «ی کورد»، لەگەڵ وشەی پیتی «هاوار»جیاوازییان هەیە. بەتایبەت وشەی «کورد»بە پیتێک چاپ کراوە کە نێو پیتەکانی بەتاڵە. ئەو جۆرە فۆنتە لەگەڵ فۆنتی وشەی «هاوار» جیاوازی هەیە. رووبەرگی دەسکاری‌نەکراوی گۆڤارەکە وشەی «ی کورد»ی پێوە نەلکاوە کە ئەو رووبەرگە وێڕای رووبەرگی گۆڤاری «هاواری کورد» کە ئێستا لەبەر دەستی زۆربەی خوێنەراندایە، لەم کتێبەدا، وەک خۆیان بڵاو کراونەتەوە. [وێنەی ژمارە ۲۹]

هەر بەو هۆیانەی کە بۆ «نیشتمان»ی ۷و۸و۹ باسمان کردن، گۆڤاری «هاوار» (= هاواری کورد)یش، ماوەی پێنەدرا پتر لە یەک ژمارەی لێ چاپ و بڵاو بێتەوە کە بە بڕوای من دەرچوونی تاقە یەک ژمارەی گۆڤاری «هاواری نیشتمان»یش هەر بەو هۆیە بوو کە بۆ گۆڤارەکانی پێش خۆی واتە «نیشتمان و

لێچاپ و بڵاو بکرێتەوە. لێرەدایە کە دەتوانین بڵێین، ئەگەر بڕیار بووبا کورد هاوارێکی کردبا، ئەوە دەبوو بەر لە کاتی دەرچوونی یەکەم گۆڤار و پێش دامەزراندنی کۆمەڵەی (ژ.ک) کردبای و بە هۆی زەخت و فشاری کاربەدەستانی ئێران و بێهیوایی کورد و نەبوونی پشتیوانێک بۆ کۆمەڵەکە، گۆڤارەکەیان ناو نابایە «هاوار» (= هاواری کورد) و ئاوات و هاواری نیشتمان» کەچی دەبینین بەپێچەوانەوە ئەو گۆڤارانە لە سەردەمی دەسەڵاتی بەهێزی کۆمەڵەی (ژ.ک)دا چاپ و بڵاو کراونەتەوە و ئەو ناوانەشیان لە سەردەمی دەسەڵاتی (ژ.ک)دا لەسەر داندراوە.

لەوەش گرینگتر ئەوە بوو کە وەکوو هەمووومان دەزانین لە رۆژی ٣ی خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ (١٩٤١) رووسەکان لە لای سەروو و ئینگلیسییەکان لە لای رۆژئاوا و خواروی رۆژئاواوە سنووری ئێرانیان شکاندووە و هاتوونە ناو خاکی ئێرانەوە، کەچی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە رۆژی ٢٢ی جۆزەردانی ساڵی ١٣٢٢ (١٣ی مەی ١٩٤٣) بە زۆربەی دەنگ بڕیاری داوە کە لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت پێوەندی دامەزرێنێ و یەکەم پێوەندی رووسەکانیش بە کۆمەڵەی (ژ.ک)، بەپێی ئەو بەڵگانەی تا ئێستا لەبەر دەستماندایە، رۆژەکانی ٨ - ١٠ی رێبەندانی ساڵی ١٣٢٢ (٢٨ - ٣٠ی ژانوییەی ساڵی ١٩٤٤) بووە.

کەوایە ئەو ماوەیە هەرچی بڵاو کرابایەوە دەبوو بۆ نیشاندانی مەزلوومییەتی کورد و وەک هاوارێک لە دەست زوڵم زۆری کاربەدەستانی ئێرانی و بێهیوایی کورد، ناویان نرابایە «هاوار» (= هاواری کورد) و «ئاوات» و «هاواری نیشتمان» بەڵام بە سەرسوڕمانەوە دەبینین کە یەکەم ژمارەی ئۆرگانی کۆمەڵەی (ژ.ک) بە ناوی «نیشتمان» بڵاو کراوەتەوە. دوای ئیزنپێنەدانی بۆ ژمارەکانی داهاتووی گۆڤارەکە، « هاوار» (= هاواری کورد) و «ئاوات» و «هاواری نیشتمان» لە دەست فشاری دەرەوە و ناوخۆی کوردستان چاپ و بڵاو کراونەتەوە. نووسراوەکانی داهاتوو پتر ئەو بۆچوونانەمان دەسەلمێنن.

## وەلانانی بەرپرسی چاپەمەنییەکان

با بگەڕێینەوە سەر شیکردنەوەی لاپەڕەکانی «گۆڤاری نیشتمان». لە لاپەڕە ١١ی گۆڤارەکەدا ئەم نووسراوەیە هاتووە: «کەسانێکی نووسراو و هەڵبەستمان بۆ دەنێرن، لازمە لە سەر روویەکی کاغەز بە ئەندازی لاپەڕی ئەم ژمارە، بە پاک و خاوێنی بینووسن؛ نێو و نیشان و ژمارەی ئەندامەتی، جێگای دانیشتن و تەشکیلاتی کۆمەڵیان زۆر چاک لە سەرەوەی نووسراوەکەدا دەرج بکرێت. گەڕێنەندەی چاپەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) ع. بیژەن - ٢».

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە بەرپرس و مەسئوولی هەموو ژمارەکانی گۆڤاری «نیشتمان» و بڵاوکراوەکانی دیکە تەنانەت ئەگەر بە شێوەی بەیاننامەش بووبێ، ع.بیژەن بووە کە ئەویش ناوی نهێنی مامۆستا «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» ئەندامی ژمارە ٢ی کۆمەڵەی (ژ.ک) و هەڵسووڕاوترین و چالاکترین ئەندام و هەروەها لە دامەزرێنەرانی سەرەکی ئەو کۆمەڵەیە بووە. ئەگەرچی بۆ هەمووان روون و ئاشکرایە کە بەرپرسی بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک)، مامۆستا «زەبیحی»یە، بەڵام بە سەرسووڕمانەوە، لە لاپەڕە ١٩ی هەمان ژمارەی «گۆڤاری نیشتمان»دا دەبینین ئەو نووسراوەیە هاتووە: «بۆ زانین - پێویستە هەر نووسین و هۆنراوەیەکی کە لە لایەن ئەندامانەوە بۆ چاپ کردن بۆ کۆمەڵە دەنێردرێ ئەو ماددانەی خوارەوە مراعات بکرێ: ١- بە خەتێکی دیاری و لە لایەکی کاغەز و.بە مرەکەب بنووسرێت. [٢-] بە ئادرەسی: هەیئەتی ئینتیشاراتی کۆمەڵەی ژ.ک بنێردرێت. لە لایان هەیئەتی فەرهەنگی کۆمەڵ: نادری.» کە بەو چەند دێڕەش ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە بەرپرس و مەسئوولی گۆڤارەکە گۆڕدراوە و لە جیات «ع.بیژەن» بۆتە «نادری» کە وەک هەموومان دەزانین نادری، ناوی نهێنی کاک «محەممەد دڵشادی رەسووڵی»، ئەندامی ژمارە ٧٦ی کۆمەڵەی (ژ.ک)ە. لێرەدا پرسیارێکی گرینگ دێتە گۆڕێ: کە ئاخۆ دەکرێ لە یەک گۆڤاردا دوو بەرپرس بۆ چاپی بڵاوکراوەیەک هەبێ و لە دوو شوێنی جیاوازدا ئاگاداری ئەوە بدرێ کە

نووسەران بە چ شێوەیەک و لە سەر چ جۆرە کاغەزێک بەرهەمەکانیان بۆ بەرپرسی چاپەمەنی گۆڤارەکە بنێرن؟!

دیسان لە لاپەڕە ٣١یشدا لە خوار وتاری «مەلا عەلی ئوشنەوی - شێخانی» ئەو رستەیە هاتووە: «چونکە ‹لە هەوەڵی کاردا› وەسیلەمان بەچاکی فەراهەم نەبوو، تکامان لە هەموو خوێنەرەکان ئەوەیە لە هێندێ عویووب و ئەغلاتی جوزئی کە دێتە بەرچاو، چاو بپۆشن.» کە لێرەشدا خاڵێکی زۆر گرینگمان بۆ روون دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە نووسەر دەڵێ: «ئێمە لە هەوەڵی کاردایــن ...» ئەم قسەیە لەگەڵ تێکۆشانی چەندین ساڵەی بەردەوام و زانیارییەکانی پێویست بۆ کاری رۆژنامەگەری مامۆستا «زەبیحی» کە سەرنووسەر و بەرپرسی گۆڤاری «نیشتمان» بووە، یەک ناگرنەوە. مامۆستا «زەبیحی» وەک ئەندامی ژمارە ٢ی کۆمەڵەی (ژ.ک) زۆر شارەزایانە و لێهاتووانە دەستی داوەتە قەڵەم و بە نووسین تێکۆشانی خۆی دەسپێکردووە و یەکەم ژمارەی گۆڤاری «نیشتمان» لەسەر فکر و بیر و هۆشی ئەو و بە بەرپرسێتی و سەرنووسەری ئەو دەرچووە، هەر بە هیممەت و ماندوویەتی ئەو بووە کە ژمارەی «نیشتمان» لەو بارودۆخە سەخت و ناهەموارەی ئەوکاتدا گەیشتۆتە ژمارە ٩ی خۆی. کاک مەنافی کەریمی لە وتووێژێکدا کە لە گۆڤاری روانگەی ژمارە ١١دا بڵاو کراوەتەوە دەڵێ: «ئەمن لەگەڵ زەبیحی دۆست و هەواڵی زۆر نزیک بووم. زەبیحی ئینسانێکی سەربەگێچەڵ بوو. سەدی نەوەدی بابەتەکانی «نیشتمان»ی بۆخۆی دەنووسی لەگەڵ هەموو جۆرە سیاسەتێکیش بوو.» ئایا دەکرێ کەسایەتێکی وەک مامۆستا «زەبیحی» کە رابردوویەکی پڕ لە ئەزموون و سەروەری و گەورە و گرانی لە هەموو بوارەکانی خەباتدا و بەتایبەتی لە بواری رۆژنامەگەری و کاری نهێنی هەبێ؛ بێت و بڵێ «لە هەوەڵی کاردایــن...» کە وەڵامەکەی بۆ هەمووان روون و ئاشکرایە، ئەم هەڵە و ئیشتیبایە لە کەسایەتییەکی وەک ئەو ناوەشێتەوە. بەو جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە گۆڤاری «نیشتمان» لە دوای چاپی دوازدە لاپەڕەی هەوەڵی لە ژێر سەرنووسەری و بەرپرسایەتی مامۆستا «زەبیحی» دێتە دەرێ و ٢٠ لاپەڕەی دواییشی بە بێ ئاگاداری ئەو و ‹ناشیانە› و بە جودا بە گۆڤارەکەوە دەلکێندرێ و لە مەهاباد

چاپ و بڵاو دەکرێتەوە. هەروەها ئەو بەڵگەشمان دێتە دەستی کە لەو ماوەیەدا مامۆستا «زەبیحی» بۆ ماوەیەک دەسبەسەر کراوە و لە کاری سیاسی و نهێنیکاری (ژ.ک) وەلا نراوە. چونکە ئەگەر بەو جۆرە نەبایە ئەو جیاوازییانەمان لە گۆڤارەکەدا وەبەر چاو نەدەهات. بۆیە وشەی «ناشیانە»شم دەکار کردووە، چونکە لەو ۲۰ لاپەڕەی کۆتایی ژمارە (۷و۸و۹)ی «نیشتمان»دا دەبینین کە ئەوانەی سەرنووسەری گۆڤارەکەیان وەرگرتووە (کە وێشدەچێ م.نادری واتا کاک محەممەد دڵشادی رەسووڵی بێ)، بە هۆی ئەوەی کە کاری رۆژنامەگەرییان نەکردووە، نەشیانزانیوە لاپەڕەکانی دیکەی گۆڤارەکە بە چی پڕ بکەنەوە. هەر لەو ژمارەی گۆڤاری «نیشتمان»دا سێ وتاری م.نادری، دوو وتار و شێعرێکی مامۆستا هێمن و دوو شێعری مامۆستا هەژاری تێدا بڵاو کراوەتەوە کە مەبەست لەو کارەش تەنیا ‹پڕکردنەوە› و زیادکردنی لاپەڕەکانی ئەم ژمارەیە بووە و ئەو کارە لەگەڵ ژمارەکانی پێشووی «نیشتمان» جیاوازی زۆرە. بۆیە دەڵێم ‹پڕکردنەوەی ئەو ۲۰ لاپەڕەی دوایی›، چونکە ئەو ژمارەی کۆتایی گۆڤارەکە تەنیا ژمارەیەکە کە بۆ سێ مانگی خاکەلێوە و بانەمەڕ و جۆزەردانی ساڵی ۱۳۲۳ی گۆڤارەکە تەرخان کراوە. واتا هیچکام لە ژمارەکانی «نیشتمان» بۆ سێ مانگ ئامادە نەکراون. ناشارەزایی و کەمئەزموونی بەرپرسانی تازەی گۆڤارەکە لە لایەک و بڕیاری داخستنی گۆڤارەکە لەبەر فشاری ناڕاستەوخۆی رووسەکان لە لایەکی دیکەوە، بوو بە هۆی ئەوەی کە «نیشتمان» چیدی بڵاو نەکرێتەوە. هەڵبەت ئەوە تەنیا رووسەکان نەبوون کە بەو شێوەیە کاربەدەستانی کوردیان لەژێر فشار دەنا بەڵکوو ئینگلیسییەکانیش دەرچوونی گۆڤاری «نیشتمان»یان بە زیانی خۆیان دەزانی و لەو بڕوایەدا بوون کە دەرچوونی ئەو گۆڤارە و گەیشتنی بە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئەوان، بیری سەربزێوی لە مێشکی کوردەکانی ئەوێدا زیاتر دەکا و ئەوانیش هان دەدا شۆڕشێکی دیکە دەست پێبکەنەوە و وەک کوردەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان داوای مافی خۆیان بکەن. کاک «هیمدادی حوسێن» لە لاپەڕە ۸۱ و ۸۲ی کتێبی «رۆژنامەنووسیی کوردی...» باسی بەڵگەنامەیەکی نهێنی کردووە کە «دوکتور کەماڵ مەزهەر» لە رۆژنامەی

بەڵگەنامەوە» بڵاوی کردۆتــەوە. لــەو بەڵــگەنامەیەدا کــە لــە لایــەن وەزارەتی دەرەوەی عێراق و بە پشتبەستن بە راپۆرتی کۆنسوولخانەی عێراق لــە تــەورێز ئامادە کراوە، هاتووە: نهێنی، ژمارە ش ٤/٨٥٨ - رۆژی: ١٧ی مایسی ١٩٤٤ (٢٦ی جۆزەردانی ١٣٢٣) بابەت: بزووتنــەوەی کــورد. «کۆنــسوولخانەی عێــراقی لــە تەورێزەوە بە برووسکە پێی راگەیاندووین کە وا کــوردی مــەهاباد رۆژنامەیــەک دەردەکەن ناوی (نیشتمان)ە و بە زمانی کوردی عێراق چاپ دەبێــت و بــە نهێنی دەینێرن بۆ کوردی عێراق، (نیــشتمان) داوای ســەربەخۆیی بــۆ کــورد دەکــات و حکوومەتی ئێران بایخی داوەتە ئەم باسە، سەرباری ئەوە، بــەپێی برووســکەی کۆنسوولخانەی ناوبراو هاتوچۆ لە ناو ئێران و عێراقدا لە رێگای کوردستانەوە کارێکی ئاسانە، پێویستی بە ڤیزە و ڤیزەکاری نییــە». کــە ئــەوەش لــە لایــەک ئەوپەڕی ترس و تۆقینی دوژمنانی کورد و لە لایــەکیش رادەی گرینگــی گۆڤــاری نیشتمان بۆ ژیانەوە و راپەڕین لە هەموو پارچــەکانی کوردســتان نیــشان دەدا. وەنەبێ کورد بەگشتی و کۆمەڵەی «ژ.ک»یش بەتایبەتی هێندە بــێخەبــەر بــن و ئاگاداری ئەو جموجۆڵ و شڵەژاوییەی دەوڵەتەکانی دەوروبەر نەبووبن؛ هەر زوو زانیاری سەبارەت بەو بابەتەیان وەدەست کەوتووە و لــە لاپــەڕە ١١ی گۆڤــاری «نیشتمان»ی ژمارە ٧و٨و٩دا بڵاویان کردۆتەوە: «ئــەو ئاگایانــەی لــە عێــراق و ئێــران بۆمــان هــاتووە نیــشان دەدەن ئــەو دوو حکوومەتــە دیکتــاتۆڕ و ئیستیعمارییانە لــە پێــشکەوتنی کۆمەڵــەی (ژ.ک) و بڵاوبوونــەوەی «گۆڤــاری نیشتمان» کەوتوونەتە ترس و لەرزەوە؛ بۆ پێشگیری عەمەلیات (کاروبار)ی ئێمە بڕیاریان داوە نەهێڵن «نیشتمان» دەربچێت. لــە شــارانی: هــەولێر، سلێمانی، بەغدا، کرماشان و سنە چاپخانەکانیان پشکنیوە. باڵوێزی ئێــران لــە «بەغــدا» راستەوخۆ نامەیەکی بۆ حاکمی یەکێک لە شــارانی ئێــران نووســیوە [نووســەر نایهــەوێ بڵێ بــۆ تــەورێز نووســراوە چونکــە ئــەوەش بەشــێک بــووە لــە نهێنیکاریــەکانی ژ.ک] کــە گۆیــا ناوچــەی ژ.ک و ئیدارەخانــەی «نیــشتمان» لەم شارەیە لازمە کەشــف و پێــشی بگیرێــت. کــۆواری خۆشەویــستی گــەلاوێژ کە بە پۆستە بۆ ئێــران دەچــوو لــە لایــەن «پۆســتە»ی ئێــران رەددی کــردووە. لە مقابیلی ئەم کارە پۆستەی حکوومەتی ئێران ئێــستا (پۆســتەی ژ.ک) بــۆ زۆر

شارانی کوردستانی ئێران «گەلاوێژ»، «نیشتمان»، «رۆژا نویٚ» و «رۆناهی» دەبا و ئیرتباتی نێوان دوو پارچەی کوردستان حیفز دەکات...». پێش ئەوەی کۆتایی بەو بەشە لە شیکردنەوەکانمان سەبارەت بەو گۆڤارە بێنین، بەپێویستی دەزانم کە بڵێم مەبەستی گرینگ و سەرەکیم لەو باسە تەنیا ئەوەیە کە گۆشەیەک لە گەمەی رووسەکان و تا رادەیەکیش ئینگلیسییەکان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ، سەبارەت بە مەسەلەی کورد لە رۆژهەڵاتی کوردستان پێشانی خوێنەران بدەم. هەروەها هەموو بزانین کە چۆن ئەو فشارە، داخرانی گۆڤار و بڵاوکراوەکانی کوردی لە سەردەمی دەسەڵاتی بەهێزی کورد، لێکەوتۆتەوە. پشتبەردانی کۆماری کوردستان لە بەرامبەر قازانجە ئابوورییەکان، دوایین قومار و گەمەی رووسەکان بوو بەرامبەر بە کێشەی کورد و داوا رەواکەی.

٤

# پەیمانی «سێ سنوور»

هەر دوابەدوای دامەزراندنی کۆمەڵـەی (ژ.ک) بـە مەبەسـتی پـەرەگرتنی تێکۆشانی ئەو کۆمەڵەیە، کاک «محەممەدئەمینی شەرەفی» وەک نوێنـەری ئـەو کۆمەڵەیە دیاری کرا بچێتە شاری کەرکووک. ئەو سـەردانە بـۆ هەڵـسەنگاندنی هەلومەرجی دامەزراندنی یەکێتی نێوان کۆمەڵەی (ژ.ک) و حیزبی «هیوا» بوو. لە ماوەیەکی کەمدا ئەو پێوەندییانە پەرەیان گرت و ئەندامانی هەر دوو حیـزب زوو زوو پێوەندییان پێکەوە دەگرت. دوکتور «عەزیزی شـەمزینی» لـە لاپـەڕە ١٥٨ی کتێبی «جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان»دا دەڵێ: «لە «ئاب»ی ١٩٤٢دا نوێنەرانی جووڵانەوەی رزگاریی نیـشتمانی کوردسـتانی ئێـران و عێـراق، لـە شاری مەهاباد کۆ بوونەوە. لەم کۆبوونەوەیەدا ١١ نوێنەری هـەردوو لا بەشـدار بوون. پێکـهێنانی رێکخراوەیـەکی سیاسـی بـە نـاوی «کۆمەڵـەی ژیانـەوەی کورد»ەوە، یەکێ بوو لە بڕیارەکانی کۆبوونەوەکە. «عەبدولڕەحمانی زەبیحـی» بە سکرتێری، «زەرگەری» [حوسێنی زێڕینگـەران] بـە سـەرۆک هەڵـبژێردران.» «سەرهەنگ میرحاج ئەحمەد» یەکێک لە ئەندامانی بەشداری «کۆمەڵـەی هیـوا» بوو لە یەکەم دانیشتنی پێکهێنان و دامەزراندنی کۆمەڵـەی (ژ.ک) کـە لـە رۆژی

٢٥ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٢١ (١٩٤٢) لە مێژووی گەلەکەماندا نووسراوەتەوە. زۆری پێنەچوو ناوبانگ و نفووزی کۆمەڵەی (ژ.ک) هەموو کوردستانی گرتەوە».

بەر لە وەی بچینە نێو باسی «پەیمانی سێسنوور» با بزانین ڕێکەوتی دامەزراندنی یەکەم لقی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە کوردستانی باشوور کەنگێ بووە. لە لاپەڕە ١٠ی ژمارە ٥ی گۆڤاری «نیشتمان»ی ساڵی یەکەم کە لە ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٢ چاپ و بلاو کراوەتەوە، وەکوو هەموو ژمارەکانی پێشووی ئەو گۆڤارە وتارێک لە ژێر ناوی «لە ناو کۆمەڵەدا» هاتووە. لەو وتارەدا خاڵێکی گرینگ باسی لێکراوە کە بە لێخوردبوونەوەی پتری ئەو وتارە، بەشێک لە مێژووی پڕ لە شانازی (ژ.ک) روون دەبێتەوە. لەبەر گرینگی باسەکە، پێشتر دەقی نووسراوەکە وەک خۆی دەنووسینەوە: «لە ناو کومەڵەدا - لەم مانگەدا، «سیامەک» ئەندامی ژمارە ٥٧ دانیشتووی شاری ئا/ک سەفەرێکی بۆ شاری ب/ئا.م کردووە و ئیدارەیەکی محەللی تەشکیل داوە. ئەوە یەکەم شارە کە کۆمەڵەی (ژ.ک) لە پارچە کوردستانێکی دەرەوەی مەنتیقەی نفووزی خۆی ئەندامی لێوەرگرتووە. لەو ئاگاییانەی پێمان گەیشتووە، گەنجانی بەشی (ب) لە کوردستانی گەورە، زۆر داوخوازی ئەندامەتی کۆمەڵەی ئێمەن. ئیدارەی ناوەندیی لە بەرانبەر ئەو خزمەتە بەنرخەی «سیامەک» سوپاسی ئەکا و هیوای وایە کە هەموو ئەندامەکان هەر وەکوو ئەم برایە بۆ پێشکەوتنی کاروباری «کۆمەڵە» تێبکۆشن.»

هەروەک دەزانین هەموو ئەندامانی (ژ.ک) ناوی نهێنی و ژمارەی ئەندامەتییان هەبووە کە «سیامەک» ئەندامی ژمارە ٥٧یش یەکێک لەو کەسانەیە و ناوی نهێنی کاک «عەبدولقادری دەباغی»یە. کاک قادر خەڵکی ناوچەی موکریان لە رۆژهەڵاتی کوردستانە و هەر لە سەردەمی لاوەتیدا بۆتە ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک) و یەکێک لە ئەندامە چالاک و هەڵسووڕاوەکانی (ژ.ک) بووە. کاک «عەلی کەریمی» لە لاپەڕە ٤٠٠ تا ٤٠٢ی کتێبەکەیدا (ژیان و بەسەرهاتی عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی) دەقی نامەیەکی کاک «عەبدولقادری دەباغی» چاپ کردووە. کاک قادر لەو نامەیەدا باسی ئەوە دەکا کە پێشنیاری بە مامۆستا

سەقز و بانە و شارەکانی دیکەدا بلاو بکاتەوە. کاک «قادری دەباغی» لە بەشێکی نامەکەیدا (ل٤٠٢) دەڵێ: «زەبیحی زۆری پێخۆش بوو، ئیدی دەستووریان دامێ کە گشت کارێکت هەر لەگەڵ ئەودایە، لەو ماوەیەدا من سەفەرێکی سلەیمانیم کرد و لقی کۆمەڵەم دامەزراند و گەڕامەوە. گوزاریشەکەم بە زەبیحی پێشکەش کرد و لە ژمارە ٥ یا ٦ی «نیشتمان» بە رەسمی شانازی سپاسیان بۆ نووسیم. بەڵام کومیتەی ناوەندی «پەروەندەی گەرمێن»یان جوێ کردەوە ...»

بەپێی ئەو ژمارەی «نیشتمان» و نامەکەی کاک «قادری دەباغی» چەند خاڵی گرینگ لە مێژووی خەبات و جووڵانەوەی گەلەکەمان بەتایبەتی لە سەردەمی دەسەلاتی کۆمەڵەی (ژ.ک) روون دەبێتەوە کە لێرەدا چەند خاڵێکیان دەخەینە روو:

لە نووسراوەکەی گۆڤاری «نیشتمان»دا هاتووە کە «لەم مانگەدا سیامەک ئەندامی ژمارە ٥٧ دانیشتووی شاری ئا/ک سەفەرێکی بۆ شاری ب/ئا.م کردووە و ئیدارەیەکی محەللی تەشکیل داوە...» کە تا ئێرە بۆمان روون بۆوە کە ئەو ئەندامە کاک «عەبدولقادری دەباغی» بووە کە ئیدارەی محەللی (ژ.ک)ی دامەزراندووە. پاشان دەڵێ: «ئەوە یەکەم شارە کە کۆمەڵەی (ژ.ک) لە پارچە کوردستانێکی دەرەوەی مەنتیقەی نفووزی خۆی ئەندامی لێ وەرگرتووە...» کە ئەو بەشەش ئەم راستییە دەسەلمێنێ کە هەتا ئەوکات لە هیچ شار و ناوچەیەکی دەرەوەی ناوچەکانی ژێر دەسەلات و نفووزی (ژ.ک) (رۆژهەلاتی کوردستان)، ئەندام وەرنەگیراوە و لقی ئەو کۆمەڵەیەش دانەمەزراوە.

بەلام شتێکی لە هەمووان گرینگتر ئەوەیە کە لەو ژمارەی «نیشتمان»دا هاتووە کە ئەو کارە بە هۆی سیامەک ئەندامی ژمارە ٥٧ و ‹لەم مانگەدا› جێبەجێ کراوە. کەروونکردنەوەی رێکەوتی ئەو کارە مێژووییەش ئاسانە. ژمارە ٥ی گۆڤاری «نیشتمان» لە رێبەندانی ساڵی ١٣٢٢ چاپ کراوە. کەوایە یەکەم لق و ئیدارەی محەللی (ژ.ک) کە لە دەرەوەی ناوچەکانی ژێر نفووزی (ژ.ک) دامەزرێندراوە، لە مانگی رێبەندانی ١٣٢٢ی هەتاوی بووە کە ئەو ساڵەش بەرامبەرە لەگەڵ رۆژەکانی کۆتایی ساڵی ١٩٤٣ی زایینی و سەرەتای ساڵی ١٩٤٤. وادیارە هەر دوای دامەزراندنی یەکەم لقی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە دەرەوەی سنووری

ژێردەسەڵاتی ئەو کۆمەڵەیە، پەروەندە و فایلی «باشووری کوردستان» و بە واتایەکی دیکە «گەرمێن» جودا کراوەتەوە و پاشان لقەکانی ئەو کۆمەڵەیە لە زۆربەی شارەکانی «باشووری کوردستان» دامەزرێندراوە.

جا ئەوجار با بێینەوە سەر باسی پەیمانی «سێسنوور» و بزانین سەرچاوەکان ئەم پەیمانەیان چۆن ناساندووە:

مامۆستا «ئیبراهیم ئەحمەد» لە لاپەڕە ۲۷۹ی کتێبەکەی کاک عەلی کەریمی (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی)، لە وەڵامی ئەو پرسیارە کە: «لەسەر «میرحاج»، ئایا میرحاج وەک نوێنەری «هیوا» هاتووە بۆ مەهاباد؟» دەڵێ: «نا! میرحاج نوێنەری «هیوا» نەبوو. ئەوە لە پاش تێکچوونەکەی «هیوا» دووپارچە بوونەکەی «هیوا» هات وە ئەوە ئەو پرۆگرامەی ئەو دای بە وان، لێژنەیەک دانرا لە لایەن ئەو کەسانەوە کە «هیوا»یان تێکدابوو، بڵێین سەرۆکی باڵا «رەفیق حیلمی»یان لابردبوو، خۆیان ویستیان پارتێکی تازە دروست کرێ جا یان بە ناوی «هیوا» یان ناوێکی کەوە بێ، پرۆگرامێکی رێکوپێکی بۆ دانرێ، لێژنەیەکیان بۆ دانا، من یەکێک بووم لە ئەندامانی ئەو لێژنەیە کە ئەندامی وانیش نەبووم (ئەندامی هیوا) فەقەت وەکوو یەکێکی سەربەخۆ کە ئامادە بووم لە هینە تازەکەیان داخل بم وە «میرحاج» و «مستەفا خۆشناو» و چەند کەسێکی کەش لەو برادەرانە ئەندام بوون لەو لێژنەیە، کە ئێمە لە ماڵی ئەو کوڕە کە وتم «حامید فەرەج» معاونی مودیر پۆلیسی کەرکووک بوو لە ماڵی ئەوانا ئەو هینە کرا وە ئەو هینی رێکخستن و نیزام و شتەی کە دامانا ئەوە بوو کە بردیان بۆ مەهاباد وە ئەوەش هەر پاشماوەی ئەو پەیوەندییە بوو کە «ئەمین رەواندزی» منی بۆ بانگ کردبوو کە بچم لە ٤٢ رێکیخەین لە رەواندز. نە «میرحاج» و نە «مستەفا خۆشناو» لایەنگری «رەفیق حیلمی» نەبوون هەتا لایەنگری دروست کردنی پارتی نەبوون. «میرحاج» لایەنی کوردایەتێکی بێبەستنەوەی گرتبوو.»

سەبارەت بە پێوەندی ساڵی ۱۹٤۲ی رەواندز، مامۆستا «ئیبراهیم ئەحمەد» لە لاپەڕە ۲٦۲ی سەرچاوەی پێشوو دەڵێ: «جا ئێمە پێش دروست بوونی ژ.ک هەوڵ هەبوو کە رێکخستنێک پێک بێنین، هەتا من لە ٤٢ - ٤٣یا چووم بۆ

کەسانەی کە لەوێ بوو، بە هۆی ئەوەوە گەیشتینە حدوود کە بەڵکوو لەوێوە چەند کوردێ لە ئێرانەوە بێن، ئێمە بیانبینین و قسەیان لەگەڵ بکەین ڕێکخراوێک پێک بێنین... لەپڕ بلاوەیان کردەوە وتیان لەشکری رووس هات بەرەوخوار، هەموو حدوود گیراوە... ئیتر ئەوە ئەو کوردایەتییە و هەوڵدانە هەبوو بۆ ئەوە، پێک نەهات. دیارە لە دواییا ئەو ئیتیساله ببوو لە ڕێی «میرحاج» و «مستەفا خۆشناو».

«ویلیام ئیگلتۆن» لە لاپەڕە ٧٢ی کتێبی «کۆماری ١٩٤٦ی کوردستان» وەرگێردراوی کاک «سەید محەممەدی سەمەدی»دا دەڵێ: «کوردستانی گەورە: بۆ وتوویژ دەگەڵ حیزبی هیوا سەبارەت بە ئارەزووە هاوبەشەکان و هەڵسەنگاندنی بارودۆخی داهاتوو، کوردەکان لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٤٤ لە لایەن کۆمەڵەی (ژ.ک) «محەممەدئەمینی شەرەفی»یان وەک نوێنەری کۆمەڵە ناردە کەرکووک. نوێنەرانی «هیوا» کە لەوێ بوون بریتی بوون لە: ئەمین ڕەواندز، عیززەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو، شێخقادری سولەیمانی، سەید عەبدولعەزیزی گەیلانی و ڕەفیق حیلمی. چەند مانگ دوایە لە سەروبەندی هاوینی ساڵی ١٩٤٤ لقی سولەیمانی حیزبی «هیوا»، «ئیسماعیل حەقی شاوەیس» و «عوسمانی دانیش» بۆ جاری دووهەم هاتنە مەهاباد. ساڵ و نیوێک دوایە، «هەمزە عەبدوڵلا» و «وردی» لە عێراق، «قەدری بەیگ» نەوەی «جەمیلپاشا»ی دیاربەکر لە سووریا و «قازی مەلا وەهاب» لە تورکیا بۆ چاوپێکەوتنی ڕێبەرانی کورد هاتنە مەهاباد.»

لێرەدا «ئیگلتۆن» باسێکی مێژوویی زۆر گرینگ ئاماژە پێدەکا، ئەویش پەیمانی «سێسنوور»ە. سەبارەت بە پەیمانی «سێسنوور» زۆر وتار لە کتێب و گۆڤارەکاندا بلاو کراوەتەوە، بەڵام هەر کەس شتێکی لێ زیاد یا کەم کردۆتەوە، بە چەشنێک کە تا ئێستا بە تەواوی بۆ زۆربەی نووسەران و مێژوونووسان ساغ نەبۆتەوە. نووسەر هەر لەو لاپەڕەیەدا (٧٢) دەڵێ: «لە مانگی «ئووت»ی ساڵی ١٩٤٤، وتوویژێکی نهێنی سەبارەت بە یەکێتی کوردستانی گەورە لە چیای «دالانپەڕ» کە لەوێ سنوورەکانی ئێران و عێراق و تورکیا گەیشتوونەتەوە یەک، پێکهات و یەکتریان دیتەوە. ئەو پەیمانە بە نوێنەرایەتی کوردەکانی هەر سێ

وڵات بۆ ئیمزای پەیمانی «دۆستایەتی و پشتیوانی لە یەکتر» بەسترا و بڕیاری ناوبراو بە پەیمانی «سێسنوور» ناوبانگی دەرکرد.» لەپاشان نوێنەران ناو دەبا و دەڵێ: «نوێنەری کوردەکانی ئێران کە لە لایەن کۆمەڵەی (ژ.ک) نـاردرابوو، «قاسمی قادری» بوو. لە عێراق «شێخ عوبەیدیللا» لە گوندی «زینوێ» هـاتبوو و نوێنەری کوردەکانی تورکیاش «قازی مەلا وەهاب» بووە. لەو کاتـە رەسمییـەدا ناساندنی جوغرافیای کوردستان پێویست بوو.»

زۆربەی نووسەرانیش هەر ئـەو زانیارییانـەی «ئیگلتـۆن»یـان دووپـات کردۆتەوە.

«دێیوید مەکداوڵ» لە لاپەڕە ٤٠٥ی کتێبی «مێژووی هاوچـەرخی کـورد»دا دەڵێ: «لە «ئووت»ی ساڵی ١٩٤٤، هەیئەتی نوێنەرانی سێ وڵات (ئێران، عێراق، تورکیا) لە چیای «دالانپەڕ»، لەو شـوێنەی سـنوورەکانی سـێ وڵات دەگەنـەوە یەک، یەکتریان دیت، هەتا پەیمان ببەستن کە پشتیوان و لایەنگری یەکتر بـن و لە سەرچاوە و ئیمکاناتێک کە هەیانە یەکتری بێبەش نەکەن.»

«کریس کۆچیرا» لە لاپەڕە ٢٠٦ی کتێبی «جووڵانەوەی نەتەوەیی کـورد»دا هەر ئەو قسانەی «ئیگلتۆن» و «مەک داوڵ»ی دووپات کردۆتەوە.

کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» لە لاپەڕە ١١٤ و ١١٥ی کتـێبی «ئاوڕێـک لە مێژووی مەهاباد»دا دەڵێ: «بڕیار درا نوێنەری کوردەکانی چوار دەوڵـەت لـە شوێنێک کۆ ببنەوە و سەبارەت بە جوغـرافیای کوردسـتان و فەرهـەنگی کـورد وتووێژ بکەن. ئەو کۆبوونەوە لە چیای «دالانپەڕ» لە پشت «پیرانشار»، نیزیـک ئاوایی «کولیج»، لە سەر سنووری ئێران، عێراق، و تورکیا پێکهات. بەشـداران ئەوانە بوون: لە عێراق «هەمزە عەبدوڵـلا»، «وردی» [محەممـەد تۆفیـق وردی]، «سەید عەبدولعەزیزی گەیلانیزادە» «میرحاج» و «مستەفا خۆشناو»، لە تورکیا «قازی مەلا وەهاب»، لە سووریا «قادری بـەیگ» (قـەدری بـەگ) لـە نـەوەکانی «جەمیل پاشا»ی دیاربەکر و لە ئێـران «عەبـدوڕڕەحمانی زەبیحـی»، «قـاسمی قادری قازی»، «محەممەد دڵشاد» و «حاجی رەحمانئاغای ئیلخانیزادە.»

سەبارەت بە ئامانجی کۆبوونـەوە و پەیمانەکـەش دەڵـێ: «بـۆ یـەکێتی

«سێسنوور» ناوبانگی دەرکرد... خانەخوێ کاک «مامەندی قادری» ئاغای گوندی «کولیج» بووە.»

کاک «غەنی بلووریان» لە لاپەڕە ٣٢ و ٣٣ی «ئاڵەکۆک»دا باسی پەیمانی «سێسنوور» دەکا. وادیارە ئەویش ئەو زانیارییانەی لە «مەک داوڵ» و «ئیگلتۆن» وەرگرتووە، بەڵام جیاوازی نووسراوەکەی کاک غەنی دەگەڵ ئەوانەی پێشتر باسمان کردن لێرەدایە کە کاک غەنی بلووریان دەڵێ: «لە باغی «حاجی داودی» کۆبوونەوەیەک لە بناری چیای خەزایی ساز کرا و هەر دوابەدوای دامەزراندنی کۆمەڵەی (ژ.ک) واتا ساڵی ١٩٤٢ پەیمانی «سێسنوور» بەسترا. لەو کۆبوونەوەدا بۆ بەهێزکردنی ئەو ڕێکخراوەیە چەند بڕیاریان پەسەند کرد. ئەوان بڕیاریاندا بۆ پتەوکردنی پێوەندی لەگەڵ کوردی بەشەکانی تری کوردستانی دابەشکراو، کۆبوونەوەیەکی چەندقۆڵی لەگەڵ نوێنەرانی کوردی بەشەکانی تری کوردستانی داگیرکراو پێکبێنن... .»

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لە ژمارە ٢٥ی ڕۆژنامەی «ئاڵای ئازادی»دا بەکورتی باسی پێکهاتنی ئەو پەیمانە لە نێوان کوردەکانی سێ دەوڵەتی ئێران، عێراق و تورکیا دەکا. هەروەها لە وتووێژێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی «کوردستانی نوێ» گوتوویەتی: «بەپێچەوانەی نووسینی سەرلەشکر زەنگەنە، «زەبیحی» و هاوڕێکانی ‹کاتی گەڕانەوە› لە پەیمانی «سێسنوور» گیران.» کە ئەوەشمان لە بەشی وتاری گیرانی مامۆستا «زەبیحی»دا ڕوون کردۆتەوە. بەڵام بەوپێیەی کە بەڵگەی پەیمانی «سێسنوور»مان لەبەر دەستدایە، دەتوانین بڵێین زۆرترین و باشترین زانیاری سەبارەت بەو پەیمانە لە کتێبی «چێشتی مجێور»ی مامۆستا «هەژار»دایە. مامۆستا هەژار لە لاپەڕەی ٦٤ و ٦٥ی ئەو کتێبەدا لە بەشی «مەعمووریيەت لە ژ.کدا» دەڵێ: «مانگی جۆزەردان بوو، دروێنەی جۆ لە دەوری بۆکان دەستی پێکردبوو. حیزب ناردی چوومە سابلاغ، دەگەڵ «میرزا قاسمی قادری» و «زەبیحی» کە دەبووینە سێ کەس، گوتیان دەبێ بچنە «دزەی مەرگەوەڕ». دەگەڵ نوێنەرانی حیزبی «هیوا»ی کوردستانی عێراق گفتوگۆ بکەن و هەر قەرارێک ئێوە بیدەن، ئێمە پێی ڕازین.» دوای ئەوەی چەند دێیان دەکەن دەگەنە گوندی قاسملوو و لەوێ لە ماڵە مستەفائاغا ناوێک میوان

دەبن، پاشان دەڵێ: «بەیانی ولاغمان لە «سۆفی شێرە»ناوێک بەکرێ گرت و چووینە «دۆڵی دزە»، بۆ نیوەڕۆ لای «عەبدولقادر»ی کوڕی «شێخ عەبدوڵڵا» لە (گردووان) بووین و ئێوارێ چووینە ڕەشماڵی ماڵی شێخ لە دزە.» هەر دوابەدوای ئەم قسەیە باسی نوێنەرانی «هیوا» دەکا و دەڵێ: «نوێنەرانی هیوا: «شێخ عوبەیدیللای زینوێ»، «سەید عەزیزی شەمزینی» کە ئەفسەرێکی عێراق بوو، «سەعیدی کانیمارانی»ناوێکیش کە تازەلاوێک و خوارزای «شێخ عوبەیدیللا» بوو دەگەڵیان هاتبوو. چەند کۆبوونەوەمان پێکەوە کرد و لەسەر ‹دوازدە نوختە› پێک هاتین کە هەردووک حیزب پێکەوە هاوکاری بکەن و مەعلوومات پێک بگۆڕنەوە. جا چونکە لەو شوێنەی کە پێکهاتین بناری «دالانپەڕ» و لایەکی «شەمزینان» و ئەملای «ئێران» بوو، ناومان نا پەیمانی سێسنوور».

مامۆستا هەژار لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «بڕیار درا هەردووکمان بێ خۆگرتن، هەر کەسە لای خۆی «بەیانەکە» بڵاو کاتەوە. دوای حەوت شەو لە «دزە» بە ڕێگەی «شنۆ»دا گەڕاینەوە. لە «شنۆ» بە پێ هاتینە نەغەدە. لە نەغەدەوە بە سواری «ترۆمبێلێکی سینەما»ی ئینگلیسیان کە دەهاتە سابلاغ هاتینەوە. ئێمە دەسبەجێ نوسخەی «بەیان»ی خۆمان لە «نیشتمان»دا چاپ کرد. هێشتا بڵاومان نەکردبۆوە خەبەریان داینێ کە حیزبی «هیوا» بەو پێکهاتنە ڕازی نەبووە و چاپی مەکەن. رووپەڕە چاپکراوەکەی پێکهاتنەکەمان لە گۆڤارەکە دڕی.» لە لاپەڕە ۱۱٦شدا دەڵێ: «گوتیان «حەمەسەعید کانیمارانی» لە بەغدا دەخوێنێ. ئۆخەی برادەرێکم پەیدا کرد کە لە سەفەری «مەرگەوەڕ» دەگەڵی بوومە ئاشنا و مانگێک لە سابلاغ میوانم بووە...».

هەروەک پێشتر گوتمان مامۆستا هەژار باشترین زانیاری سەبارەت بە پەیمانی «سێسنوور»ی لە کتێبەکەیدا تۆمار کردووە، لێرەدایە بۆمان دەردەکەوێ کە نووسینی مێژوو بە دەستی خۆمان گرینگی چەندە زیاترە لە مێژوویەک کە بێگانە بۆمان بنووسێ. هەر بۆ نموونە تاقە یەکدانە ڕستەی ئەو نووسراوەی مامۆستا هەژار، یەکێک لە گرینگترین ڕووداوە مێژووییەکانی سەردەمی دەسەڵاتی (ژ.ک) و لاپەڕەیەکی زێڕینی مێژووی گەلەکەمان بۆ ڕوون

## ناسینی پەیمانی «سێ سنوور»، بە وردبوونەوەی پتر لە ژمارەی کۆتایی گۆڤاری «نیشتمان»

بۆ روونتر بوونەوەی ئەو بابەتە پێویستە ژمارەی کۆتایی نیشتمان چاکتر بناسین و بیخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بڕیار وابووە کە گۆڤاری «نیشتمان»ی ژمارە ٧ و ٨ و ٩،ساڵی یەکەم بۆ مانگی خاکەلێوە، بانەمەڕ و جۆزەردانی ساڵی ١٣٢٣ بەرامبەر دەگەڵ (ئاوریل، مەی و ژووئەن)ی ساڵی ١٩٤٤ واتا سێ مانگی وەرزی بەهاری ئەو ساڵەدا بلاو بکرێتەوە. ئەو کاتی کە گۆڤاری «نیشتمان» بلاو دەکراوە، هەموو ژمارەکانی لە تەورێز چاپ دەبوو و مامۆستا «زەبیحی»ش کە یەکێک لە هەڵسووڕاوترین ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) و بەرپرسی چاپەمەنییەکانی ژ.ک بوو، لەوێ خەریکی چاپی ئەم گۆڤارە بوو. بەڵام بە قسەی کاک عوبەیدیللا ئەییووبیان لەبەر چەند هۆیەک، کاک «سەدیقی حەیدەری» دەنێرنە تەورێز و بە هۆی ئەو داوای لێدەکەن بێتەوە مەهاباد و چاپخانە و تەنانەت کلێشەکانیشی دەگەڵ خۆی دەهێننەوە مەهاباد. تا کاتی هاتنەوەی بۆ مەهاباد مامۆستا «زەبیحی» ١٢ لاپەڕەی «نیشتمان»ی ژمارە ٧و٨ و٩ی چاپ کردبوو. بەڵام کاتێک دێتەوە مەهاباد، بۆ ماوەیەک دەسبەسەر د ەکرێ و لەو ماوەیەشدا هێندێک گۆڕانکاری لە گۆڤارەکە پێکدێ کە لێرەدا جیاوازییەکانی باس دەکەین: ئەو نیشانە تایبەتەی کۆمەڵەی (ژ.ک) کە لە نێو چەغزی «رۆژ»ێکدا کە تیشکی دارەتەوە و بە پیتی لاتین « J.K» نووسراوە، لادەبردرێ و لە جیات ئەو دوو پیتە لاتینییە، (ژ.ک) بە پیتی عەرەبی دەنووسرێ [وێنەی ژمارە ٢٢] لەمبەروئەوبەریشی دوو دانە ئەستێرە دادەنرێ. لە سەرووی ئەویشەوە وشەی «الله» زیاد دەکرێ. لە نوسخەی ئەسڵی گۆڤاری «نیشتمان» و لە لای راستی رووبەرگی گۆڤارەکە، رستەی «بژی کورد و کوردستانی گەورە!» هاتووە بەڵام لە ژمارە دەسکاریکراوەکەیدا ئەو رستەیە هاتۆتە ژێر دوو پیتی (ژ.ک). هەروەها ناوی گۆڤارەکە کە لە نوسخەی سەرەکیدا بە خەتێکی درشت نووسراوە و زوو وەبەرچاو دەکەوێ، بەڵام لە ژمارە دەسکاریکراوەکەیدا زۆر چکۆلە کراوەتەوە. وێنەی «سەلاحەددینی ئەییووبی» لە

هەر دوو نوسخەدا لە ژێر ئەو نووسراوانەدا چاپ کراوە. ئەو ١٢لاپەڕەی باسمان کرد لە لایەک رادەگرن و ٢٠ لاپەڕەشی لە چاپخانەی مەهاباد بۆ چاپ دەکەن و بەو شێوەیە گۆڤارەکە بە ٣٢ لاپەڕە بڵاو دەکەنەوە کە ئەو ١٢ لاپەڕەی چاپی تەوریز هەم لە بابەت ناوەرۆکی وتارەکان و هەم لە رواڵەتدا، دەگەڵ چاپی ٢٠ لاپەڕەی دوایی گۆڤارەکە جیاوازییان هەیە، تەنانەت وتار و بابەتەکانی ئەو دوو بەشە چاپکراوەی گۆڤارەکە لە دوو جۆرە کاغەز و بە رەنگی جیاواز چاپ کراون. [وێنەی ژمارە ٢٣]

لە لاپەڕە ١٠ی نوسخەی ئەسڵی گۆڤاری «نیشتمان»دا چاومان بە وتارێک دەکەوێ کە بە قەڵەمی مامۆستا «زەبیحی» نووسراوە. ئەم وتارە لە ژێر ناوی «لە ناو کۆمەڵەدا» زۆر بە وردی باسی پەیمانی «سێ‌سنوور» دەکا و نوێنەرانی بەشداری هەردوو کۆمەڵەش ناو دەبا. گۆشەی «لە ناو کۆمەڵەدا» بابەتێکە کە لە ژمارە ٢ هەتا ٩ی «نیشتمان»دا بڵاو دەبۆوە، لەم گۆشەیەدا دەنگ و باس و چالاکییەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە هەموو بوارەکاندا باسی لێدەکرا، بەڵام ئەو لاپەڕە لە نوسخەی دەسکاریکراوی ژمارەی کۆتایی «نیشتمان»دا بەدی ناکرێ. بە ئاوڕدانەوەیەک لە کتێبی «چێشتی مجێور»ی مامۆستا «هەژار» ئەو گرێ کوێرەشمان بۆ دەکرێتەوە. هەروەک پێشتر باسمان کرد، مامۆستا «هەژار» دەڵێ: «بڕیار درا هەردووکمان بێ خۆگرتن هەر کەسەی لای خۆی بەیانەکە [واتا ئەو دوازدە خاڵەی لەسەری پێکهاتبوون] بڵاو کاتەوە... ئێمە دەسبەجێ نوسخەی بەیانی خۆمان لە «نیشتمان»دا چاپ کرد. هێشتا بڵاومان نەکردبۆوە کە خەبەریان دایێ کە حیزبی «هیوا» بەو پێکهاتنە رازی نەبووە و چاپی مەکەن، رووپەڕە چاپکراوەکەی پێکهاتنەکەمان لە گۆڤارەکە دڕی.»

جا لە نوسخەی دەسکاریکراوی گۆڤاری «نیشتمان»، دوای وتاری «هاوار» کە کاک «محەممەدی شاپەسەندی» نووسیویەتی، وێنەی دوو کیژ هاتووە. [وێنەی ژمارە ٢٤] لە دوای ئەو وێنەیەش لە لاپەڕە ١١ باسی حکوومەتی ئێران و عێراقی ئەوکات کراوە. وتاری «هاوار» کەوتۆتە لاپەڕەی ٨. ئەو وتارەش کە باسی ئێران و عێراق دەکا کەوتۆتە لاپەڕە ١١. بەو حیسابە لە جێگای دوو لاپەڕەی ٩ و ١٠دا، وێنەی دوو کچەکان داندراوە. لە لاپەڕەی کۆتایی گۆڤارەکەش

وتاری ژمارە ٧ کەوتۆتە لاپەڕەی ٨. بۆ شەرحی مەتڵەبی ژمارە ٨یش نووسراوە: «دوو کچە کورد لە تورکیەدا لە داری سیاسەت دران» لە بەرامبەر ئەویش نووسراوە ١٠، کە مەبەستی لاپەڕە ١٠یە. بۆ ناوی نووسەریش نووسراوە «نیشتمان». ژمارە ٩ی وتارەکان، وتاری «اشتی»یە کە کەوتۆتە لاپەڕە ١٢ و لە لایەن «ڕژدی»یەوە نووسراوە. وەکی دەبینین کەلێنێک و مەودایەک لە نێوان لاپەڕە ٨ تا ١١دا هەیە، واتا ئەگەر وێنەکە لابەین، جێگەی دوو لاپەڕەی ٩ و ١٠ نادیارە. بەوپێیە ئەگەر ئەم وتارەی لاپەڕە ١٠ی «نیشتمان»ی دەسکارینەکراو، واتا وتاری «لە ناو کۆمەڵەدا» لە لاپەڕەی کۆتایی گۆڤارەکە (فهرست) دابنێین واتا لە جێی «دوو کچە کورد لە تورکیا...» ئەوە پێڕشتەکە ساغ و کەلێنەکەی نێوان لاپەڕە ٨ تا ١٠ش پڕ دەبێتەوە. بەخۆشییەوە لەو دواییانەدا بە یارمەتی کاک «عەبدوڵڵای سەمەدی» ئەو بەڵگە مێژووییەمان لە کتێبخانەی مامۆستای بەڕێز «کاک عوبەیدیللای ئەییووبیان» وەدەسکەوت. مامۆستا ئەییووبیان نوسخەی ئەسڵی گۆڤاری «نیشتمان»ی دەسکارینەکراوی پاراستووە. بە هۆی ئەم نوسخەوە لاپەڕە ٩ و ١٠ی گۆڤارەکەشمان کەوتە دەست. لێرەدا بۆمان روون بۆوە کە ئەو لاپەڕەی مامۆستا هەژار دەڵێ چاپمان کردبوو بەڵام لەبەر پێکنەهاتنمان لەگەڵ کۆمەڵەی «هیوا» دڕیمان، هەر ئەو لاپەڕە بووە کە وتاری پەیمانی «سێسنوور»ی تێدایە، بەڵام ویستبێتیان یان نا، کاتێک لاپەڕەی «بەیان»ی پەیمانی «سێسنوور»یان دڕیوە کە کەوتۆتە لاپەڕە١٠، چونکە پشت و ڕوو چاپ کراوە، لاپەڕە ٩شی پێوە دڕاوە، بەو شێوەیە دوو لاپەڕە بێ سەروشوێن بووە. [وێنەی ژمارە ٢٥] جا کاتێک ئەو لاپەڕەیان دڕاندووە، وێنەی دوو کچەکەیان لە جێی داناوە کە وەکی دەزانین لاپەڕەی وێنەکە نە نیشانە و ناوی گۆڤارەکەی بە سەرەوە و نە ژمارەی لاپەڕەی لێدراوە. وەکوو پێشتر گوتمان لە لاپەڕە ١٠ی نوسخەی ئەسڵی گۆڤاری «نیشتمان» وتارێک لە ژێر ناوی «لە ناو کۆمەڵەدا» هاتووە. ئەم وتارە لە لایەن مامۆستا «زەبیحی»یەوە نووسراوە. لێرەدا دەقی تەواوی وتارەکە وەک بەڵگەیەکی مێژوویی و بۆ جاری دووهەم وەک خۆی دەنووسینەوە و دواتر شی دەکەینەوە: [وێنەی ژمارە ٢٦]

لە ناو کۆمەڵەدا - «زۆر لەمێژ بوو بڕیار درابوو کۆنفڕانسێک لە نێوان ئێمە و کۆمەڵی «هیوا»دا بۆ هاوپرسەکی لە بابەت هێندێک مەسائیل تەشکیل

بدرێت. رۆژی ئەم ئیجتیماعە دەبوو لە لایەن کەمەلی (= کۆمەلی) «هیوا» مەعلووم بکرێت. هەرکە نوێنەرانی کۆمەلەی ناوبراو ئامادەبوونی خۆیان بە ئێمە راگەیاند، نوێنەرانی ئێمەش رەوانە بوون؛ دوای ٣ رۆژ گفتوگۆ و موزاکەرە لەسەر ئیقتیراحی (= داوای) نوێنەرانی ئێمە پەیمانێک بە نێوی «سیە (=سێ) سنوور» لە لایەن نوێنەرانی هەردوو لا بۆ زیادکردنی کۆششت و ئیجادی پەیوەندییەکی وەسیعی سیاسی ئیمزا کرا. نوێنەرەکانی کۆمەلەی «هیوا» لەم کۆنفەرانسەدا عیبارەت بوون:

١- ع. هووشەنگ، ئەندامی ژمارە ٧

٢- ع. جانگیر، ئەندامی ژمارە ٧١٦

کۆمەڵەی ئێمەش لە لایەن ئەو ئەندامانەوە:

١- ق.ق.ق. پیاو، ئەندامی ژمارە ١٠٥٣، سەرۆکی نوێنەران

٢- ع. هەژار، ئەندامی ژمارە ٢٠

٣- ع. بیژەن، ئەندامی ژمارە ٢

تەمسیل دەکرا؛ م.س. خوێنین ١٠٦٠، رابیتی نێوانی ئێمە و «هیوا» بوو تا کۆنفرانس تەشکیل درا، کۆمەڵە لە کۆششتی ئەو لاوە ئازایە و هەروەها لە گشت ئەندامەکانی ئەم کۆنفرانسە گرینگە، کە بێگومان لە دوایی‌دا دەبێتە فەسلێکی گەورە دە مێژوویی فەعالییەت و کۆششتی دوو کۆمەڵەدا، سوپاس و تەشەککور دەکا.

«پەیمانی سیە (= سێ) سنوور» لە لایەن هەیئەتی ئیستیشارەی (=راوێژکاری) ئیدارەی ناوەندی (ژ.ک) پەسند کراوە. بەم زووانە دەگەڵ نوسخەی پەسندکراوی ناوچەی «هیوا» موبادیلە دەکرێت.»

لێرەدا باسی پەیمانی «سێ‌سنوور» کۆتایی دێ و ئەوەی دوای ئەو نووسینە لە گۆڤارەکەدا هاتووە پێوەندی بە پەیمانەکەوە نییە.

## شیکردنەوەی ئەو وتار و نووسراوانەی کە سەبارەت بە «سێسنوور» چاپ و بڵاو بوونەوە

وەکی دیتمان زۆربەی ئەم نووسەرانەی لەسەر پەیمانی «سێسنوور» شتێکیان نووسیوە، لە یەک بۆچوونda هاوبەشن، ئەویش ئەوەیە کە هەموویان دەڵێن: نوێنەرانی کوردی ئێران و عێراق و تورکیا لە شوێنێک بە ناوی «دالانپەڕ» یەکتریان دیوە و پەیمانی «سێسنوور»یان مۆر کردووە. تەنانەت هێندێک لە سەرچاوەکان باسی هاتنی نوێنەری کوردەکانی سووریاش دەکەن کە لەو کۆبوونەوەدا بەشداری کردووە.

کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» لە لاپەڕە ١١٤ و ١١٥ی کتێبی «ئاوڕێک لە مێژووی مەهاباد»دا دەڵێ: «قادری بەیگ (قەدریبەگ) لە نەوەکانی جەمیلپاشای دیاربەکر بەشداری ئەم کۆبوونەوە بووە.» هەر لەو سەرچاوە و چەند سەرچاوەی دیکەشدا باسی بەشداری «قازی مەلا وەهاب»ناوێک دەکەن کە بەشداری کۆبوونەوەی «دالانپەڕ» بووە. مامۆستا هەژار لە لاپەڕە ٦٥ی کتێبی «چێشتی مجێور»دا دەڵێ: «باسی ئەو ڕێککەوتننامە مێژووییە تا ئێستا لە زۆر چاپەمەنی ناوخۆیی و لاوەکیدا کراوە، بەڵام سەیر لەوەدایە کە ناوی «هەژار» لە هەمووانda فڕێدراوە و نووسیویانە: «زەبیحی» و «میرزا قاسم» لە ئێران و «شێخ عوبەیدیللا» و «سەید عەزیز» لە عێراق و «قازی خدر» (یان قازی مەلا خالید - جاری واش هەیە گوتوویانە قازی عەبدولوەهاب) لە لایەن کوردی تورکیاوە، ئەم پەیمانی «سێسنوور»ەیان پەسند کرد.» لە کۆتاییشدا دەڵێ: «هومێدەوارم ئەم گۆڕانی ڕاستییە لە رووی هیچ غەرەزێکەوە نەبووبێ و هەڵەیەک بێ لە دڵپاکییەوە رووی دابێ»

بەڵام بەپێی ئەو بەڵگەی کە لە کۆبوونەوەی «سێسنوور»دا بڵاو کراوەتەوە و لەودا ئەندامانی بەشداربوو ناسێندراون و هەروەها بەپێی چەند بۆچوونێکی خۆم، لەو بڕوایەدام تەنیا نوێنەرانی کۆمەڵەی «هیوا» و کۆمەڵەی (ژ.ک) لە کۆبوونەوەی «دالانپەڕ» بەشدار بوون و پەیمانی «سێسنوور»یان ئیمزا کردووە. لە دەقی بڵاوکراوەی ئەو پەیمانەدا نووسراوە: «زۆر لەمێژ بوو بڕیار

درابوو کۆنفرانسێک لە نێوان ئێمە و کۆمەڵی هیوا... تەشکیل بدرێت» دوای ئەوە دەڵێ: «رۆژی ئەم ئیجتیماعە دەبوو لە لایەن کۆمەڵی هیوا مەعلووم بکرێت، هەر کە نوێنەرانی کۆمەڵی ناوبراو ئامادەبوونی خۆیان بە ئێمە راگەیاند، نوێنەرانی ئێمەش رەوانە بوون» لە درێژەی راپۆرتی کۆبوونەوەکەدا دەڵێ: «موزاکەرە... لە لایەن نوێنەرانی ‹هەردوو لا› بۆ زیادکردنی کۆششت و ئیجادی پەیوەندییەکی وەسیعی سیاسی ئیمزا کرا» لەو بەشەشدا کە نوێنەرانی دوو کۆمەڵە دەناسێندرێ تەنیا ناوی نوێنەرانی کۆمەڵەی «هیوا» و «ژ.ک» هاتووە و ناوی نوێنەرێک یان کەسێک وەک نوێنەری کوردەکانی تورکیا و سووریا نەهاتووە و هەروەها نووسەر لە بەشێکی دیکە لەم پەیمانەدا باسی گرینگی ئەو کۆبوونەوە دەکا و دەڵێ: «بێگومان لە دواییدا دەبێتە فەسڵێکی گەورە دە مێژووی فەعالییەت و کۆششتی ‹دوو کۆمەڵە›دا... .» کە لێرەشدا تەنیا ناوی دوو کۆمەڵە هاتووە و ناوێک لە کۆمەڵە یان نوێنەرێک لە کوردەکانی تورکیا و سووریا نەهاتووە. لە کۆتاییدا نووسەر دەڵێ: «پەیمانی «سێسنوور» لە لایەن هەیئەتی ئیستیشارەی (راوێژکاری) ئیدارەی ناوەندی (ژ.ک) پەسند کراوە، بەم زووانە دەگەڵ نوسخەی پەسەندکراوی ناوچەی «هیوا» موبادیلە دەکرێت» کە لێرەشدا بۆمان روون دەبێتەوە کە تەنیا دوو کۆمەڵە بەشداری ئەو کۆبوونەوە بوون، چونکە نووسەر دەڵێ پەیمانەکە لە لایەن هەیئەتی راوێژکاری ناوەندی (ژ.ک) پەسند کراوە و هەر ماوە لەگەڵ ئەو نوسخەی کە بڕیارە ناوچەی کۆمەڵەی «هیوا»ش پەسەندی بکا، بگۆڕدرێتەوە. ئەگەر بڕیار بووایە نوێنەری کوردەکانی بەشەکانی دیکەی کوردستانیش بەشدار بووبان، سەربەخۆ بەشدار نەدەبوون و لە لایەن کۆمەڵە یان حیزبێکەوە وەک نوێنەر دیاری دەکران و وەک نوێنەری لایەنێک لەو دوو بەشەی کوردستان (تورکیا و سووریا) لە پەیمانەکەدا ناویان دەهات و باسیان دەکرا. بەڵام هەروەک دەبینین ناوێک لە نوێنەرانی ئەم دوو بەشەی دوایی نەهاتووە.

بیروڕای ئەو نووسەرانەی سەبارەت بە بەشداربووانی پەیمانی «سێسنوور» نووسراوەیان هەیە، جیاوازە. هێندێک دەڵێن ئەندامان و نوێنەرانی

بوون. سەبارەت بەو کەسانەی بەشداری کۆبوونەوەی «دالانپەڕ»یش بوون بیروڕای جیاواز هەیە. لێرەدا ناوی نووسەران و بیروڕایان سەبارەت بە بەشداربووانی ئەو پەیمانە دەنووسینەوە:

«مەک داوڵ» ناوی کەسی نەبردووە و تەنیا دەڵێ نوێنەری سێ وڵات بەشدارییان کردووە. «کریس کۆچیرا» بۆ ئەوەی بە روونی باسی پەیمانی «سێسنوور»ی کردبێ دەڵێ: چەند مانگ دوای ئەو (واتا چوونی نوێنەری کۆمەڵەی (ژ.ک) بۆ کەرکووک.) «هەمزە عەبدوڵلا» دەچێتە مەهاباد و دوای ئەویش «قەدریبەگ» نەوەی «جەمیل پاشا»ی دیاربەکر لە سووریا و «مەلا وەهاب» لە تورکیا» دەچنە مەهاباد. کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» لە کتێبی «ئاورێک لە مێژووی مەهاباد»دا لە زمان ئەو چەند کەسەی وتووێژی دەگەڵ کردوون، ناوی ئەو دێیەی کە کۆبوونەوەکەی تێدا بەڕێوە چووە هێناوە و دەڵێ: ئەو کۆبوونەوە لە چیای «دالانپەڕ»، لە پشت «پیرانشار» و نیزیک دێی «کولیج» لە سەر سنووری ئێران و عێراق و تورکیا پێکهات. سەبارەت بەشدارانیش دەڵێ، هەمزە عەبدوڵلا، وردی (=محەممەدتۆفیق وردی)، سەید عەبدولعەزیزی گەیلانیزادە، میرحاج و مستەفا خۆشناو (لە عێراق)، قازی مەلا وەهاب لە تورکیا، قادری بەیگ (قەدریبەگ) لە سووریا، عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی، قاسمی قادری قازی، محەممەد دڵشاد و حاجی رەحمانئاغای ئیلخانیزادە (لە ئێرانەوە) بەشداری ئەو کۆبوونەوە بوون.

کاک غەنی بلووریان دەڵێ: قاسمی قادری لە بەشی کوردستانی ئێران، شێخ عوبەیدیللای زینوێ لە کوردستانی عێراق و مەلا وەهاب لە کوردستانی بەشی تورکیا بەشداری پەیمانی «سێسنوور» بوون.

کاک عەلی کەریمی لە لاپەڕە ١٠٩ی کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی»دا دەڵێ: «روون نییە کۆبوونەوەیەکی وا کراوە یان نا... .» مامۆستا «ئیبراهیم ئەحمەد» کە لە لایەن کاک عەلی کەریمییەوە وتووێژی لەگەڵ کراوە لە لاپەڕە ٢٧٤ی هەمان کتێبدا دەڵێ: «... پەیمانی «سێسنوور» ئەسڵ و ئەساسی نییە...» لە وەڵامی پرسیارێکی دیکەشدا کە لێیکراوە: «یانی ئێوە بڕواتان بە پەیمانی سێ سنوور نییە؟» (ل ٢٧٥) دەڵێ: «ئەمن بڕوام بە گەلێ شت نییە، بڕوام لە

خۆمەوە نییە...» دیسان کاک عەلی کەریمی لە لاپەڕە ٣٥٧ی کتێبەکەی خۆیدا ئەوجار پرسیاری لە مامۆستا «شێخ عیززەددینی حوسێنی» کردووە کە: مامۆستا لەسەر پەیمانی سێ سنوور چ دەزانی؟ مامۆستا لە وڵامدا دەڵێ: «وەڵا ئەمن لەسەر پەیمانی سێ سنوور هیچ نازانم. هەر ئەوەی کە هەموو بیستوومانە، بۆخۆم هیچ نازانم. زۆر شت لە کۆمەڵەی ژ.ک مەجهوولە ئەودەم ئەو شتانە زۆر نهێنی بوو لە کۆمەڵەی ژ.ک...»

مامۆستا هەژار دەڵێ: «نوێنەرانی «هیوا» «شێخ عوبەیدیللای زینوێ»، «سەید عەزیزی شەمزینی» کە ئەفسەرێکی عێراق بوو، «سەعیدی کانیمارانی» کە خوارزای شێخ عوبەیدیللا بوو، [لە کوردستانی عێراق] «میرزا قاسمی قادری» و «زەبیحی» لە کوردستانی ئێران.» لە پاشان مامۆستا هەژار گلەیی دەکا و دەڵێ: «بەڵام سەیر لەوە دایە کە ناوی «هەژار» لە هەمووان‌دا فڕێدراوە.» هەر بۆیە دەڵێ: «هومێدوارم ئەم گۆڕانی راستییە لە رووی هیچ غەرەزێکەوە نەبووبێ و هەڵەیەک بێ لە دڵپاکییەوە رووی دابێ.» بەڵام بە هۆی ئەو وتارەی لە گۆڤاری «نیشتمان»دا بڵاو کراوەتەوە و هەروەها نووسینەکانی مامۆستا هەژار بۆمان دەرکەوت کە مامۆستا «هەژار»یش بەشدار بووە و نووسینەکانی سەبارەت بەو پەیمانە هەڵەیان تێدا نییە.

هەتا ئێستا بیروڕای چەند نووسەرێکمان سەبارەت بە پەیمانی «سێسنوور» باس کرد و دیتمان کە ئەگەر بەپێی ئەو نووسراوانە بێ، نوێنەرانی هەر چوار پارچەی کوردستان هەر بەشەی بە چەندین ئەندامەوە بەشداری کۆبوونەوەی «داڵانپەڕ» بوون، بەڵام دیتنەوەی ئەو بەڵگەی باسمان کرد، ئەو بیروڕا جۆراوجۆرانەمان بۆ ساغ دەکاتەوە. هەروەک دەبینین ناوی نوێنەرانی بەشدار لە کۆبوونەوەی «داڵانپەڕ» لە بەڵگەی نێو بڵاوکراوەی گۆڤاری «نیشتمان»دا بە شێوەی رەمز و نهێنی هاتووە. بۆ ساغکردنەوەی ئەو بەشەش رۆژی جومعە ٩ی بەفرانباری ساڵی ١٣٨٤ (٣٠ی ١٢ی ٢٠٠٥) لە سەردانێکی مامۆستا «عوبەیدیللا ئەییووبیان» سەبارەت بە ئەو ناوانە پرسیارم لێکرد و بە یارمەتی ئەو توانیمان ناوی دوو ئەندامەکەی کۆمەڵەی هیواش بدۆزینەوە.

## ناساندنی بەشدارانی کۆبوونەوەی «سێسنوور»

نوێنەرەکانی کۆمەڵەی «هیوا» ١- (ع. هووشەنگ، ئەندامی ژمارە ٧)، ناوی نهێنی «سەید عەزیزی شەمزینی»یە.

٢- (ع. جانگیر، ئەندامی ژمارە ٧١٦)، ناوی نهێنی «شێخ عوبەیدیللای زینوێ»یە.

شێخ عوبەیدیللای زینوێ، لە کۆمەڵەی (ژ.ک)یش‌دا ئەندام و ناوی نهێنی لەو کۆمەڵەدا «هەڵۆ» بووە.

ئەندامانی بەشداری کۆمەڵەی (ژ.ک)یش بریتین لە:

١- (ق.ق.ق. پیاو، ئەندامی ژمارە ١٠٥٣)، ناوی نهێنی کاک «قاسمی قادری قازی»یە.

کاک «قاسمی قادری قازی» سەرۆکی نوێنەران بووە. ئەوەش رەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە ناوبراو بەتەمەنترین ئەندامی بەشداری ناو دوو کۆمەڵەکە بووە. ناوبراو کوڕی قازی قادر، کوڕی میرزا رەحمان، کوڕی میرزا عەبدوڵلای قازی، کارمەندی ئیدارەی «فەرهەنگ»ی شاری مەهاباد بووە.

٢- (ع. هەژار، ئەندامی ژمارە ٢٠)، ناوی نهێنی «کاک عەبدوڕڕەحمانی شەرەفکەندی» (مامۆستا هەژار)ە.

٣- (ع. بیژەن، ئەندامی ژمارە ٢)، ناوی نهێنی مامۆستا «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی»یە.

لەم پەیمانەدا لە «م.س. خوێنین ١٠٦٠» رابیتی نێوان کۆمەڵەی (ژ.ک) و کۆمەڵەی «هیوا» سپاس کراوە و هاتووە: «تەمسیل دەکرا؛ م.س. خوێنین ١٠٦٠، رابیتی نێوان ئێمە و هیوا بوو تا کۆنفڕانس تەشکیل درا، کۆمەڵە لە کۆششتی ئەم لاوە ئازایە [بێبەهرە نەبوو وە لە ناوبراو و بەشداران...] سپاس و تەشەککور دەکا.»

ئەگەرچی تا رادەیەکی زۆر دەکرێ و دەتوانین بڵێین ئەو ‹لاوە ئازایە›ش «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی»یە، بەڵام بۆ رێزلێنان و ناسینی پتر و یادێک لەو کەڵەپیاوەی کۆمەڵەی (ژ.ک)، لێرەدا کە هەلێکی باش بۆ ناساندنی ئەو

تێکۆشەرە نەناسراوە هەڵکەوتووە، بە پێویستم زانی بەشێکی جیاواز و تایبەتی بۆ بکەمەوە، کە ئەو بەشەمان خستۆتە کۆتایی ئەم کتێبە و بە خوێنەرانی بەڕێزی دەناسێنین.

## گومانی بەشداری نوێنەرانی کوردستانی تورکیا و سووریا

سەبارەت بە ئەوەش کە دەڵێن نوێنەری کوردەکانی تورکیا «قازی عەبدولوەهاب» و هەروەها نوێنەری کوردەکانی سووریا «قەدریبەگ» بەشداری پەیمانی «سێسنوور» بوون، بەپێویستی دەزانم چەند راستییەک بخەمە بەر باس و لێکۆڵینەوە. «رۆهات ئالاکۆم» لە لاپەڕە ٣٧ی کتێبی «خۆیبوون و شۆڕشی ئاگری»دا کە مامۆستا «شوکور مستەفا» کردوویە بە کوردی، دەڵێ: «بەپێی قسەی «ئەکرەم جەمیل پاشا»، «قەدری جەمیل پاشا» لە سالانی (١٩٣٤-١٩٧٤)دا بە «نماینەی سیاسی»ی (= نوێنەری سیاسی) «خۆیبوون»، بەرپرسیارێتی لە ئەستۆ گرتووە و لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ ئەم بەرپرسیارەتییە لە سالانی (١٩٣٩ - ١٩٤٦)دا بە خۆی دراوە: «نماینەی سیاسی خۆیبوون لە سالی (١٩٣٩)دا بەرەورووی من کرایەوە.» لە لاپەڕە ٤٣شدا دەڵێ: ««تۆفیق وەهبیبەگ»یش کە خەڵکی سلێمانییە، نماینەی خۆیبوون بووە». لە لاپەڕە ٤٤یشدا دەڵێ: «جەمیلزادە یەکێکە لەو کەسانەی کە زۆر لەمەڕ چالاکیی خۆیبوون دەدوێ. «قەدری جەمیل پاشا» و «ئەکرەم» پێش ئەوەی دیاربەکر بەجێ بێڵن و بۆ سووریا بپەڕنەوە، لەم چالاکییانەدا فرە وەکار بووگن. دوای ئەوەی خانەوادەی «جەمیلپاشازادە» لە دیاربەکر کۆچ و رەو دەکەن، کەسانی دیکە ئەرکی بەرپرسی کاری خۆیبوون لە ستۆی خۆ دەگرن. هەروەها جگە لەم مەڵبەندانەی نێومان هێنان، خۆیبوون نماینەی لە «ئاگری» و «وان» و «سعرت» و «کەرکووک» و «سلێمانی»ش هەبوون.»

هەروەک پێشتر باسمان کرد «ئیگلتۆن» لە کتێبی «کۆماری ١٩٤٦ی کوردستان» لاپەڕە ٧٢دا دەڵێ: «قەدریبەگ نەوەی جەمیلپاشای دیاربەکر لە لایەن کوردەکانی سووریا و قازی مەلا وەهاب لە لایەن کوردەکانی تورکیا بۆ

«قەدری‌بەگ»یشی بڵاو کردۆتەوە. هاتنی «قەدری‌بەگ» و «قازی عەبدولوەهاب» (خەڵکی هەکاری و نوێنەری خۆیبوون بووە) بۆ مەهاباد جێی شک و گومان نییە. بەڵام هەروەک لە وێنەکان‌دا دەبینین، «قەدری‌بەگ» لە یەکێک لە وێنەکاندا لە ناو هێندێک لە وەزیر و بەرپرسانی رەسمی حکوومەتی کوردستان، وێنەی هاتووە و لە پەنا «پێشەوا قازی محەممەد» دانیشتووە [وێنەی ژمارە ٤٦] و لە جێیەکیش‌دا لە دەستی چەپی «مەلا مستەفا بارزانی» و هێندێک لە ئەفسەرە کوردەکانی ئەودیو راوەستاوە [وێنەی ژمارە ٥١] کە هەر دووک وێنەش لە ساڵی ١٩٤٦ لە مەهاباد کێشراون. کەچی باسی ئێمە لە ساڵی ١٩٤٤ رووی داوە و دەگەرێتەوە سەردەمی دەسەڵاتی کۆمەڵەی (ژ.ک). کەوایە ناتوانین بڵێین بەشداری پەیمانی سێ سنوور بوون.

کاک «سەعید ناکام» کە بۆخۆی خەڵکی کوردستانی رۆژهەڵاتە، بەڵام زۆربەی ژیانی لە کوردستانی باشوور بەسەر بردووە، لە لاپەرە ٦١ی کتێبی «بیرەوەرییەکانی سەعید ناکام»دا دەڵێ: «ساڵی ١٩٤٦ نامەیەکی تایبەتی برادەری خۆشەویستم «سەید محەممەدی تەهازادە»م بۆ هات کە نووسیبووی بەپەلە خۆم بگەیەنمە پایتەختی کوردستانی ئازاد. بەم پێیە رۆژێکی هاوینی ١٩٤٦ بە ماڵەوە رووومان کردە شاری مەهاباد.» پاشان لە چاپخانەی کوردستان دادەمەزرێ و لە لاپەرە ٦٣دا دەڵێ: «رۆژێک لە بارەگای پێشەواوە داوا کرا ژمارەی نوێی رۆژنامە بەرم و بچمە دائیرەی پێشەوا. چاپخانە و بارەگای حیزب بەرامبەری یەکتر و تەنیا شەقامیان نێوان بوو. کاتێ رۆژنامەکەم برد و چووم دیتم کە یەکێکی نەناسراوی لە لا دانیشتووە. پێشەوا منی بەو ناساند کە ئەمە سەرنووسەری رۆژنامەکەمانە. بە منیشی گوت ئەو برایە «قەدری‌بەگ»ە لە کوردە ناسراوەکانی کوردستانی سووریا.» پاشان «قەدری‌بەگ» رەخنەی لە شپرێوی جلوبەرگی مامۆستا «سەعید ناکام» گرتووە و گوتوویەتی: «ئەتۆ بەرپرسیاری رۆژنامەی کۆماری کوردستان بی، ئەگەر ئاوا بچییە بەر دەمی میوانێکی بێگانە، دەبێتە هۆی سلەمینەوەیان...» «پێشەوا»ش بەپێکەنینەوە لە وەڵامدا گوتوویەتی: «ئێمە

گەلێکی هەژار و چەوسێندراوەین، تازە خۆمان رزگار کردووە و خەریکین ماڵ پێکەوەدەنێین، هەر میوانێک روومان تێبکا لە کەموکووڕیمان دەبووریّ...».
لێرەدا مەبەستم لە خستنە رووی ئەو باسە ئەوەیە کە بڵێم هەروەک هەموومان بۆمان روون بۆوە، «قەدری بەگ» ساڵی ١٩٤٦ هاتۆتە مەهاباد و تەواوی بەڵگەکان و تەنانەت وێنەکانیش ئەوە دەسەلمێنن. مامۆستا «سەعید ناکام»یش دەڵێ، ئەمن ساڵی ١٩٤٦، «قەدری بەگ»م لە مەهاباد دیوە کە لە لای پێشەوا «قازی محەممەد» بووە. لە کۆتایی ئەو باسەدا دەمەوێ بڵێم رەنگە بڕیار بووبێ کە نوێنەرانی کوردەکانی تورکیا و سووریا بەشداری کۆبوونەوەی «دالانپەڕ» بن، بەڵام بەپێی ئەو بەڵگەی لەبەر دەستماندایە، ئەو دوو بەشەی دوایی بەشدار نەبوون؛ رەنگە هۆیەکەشی ئەوە بووبێ کە دوو نوێنەری کوردستانی تورکیا و سووریا نەیانتوانیبێ لە رۆژی دیاریکراودا خۆیان بگەیەننێ کە ئەوەش لەبەر نەبوونی ئیمکاناتی (ژ.ک) بووە کە نەیانتوانیوە ئاگاداریان بکەنەوە چونکە دەبینین بۆ بانگهێشتی کۆمەڵەی «هیوا» کە ئەوکات پێوەندیشیان زۆر بووە، هێشتا کۆبوونەوەکە وەدرەنگی کەوتووە و لە رۆژی خۆیدا بەڕێوە نەچووە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش کە گوتمان نوێنەرانی کوردی تورکیا و سووریا بەشدار نەبوون، ناتوانین بڵێین سەردانی مەهابادیشیان نەکردووە. دوو نوێنەری کۆمەڵەی «خۆیبوون» بەپێی بەڵگە، ساڵی ١٩٤٦ واتا نیزیک دوو ساڵ دوای پەیمانی «سێسنوور» هاتوونەتە مەهاباد.

## ئەندامانی هەیئەتی راوێژکاریی کۆمەڵەی ژ.ک

کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» لە نامیلکەی «ئاوڕێکی دیکە لە ژ.ک»دا لە لاپەڕە ١٠ و لە زمان «مەلا قادری مودەڕیسی»یەوە ئەندامانی دامەزرێنەری کۆمەڵەی (ژ.ک)ی ناساندووە و پاشان ئەرکی هەر ئەندامێکیشی دیاری کردووە.

٤- عەبدوڕەحمانی ئیمامی ٥- قاسمی قادری ٦- مەلا عەبدوڵلای داودی ٧- محەممەدی یاهوو ٨- قادری مودەڕڕیسی ٩- سەدیقی حەیدەری ١٠- عەبدوڕڕەحمانی کەیانی ١١- محەممەدی شاپەسەندی [کاک محەممەد بۆخۆی لە رۆژنامەی «ئاڵای ئازادی» ژمارە ٢٥ی رۆژی ٣١ی ٥ی ١٩٩٢ دەڵێ: «دوای شەش مانگ لە دروستبوونی حیزب چوومە ریزییەوە... بەڵام (عەلی ریحانی) لەبیر چووە کە لە ریزی دامەزرێنەراندایە...] ١٢- محەممەدی ئەسحابی ١٣- نەجمەددینی تەوحیدی ١٤- حامیدی مازووچی ١٥- عەلی مەحموودی ١٦- محەممەدی سەلیمی [١٧-] میرحاج و [١٨-] مستەفا خۆشناو [لە کوردەکانی ئەودیو]لە کاتی دامەزراندنی یەکەم بەردی بناغەی کۆمەڵەکە بەشدار بوون. ئەو هەیئەتە دوای سوێندی وەفاداری بە حیزب و ئەساسنامەکەی، بۆ دابەشکردنی ئەرکەکان و دیاریکردنی کارەکان، لە شوێنی «باغی گوێزی» مەهاباد رەئیگیری (= تیر و پشک) کرا و ئەو کەسانە بە ئەرکەکانی تایبەت بە خۆیان دیاری کران: حوسێنی فرووهەر، بەرپرسی کۆمیتە - قادری مودەڕڕیسی، بەرپرسی هەیئەتی ئیستیشارە (= راوێژکار) - عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی، بەرپرسی چاپەمەنییەکان - سەدیقی حەیدەری، بەرپرسی تەبلیغات و مەئمووری بڵاوکردنەوەی چاپەمەنییەکان - نەجمەددینی تەوحیدی، ژمێریار و تەحویلدار - محەممەدی یاهوو، سکرتێر (نووسەر) - محەممەدی شاپەسەندی (سکرتێر) - عەبدوڕڕەحمانی ئیمامی (بازرەس = پشکێنەر) – قاسمی قادری قازی، ئەندامی ئیستیشارە - محەممەدی ئەسحابی، ئەندامی ئیستیشارە - رەحمانی کەیانی، موستەشار - حامیدی مازووچی، ئینتیزامات - محەممەدی سەلیمی، کارمەند - عەلی مەحموودی، ئەندامی کومیتە - محەممەدی نانەوازادە، فەرماندەی هێز.» بەو شێوەیە بۆمان دەرکەوت کە ئەندامانی هەیئەتی ئیستیشارەی ئیدارەی ناوەندی کۆمەڵەی ژ.ک کە نوسخەی «پەیمانی سێ سنوور»یان پەسەند کردووە بریتی بوون لە: کاک قادری مودەڕڕیسی، کاک قاسمی قادری قازی و کاک محەممەدی ئەسحابی.

## هۆکاری رەتکردنەوەی پەیمانی «سێسنوور» و بە نەناسراوی مانەوەی

خاڵێکی گرینگی ئەو کۆبوونەوە ئەوەیە کە بۆمان روون بێتەوە بۆچی هەتا ئێستا ئەو پەیمانە بە نەناسراوی ماوەتەوە. مێژوونووسانی رۆژهەڵاتی کوردستان کاتێک دەگەنە سەر باسی چالاکییەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) لەو بەشە، باسی پەیمانی «سێسنوور» دەکەن، بەڵام جێگای سەرنج و سەرسوورمانە کە بۆچی لە کوردستانی باشوور ئەو پەیمانە نەناسراوە، یا ئەگەریش ناسرابێ بە شک و گومان و نیوەچڵی باسی لێوە کراوە. بۆ روونبوونەوەی زیاتری ئەم بابەتە، دیسان روو دەکەینەوە کتێبەکەی مامۆستا هەژار (چێشتی مجێور). مامۆستا هەژار لە درێژەی نووسینەکەی لە لاپەرە ٦٤ و ٦٥دا دەڵێ: «ئێمە دەسبەجێ نوسخەی «بەیان»ی خۆمان لە «نیشتمان»دا چاپ کرد، هێشتا بڵاومان نەکردبۆوە خەبەریان داینێ کە حیزبی «هیوا» بەو پێکهاتنە رازی نەبووە، چاپی مەکەن... هۆش ئەوە بوو کە لە بەندێک لە پێکهاتنەکەدا دەڵێ: «ئەگەر ئینگلیس لە عێراق بەشێ بدەن بە کورد، نابێ کوردی دەرەوەی عێراق هەڵاوێرێ، چونکە کوردستان یەکپارچەیە. با بڵێین ئێمە بەشی کورد بە هەق دەزانین و بەپێی توانا یاریدەی هەموو کوردێک دەدەین. کە ئێمەش دەگەڵ رووسان هەر ئەو حەولە دەدەین و موکریان لە کوردی تورکیا بە جیا نازانین. حیزبی «هیوا» کە بە سەرۆکایەتی مامۆستا «رەفیق حیلمی» بوو، لە مەسڵەحەتی نەزانیبوو کە هیچ ناوێک لە رووس و کوردی ئێران و تورکیا هەبێ.»

ئەگەرچی وەکی گوتمان چەشنێک لە شک و گومان لە گێرانەوە و باسی پەیمانی «سێسنوور» لە لایەن نووسەران و مێژووناسانەوە بەدی دەکرێ. بەڵام دەکرێ لە رووی زانیارییە جۆراوجۆرەکان بنەمای باسەکەمان ساغ بکەینەوە و بە روونیش بڵێین کە لە ناو کۆمەڵەی «هیوا»دا چەشنە ناکۆکییەک هەبووە.

بەر لەوەی باسی ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵەی «هیوا» بکەین، پێویستە کورتەمێژوویەک لەو کۆمەڵە و چۆنیەتی دامەزران و هەڵوەشانەوەی باس

«جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان»دا کە پوختە و کورتمان کردۆتــەوە دەڵێ: «حیزبی هیوا ساڵی ١٩٣٩ لە لایەن ژمارەیەک ئەفسەر و رۆشـنبیری کـورد حیزبێکی سیاسی بە ناوی حیزبی «هیوا» بە شێوەیەکی نهێنی دامــەزرا. زۆر زوو ئەندامەکانی گەیشتە پتر لە هەزار و پێنجسـەد ئەنـدامی چـالاک کـە زۆربـەیان ئەفـسەر و مافنــاس و خوێنـدکار و پزیـشک و مامۆسـتای قوتابخانــە بـوون. چالاکییەکانی کۆمەڵەی «هیوا» تەنیا باشووری کوردستانی نەگرتــەوە بەڵـکوو کوردستانی تورکیا و ئێـران و سووریاشـی گرتــەوە (ل ١٦٩) حیـزبی هیـوا کـە ئامانجە سەرەکییەکانی - بەرهەڵەسـتی کـردنی فاشـیزم و سـەندنەوەی مافــە دێموکراتییەکانی گەلی کورد بوو، بە شێوەیەکی نــەهێنی دامــەزرا و تــا ساڵــی ١٩٤٣ گەورەترین حیزبی سیاسـی کوردسـتانی عێـراق بـوو. دوای رزگــاربوونی ناوچەکانی باکووری رۆژئاوای ئێران لە ساڵی ١٩٤٢، کۆمەڵەی هیوا بـڕیاری دا دوو ئەندامی خۆی کە بریتی بوون لە مستەفاخۆشناو و میرحاج ئەحمــەد، وەک نوێنەر بە مەبەستی پێوەندی کردن بە سەرانی جووڵانەوەی کوردستانی ئێرانەوە بۆ ئەو مەڵبەندە بنێـرێ. تــا کۆتــایی ساڵــی ١٩٤٣ کۆمەڵــەی هیــوا حیزبێکــی پێشکەوتنخواز و بەهێزترین گرووپی سیاسـی ئــەوکاتی جووڵانــەوەی رزگــاری نیشتمانی کوردستان بوو. ئەگەرچی حیزبێکی هەمەلایەن، بەهێز و دیـسیپلیندار بوو و پێوەندی بە هــەموو پارچــەکانی دیکــەی کوردسـتانەوە کردبـوو، بــەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانە، دووبەرەکی و ناکۆکی ناوخۆیی لە ریزی حیزبەکەدا لە نێوان بازووی چەپ و بازووی راست سەبارەت بە هەموو ئەو مەسەلانەی تایبەت بە رێکخستن، بەرنامــە، نەخـــشەی کــارکردن و بەتایبــەتی دروشــم و رێبــازی سیاسی بوون، سەری هەڵدا. ساڵی ١٩٤٣ کــە جووڵانــەوەی چەکـداری ناوچــەی بارزان دەستی پێکرد. ئــەو جووڵانــەوە هاوکــات بــوو دەگــەڵ گەورەبوونــەوەی ناکۆکییەکانی نێوان دوو باسکی چەپ و راستی کۆمەڵەی هیوا.»

دوکتور «عەزیزی شەمزینی» کە یەکێک بووە لە بەشدارانی کۆبوونــەوەی «دالانپەڕ» و لە کتێبەکەی خۆیدا سەبارەت بە ناکۆکییەکانی ناو ریــزی حیــزبی هیوا زۆر بە روونی دواوە. ئەگەرچی سەبارەت بە بەشداربوونی خۆی لە پەیمانی

«سێسنوور» شتێکی نەنووسیوە، بەڵام زانیاری باشی لەسەر ناکۆکییەکانی ناو ریزی حیزبی «هیوا»ی ئاماژە پێکردووە.

رەنگە هۆی ئەوەیکە نووسەر سەبارەت بە کۆبوونەوەی «دالانپەڕ» شتێکی لە کتێبەکەیدا نەنووسیوە، هەر ئەوە بێ کە ئەم پەیمانە لە لایەن حیزبی «هیوا»وە قەبووڵ نەکرا. جا هەر لەبەر ئەوە بە پێویستی نەزانیوە هیچی لەسەر بنووسێ.

کاک دوکتور «عەزیزی شەمزینی» هەر لە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ١٣٢ و ١٣٣ دەڵێ: «ناکۆکییەکانی ناو ریزی حیزبی «هیوا» سەبارەت بە دوو مەسەلەی سەرەکی بوون:

یەکەم: «ئایا گەلی کورد لە خەباتی نیشتمانی رزگاریخوازدا بۆ چارەسەرکردنی مەسەلە نەتەوایەتییەکەی ئەبێ کام رێبازی سیاسی بگرێتەبەر؟ ئایا ئەبێ بە یەکێتی سۆڤیەت و کامپی سۆسیالیست یا خود بریتانیە و کامپی ئیمپریالیستی و رۆژئاوا پشتئەستوور بێ؟ ئایا کامیان پشگیری گەلی کورد دەکەن و بۆ وەدەسهێنانی ئازادی مافە نەتەوەییەکانی یارمەتی دەدەن؟

رابەری بازووی راست هەمان سەرکردەی حیزب بوو واتا «رەفیق حیلمی». ئەو بازوە بە بیانووی ئەوەی گۆیا بریتانیە بەهێزە و دەسی بە سەر عێراقدا گرتووە، دەیویست رەگی پێوەندی نێوان «هیوا» و بریتانیە داکوتێ.» نووسەر هۆی ئەو بۆچوونەش بەو جۆرە باس دەکا: «چونکە لە حیزبی رانەدەبینی کە بتوانێ بە گژ بریتانیەدا بچێ و هەمیشە بڵاوی دەکردەوە و گوایە بریتانیە دەتوانێ حیزب و جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی هەپروونبەهەپروون بکا»

نووسەر سەبارەت بە یەکێتی سۆڤیەتیش دەڵێ: «بازووی راست پێی وابوو کە یەکێتی سۆڤیەت لەبەر ئەوەی لە کوردستان دوورە ناتوانێ یارمەتی گەلی کورد بدا.» ئەگەرچی خاڵی دووهەمی ناکۆکییەکە پێوەندی دەگەڵ رووداوی بەستنی پەیمانی «سێسنوور» نییە، بەڵام با بزانین نووسەر چۆن لە خاڵی دووهەم دەدوێ: «سەبارەت بە خاڵی دووهەمی ناکۆکی: بازووی راست دەیویست کاری بەسەر جووڵانەوە چەکدارییەکەی بارزانەوە نەبێ، هەم یارمەتی نەدا و هەم سەرکردایەتی نەکا.»

هەروەها سەبارەت بە هۆکاری ئەم بۆچوونەش بەپێی بیروڕای مامۆستا «رەفیق حیلمی» و لایەنگرانی (باڵی راست) دەڵێ: «ئەم کارە مایەی تووڕەبوون و هاروژانی بریتانیەیە، بەتایبەتی کە جووڵانەوەکە دژی دەوڵەتی عێراقی هاوپەیمانی بریتانیەیە.»

بەڵام باسکی چەپی ئەندامانی کۆمەڵەی «هیوا» ئەوکات لەو بڕوایەدا بوون کە پێوەندی حیزبی هیوا و یەکێتی سۆڤیەت و دەوڵەتە سۆسیالیستەکان هەبێ باشترە.

چونکە بەپێچەوانەی باسکی راستی ئەندامانی کۆمەڵەی «هیوا»، بازووی چەپ لەو بڕوایەدا بوو کە: «تەنها کامپی سۆسیالیست دەتوانێ یارمەتی گەلی کورد بدا و لە خەباتی نەتەوەیی پشتیوانی بکا، بەتایبەتی کە هەموان شارەزای سیاسەت و هەڵوێستی بریتانیە و دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانی رۆژئاوان.»

هەر بۆیە باڵی چەپ سەبارەت بە خاڵی دووهەمی ناکۆکییەکان ناو ریزی حیزبی «هیوا»، «داواکار بوو حیزب بە تۆکمەترین شێوە لە جووڵانەوەی بارزاندا بەشداری بکا و بە هەموو تواناوە یارمەتی بدا و جڵەوی سەرکردایەتی کردن بگرێتە دەس.»

نووسەر لە درێژەی قسەکانیدا لە لاپەڕەی ١٣٣دا دەڵێ: «لە مانگی شوباتی ١٩٤٤دا (=رێبەندان و رەشەمەی ١٣٢٣) لە شاری کەرکووک کۆنفرانسی کۆمەڵەی هیوا بەسترا کە لەودا ناکۆکییەکان سەبارەت بە هەر دوو خاڵی ناوبراو گەیشتە ئەوپەڕی خۆی و بازووی چەپ پەردەی لەسەر نەخشی ئابڕووبەرانەی ئیمپریالیزمی بریتانیا هەڵماڵی و دەریخست کە گەلی کورد بە پشتیوانی بریتانیا رزگاری نایە و دەبێ بۆ ئەو مەبەستە یەکێتی سۆڤیەت بە پشتوپەنای خۆی بزانێ... بەم جۆرە کۆنفرانسەکە، کۆمەڵەی هیوای کردە دوو بەش: بازووی راست بە سەرۆکایەتی «رەفیق حیلمی» بوو کە هەموو داخوازەکانی بازووی چەپی رەت کردەوە و لە حیزب دابڕا. ماوەیەک بە ناوی حیزبی هیواوە کاری کرد بەڵام پاشان بە یەکجاری هەڵوەشایەوە. بەم جۆرە نەخشی مێژوویی حیزبی هیوا کۆتایی هات. ئەو لێکدابڕانە کارێکی وای کرد بەشێک لە ئەندامان و لایەنگرانی بازووی چەپ بچنە ریزی حیزبێک بە ناوی تاقمی «ئەلقاعیدە»ی حیزبی کۆمۆنیستی عێراقەوە کە ئەو بەشە رۆژنامەیەکیان بە ناوی «ئازادی» بە نهێنی

دەرکرد. بەشێکی دیکەش لە ئەندامانی باڵی چەپی کۆمەڵەی هیواش بوونە ئەندامی لقی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە کوردستانی عێراق. ئەوانی مانەوەش حیزبێکیان بە ناوی «رێیا راست» پێکەوەنا کە زۆربەی رێکخراوەکانی لە سلێمانی و لە نێو ریزی خوێندکارە کوردەکانی بەغدا بوو. بەشێکی کەمیشیان چوونە ریزی تاقمی «وەحدە ئەننیزال»ی کۆمۆنیستەکان و لە کوردستان بە ناوی «یەکێتی تێکۆشین» لقێکیان دامەزراند. لە کۆتایی ١٩٤٤ تاقمی «وەحدە ئەننیزال» چووە ریزی تاقمی «ئەلقاعیدە»وە کە هەردووکیان لە حیزبی کۆمۆنیستی عێراق جیا بوونەوە، بەڵام کۆمۆنیستە کوردەکان نەچوونە ریزی ئەم تاقمە و لە کوردستان حیزبێکی کۆمۆنیستیان پێکەوە نا، ئۆرگانی ئەو حیزبە رۆژنامەی «شۆڕش» بوو. لەبەر ئەوە حیزبەکەش لە ناو خەڵکدا هەر بە «حیزبی شۆڕش» ناسرا. لە کاتی جووڵانەوە چەکدارییەکەی ١٩٤٣ - ١٩٤٥ی بارزاندا حیزبی شۆڕش یارمەتی جووڵانەوەکەی دا و لە ساڵی ١٩٤٦یشدا پێش بەستنی کۆنگرەی دامەزراندنی «پارتی دێموکراتی کوردستان»، خۆی هەڵوەشاندەوە. (ل ١٣٤ - ١٣٥) لە کۆتایی ١٩٤٤ و سەرەتای ساڵی ١٩٤٥ حیزبی شۆڕش و گرووپە چەپەکانی تر و لایەنە پێشکەوتنخوازەکانی حیزبی هەڵوەشاوەی هیوا ئەرکی دامەزراندنی بەرەیەکیان خستە ئەستۆ؛ بە دەسپێشخەری ئەو لایەنانە حیزبی بەرەی نیشتمانی یەکگرتووی کوردی عێراق بە ناوی «حیزبی رزگاری کورد»وە دامەزرا کە سەرکردایەتییەکەی لە کۆمیتەیەکی حەوت کەسی بە نوێنەرایەتی هەموو لایەنەکان پێک هاتبوو... (ل ١٣٧)، بەم شێوەیە دەردەکەوێ کە هەڵوەشانەوەی حیزبی هیوا، ئەو ئەنجامانەی نەبوو کە ئیمپریالیزمی بریتانیا گەرەکی بوو، بەپێچەوانەوە هەڵوەشانەوەی ئەم حیزبە، «حیزبی رزگاری» هێنا کایەوە کە زۆر لە حیزبی هیوا پتەوتر، تۆکمەتر و یەکگرتووتر بوو و لە ماوەیەکی کەمدا تێکڕای گەلی کورد (=حیزبە کوردییەکانی باشوور)ی لە ژێر ئاڵایەکدا کۆ کردەوە. «حیزبی رزگاری کورد» لە خاڵی یەکەمی یادداشتێکیدا کە بۆ کۆبوونەوەی وەزیرانی کاروباری دەرەوەی مۆسکۆی ناردووە (ل١٣٨) دەڵێ: «ئێمە لە خەباتی برا کوردەکانی ئێران و برا ئازەرییەکانیان بۆ وەدەس هێنانی ئۆتۆنۆمی و

[ی‌ئێران] و نۆکەرانی پشتیوانی دەکەین.» نووسەر لە کۆتایی ئەو باسەدا لە لاپەڕە ١٣٩دا دەڵێ: «چالاکی «حیزبی رزگاری کورد» تا ناوەڕاستی مانگی ئابی ١٩٤٦ درێژەی کێشا. لە سەرەتای مانگی ئابدا کۆنگرەی بەست و بە تێکڕایی دەنگ بڕیاری هەڵوەشانەوە و پێکەوەنانی «پارتی دێموکڕاتی کوردستان»ی دا. بوونی کۆمەڵەی (ژ.ک) بە «حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران» و دامەزراندنی کۆماری ئۆتۆنۆمی [کوردستان لە] مەهاباد، پاڵپشتی ئەم مەسەلەیە بوون. هەموو حیزبە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق بڕیاریان دا لە کۆنگرەی تایبەتیدا خۆیان هەڵوەشێننەوە و پاشان لە حیزبێکی تردا (ئەویش پارتی دێموکراتی کوردستانە) یەک گرنەوە... کۆنگرەی «حیزبی رزگاری» بەسترا و حیزب خۆی هەڵوەشاندەوە و لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦دا «پارتی دێموکڕاتی کوردستان» دامەزرا.»

لێرەدا قسەکانی دوکتور «عەزیزی شەمزینی» تەواو دەبێ، مەبەستی منیش لە هێنانەوەی ئەو کورتە مێژوویەی کۆمەڵەی هیوا، لە رۆژی دامەزراندنییەوە هەتا پێکهێنانی «پارتی دێموکڕاتی کوردستان» تەنیا ئەوە بوو کە یەکەم: بە بۆنەی ئەو شیکردنەوەیە کۆمەڵەی هیوامان باشتر ناسیبێ. دووهەم: بە بێ شیکردنەوەی دووبارەی قسەکانمان و هەر بەپێی ئەو کورتە مێژوویە دەبینین کە خاڵێکی گرینگی دیکەشمان بۆ روون بۆتەوە ئەویش هۆکاری قەبووڵ نەکردنی پەیمانی «سێسنوور» لە لایەن حیزبی «هیوا»وەیە کە تا رادەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە سەر بۆچوونی دوولایەنی راست و چەپی نێو ریزەکانی حیزبی «هیوا». هەروەها ئەو بەشە لە قسەکانی مامۆستا «هەژار»یش دەسەلمێن کە دەڵێ: «حیزبی هیوا کە بە سەرۆکایەتی مامۆستا «رەفیق حیلمی» بوو، بە مەسڵەحەتی نەزانیوە کە هیچ ناوێک لە رووس و کوردی ئێران و تورکیە هەبێ.»

هەروەها قسەکانی دوکتور «عەزیزی شەمزینی» کە دەڵێ: «رەفیق حیلمی سەرۆکی ئەوکاتی کۆمەڵەی «هیوا» بووە و «هەمیشە بڵاوی دەکردەوە کە گوایە بریتانیە دەتوانێ حیزب و جووڵانەوەی رزگاریی نیشتمانی هەپروونبەهەپروون بکا.»، دەگەڵ قسەکانی «ماموستا هەژار» جیاوازییان نییە و هەردووک لە گەیاندنی پەیامەکەیان هاوفکرن.

کاک «عەلی کەریمی» لە لاپەڕە ٢٦٢ تا ٢٧٩ی کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی»دا کە لەگەڵ مامۆستا «ئیبراهیم ئەحمەد» وتووێژی کردووە، چەند زانیارییەکی سەبارەت بە هەر دوو کۆمەڵەی (ژ.ک) و «هیوا» باس کردووە کە بۆ روونکردنەوەی ئەو بەشەی کتێبەکەمان بەکەلک دەبێ. لە لاپەڕە ٢٦٢ و ٢٦٣دا کاک عەلی دەپرسێ: «مامۆستا ئەودەمەی کە دەفەرمووی کە «ئیسماعیل شاوەیس» و ئەوان ئیتتیسالیان بەتۆوە کرد، کۆمەڵەی «هیوا» ئینشقاقی تێکەوتبوو؟» مامۆستا دەڵێ: «هەر نەمابوو تەقریبەن! وەکوو شتێک نەمابوو، ئەو کۆمەڵە خەڵکە مابوونەوە کە ئەگەرچی بە ناوی «هیوا»وە ئیشیان ئەکرد بەڵام چ پەیوەندییەکیان لەگەڵ «هیوا»ی پێشوو نەبوو. ئەوە بە سەرکردایەتی «یونس عەبدولقادر» [و] ئەندامەتی «محەممەدی شێخ سەلام» کە زابت بوو لەگەڵ «مەحموود کوردی» ئەویش زابت بوو، لەگەڵ «رەمزی عەبدولکەریم» لەگەڵ «ئەمین رەواندزی» ئەوانە سەرکردایەتی ئەو ئیشەیان ئەکرد. چەند کەسێکی دیکەشیان لەگەڵ بوو کە زابت بوون، «مستەفا خۆشناو»، «میرحاج» خۆیان لەو کەسانە بوون، «عزەت عەبدولعەزیز»، ئەمانەش لەو کەسانە بوون کە لەو هینە تازەیە لەو تەنزیمە تازەیەی دوای پارچەپارچە بوونی «هیوا» ئیشیان ئەکرد. هینەکەی ئێمە ناوی «لقی کوردستانی عێراق» بوو نەک «لقی سلەیمانی»...»

لە راپۆرتی دانیشتنی دووقۆڵی «دالانپەڕ»دا هاتووە: «پەیمانی «سێسنوور» لە لایەن هەیئەتی ئیستیشارەی (راوێژکاری) ئیدارەی ناوەندی (ژ.ک) پەسند کراوە بەم زووانە دەگەڵ نوسخەی پەسندکراوی ناوچەی «هیوا» موبادەلە دەکرێت» وا دیارە لەبەر ئەو هۆکارانەی باسمان کردن، مامۆستا «رەفیق حیلمی» و هاوبیرەکانی پەیمانەکەیان پەسند نەکردووە و هەر بەو هۆیەش ئەو بەڵگەیە لە کوردستانی باشوور بڵاو نەکراوەتەوە و تا رادەیەکی زۆر بە نەناسراوی ماوەتەوە و بە شک و گومانەوە باسی لێکراوە.

## پەیمانی «سێسنوور» و گومانی دژایەتی رووسەکان

ئەگەرچی رووسەکان لە زۆر بواردا لەمپەریان بۆ تێکۆشەرانی کۆمەڵەی

و سەرەتاکانی ساڵی ١٣٢٤ ڕێگر بوون. بەڵام بە روونی دژایەتییەکیان لەگەڵ پەیمانی «سێسنوور» و بڵاوکردنەوەی بەڵگەکەی نەکردووە. چونکە ئەگەر ئەوان دژایەتییان کردبایە ئەوکات رەنگبوو کۆمەڵەی «هیوا» «بەیانی» لای خۆی بڵاو کردباوە کە ئەوجار ئاشکرا دەبوو کە کۆمەڵەی (ژ.ک) پەیمانەکەی پەسەند نەکردووە و دەمانگوت لەبەر فشاری رووسەکان یا رازی نەبوونی هەیئەتی راوێژکار (= مەشوەرەت)ی (ژ.ک) پەیمانەکە پەسەند نەکراوە. هەڵبەت هیچ دووریش نییە نهێنیکارییەکانی ژ.ک لە ئاستێکی وەها بەرزدا بووبێ کە تەنانەت رووسەکانیش پێیان نەزانیبێ یا ئەگەریش پێیانزانیبێ لەبەر ئەوە کە پەیمانەکە سەری نەگرتووە، ئەوانیش هەڵوێستێکیان لە بەرامبەریدا نەگرتبێ و سیاسەتێکی دیکەیان رەچاو کردبێ کە ئەویش هەر وەلانان و گۆڕانی بنەڕەتی ژ.ک بووبێ.

نهێنیکاری و چالاکییە بێسنوورەکان و ئامانجە هەمەلایەنەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) وایان لە بەرپرسانی سۆڤیەت کرد کە دواتر لەمپەری گەورەتر لە بەرامبەر زۆربەی تێکۆشانەکانی ئەم کۆمەڵەیە دابنێن. لە ئاوڕدانەوەیەک بە سەر ژمارەکانی گۆڤاری نیشتمان، ئۆرگانی کۆمەڵەی (ژ.ک) بۆمان دەردەکەوێ کە گەورەترین هۆکاری ئەو لەمپەر و یارمەتینەدانەی رووسەکان لە بەرامبەر چالاکی ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) و حیزبەکەیان، دروشمی «کوردستانی گەورە»یە. گۆڤاری نیشتمان لە ژمارەی یەکی خۆیدا کە لە پووشپەڕی ١٣٢٢ (جوولای ١٩٤٣) چاپ کراوە، یەکەم دێڕی گۆڤارەکەی بە رستەی «بژی سەرۆک و کورد و کوردستان و هیوا» دەست پێکردووە و بە ئایەی «کم فئە قلیلە فئە کثیرە باذن‌الله» رازاندوویەتەوە. ژمارەی دووی بە ئایەتی «ومن یتوکل علی‌اللە فهو حسبە»، هەروەها بە دروشمی «بژی کورد و کوردستان بە سەربەستی و سەربەخۆیی» لە لاپەڕە ٨یدا. ژمارە ٣ و ٤ بە ئایەتی «نصر من‌الله وفتح قریب وبشرالمؤمنین»، ژمارە ٥ بە ئایەی «تعاونوا علی‌البر والتقوی»، ژمارە ٦ی بە ئایەی «ان‌الله یأمر بالعدال والاحسان» و لە ژمارە ٧و٨و٩شدا بە ئایەی «کل حزب مالدیهم فرحون» دەستی پێکردووە کە مەبەست لە نووسینی ئەوانە، کارکردن بۆ یەکێتی و هاوکاری لەگەڵ یەک و دیتنی ئاکامەکانێتی کە ئەویش گەیشتن بە

ئاوات و خۆشییەکانە و مەبەستیشی ئەوەیە کە ئەگەر بەو پێیە بڕۆینە پێش، سەرکەوتن نیزیکە. لە لاپەڕە ٨ی ژمارە ٢دا لە دروشمی «بژی کورد و کوردستان بە سەربەستی و سەربەخۆیی» کەلک وەرگیراوە. کۆمەڵەی (ژ.ک) لە مانگی خەزەڵوەری ١٣٢٢ (ئۆکتۆبری ١٩٤٣) نامەیەکی «لە لایەن ئیدارەی محەللی شاری ئا- خ» (سابلاغ)ەوە بۆ سەرۆک بارزانی نووسیوە کە لە لای سەرووی نامەکەدا نووسراوە: «بۆ جەنابی زەعیمی ئازادی، مەلامستەفا بارزانی». نامەکە لە ٩ بەند و خاڵ پێک هاتووە. زۆربەی پێشنیار و پرسیارەکان گرینگن، بەڵام ئەو خاڵانەی مەبەستی سەرەکی ئێمەن، خاڵەکانی ژمارە (٣ و ٥ و ٧)ن. خاڵێکی گرینگی هاوبەش لە نێوان «بەیان»ی پەیمانی «سێسنوور» و ئەم نامەیە کە بۆ مەلا مستەفا بارزانی بەڕێکراوە، بیری یەکگرتن و بەستنی پەیمانێکی نەتەوەییە لە نێوان پارچەکانی دیکەی کوردستان. لە ژمارە ٣ی پرسیارەکاندا هاتووە «٣ - بەراعەتی سەورەی ئێوە چییە، ئایا ئیدیعای ئازادی کوردستانی عێراق دەکەن وە یا خود هەموو کوردستانی گیتی و زیمنەن کوردستانی تورکیا.» مەبەستی بەرپرسانی ئیدارەی محەللی (ژ.ک) ئەوە بووە کە بۆیان دەرکەوێ ئایا «مەلا مستەفا بارزانی» و بزووتنەوەکەی، وەک ئەوان داوای کوردستانی گەورە دەکا و هاوئاهەنگیان دەگەڵ دروشمەکانی (ژ.ک)دا هەیە یان نا؟ لە خاڵی ژمارە ٥دا دەڵێ: «٥- رەئی ئێمە ئەوەیە کە سەورەی موقەددەسی ئێوە ناوێکی عوموومی وەربگرێ یەعنی ئیددیعای ئازادکردنی هەموو کوردستان بکەن و بۆ ئەمە دەبێ کوردی گیتی بە مەشوەرەت تەعاونتان دەگەڵ بکا و لە ژێر قیادەی ئێوە لەشکرێکی کوردی لە هەموو کوردی گیتی تەنزیم بکرێ. بۆ ئەوەش دەبێ ئامادە بن لە عەقدی موئتەمەرێک لە حاڵی حازر لە ئێوە و لە هەیئەتی ئیستیشارەی ئێوە و هەیئەتی ئیستیشارەی ئێمە تەنزیم بکرێ و جێگە و زەمان تەعیین بکرێ، بۆ ئەو موئتەمەرە، چ لە ئەرزی عێراق چ لە ئەرزی کوردستانی ئێران. لەم موئتەمەرەدا هەموو مەتالیبی کورد‹بە شکڵی پەیمانێکی میللی› تەعیین بکرێ وە لە تەرەف هەمووومان ئیمزا دەکرێ وە لەم موئتەمەرەدا میزانی (=بوودجە) عەسکەری تەعیین دەکرێ وە واجیباتی هەموو لایەک تەعیین دەکرێ.»

لێرەشدا خاڵی هاوبەشی ئەو بەندە لەگەڵ پەیمانی «سێسنوور» بە روونی دەردەکەوێ. روون و ئاشکرایە کە فکری دامەزرانی وەها پەیوەندییەک و کۆبوونەوەیەکی لەو چەشنە، لە مێژ بووە لە مێشکی بەرپرسانی پایەبەرزی کۆمەڵەی (ژ.ک)دا بووە. هەروەک لە دەقی نووسراوەی نێو گۆڤاری «نیشتمان»دا هاتووە کە «زۆر لەمێژ بوو بڕیار درابوو کۆنفڕانسێک لە نێوان ئێمە و کۆمەڵی هیوا... تەشکیل بدرێت...» بەڵام باروودۆخی ناوچە و هەلومەرجی تایبەتی داسەپاو بە سەر هەر پارچەیەکی کوردستاندا، ئەم ئاوات و ئامانجەی لە ڕۆژی یەکەمی بیرکردنەوە لە دامەزراندنی وەها پەیمانێک تا کۆتایی و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی ژ.ک و رووخانی کۆماری کوردستان، دوور خستۆتەوە. خاڵی ژمارە ٧ دەڵێ: «٧- بۆ ئازادبوونی کوردستان دەبێ سیاسەتی یەک لە دووەلی موعەززەمە لەگەڵمان بێ، بە رەئی ئێمە ئەم دەوڵەتە، دەوڵەتی شوورەوییە. رای ئێوە بەم خوسووسە چییە؟ چونکوو نابێ (علی‌الحیاد) (=بێلایەن) بین لەگەڵ هەموو دەوڵەتان.» کە ئەو خاڵەش بیری بەربڵاو و هەمەلایەنەی بەرپرسانی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە خەبات بۆ وەدیهێنانی ئاواتی «کوردستانی گەورە» ئاشکرا دەکا. کاک «نەوشیروان مستەفا ئەمین» لە لاپەڕە ٧٨ تا ٨٠ی کتێبەکەیدا (حکوومەتی کوردستان...) باسی ئەو نامەیە دەکا و لە لاپەڕە ٨٠دا دەڵێ: «١- ئەم نامەیە لە ئارشیفی بریتانیادا دۆزراوەتەوە ئەبێ بۆچی گەیشتبێتە ئەوێ. ٢- نامەکە بە زمان و داڕشتن و نووسراوە، لەگەڵ زاراوەی موکریان و سەرکردەکانی کۆمەڵەی ژ.ک و نووسینەکانی گۆڤاری نیشتمان جیاوازی هەیە. زۆرتر لە زاراوەی کوردی عێراق نزیکە، جا نووسەر بەو جۆرەی داڕشتووە بۆ ئەوەی لە زمانی کوردی عێراقەوە نزیک بێ، ئەوە باسێکی ترە.» نووسەر لە درێژەی ئەو باسەدا دەڵێ: «٣- ناوەرۆکی نامەکە: پرسیارەکانی و بۆچوونەکانی پێشنیارەکانی پتر لە هەموو نووسینەکانی تری ژ.ک ستراتیجی نەتەوەیی کۆمەڵە دەرئەخا و لە هەندێ مەسەلەی سەرەکیدا لەگەڵ بۆچوونە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەدا ناسازێن.»

مامۆستا «ئیبراهیم ئەحمەد» لە لاپەڕە ٢٧٨یشدا لە وەڵامی ئەو پرسیارە کە: «ئایا ئێوە بڕواتان بەو نامەیە هەیە کە گۆیا کۆمەڵەی ژ.ک بۆ بارزانی نووسیوە؟» دەڵێ: «رەنگە! چون ئەو وەختە لقەکەی ئێمە دروست نەببوو، لەو

وەختا حەولێکیان دا حەتا برادەرێکیان نارد، لە کەرکووک وتیان ئەمە نوێنەری (ژ.ک)ە، «حەمەدەمینی شەڕەفی» ئەمە لە کەرکووک بوو لەو وەختەیا کە هیوا دووکەرت ببوو، جا ڕەنگە لە ڕێی ئەو زابیتانەوە کە ئیتسالیان بوو بە مەلا مستەفاوە ئەو کاغەزەیان بۆ مەلا مستەفا ناردبێ.»

کاک «عومەری فارووقی» لە کتێبی «٥٠ ساڵ خەبات لە کوردستان»دا بیرەوەرییەکانی کاک «نووری شاوەیس»ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی. لە لاپەڕە ٢٣ و ٢٤ی ئەو کتێبەدا باسی نامەیەکی کردووە کە بە بڕوای من هەمان نامەیە کە پێشتر باسمان کرد. لێرەدا بۆ گەیشتن بە وەڵامی هێندێک پرسیار و ڕوونبوونەوەی باشتری ئەو بابەتەش بێ، بەپێویستم زانی دەقی ئەو باسە بەکورتی لە زمانی کاک نووری شاوەیسەوە بنووسمەوە کە دەڵێ: «شۆڕشی بارزان ساڵی ١٩٤٣ لە کوردستان دەستی پێکرد و ئەو شۆڕشە بوارێکی ڕەخساند کە کۆمەڵەی هیوا هەڵوەشێتەوە چونکە «ڕەفیق حیلمی» وەک سەرۆکی هیوا لەژێر کاریگەری هەمان سیاسەتی ئاشتیخوازانە و پێشکەوتن لە ڕێگای وتووێژی سیاسی، دژی شەڕ بوو و لەو ڕێگایەشدا هەوڵێکی زۆری دا بەڵام «مەلا مستەفا بارزانی» دژی ئەو بڕوایە بوو و بڕوای بە شەڕی چەکدارانە هەبوو... لەو سەروبەندەدا کاک «ئەمین ڕەواندزی» وەک یاریدەدەری نیزامی سلێمانی هەڵبژێردرا... ئەوکات زۆرکەس پێی وابوو من ئەندامی کۆمەڵەی (ژ.ک)م. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە من ئەندامی حیزبی هیوا بووم. هەرچۆنێکی بێ لەگەڵ بابم و مامم چووین سەری ئەمین ڕەواندزی بدەین. ناوبراو نامەیەکی پێشانی ئێمە دا و گوتی ئایا ئێوە لەم نامەیە ئاگادارن؟ من بە زیرەکییەکی زۆرەوە نامەکەم وەرگرتوو گۆشەیەکی گرینگی نامەکەم دڕی...، دوکتور «جەمال ڕەشید» و دوکتور «کەماڵ» کە ئەندامی کۆمیتەی نێوخۆیی بوون... ئاگاداری ئەو مەسەلەیەن. لەو نامەیەدا نووسرابوو: «بژی کورد و کوردستان، بژی شۆڕشی بارزان» ئێستاش لەبیرمە لەو ئیعلامییەدا وشەی پڕ مانای تێدابوو، بۆ وێنە «دۆستان» کە مەبەست لە «بریتانیا» بوو. لەو سەردانەدا زانیم کە ئەمین ڕەواندزی ئاگاداری سەردان و مەئموورییەتی «مستەفا خۆشناو» و «میرحاج» بوو

لەو نامەیەدا نووسیبوویان دەریاندەخست کە ئەم بابەتە بە سیاسەتی گشتی یەکێتی سۆڤیەت بەستراوەتەوە...»

کاک «دوکتور عەبدوڵلا مەردووخ»یش لە لاپەڕە ٣١ی ژمارە ١٤ی گۆڤاری «گزینگ»دا، زانیاری وردتری لەم بارەوە نووسیوە و دەڵێ: «ئەو نامەیە لە ٦ی خەرمانانی ١٣٢١ (رۆژی هەینی ٢٨ی ئووتی ١٩٤٢) بە ژمارە ٢٠٧ و بە ناوی کۆمەڵەی «ژ.ک»ەوە بۆ مەلا مستەفا نێردراوە.» لە پەراوێزی لاپەڕە ٣٤ی ئەو نووسراوەیەشدا دەڵێ: «کۆپی دەقی ئەم نامەیە لای نووسەری ئەم باسەیە. دەقی نامەکە لە FOی ئینگلیستانە بەڵام چۆن گەیشتۆتە دەست ئینگلیسییەکان ئەمەش لە نهێنییەکانی مێژووە. هێندێک دەڵێن مەلامستەفا خۆی ئەم نامەیەی داوەتە دەست ئینگلیسییەکان.» کە ئەگەر بە بۆچوونی دوکتور مەردووخ بێ، ئەوە رێکەوتی ناردنی نامەکە لەگەڵ لێکدانەوەی کتێبەکەی کاک «حامیدی گەوهەری» کە دەڵێ لە مانگی خەزەڵوەری ١٣٢٢ بۆ مەلا مستەفا نووسراوە، نیزیکەی ساڵێکیان مەودا دەبێ.

## بەڵگەی دووهەم لەسەر پەیمانی «سێسنوور»

بێجگە لەو بەڵگەی پەیمانی «سێسنوور» کە لە ژێر ناوی «لە ناو کۆمەڵەدا» لە گۆڤاری نیشتماندا چاپ کراوە و پێشتر بە وردی شیمان کردەوە، بەڵگەیەکی جێی متمانەی تەواوکەری دیکەشمان لەبەر دەستان بوو کە لێرە وەک پشتیوانەیەک بۆ شیکردنەوەکانمان و ناساندنی تێروتەسەلی پەیمانەکە دەیخەینە بەر دیدەی خوێنەران.

ئەو بەڵگەیەش هەر لە لایەن مامۆستا «زەبیحی»یەوە نووسراوە و بۆ سەرکۆنسوولی یەکێتی سۆڤیەت لە تەورێز نێردراوە. رێکەوتی نووسینی نامەکە ١٤ی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٣ی بە سەرەوەیە کە ئەو رۆژەش بەرامبەرە دەگەڵ ٥ی دیسامبری ١٩٤٤. نامەکە بە زمانی تورکی ئازەری نووسراوە و لە دوو لاپەڕەی تایبەت بە نووسینەکانی (ژ.ک) و بە ئارم و نیشانەی «کۆمەڵەی ژ.ک» و بە هەردوو ئەلفوبێی لاتینی و عەرەبی نووسراوە. لە لای چەپی نووسراوەکە لە

سەرووی ناوی سەرکونسوولی یەکێتی سۆڤیەت، بە زمانی کوردی ئەم رستەیە نووسراوە: «بژی کورد و کوردستانی گەورە!». [وێنەکانی ژمارە ٣٠ و ٣١]

نامەکە لە پێنج بەش پێکهاتووە کە هەر بەشەی زانیاری و هەواڵ یا داوایەکی جودای تێدا باس کراوە. دەقی ئەو بەڵگەیە لە لایەن کاک «ئەفراسیاو هەورامی» لە ئارشیڤی وەزارەتی دەرەوەی رووسیاوە کەوتۆتە دەست و پێم وایە کاک ئەفراسیاو ئەو بەڵگە و بەڵگەکانی دیکە بە سەر یەکەوە لە کتێبێک بە ناوی «کۆماری کوردستان، لە بەڵگەنامەکانی سۆڤیەتدا» چاپ کردووە کە من ئەو کتێبەم نەدیوە بەڵام بەشێکی زۆر لەو بەڵگەنامانە لەو دوو کتێبەی ژێرەوەدا هاتووە. دەقی وەرگێڕدراوی ئەو بەڵگەیەی کە جێی سەرنجی ئێمەیە لە لاپەڕەکانی ١٣٢ و ١٣٣ و ٢٣٥ و ٢٣٦ی کتێبی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان»ی نووسراوی کاک «حامیدی گەوهەری» و لاپەڕەکانی ٦٢٠ و ٦٢٣ی کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» نووسراوی کاک «عەلی کەریمی»دا هاتووە. بەر لەوەی بەڵگەکە شی بکەینەوە و دەگەڵ بەڵگەی گۆڤاری نیشتمان بەیەکەوە پەیوەندی و گرێیان بدەینەوە، وەرگێڕدراوی بەڵگەکە بە زمانی کوردی بە بێ دەسکاری دەنووسینەوە:

«کۆمەڵەی ژ.ک - ئیدارەی ناوەندی، بەرواری ١٤ی سەرماوەزی ١٣٢٣ - ٥ی دێسامبری ١٩٤٤ - کۆنسوولی بەڕێزی یەکێتی سۆڤیەت لە شاری تەورێز.

بە رێزەوە ئاگادارتان دەکەم: ١- رێکخراوی خەڵکی کوردی عێراقی بە ناوی هیوا (ئومێد) بۆ پێوەندی گرتن لەگەڵ ئێمە دوو ئەندامیان ناردبوو کە ئێمە لەگەڵ ئەوان بڕیارمان دا بۆ بەرەو پێش بردنی ئامانجی هەر دوو رێکخراوەکە (ئازادی گەلی کورد) هاوکاری بکەین و کاتی پێوەندی گرتن لەگەڵ دەوڵەتێکی دیکە ئەوان پرسمان پێبکەن. پاشان بەرپرسی رێکخراوەکەمان لە (هەولێر) لەگەڵ بەڕێوەبەرەکانی ئەم رێکخراوە دانیشتووە. داوامان لە رێکخراوەی خۆمان کردووە کە بزانن رایان چۆنە. رێکخراوەکەمان لە ئاخر نامەی خۆیاندا (١٧ی نۆوامبر)(= ٢٦ی خەزەڵوەری ١٣٢٣) بۆیان نووسیوین لەگەڵ بەڕێوەبەرەکانی «هیوا» لە هەولێر دانیشتووین و بە لایەنگری ئینگلیسییەکانیان دەزانن. لە

شارەکانی دیکەی (کوردستانی) عێراقیش لــە لقــەکانی دیکــەی ڕێکخراوەکــەمان پرسیار دەکەین. ٢- لە عێراق ڕێکخراوێکی کۆمۆنیستی هەیە کە لــەم دواییانــەدا بڵاوکراوەیەکیان بە نهێنی دەرکردووە و لە ژمــارەی یەکەمیــدا پیرۆزباییــان لــە ڕۆژنامەکەی ئێمە (نیشتمان) کردووە. ئێمەش دەمانهەوێ لەگەڵ ئــەم ڕێکخــراوە پێوەندی بگرین. هەروەها لقەکانمان لە عێراق دڵنیان ئەمانە بۆخۆیــان نوێنــەر دەنێرن. ٣- بەیاننامەی ئێمە سەبارەت بە نەوتی باکووری ئێران گەیشتە عێــراق و بڵاو کراوەتەوە. ٤- لە نامەی ژمــارە ٣٥١ی کۆمیتــەی ناوەنــدی حیزبەکــەمان نووسراوە: یەکێتی سۆڤیەتی مەزن ویستیاری پێشکەوتنی شارستانێتییە لە نێــو گەلی کورددا و بەو بۆنەیەش ئێمە داوا دەکــەین کــە لــە لایــەن سۆڤــیەتەوە لــە شارەکانی مەهاباد، بۆکان و نەغەدە و شنۆ، ناوەنــدی کولتــووری بکرێتــەوە و هەر نەبێ بۆ کرانەوەی ئــەو ناوەنــدە لــە شــاری مــەهاباد، زۆر تکــا دەکــەین. ٥- نامەی ژمارە ٣٤٧ی کۆمیتەی ناوەندی حیزبمان دەڵــێ: ســوپای ئێرانــێ بــە سەرۆکایەتی سەرتیپ هووشمەندی ئەفشار چۆتە سەردەشتێ و خەڵــکی وێ زۆر ناڕازین - سوپای ئێران بۆ هەر شوێنێ دەچێ بــۆ چاوترســاندن دەس دەکــا بــە گرتنی خەڵکی.ئێستا لە نێو گیراوەکــانی سەردەشــتێدا ســێ ئەنــدامی ئێمــەیان لەگەڵە، یەکیان خەڵکی مەهابادە و بە وییان گوتووە کــە لــە مــەهاباد نــەوتی ئێران دەدەن بە سۆڤیەت و لە دژی دەوڵەتی ئێران قسان دەکەن و ئێمــەش ئێــوە لێرە لە زیندان دەکەین.»

بەرپرسی بەشی ڕاگەیاندنی حیزبی ژ.ک - ڕەحمانی زەبیحی.

## شیکردنەوەی بەڵگەی دووهەمی پەیمانی سێسنوور

١- لە بەشی یەکەمی نامەکەدا دوو شتی گرینگمان بۆ دەردەکەوێ ئــەویش ناردنی دوو نوێنەری «کۆمەڵەی هیوا»یە بۆ پێوەنــدیگــرتن لەگــەڵ «کۆمەڵــەی ژ.ک». لەوەش گرینگتر ئامانجی کۆبوونەوەکەیە کە دەڵێ: «بۆ بەرەوپێــشبردنی ئامانجی هەر دوو ڕێکخراوەکە بڕیارمان داوە هاوکاری یــەکتر بکــەین» کــە ئــەو ئامانجەش ئازادی گەلی کورد و پێکهێنانی کوردستانی گەورەیە. هــەروەها لــەو

دانیشتن و کۆبوونەوەدا دوای ئامانجی هەرە گرینگی دوو لایەن (ئازادی گەلی کورد و پێکهێنانی کوردستانی گەورە) بڕیار دراوە کە کاتی پێوەندیگرتنی کۆمەڵەی هیوا بە دەوڵەتێکی دیکەوە پرس بە (ژ.ک) بکرێ. کە مەبەست لە کۆمەڵەی هیوایە کە ئەگەر پێوەندی بە دەوڵەتێکی دیکەوە بگرێ، کۆمەڵەی ژ.ک ئاگادار بکاتەوە. چونکە پێوەندی کۆمەڵەی ژ.ک بە دەوڵەتی رووسیاوە تا کاتی کۆبوونەوەی دووقۆڵی دوو کۆمەڵەکە بۆ کۆمەڵەی هیوا ئاشکرا و ئەوە کۆمەڵەی هیوا بووە کە کاتی پێوەندی گرتن بە دەوڵەتێکی دیکە (کە مەبەستیشی هەر ئینگلیسییەکان بووە) دەبوو بەپێی ئەو بڕیارە، کۆمەڵەی ژ.ک ئاگادار بکاتەوە. هەتا ئێستا هەموو نووسراوە و بابەتەکانی نێو ئەم نامەیە لەگەڵ دەقی «پەیمانی سێسنوور»ی بلاوکراوە لە نیشتماندا یەک دەگرنەوە.

لە بەشێک لە نامەکەدا هاتووە کە کۆمەڵەی هیوا بۆ پێوەندی لەگەڵ ئێمە دوو ئەندامی خۆی ناردبووە لای ئێمە، لە بەڵگەی نێو گۆڤاری نیشتمانیش دیتمان نوێنەرانی کۆمەڵەی هیوا دوو ئەندام بوون. نابێ بەهەڵەش بچین و بڵێین کە بەو حیسابە لە دەوروبەری مانگی سەرماوەزی ١٣٢٣ کۆبوونەوەکە پێکهاتووە، چونکە هەر لە دێڕەکانی سەرەتای نامەکەدا هاتووە: «دوو ئەندامی خۆیان ناردبووە لای ئێمە» کە وایە دیارە پێشتر ناردوویانە و نووسەری نامەکە، تازە هەواڵەکەی بۆ رووسەکان نووسیوە. لە بەشێکی دیکەی ژمارە (یەک)ی نامەکەدا هاتووە: بەرپرسی رێکخراوەکەمان لە هەولێر لەگەڵ بەڕێوەبەرەکانی کۆمەڵەی هیوا دانیشتووە و لە لایەن کۆمەڵەی ژ.ک داوایان لێکراوە بزانن بیرورای ئەوان (کۆمەڵەی هیوا) سەبارەت بە کۆبوونەوەکە چۆنە، کە نوێنەری کۆمەڵەی ژ.ک لە دوایین نامەی خۆیدا کە لە ١٧ی نۆوامبری ١٩٤٤ بۆ مەهابادی ناردۆتەوە نووسیویەتی کە لەگەڵ بەڕێوەبەرەکانی کۆمەڵەی هیوا دانیشتووین و دوای ئەو دانیشتنە و قسەکردن لە بابەتە جۆراوجۆرەکان بۆمان دەرکەوتووە کە ئەوان لایەنگری ئینگلیسییەکانن. ئەو بابەتە لەگەڵ شیکردنەوەکانی ئێمە و قسەکانی مامۆستا هەژار و دوکتور عەزیزی شەمزینی، تەواو یەک دەگرنەوە. ئەوەشمان بۆ ئاشکرا دەبێ کە ئەو لایەنگرییەش هەر

ئەویش زۆری هیوا بە یارمەتی ئینگلیسییەکان هەبووە کە گەلی کورد بە ئامانجەکانی خۆی بگەیەنێ و یارمەتی بدا. بەڵام لەسەر ئەوەشڕا دیارە هێشتا کۆمەڵەی ژ.ک و بەرپرسانی کۆمەڵەکە لە مەهاباد و لقەکانی لە کوردستانی عێراق، بێهیوا نەببوون و نوێنەرانی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە کوردستانی عێراق لە پاش نامەی ١٧ی نۆوامبری خۆیان، بەرپرسانی کۆمەڵەی (ژ.ک)یان لە مەهاباد بێهیوا نەکردووە و دەڵێن: [سەرەڕای ئەوەی گوتمان] بەڕێوەبەرانی کۆمەڵەی هیوا لە هەولێر بە لایەنگری ئینگلیسییەکان دەزانین [بەڵام دیسانیش] لە شارەکانی دیکەی کوردستانی عێراقیش ، لە لقەکانی دیکەی ڕێکخراوەکەمان پرسیار دەکەین.» لێرەدا بەندی یەکەمی نامەکە کۆتایی دێ. بەڵام شتێکی دیکەشمان بۆ دەردەکەوێ، ئەویش ئەوەیە کە هەتا کاتی نووسینی نامەکە، واتا ١٤ی سەرماوەزی ١٣٢٣ و لە پاش ویش دوایین نامەی بەرپرسی لقی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە هەولێر (١٧ی نۆوامبر - ٢٦ی خەزەڵوەر) هێشتا ‹بەڕەسمی› کۆمەڵەی هیوا سەبارەت بە پەسەندکردنی پێکهاتنی پەیمانی «سێسنوور»، ڕەزامەندی یا نارەزامەندی خۆی بە کۆمەڵەی (ژ.ک) ڕانەگەیاندۆتەوە کە ئەو بابەتەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە تا ئەو کات هێشتا بەڕەسمی کۆمەڵەی هیوا هەڵنەوەشابوو، چونکە وەکی پێشتر گوتمان لە مانگی شوباتی ١٩٤٤ کە دەکەوێتە نێوان دوو مانگی ڕێبەندان و ڕەشەمەی ١٣٢٣، کۆمەڵەی هیوا کۆنفرانسی گرت و باڵی چەپ و ڕاستی ئەم کۆمەڵە هەتا ئەوکاتی هێشتا لێک دانەبڕابوون کە ئەگەر بەو پێیە بێ، قسەکانی مامۆستا هەژار لەو جێیە کە دەڵێ: «هێشتا بەیانەکەمان بڵاو نەکردبۆوە کە خەبەریان داینێ کە حیزبی هیوا بەو پێکهاتنە رازی نییە و چاپی مەکەن» ناتوانین قەبووڵ بکەین، چونکە هەر وەک مامۆستا هەژار بۆخۆی دەڵێ مانگی جۆزەردان بوو کە دوو کۆمەڵەکە کۆبوونەوەکەیان پێک هێناوە و ئەوانیش (کۆمەڵەی ژ.ک) دەسبەجێ نوسخەی بەیانی خۆیانی چاپ کردووە، بەڵام بەپێی ئەو بەڵگەیە دەبینین کە هەتا ٢٦ی خەزەڵوەر هێشتا کۆمەڵەی ژ.ک ئەرخەیان نەبووە کە حیزبی هیوا بە پەیمانەکە رازی نییە، بێجگە لەوەش ئیمکاناتی هیچکام لە دوو کۆمەڵەکە بەو ڕادەیە نەبووە کە ئاوا زوو خەبەر و هەواڵێک بە یەکتر ڕابگەیەننەوە؛ کە وایە کۆمەڵەی

هیوا تا کاتی نووسینی نامەی مامۆستا زەبیحی بۆ کۆنسوولی رووسیە لە تەورێز، بیروڕای خۆی سەبارەت بە پەیمانەکە بە شێوەی رەسمی دەرنەبڕیوە و لە لایەکیش کۆمەڵەی (ژ.ک) هەتا گەیشتنی دوایین نامەی (١٧ی نۆوامبر) بەرپرسی لقی هەولێری کۆمەڵەکەیان هەر چاوەڕوانی وەڵامی «بەڵێ»ی کۆمەڵەی هیوا بووە و لەو بڕوایەدا بووە کە جارێ زووە کە بەو ئاکامە بگەن کە کۆمەڵەی هیوا رەزامەندی خۆی بەرامبەر بە بەند و خاڵەکانی پەیمانەکە دەرنەبڕیوە و پێی رازی نییە. ئەوەی مامۆستا هەژاریش دەڵێ: ئێمە دەسبەجێ نوسخەی «بەیان»ی خۆمان لە «نیشتمان»دا چاپ کرد، نابێتە بەڵگە کە بڵێین هەر ئەوکات (مانگی جۆزەردان) کۆمەڵەی هیوا وەڵامی دابێتەوە کە بە پەیمانەکە رازی نییە. چونکە وەکی پێشتر گوتمان هەتا ١٧ی نۆوامبری ١٩٤٤ کۆمەڵەی ژ.ک بێ‌هیوا نەببوو کە کۆمەڵەی هیوا بە پەیمانەکە رازی نییە. بەڵام رەنگە لە پاش ئەوەی کۆمەڵەی هیوا لە کاتی دیاریکراودا وەڵامی رەزامەندی یا نارەزامەندی خۆی بە کۆمەڵەی ژ.ک رانەگەیاندۆتەوە، بەرپرسانی کۆمەڵەی ژ.ک و گۆڤاری «نیشتمان» بڕیاریان دابێ لەبەر روون نەبوونەوە و ساغنەبوونەوەی بڕیاری کۆتایی هەیئەتی راوێژکاری کۆمەڵەی هیوا، گوتبێتیان جارێ با ئەو لاپەڕە لە گۆڤارەکە بدڕێنین؛ هەر کاتیش ئەوان رەزامەندی خۆیان دەربڕی، ئەو جار بە تێروتەسەلی لە گۆڤاری نیشتمان یا بڵاوکراوەیەکی دیکە یا بە شێوەی بەیاننامە بڵاوی دەکەینەوە.

پێشتر گوتمان کە ئەگەرچی رووسەکان لە زۆر بواردا لەمپەریان بۆ تێکۆشەرانی کۆمەڵەی ژ.ک داناوە، بەڵام بە روونی دژایەتییان لەگەڵ پەیمانی «سێ‌سنوور» و بڵاوکردنەوەی «بەیان»ەکەی کۆمەڵەی ژ.ک لە نێو گۆڤاری نیشتماندا نەکردووە. بەڵگەشمان لە جێی خۆیدا هێناوە کە چۆن گەیشتووینە سەر ئەو باوەڕە. بەندی یەکەمی ئەم بەڵگەی ئێستا باسی لێوە دەکەین ئەو بۆچوونەمان پشتڕاستتر دەکا و بە روونی بۆمان دەسەلمێنێ. چونکە ئەگەر لەمپەرێک لە بەرامبەر ئەم پێکهاتنە و بڵاوکردنەوەکەی لە گۆڕێدا با ئەوە لەو نامەی مامۆستا زەبیحیدا کە بۆ کۆنسوولی سۆڤیەت لە تەورێز نێردراوە، باسی

بەپێچەوانــەوە دەبیــنین زۆر بــەوردی بــیروڕای کۆمەڵــی هیــوا و نامــەکانی بەرپرسانی کۆمەڵەی ژ.ک لە هەولێر و ئامانج لە کۆبوونەوەکـە بـە راشـکاوی باسی لێکراوە.

ئەوەی ماوە لەو بەشەدا باسی بکـەین ئەوەیـە کـە بـە روونی نوێنـەری کوردەکانی تورکیا و سووریا بەشداری کۆبوونەوەکە نەبوون، چونکـە هـەم لـە «بەیان»ەکەی ناو گۆڤاری نیـشتمان و هـەم لـە نامـەی مامۆسـتا زەبیحـی بـۆ کۆنسوولی سۆڤیەت لە تەورێز، تەنیا ناوی دوو کۆمەڵە هاتووە و باسـێک لـە کۆمەڵە یا حیزبێکی کوردستانی تورکیا و سووریا نەکراوە.

٢- لە بەشی دووهەمی نامەکەدا نووسەر بەسیاسـەت نـاوی رێکخراوێکـی کۆمۆنیستی هێناوە کە «گۆڤاری نیشتمان»یان بەدەست گەیوە و داوای ئـەوەیان کردووە کە لەگەڵ کۆمەڵەی ژ.ک پەیوەندییان هەبێ کە بە بڕوای من ئەو بابەتـە بەئانقەست لەو نامەیەدا باسی کراوە و مەبەستی نووسەریش هەر ئەوە بووە کە لایەنگری و پشتیوانی رووسەکان بۆ ژ.ک وەدەست بێنێ. رەنگە مەبەستیـشی لـە بڵاوکراوە نهێنییەکەی ئەم رێکخراوەیە «ئازادی» یا «شۆڕش»بێ کـە پێـشتر بـە تێروتەسەلی لە سەری دواوین.

بە ئاوڕدانەوەیەک لە گۆڤاری «روانگە»ی ژمارە ١١، ئـەو بابەتـەمان زۆر باشتر بۆ روون دەبێتەوە کە چۆنە لەو نامەیەدا باسی حیزبێکی کۆمۆنیـست لـە باشووری کوردستان، بۆ کۆنـسوولی سۆڤـیەت نـاردراوە کـە بـە بـڕوای مـن بەئانقەست پێوەندی ژ.ک لەگەڵ «رێکخراوێکی کۆمۆنیستی» باسی لێکراوە. لـە لاپەڕە ٤٠ی ئەم گۆڤارەدا کاک «سـەید محەممـەدی سـەمەدی» لـە وەڵامـی ئـەم پرسیارە کە: لە ژمارەکانی سـەرەتای گۆڤـاری «نیـشتمان»دا دەبیـنین کـە زۆر تاریفی دەوڵەتی بریتانیا کراوە، لە ژمارەکانی دواتر بەسەر دەوڵەتی سۆڤیەتدا هەڵگوتراوە، هۆی ئەو وەرچەرخانانـە چ بـووە؟ نـاوبراو دەڵـێ: «ئـەمن ئـەو مەسەلەیە و چەن نموونەی دیکەی ئاوام دیت و پێم سەیر بـوو، هـەر بۆیـە لـە ئاغای «مودەڕڕیسی»م پرسیار کرد. ئەویش فەرمووی لە هەلومەرجی ئەودەمدا، رووس و ئینگلیس وەک دوو بەرداش وابوون و کوردیش وەک گەنم لە نێوانیاندا. جا بۆیە ئێمە ئەگەر تاریفێکمـان لـە یـەکیان دەکـرد، لـە ژمـارەی داهـاتوودا

قەرەبوومان دەکردەوە و باسی ئەوی دیکەمان دەکرد. بۆ ئەوەی کە ئەو دوو دەوڵەتە گەورە هیچیان وا نەزانن کە ئێمە سەر بە یەکێک لەوان و دوژمنی ئەوی تریانین و ئەگەر ئاوامان نەکردبا، گیروگرفتمان بۆ ساز دەبوو. ئامانجی ئێمە ئەوە بوو کە بڵێین ئێمە سەربەخۆین و سەر بە هیچ لایەنێک نین و لەگەڵ هەردوو لاش دۆستین.» نووسینی ئەو هەواڵەش بۆ کۆنسوولی رووسیا هەر بەو سیاسەتەوە بووە کە ئەوان وا تێبگەن کە کۆمەڵەی ژ.ک ئەگەریش بڕیار بێ پێوەندی بە حیزب و لایەنەکانی ئەودیوی کوردستانەوە هەبێ، ئەوە زۆرتر پێوەندی بەو حیزبانەوە دەگرێ کە بیروباوەڕی کۆمۆنیستییان هەیە؟! بەڵام بۆ گەیشتن بەو داواییانەی کە کۆمەڵە بۆی تێدەکۆشا، لەبنەوە بە هەرکەسێک و وڵاتێک و لایەنێکەوە پێوەندی دەکرا کە لایەنگری مافە رەواکانی گەلی کورد و ژ.ک بێ.

لە لاپەڕە ٢٦٨ی کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی»یشدا لە وەڵامی پرسیاری: «ئەوە چۆنە کە کۆمەڵەی ژ.ک هەم باسی بریتانیا ئەکا و هەم باسی لێنین و سۆڤیەت و... ئەکا، ئەو سیاسەتە چۆن ئەبینی؟» مامۆستا «ئیبراهیم ئەحمەد» دەڵێ: «ئەو سیاسەتە لە ناشارەزاییەوەیە. ئەو وەختە کە ئەوان لەگەڵ «هیوا» پێوەندیان پەیدا کرد، پێوەندێکەیان لەگەڵ بەشی «رەفیق حیلمی» بوو، بەشی «رەفیق حیلمی» سەر بە بریتانیا بوو، ئەوە ئەو بەشەی کە ئی وان بووە، کە مەقالەی دووهەمی نووسیوە ئی بەشەکەی ترە، ئەوان خەبەریان نەبوو لەو شتانە!»

لە وەڵامی ئەو پرسیارەشدا: «یانی ئەوان تەحتی تەئسیری کۆمەڵەی «هیوا» بوون؟» دەڵێ: «بەڵێ لەو سەردەمەدا کە باسی ئینگلیس ئەکەن! شتێکی کە، ئەمن «نیشتمان»م لە کوێ وەرگرت؟! من نیشتمانم لە زابتی ئیستخباراتی بریتانی لە سلەیمانی، لای ئەو دیت، لە پێش ئەوەی ئێمە بزانین کە ئێمە گۆیا مەسئوولی (ژ.ک)ین بزانین لەوێ بووا چونکا بۆ «هیوا»یان ناردبوو، «هیوا» لە رێی «رەفیق حیلمی»یەوە دابووی بە ئەوا ئێمە ئاگامان لێی نەبوو کە هەیە من ئێستە زۆر چاکم لەبیرە کە چووم دیم لای موتەسەرفی سلەیمانی دیم، «مەعرووف جەواد»، لای ئەو دیم. پاشان «بەهائەدین نووری» هات بوو بە

ئێران کە نەوەکا کوردی عێراقیش بیکا بە هەرا. هەندێک کوردایەتی تێکەڵ ببوو، ئەوە بوو زابیتە کوردەکانیان کردبوو بە مەسئوول لای «مەلا مستەفا» و نازانم چییان کردبوو و... خەریک بوون وەزع بگۆڕن بە نەوعێک. جا ئەوە بوو وای لە ژ.ک کرد کە جەریدەکە لای ئەو بێت. تەبعەن باسی بریتانیا دەکا وە ئەو رەئیە هەبوو لە ناو «هیوا»دا.

٣- لە بەشی سێهەم نووسەر باسی بەیاننامەی ژ.ک سەبارەت بە نەوتی باکووری ئێران دەکا کە گەیشتۆتە کوردستانی عێراق و لەوێش بلاو کراوەتەوە. ئەو بەیاننامە هەمان بەیاننامەیە کە لە لاپەڕە ٥٥١ی کتێبی «ئاوڕێک لە مێژووی مەهاباد»، نووسراوی کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» دا هاتووە. بەیاننامەکە بە رستەی «بژی کورد و کوردستانی گەورە!» دەستی پێکراوە. لە ژێر ئارمی تایبەتی ژ.کدا نووسراوە: «بە ناوی یەزدانی گەورە و بەرز - بەیاننامەی ژمارە ٣١٢ رۆژی دوویەمی خەزەڵوەری ١٣٢٣». لە کۆتایی بەیاننامەکەش دەڵێ: «کۆمەڵەی ژ.ک حکوومەتی یەکێتی سووەت (= سۆڤیەت) ئاگادار دەکا، ٩ میلیۆن نەتەوەی کورد بەتایبەتی کوردەکانی ئێران لە بڕیاری حکوومەتی ئێران دەربارەی نەدانی ئیمتیازی نەوتی باکوور [لە ئێوە] بێزراوە و بە هیچ بارێک موافەقەتی ئەم بیرەی حکوومەت ناکا. آ.ل.ب. هەیئەتی ناوەندی کۆمەڵەی ژ.ک. [وێنەی ژمارە ٣٢]

ئەو بەیاننامە رۆژی سێشەممە ٢ی خەزەڵوەری ١٣٢٣ بەرامبەر دەگەڵ ٢٤ی ئۆکتۆبری ١٩٤٤ چاپ و بلاو کراوەتەوە. کاک «حوسێنی مەدەنی» لە کتێبی «کوردستان و ئیستراتێژی دەوڵەتان» بەرگی دووهەم، لاپەڕە ٢٢٩ تا ٢٣١، باسی دەقی تێلگرافێکی کۆمەڵەی «ژ.ک»ی کردووە. کاک حوسێن ئەو وتارەی لە گۆڤاری «رابوون»ی ژمارە ٢٢ وەرگرتووە کە پێم وابێ کاک دوکتور «هەورامی» نووسیویەتی. تێلگرافەکە بە ئیمزای ٢١٣ کەس لە پیاوماقوولان و ناسراوەکانی کورد بۆ مەجلیسی شوورای میللی و رۆژنامەکانی تاران بەڕێکراوە. دەقی ئەو تێلگرافە لە رۆژی ١٠ی فێوریەی [سالی ١٩٤٣؟] (پێنجشەممە ٢٠ی رێبەندانی ١٣٢٢) لە میتینگێکی سێهەزار کەسی لە مەهاباد بۆ خەڵک و بەشداران خوێندراوەتەوە. رووی قسەکە زۆرتر لە دەوڵەتی «ساعید»ە و لە کۆتایی تێلگرافەکەدا هاتووە: «گەلی کورد باش دەزانێت کە ئەگەر ئیمتیازی نەوت بدرێتە

یەکێتی سۆڤیەت، کوردی هەژار دەتوانێ لەوێ کار بکا، زانیاری و شارەزایی بۆ وەدەست بهێنێ و لە باری کولتوورییەوە بەرەو پێش بچێت. کوردەکان باش دەزانن کە یەکێتی سۆڤیەت دۆستی هەرەنیزیکی گەلانی بچووکە و بۆ گەیشتن بە مافی خۆیان یارمەتییان دەدا. لەبەر ئەمە ئێمە بە ئەرکی خۆمانی دەزانین کە بە هەموو توانا و ڕێگایەکەوە لەم بارەوە یارمەتی و هەوڵ بدەین تاکوو دەوری یەکێتی سۆڤیەت لە ئێراندا زیاتر بەهێز بکرێت، لەبەر ئەوە بەهێزبوونی یەکێتی سۆڤیەت لە بەرژەوەندی ئێمەدایە. سڵاو بۆ نەبەزی یەکێتی سۆڤیەت - بژی کورد و کوردستان - نەمان بۆ «ساعید» و ساعیدییەکان.» مێژوو نیشانی دا کە دەڵەتی سۆڤیەت لە بەرامبەر ئەو پشتیوانییە گەورەی ژ.ک چ خزمەتێکی بەو کۆمەڵە و کورد و کوردستان کرد؟!

٤- بەشی چوارەمی نامەکە باسی نامەی ژمارە ٣٥١ی کۆمەڵەی ژ.ک دەکا کە داوای لە دەوڵەتی رووسیە کردووە «ناوەندی کولتووری» لە شارەکانی مەهاباد، بۆکان و نەغەدە و شنۆ بکرێتەوە. کاک «حامیدی گەوهەری» لە کتێبی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان» لاپەڕە ١٢٠ تا ١٢٢ باسی دامەزراندنی ئەو ناوەندەی کردووە و لە لاپەڕە ١٢٢دا دەڵێ: « ئەو ناوەندە بە ناوی «کۆمەڵەی پێوەندییە فەرهەنگییەکانی سۆڤیەت» ڕۆژی ٢٢ی گوڵانی ١٣٢٤ لە مەهاباد دامەزراوە و ئەفسەرێکی ئازەربایجانی بە ناوی «ماژۆر عەبدوڵلائۆڤ» کراوەتە لێپرسراوی ئەو بنکەیە.» پێویستە ئەوەش بڵێم، ڕێکەوتی ئەو داوایە کە لە بەرپرسانی ڕووسی داوا کراوە کە کۆمەڵەی پێوەندی رووس لە مەهاباد بکرێتەوە، دەگەڕێتەوە ڕۆژی ٢١ی بەفرانباری ١٣٢٣ - لە دووهەم دانیشتنیشدا مامۆستا زەبیحی و کاک قاسمی ئێلخانیزادە لە تەورێز چاویان کەوتووە بە «شەریفۆڤ» لێپرسراوی کۆمەڵەی فەرهەنگی سۆڤیەت لە ئازەربایجان و داواکەیان دووپات کردۆتەوە. ڕێکەوتی دانیشتنی دووهەمیش ڕۆژی ٢ی فێورییەی ١٩٤٥ بەرامبەر دەگەڵ ڕۆژی جومعە ١٣ی ڕێبەندانی ١٣٢٣ بووە. بەڵام لە لاپەڕە ١٢٧ و ١٢٨ی کتێبی «ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا» لە راپۆرتی ژمارە ٨ی - ١٩ی مانگی ئاپریل تا ١٦ی مەی ١٩٤٥دا هاتووە: «هەرچۆنێک بێ، راپۆرتەکان لەوەدا هاودەنگن کە «ئەنجومەنی ژ.ک» یا

هەیە. هەواڵدەرێکمان بنەمای ئەو توانایە دەگەڕێنێتەوە بۆ مەسەلەی کرانەوەی «ئەنجومەنی فەرهەنگیی ئێران و سۆڤیەت» لە نۆهەمی ئاپریل [ی ١٩٤٥، لە مەهاباد] نامەیەکی بانگهێشتن «بە فارسی و کوردی» چاپ کراوە و بۆ سەرەک هۆزە دوور و نیزیکەکان نێردراوە. جێگری کۆنسوولی رووس لە ورمێ میوانی فەخریی بانهێشتنەکە بووە.» رۆژی نۆهەمی ئاوریلی ١٩٤٥ بەرامبەر دەگەڵ رۆژی دووشەممە ٢٠ی خاکەلێوەی ١٣٢٤. بە ئاوڕدانەوەیەک لە گۆڤاری «هەڵاڵە»ی ژمارە ١ کە لە رەشەمەی ١٣٢٤ لە بۆکان دەرچووە، ئەو راستییەمان بۆ دەردەکەوێ کە ٢٠ی خاکەلێوەی ١٣٢٤ رۆژی کردنەوەی ئەو بنکەیە بووە. لە لاپەڕە ١٨ی ئەو گۆڤارەدا شێعرێکی مامۆستا هێمن لە ژێر ناوی «بەهاری زانین» چاپ کراوە کە لە سەرووی شێعرەکە نووسراوە: «بەبۆنەی کردنەوەی رەوابیتی فەرهەنگی لە مەهاباد خوێندراوەتەوە.» یەکەم بەیتیش بەمجۆرە دەست پێدەکا:

ئەوا هات مانگی خۆشی خاکەلێوە   نەما سەرما و بۆران و کڕێوە

لە کۆتاییشدا دەڵێ:

بژی مارشاڵ ستالین پێشەوای رووس   کە ئازادی لە گیتیدا بەشێوە

٥- لە بەشی کۆتایی نامەکەشدا باسی نامەی ژمارە ٣٤٧ی کۆمیتەی ناوەندی کۆمەڵەی ژ.ک کراوە کە لەودا هەواڵی گیرانی سێ ئەندامی کۆمەڵە لە شاری سەردەشت هاتووە کە لە لایەن سەرتیپ هووشمەندی ئەفشارەوە گیراون و یەکیان خەڵکی مەهابادە کە بەپێی ئەو نامەیە لەقسان بەو کەسە گیراوەی مەهابادیان گوتووە، چونکە لە مەهاباد نەوتی ئێران دەدەن بە سۆڤیەت و لە دژی دەوڵەتی ئێران قسە دەکەن، ئێمەش ئێوە لێرە لە زیندان دەکەین. کە بەو پێیە دەتوانین بڵێین ئەو رووداوە دوابەدوای بەیاننامەی ژمارە ٣١٢ی رۆژی ٢ی خەزەڵوەری ١٣٢٣ی کۆمەڵەی ژ.ک بووە کە لەودا باسی ئیمتیازی نەوتی باکووری ئێران بۆ سۆڤیەت کراوە، ئەو سێ کەسەش دوای دەرچوونی ئەو بەیاننامەیە لە سەردەشت گیراون. شیکردنەوەی ئەو بەڵگەش لێرەدا کۆتایی پێدێ، ئەگەر بمانەوێ بە تێکڕایی لەسەر ئەو ٥ برگەی بەڵگەکە بیروڕامان دەربڕین، دەتوانین بڵێین: هەموویان رێکەوتی رووداوەکانیان لەساڵی ١٣٢٣

(١٩٤٤)دا بووە. بەپێی مانگی ڕووداو و هەواڵەکانیش بێ پەیمانی «سێسنوور» لە هەمووان زووتر ڕووی داوە، هەر بۆیەشە کە لە یەکەم هەواڵی نامەکـەدا باسـی ئـەو پەیمانــە و هــاتنی نوێنــەرانی کۆمەڵــەی هیــوا کــراوە. ئەگــەر بــەپێی ڕوونکردنەوەی پێشووشمان بێ کە گوتمان لە مانگی جۆزەردانی ١٣٢٣ پەیمانەکە پێکهاتووە (چێشتی مجێور - مامۆستا هەژار) ئەوە لە جۆزەردان تـا خەزەڵـوەر (١٧ی نۆوامبر) کە دوایین نامەی لقــی ڕێکخــراوی کۆمەڵــەی (ژ.ک) لــە هــەولێر لەگەڵ هەیئەتی ناوەندی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە مەهاباد ئاڵوگۆڕی پێکراوە. مەودای جۆزەردان تا خەزەڵوەر پێنج مانگە، کە بە بڕوای من بە هۆی ئــەوەی پێوەنــدی گرتنی ئەو سەردەم لەگەڵ ئێستا جیاوازی زۆر بووە، وێدەچێ ئەو مەودایــە زۆر لە ڕاستی نیزیک بێ و مامۆستا هەژار بەدروستی ڕێکەوتەکەی تۆمار کردبێ. بـۆ نموونە بەیاننامەی ژمارە ٣١٢ی ژ.ک لــە ٢ی خەزەڵــوەری ١٣٢٣ چــاپ کــراوە، کەچی مانگێک و چەند ڕۆژ دواتر لە نامەکــەی ١٤ی ســەرماوەزی ١٣٢٣ هەواڵــی بڵاوبوونەوەکەی لە کوردستانی باشــوور، دراوە بــە کۆنــسوولی ڕووســیە لــە تەورێز، کەوایە بۆ مەسەلەیەکی گرینگی وەک پەیمانــی «سێسنوور» هــیچ دوور نییە نێوان ڕۆژی کۆبوونەوەکەی جۆزەردانی ١٣٢٣ی داڵانپەڕ هەتا دوایین نامەی لقــی ژ.ک لــە هــەولێر، بــە لەبــەرچاوگرتنی ناکۆکییــەکانی نێــو کۆمەڵــەی «هیوا»شەوە پێنج مانگ مەودا هەبێ. وەکی دەشــبینین دوای ٢٦ی خەزەڵــوەریش بەڵگەیەک لە دەستدا نییە کە باسێکی لە پێکهاتن یا پێکنەهاتنی دوو کۆمەڵەکە لەسەر پەیمانی «سێسنوور» کردبێ.

## ڕوونکردنەوەی ڕێکەوتی پێکهاتنی پەیمانی «سێسنوور»

لایەنێکی دیکە لەو پەیمانەدا کە پێویستە باشتر ڕوون بکرێتەوە، ڕێکەوتی پێکهاتنی پەیمانەکەیە. هەروەک پێشتر باسمان کــرد زۆربــەی نووســەران لــەو بڕوایەدان کە مانگی «ئووت»ی ساڵی ١٣٢٣ (١٩٤٤)کۆبوونەوەکە پێکهاتووە.

بۆ ئەوەی ئەو لایەنەش ڕوون بێتەوە پێویستە ئاوڕێکی دیکە لــە گۆڤــاری «نیشتمان»ی ژمارە ٧ و ٨ و ٩ بدەینەوە.

گۆڤاری «نیشتمان»ی ژمارە ٧ و ٨ و ٩ لە یەک بەرگدا بۆ سێ مانگی بەهار واتە (خاکەلێوە، بانەمەڕ و جۆزەردان)ی سالّی ١٣٢٣، (بەرامبەر دەگەلّ سێ مانگی ئاوریل و مەی و ژووئەن)ی سالّی ١٩٤٤ دەرچووە. بەپێی ئەوە کە ئەم گۆڤارە بۆ سێ مانگی وەرزی بەهار ئامادە کراوە و هەروەها بەپێی نووسینەکەی مامۆستا «هەژار»یش کە زۆر وێدەچێ بە دروستی تۆمار کرابێ، بەتایبەت ئەو جێیەی کە دەلّێ ئێمە دەسبەجێ نوسخەی بەیانی خۆمان لە «نیشتمان»دا چاپ کرد، دەتوانین بلّێین کە پەیمانەکە لە جۆزەردانی سالّی ١٣٢٣ پێکهاتووە.

ئەگەر بەپێی نووسینەکانی «ئیگلتۆن» و «مەک داول»بێ کە دەلّێن لە مانگی «ئووت» ئەو کۆبوونەوەیە لە «دالانپەڕ» پێکهاتووە، مانگی «ئووت، (ئاگۆست، ئاب)» دەکەوێتە نێوان دوو مانگی گەلاوێژ و خەرمانان. بەلاّم هەروەک دەزانین ئەو دوو مانگە دەکەونە نێو دوو مانگی کۆتایی وەرزی هاوین کە ئەوە لەگەلّ سەردێڕی نووسراوەکەی ژمارەی کۆتایی گۆڤاری «نیشتمان» یەکتر ناگرنەوە، چونکە گۆڤاری «نیشتمان»ی ٧و٨و٩ بۆ سێ مانگی سەرەتای وەرزی بەهار ئامادە کراوە. ئەگەر بە حیسابی «ئیگلتۆن» و «مەکداول»یش بێ، دوو هەتا دوو مانگونیو دواتر ئەو رێککەوتنە پێکهاتووە و ئیمزا کراوە کە ئەو بۆچوونە جیاوازییەکی زۆری لەگەلّ کاتی پێکهاتنی پەیمانەکەوە هەیە. لەوەش گرینگتر ئەوەیە کە چاپی هیچکام لە ژمارەکانی گۆڤاری «نیشتمان» وەدرەنگی نەکەوتوون و لە کاتی خۆیدا بلاو کراونەتەوە، ئەگەریش وەدرەنگی کەوتبن، دوو مانگ وەپاش نەکەوتوون و ئەوەندەیان مەودا نەبووە.

مامۆستا «زەبیحی» بەرپرس و سەرنووسەری گۆڤاری «نیشتمان» بووە و هەموو ژمارەکانی «نیشتمان»ی لە تەورێز چاپ کردووە. ئەوانەی لە نیزیکەوە ئاگاداری چۆنیەتی چاپکردنی «نیشتمان» بوون، دەلّێن جاری وا هەبووە مامۆستا «زەبیحی» چەند رۆژ لە سەریەک خەریکی نووسینی بووە و تەنانەت بۆ یەک سەعاتیش نەهاتۆتە دەرێ و هەر خەریکی وتارنووسین و کاری چاپەمەنی بووە. هەروەک پێشتر گوتمان تەنانەت زۆربەی هەرەزۆری وتارەکانی بە قەلّەمی خۆی دەنووسی و ژمارە ئەندامەتی و ناوی نهێنی ئەندامێکی دیکەی لەسەر دەنووسی. جا هەر لەبەر ئەوە دەتوانین بلّێین ئەو ژمارەی گۆڤاری «نیشتمان» کە

بڕیار بووە بۆ سێ مانگی وەرزی بەهار ئامادە بکرێ، بە روونی لە لایەن مامۆستا «زەبیحی» پێشتر کاری بۆ کراوە و گەڵاڵەی بۆ داڕێژراوە کە کاتی خۆی بگاتە دەستی خوێنەرانی، هەر بۆیە هیچ وێناچێ دەرچوونی ژمارەی (٧ و ٨ و ٩)ی «نیشتمان» هەتا مانگی «ئووت» (واتا گەلاوێژ و خەرمانان) وەدوا کەوتبێ. ئەگەر دایبنێین قسەی «ئیگلتۆن و مەکداوڵ»یش دروست بێ و پەیمانی «سێسنوور» لە مانگی «ئووت»ی ساڵی ١٩٤٤دا پێکهاتبێ، ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ کە چۆن دەکرێ پەیمانێک کە لە مانگی «ئووت» پێکهاتووە، هەواڵەکەی لە گۆڤارێکدا بڵاو بکرێتەوە کە دوو مانگ بەر لە مانگی «ئووت» ئامادە کراوە، کە دیارە ئەوەش دوورە لە راستی. ئەگەر چاپی نیشتمان ئەوەندەش وەپاش کەوتبێ چونکە تا کاتی وەلانانی مامۆستا زەبیحی و چاپی ئەو ١٢ لاپەڕەیە هەر خودی ناوبراو بەرپرسی ئەم گۆڤارە بووە، بێونەبێ هۆشی ئەوەندەشی هەبووە کە ئەو وتارەی لە گۆڤارەکەیدا چاپی دەکا پێویستە بەپێی رێکەوتی پەیمانەکە ئامادە بکرێ یان هەر نەبێ لە عینوانی رووبەرگی گۆڤارەکە کارێکی وا بکا کە رێکەوتی پێکهاتنەکە دەگەڵ مانگی دەرچوونی گۆڤارەکە هەماهەنگییان هەبێ و یەکتر بگرنەوە.

## لێکدانەوەی رۆژی کۆبوونەوەکە بەپێی قسەکانی مامۆستا هەژار

ئەگەر بێتوو قسەکانی مامۆستا «هەژار» بکەینە بنەمای ئەم بەشە لە لێکۆڵینەوەکەمان، ئەوە دەتوانین بەو لێکدانەوەی خوارەوە پتر لە راستی و دروستی رێکەوتی کۆبوونەوەی دوو لایەنی کۆمەڵەکە نیزیک ببینەوە.

مامۆستا هەژار دەڵێ: «مانگی جۆزەردان بوو و دروێنەی جۆ دەستی پێکردبوو.» (بەکورتی) - تا مەرگەوەڕ بە سواری ماشێن و فایتۆن دەڕۆن و دەگەنە گوندی «باڵانیش». لە وێ ماشێنەکەیان بەجێ دەهێڵن و دەچنە گوندی «کۆکی»، لە وێش نامێننەوە و شەوێ دەچنە گوندی «قاسملوو». بەیانی لە گوندی «قاسملوو»ڕا وەڕێدەکەون و بۆ نیوەڕۆ دەچنە لای عەبدولقادری کوڕی شێخ

«دزەی مەرگەوەڕ». لەوێ کۆبوونەوەکە دەس پێدەکا. مامۆستا هەژار لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «دوای حەوت شەو لە دزە، بە ڕێگەی شنۆدا گەڕاینەوە، لە شنۆ بە پێ هاتینە نەغەدە و لە نەغەدەوە بە سواری ترۆمبێلێکی سینەمای ئینگلیسییان کە دەهاتە سابلاغ، هاتینەوە...». ئەگەر بەپێی ئەو قسانەی مامۆستا هەژار بێ، دەڵێین هەر گریمان لە یەکی جۆزەردان هەواڵیان پێدرابێ کە نوێنەرەکانی کۆمەڵەی هیوا هاتبێن و ئامادەبوونی خۆیان بۆ کۆبوونەوەکە ڕاگەیاندبێ. ئەوکات نوێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ک وەڕێکەوتبێن و ڕۆژێکیان پێچووبێ و چووبێتنە «بالانیش»، شەوێکیش لە گوندی «قاسملوو» مابێتنەوە، بۆ سبەینێ چووبنە ڕەشماڵی ماڵی شێخ لە دزەی مەرگەوەڕ و دوای حەوت ڕۆژ لە دزەوە گەڕابێنەوە سابلاغ، بەو حیساب و لێکدانەوەیە تا ئەو کات دەبێ نۆ ڕۆژ لە جۆزەردان تێپەڕ بووبێ. پاشان دەڵێ: «ئێمە دەسبەجێ نوسخەی «بەیان»ی خۆمان لە «نیشتمان»دا چاپ کرد». لە ئەسڵی «بەیان»ەکەی گۆڤاری نیشتماندا هاتووە کە سێ ڕۆژ وتووێژیان کردووە. وەکی هەموومان دەزانین نیشتمان لە تەورێز چاپ دەکرا، ڕۆژێک بە هاتنەوە و ڕۆژێک بە چوون بۆ تەورێز (تازە ئەگەر هیچ مەحتەل نەبووبن) ڕۆژێکیش بۆ ئامادە و چاپکردنی هەواڵەکە، کە ئەوانەش لانی کەم سێ ڕۆژیان پێچووە، ئەو سێ ڕۆژە لەگەڵ نۆ ڕۆژی پێشوو دەکاتە دوازدە ڕۆژ. دوو ڕۆژیش بە هێنانەوەی گۆڤارەکە و بلاوکردنەوەی لە مەهاباد، تا ئێرە نیزیک چاردە ڕۆژ لە مانگی جۆزەردان تێپەڕ بووە و تازە هەواڵەکە چاپ بووە کە ئەگەر بەو حیساب و لێکدانەوە بێ، ڕێکەوتی کۆبوونەوەکە دەکەوێتە مانگی ژووئەنی ١٩٤٤. تازە ئەوە بەپێی لێکدانەوەی ئێمە بوو لە سەر ئەو ئەساسە کە لە یەکی خەزەڵوەرەوە، هەواڵی هاتنی نوێنەرەکان و دانیشتنەکەیان دەستی پێکردبێ کە ڕەنگە واش نەبووبێ و لە نیوەی دووهەمی جۆزەردانەوە هەواڵیان پێدرابێ. بەڵام چ بە لێکدانەوەی پێشوو و چ بە پێی لێکدانەوەکەی ئێستامان بێ (لە نیوەی دووهەمی جۆزەردان هاتبن)، ساغکردنەوەی ڕۆژی هەر دوو لێکدانەوە دەکەوێتە دوو حەوتووی یەکەمی مانگی جۆزەردان کە ئەویش بەرامبەرە دەگەڵ مانگی ژووئەنی ١٩٤٤. هەرچۆنێکی بێ لە کۆتایی ئەو لێکۆڵینەوەمان دەکرێ بڵێین ئەگەر بنەمای ئەم

بەشە لە لێکۆڵینەوەکەمان لە سەر قسەکانی مامۆستا هەژار بێ، ئەوە بە بۆچوونێکی یەکجار نیزیک لە راستی، دەتوانین بڵێین کە پەیمانی «سێسنوور» لە دوو حەوتووی سەرەتای مانگی جۆزەردانی ١٣٢٣ (ژووئەنی ١٩٤٤) پێکهاتووە.

## ئامانج لە کۆبوونەوەکەی داڵانپەڕ

تەنیا شتێکی ماوە بە روونی دیاری بکرێ، ئامانجی کۆبوونەوەکەیە کە ئەویش بەپێی هەر دوو بەڵگەی «نیشتمان» و «نامەی مامۆستا زەبیحی بۆ کۆنسوولی رووسیە لە تەورێز»، روون دەکەینەوە. مامۆستا زەبیحی لە وتاری «لە ناو کۆمەڵەدا» کە وەک «بەیان»ی کۆمەڵەی ژ.ک سەبارەت بە پەیمانی «سێسنوور» لە گۆڤاری «نیشتمان»دا چاپ کراوە، نووسیویەتی و دەڵێ: «پەیمانی سێسنوور لە لایەن نوێنەرانی هەر دوو لا (ژ.ک و هیوا) بۆ زیادکردنی کۆششت و ئیجادی پێوەندێکی وەسیعی سیاسی ئیمزا کرا.» یەکێک لە گەورەترین ئامانجەکانی دوو کۆمەڵەی ناوبراو دامەزراندنی «کوردستانی گەورە» بووە. هەر بۆیە لە بەڵگەکەشدا ئەو پەیمانە بەو جۆرە باسی لێکراوە: «ئەم کۆنفڕانسە گرینگە بێگومان لە دواییدا دەبێتە فەسڵێکی گەورە دە مێژووی فەعالییەت و کۆششتی دوو کۆمەڵەدا.» لە نامەی ١٤ی سەرماوەزیشدا دیسان مامۆستا زەبیحی وەک بەرپرسی بەشی راگەیاندنی کۆمەڵەی ژ.ک دەڵێ: «ئێمە بڕیارمان دا بۆ بەرەو پێش بردنی ئامانجی هەر دوو رێکخراوەکە (ئازادی گەلی کورد) هاوکاری بکەین و کاتی پێوەندی گرتن لەگەڵ دەوڵەتێکی دیکە [بەرپرسانی کۆمەڵەی هیوا] پرسمان پێبکەن.» لە تاووتوێ کردن و لێکدانەوەی هەر دوو بەڵگەدا دەتوانین بڵێن: پەیمانی سێسنوور لە لایەن نوێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ک و کۆمەڵەی هیوا بە مەبەستی پێوەندی بەربلاو و پەرەپێدانی هەوڵەکانی هەر دوو لا بۆ بەرەو پێش بردن و وەدیهێنانی ئاوات و ئامانجەکانی هاوبەش، واتا (ئازادی گەلی کورد و پێکهێنانی کوردستانی گەورە) پێکهاتووە. واش وێدەچێ کە هەردوو لا بۆ گەیشتن

نەبووبێ. بەڵام بەپێی ئەو هەلومەرجەی لەو سەردەمیدا بۆ کوردی بەشی ڕۆژهەڵات ڕەخسابوو کە ڕووسەکان یارمەتی کوردەکانی ئەم ناوچەیە بدەن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان؛ ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ک خاڵێکیان لە پەیمانەکە زیاد کردووە کە ئەویش ئەوەیە ئەگەر هات و لە پێناوی گەیشتن بەو ئامانجانەی لە سەری ڕێککەوتووین (ئازادی گەلی کورد)، کۆمەڵەی هیوا پێوەندی دەگەڵ دەوڵەتێکی دیکە گرت (کە بە ڕوونی مەبەستی نوێنەرانی ژ.ک لەو دەوڵەتە هەر ئینگلیس بووە) ئەوە پرس بە کۆمەڵەی ژ.ک بکەن. چونکە مەبەست و ئامانجەکانی درێژخایەنی هەر دوو کۆمەڵە هەر وەک لە هەموو نووسراوە و بڵاوکراوەکانڕا دیارە، خەبات بۆ وەدیهێنانی کوردستانێکی گەورە بووە، جا گرینگ نییە وەدیهێنانەکەی بە یارمەتی ڕووسەکان بێ یا ئینگلیسییەکان.

## پوختە و ئاکامی پەیمانی «سێسنوور»

بە لەبەرچاوگرتنی تەواوی ئەو شیکردنەوانەی لەو وتارەدا هاتوون، پەیمانی «سێسنوور» بە خوێنەرانی بەڕێز دەناسێنین:

ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٢١ (١٦ی ئابی ١٩٤٢) کۆمەڵەی (ژ.ک) دامەزرا. یەکێک لە بەشدارانی ئەو کۆمەڵەیە «میرحاج ئەحمەد» کوردێکی خەڵکی کوردستانی باشوور بووە کە بۆخۆی ئەندامی کۆمەڵەیەک بە ناوی «کۆمەڵەی هیوا» بوو. نفووز و ناوبانگی کۆمەڵەی (ژ.ک) زۆر زوو هەموو کوردستانی تەنیوەتەوە و لە زۆربەی شار و گوندەکانی کوردستانی ئێران و عێراق ئەندامی وەرگرتووە. لە کوردستانی باشووریش چەندین لقی کردۆتەوە و زۆربەی تێکۆشەران و پیاوە سیاسییەکانی لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە. ئەندامانی هەر دوو کۆمەڵە بە مەبەستی پتەوکردنی پێوەندییەکان و سەبارەت بە ئامانجە هاوبەشەکانیان نێوەنێوە هاتوچۆی یەکتریان کردووە و هەر بەو هەستەوە لە لایەن کۆمەڵەی (ژ.ک) کاک «محەممەدئەمینی شەڕەفی» دیاری دەکرێ بچێتە لای بەرپرسانی «هیوا» لە کەرکووک. ئەوکات بنکەی سەرەکی کۆمەڵەی «هیوا» لە کەرکووک بووە و مامۆستا «ڕەفیق حیلمی» سەرۆکی کۆمەڵەکە بووە و لە وێ نێردراوی کۆمەڵەی ژ.ک چاوی بە بەرپرسانی کۆمەڵەی

هیوا دەکەوێ. هەر دوابەدوای ئەم سەردانە ئەنـدامانی کۆمەڵـەی «هیـوا» چەنـد جاران سـەردانی مـەهابادیان کـردووە و لەگـەڵ بەرپرسـانی کۆمەڵـەی (ژ.ک) وتووێژیان پێکهێنـاوە. بـەو چەشـنە بناغـەی هاوکـاری نێـوان دوو کۆمەڵـە دادەندرێ. دوو لایەن بە مەبەستی هاوئاهـەنگی لـە تێکۆشـان و چالاکییـەکان و لەسەر بناغـە و ئەساسـی ئامـانجی هاوبـەش و بـۆ پەرەپێـدان و زیـادکردنی تێکۆشـان و دامەزرانـدنی پێوەندییـەکی بـەربلاوی سیاسـی بـڕیاریان داوە، کۆنفڕانسێک و پەیمانێک پێکبێنن.

بۆ ئەم مەبەستە ‹لەسەر داوای کۆمەڵەی (ژ.ک)› بڕیار دەدرێ لە ماوەیەکی کورتدا ئەو کۆنفڕانسە پێکبێ. هەر بۆیە کاتێک کۆمەڵەی «هیوا» ئامـادەبوونی خۆی دەربڕیوە، کۆمەڵەی (ژ.ک) بە هۆی رابیتی خۆی (واتە رابیتی دوو کۆمەڵە) ئاگادار دەکرێتەوە کە کۆمەڵەی ناوبراو ئامادەیی خۆی راگەیاندووە. دەگەڵـکوو نوێنەرانی کۆمەڵەی «هیوا» هاتوونەتە شوێنی مەبەست، نوێنـەرانی کۆمەڵـەی (ژ.ک)یش رۆیشتوونەتە شـوێنی گفتوگـۆ و دەسـتیان بـە وتووێـژ کـردووە و وتووێژەکان لە شوێنێک بە ناوی «دالانپەڕ» پێکهاتووە.

«دالانپەڕ» ناوی زنجیرەچیایەکە لە رۆژهەلاتی کوردسـتان کـە بـە هـۆی ئەوەی لایەکی لە رۆژهەلاتی کوردستان و لایـەکی لـە ناوچـەی «شـەمزینان»ی کوردستانی باکوور و لایەکەی دیکەشی لە باشووری کوردستان هەڵکەوتووە، بە «سێسنوور» ناوبانگی دەرکردووە. دەڵێن «دالانپەڕ» شـوێنێکی ئاسـتەم و چـڕ و هەڵەمووتە، کاتێ داڵ (هەڵۆ) بە سەر ئـەو شـوێنەدا تێپـەڕ دەبـێ، پەڕوباڵـی دەوەرێ، بۆیە ناویان ناوە «دالانپەڕ». کۆبوونەوەکە لە ناوەڕاسـت یـا کۆتـایی مـانگی جـۆزەردانی ساڵـی ١٣٢٣ (مـەی و ژووەنی ساڵـی ١٩٤٤) پێکهـاتووە. بەگوێرەی نووسینەکانی مامۆستا «هەژار»، کاتی کۆبوونەوەکە دەکەوێتە نیوەی ئەووەڵی مانگی جۆزەردان کە ئەویش بەرامبەرە دەگەڵ مانگی ژووئەن (جـوون)ی ساڵی ١٩٤٤. نوێنەرانی کۆمەڵەی «هیوا» لەو کۆبوونەوەدا بریتی بـوون لـە دوو ئەندام:

«سەید عەزیزی شەمزینی» (=دوکتور سـەید عـەزیزی گـەیلانی یـا ئـالی گەیلانیان) و «شێخ عوبەیدیللای کەمالی» (=شێخ عوبەیدیللای زینوێ).

«کاک قاسمی قادری قازی»، «کاک عەبدوڕڕەحمانی شەرەفکەندی» (مامۆستا هەژار)، «کاک عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی».

لە نێو ئەو چەند کەسە کاک «قاسمی قادری قازی» بە هۆی بەتەمەنبوونی، بە سەرۆکی نوێنەرانی هەردوو لا هەڵبژێردراوە. هەموو کار و ئەرکەکانی هەماهەنگی و ئامادەکاری ئەو کۆبوونەوە و پێوەندییەکانی تری نێوان دوو کۆمەڵەی «ژ.ک» و «هیوا»، بە یارمەتی و ئازایەتی و ماندوویی‌نەناسی و تێکۆشانی لە رادەبەدەری تەتەر و رابیتی (ژ.ک)، کاک «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی»یەوە پێکهاتووە.

کۆبوونەوەکە بۆ ماوەی سێ رۆژ قسەی لەسەر کراوە و لەسەر داوای نوێنەرانی کۆمەڵەی (ژ.ک) پێکهاتووە. شوێنی کۆبوونەوەکە بە هۆی هاوسنووری دەگەڵ سێ وڵاتی ئێران، تورکیا و عێراق بە «سێسنوور» و پەیمانەکەش هەر بەو ناوە ناوبانگی دەرکردووە.

پەیمانەکە بەپێی نووسینەکانی مامۆستا «هەژار» لە ١٢ خاڵ پێکهاتبوو. «پەیمانی «سێسنوور» زۆر زوو لە لایەن هەیئەتی راوێژکاری ئیدارەی ناوەندی کۆمەڵەی (ژ.ک) پەسند کراوە. بڕیار وابووە لە دوای پەسند کردنی نوسخەی ناوچەی کۆمەڵەی «هیوا»، نوسخەی هەردوو لا ئاڵوگۆڕی پێبکرێ.

بەندێک لە پێکهاتنەکە دەڵێ: «ئەگەر ئینگلیس لە عێراق مافی کوردەکانی ئەو پارچەیە بدەن، کوردەکانی ئەو ناوچەیە نابێ لە بیر بکرێن.» لە پەیمانی «سێسنوور» هەموو کوردستان بە یەک وڵات داندراوە و تەواوی تێکۆشانەکان لە پێناوی یەکخستنەوەی ئەو بەشە لێکدابڕاوانەی کوردستان بووە. دەگەڵ هاتنی لەشکری سۆڤیەت بۆ ئێران، کۆمەڵەی (ژ.ک) پێوەندی دەگەڵ بەرپرسانی ئەو دەوڵەتە دەگرێ و یارمەتی لێدەخوازێ. ئەگەرچی سەرەتا وەڵامێکی وایان لە لایەن بەرپرسانی ئەم دەوڵەتە نادرێتەوە، بەڵام ئەوانیش کاتێک نفووز و هێزی مەعنەوی کۆمەڵەی (ژ.ک) هەست پێدەکەن، دەس دەکەن بە پێوەندی و هاوکاری و یارمەتیدان بەو کۆمەڵەیە، هەر بۆیە کوردەکانی بەشی رۆژهەڵاتیش بەپێی پەیمانی «سێسنوور»، بە مەرجی رزگاربوونیان، یارمەتی‌دانی پارچەکانی دیکەیان بە ئەرکی سەر شانی خۆیان زانیوە.

سەرۆکی ئەوکاتی کۆمەڵـەی «هیـوا» مامۆسـتا «رەفیـق حیلمـی» بـووە. سەبارەت بە چۆنیەتی چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی کە ئایا کورد دەبێ پشتی بە کام کامپ ببەستێ (سۆڤیەت، ئینگلیس یا رۆژئاوا؟) و کام یەک لەوانـە پشتگیری لە گەلی کورد دەکەن تا بە مافەکانی خۆی بگا و بـە هـۆی بۆچـوونی جیاواز لەسەر ئەو بابەتە و چەند بابەتێکی دیکە ناکۆکی کەوتۆتـە نـاو ریـزی حیزبی «هیوا». مامۆستا «رەفیق حیلمی» هەم سەرۆکی کۆمەڵەی «هیـوا» و هـەم سەرۆکی باسکی راستی کۆمەڵەی ناوبراو بووە، هەموو هەوڵەکانی بۆ داکوتانی رەگی پێوەندی نێوان کۆمەڵەی «هیوا» و ئینگلیس بووە، مامۆستا رەفیق حیلمـی «باڵی راستی کۆمەڵەی هیوا» و لایەنگرانی پێیان وابوو کە کورد نابێ پـشت بـە یارمەتییەکانی سۆڤیەت ببەستێ، چونکە ئەو دەوڵـەتە لـە کوردسـتان دوورە و ناتوانێ بەپەلە یارمەتی گەلی کورد بدا. مامۆستا «رەفیق حیلمی» و لایـەنگرانی لەو بڕوایەدا بوون تەنانەت یارمەتی جووڵانەوەی «بارزان»یش نەدرێ، چونکـە یارمەتی ئەوان دەبێتە مایەی تووڕەبوونی ئینگلیسییەکان، چونکە جووڵانـەوەی بارزانیش دژی ئینگلیسییەکان بوو. بـەڵام باڵـی چـەپ تـەواو بـە پێچەوانـەی بیروڕای مامۆستا رەفیـق حیلمـی و باڵـی راسـت دەجـووڵاوە. ئـەو دژایـەتی و ناکۆکییانە لە مانگی شوباتی ١٩٤٤ بە جودا بوونەوەی ئەو دوو لایەنە یەکلا بۆوە و باسکی راست و مامۆستا رەفیق حیلمی سەردەمێک بـە نـاوی کۆمەڵـەی هیـوا کاریان کرد؛ بەڵام چی پێنەچوو ئەویش بە یەکجاری لێکهەڵوەشا.

بەشێکی ئەندامانی باڵی چەپیش بۆ ماوەیەک چوونە نێـو ریـزی تـاقمی (ئەلقاعیدە)ی حیزبی کۆمۆنیستی عێراقەوە. بەشێکی تر چوونە نێو ریـزی لقـی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە باشووری کوردستان و ئەوانەی مانەوەش چوونە ریزی تاقمی (وەحدە ئەننیزال»ی کۆمۆنیـستەوە و بـە نـاوی «یـەکێتی تێکۆشـین» لقێکیـان دامەزراند. پاشان ئەندامانی کوردی تاقمی (وەحدە ئـەننیزال) بـە جـودا حیـزبی کۆمۆنیستی کوردستانی عێراق (حیزبی شـۆڕش)یـان دامەزرانـد و لـە حیـزبی کۆمۆنیستی عێراق جودا بوونەوە.

لەو نێوەدا حیزبی (شۆڕش) بە پێچەوانەی باڵی راستی حیزبی هیوا،

لە ١٦ی ئاب (گەلاوێژ)ی ١٩٤٦ بە مەبەستی کۆنگرەی یەکەمی پارتی دێموکراتی کوردستان، حیزبەکەی خۆی هەڵوەشاندەوە و «پارتی دیموکرات» دامەزرا.

«حیزبی رزگاری»ش کە لە کۆتایی سالی ١٩٤٤ و سەرەتای سالی ١٩٤٥ پێکهاتبوو بە دەسپێشخەری لایەنە پێشکەوتنخوازەکانی حیزبی هەڵوەشاوەی هیوا و هەموو هێزە نیشتمانی و تاقمە سیاسییە پێشکەوتنخوازەکانی کوردستانی عێراق ریزی بەرەی نیشتمانی یەکگرتووی کوردی عێراقی بە ناوی «حیزبی رزگاری کورد»ی دامەزراند و ئەو حیزبەش وێرای «حیزبی شۆڕش» لە کۆنفرانسی ١٦ی ئابی ١٩٤٦ هەڵوەشانەوەی خۆی راگەیاند و بەو جۆرە نەخش و ئەرکی مێژوویی حیزبی هیوا و حیزبەکانی دوای ئەو کۆتایی هات و «پارتی دێموکراتی کوردستان» دامەزرا. لەو ماوەیەدا ئەوەی بە وردی چاوەڕوانی ئاکامەکانی ئەو بارودۆخەی دەکرد، کۆمەڵەی ژ.ک بوو.

روون‌نەبوونەوەی بەیەکجاری کۆمەڵەی هیوا بەتایبەتی لە سەر ئامانجە هاوبەشەکانی دەگەڵ کۆمەڵەی (ژ.ک) لەسەر چۆنیەتی کارکردن بۆ دامەزراندنی «کوردستانی گەورە» لە لایەک و ئاکامی پەسەندکردن یا نەکردنی کۆبوونەوەی «سێ‌سنوور» لە لایەکی دیکەوە، کۆمەڵەی (ژ.ک)ی هەتا کۆتایی مانگی خەزەڵوەری ١٣٢٣ (نۆوامبری ١٩٤٤) و بگرە چەند مانگ ئەولاتریش لە چاوەڕوانیدا هێشتەوە.

ئەگەرچی باڵی راستی کۆمەڵەی هیوا لەو بڕوایەدا بوو ئینگلیس لە گەیشتن بە ئاواتەکانی یارمەتی کورد دەدا، بە کردەوە هەڵوەشا و باڵی چەپی ئەو کۆمەڵەیە کە لەگەڵ هەلومەرجی ئەوکاتی کۆمەڵەی ژ.ک تەواو هاوئاهەنگ و هاوبیر بوو، لە حیزبی هیوا جودا بۆوە. بەلام بە هۆی ئەوەی باڵی چەپ ماوەیەک لەگەڵ حیزبی کۆمۆنیستی عێراق بوو و سەربەخۆ و ئازاد کاری نەدەکرد، لە هیچ لایەنێکی ئەم کۆمەڵەیە وەلامی «بەڵێ» بۆ کۆنفرانس و کۆبوونەوەی «سێ‌سنوور» بە بەرپرسانی کۆمەڵەی ژ.ک نەدرایەوە، هەر بۆیە دەتوانین بڵێین پەیمانی «سێ‌سنوور» لە لایەن هەیئەتی راوێژکاری ئیدارەی ناوەندی کۆمەڵەی «هیوا» پەسند نەکرا و بەم چەشنە پەیمانەکە بە کردەوە لە وەدیهێنانی ئامانجەکانی دوور کەوتەوە و جێبەجێ نەکرا، بەلام رەتکردنەوە یا پاشگەزبوونەوە لەو پەیمانە لە لایەن کۆمەڵەی «هیوا»، نەبوو بە هۆی

هەڵبڕانی پێوەندییەکانی داهاتووی کۆمەڵەی (ژ.ک) لەگەڵ حیزب و لایەنە کوردەکانی ئەودیو و پێوەندی هەر بەردەوام بووە.

بەردەوامی لە وتوویژ و دانیشتن و کۆبوونەوەی نوێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ک لەگەڵ بەرپرسان و بەڕێوەبەرانی کۆمەڵەی هیوا لە هەموو شارەکانی کوردستانی عێراق و چاوەدێری وردی بارودۆخی ناوچە و وەرگرتنی زانیاری لەسەر خەبات و گۆڕانکارییەکانی ناوچە و پێوەندی لەگەڵ سەرۆک و ئەندامانی حیزبە پێشکەوتنخوازەکانی کورد و بزووتنەوەی بارزان، هەروەها پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵی «خۆیبوون» و ناردنی نوێنەر بۆ پێوەندی لەگەڵ کوردەکانی تورکیا و سووریا، ئەو راستییانە دەسەلمێنێ کە ئەگەرچی کۆمەڵەی ژ.ک لە وەلامی کۆمەڵەی هیوا سەبارەت بە پەیمانی سێسنوور بێهیوا بووە، بەڵام ئەوە نەبۆتە مایەی هەڵبڕانی پێوەندی قووڵ و لەمێژینەی ‹رابردووی› لەگەڵ ئەو حیزب و لایەنانەی کە پێشتر پێوەندییان پێوە کرابوو. نامەی مانگی خەزەڵوەری ١٣٢٢ (ئۆکتۆبری١٩٤٣)ی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەی ژ.ک لە مەهاباد، بۆ «مەلا مستەفا بارزانی» بەڵگەیەکی دیکەیە بۆ سەلماندنی ئەو راستییەی کە ئەو کۆمەڵەیە بەر لە پەیمانی سێ سنوور و دوای ئەو پەیمانەش هەموو هەوڵەکانی بۆ پتەوکردنی پێوەندی نێوان پارچە دابڕاوەکانی کوردستان بووە.

## چاپەمەنییە کوردییەکانی سەردەمی کۆمەڵەی ژ.ک

بۆ ئەوەی وتاری پەیمانی سێسنوور دەوڵەمەندتر و جێگای سوودێکی پتر بێ، بە پێویستم زانی بە کورتی باسی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانە بکەم کە لە سەردەمی کۆمەڵەی (ژ.ک)دا چاپ و بڵاو بوونەتەوە. ئەم کورتەمێژووویە بێجگە لە دەوڵەمەند کردنی وتاری سێسنوور، زۆر بابەتی ئەو کتێب و نووسراوانە پشتڕاست دەکاتەوە کە باسی حیزب و کۆمەڵە پێکهاتووەکان و هەروەها خەباتی ئەو سەردەمی کورد لە هەر دوو بەشی رۆژهەلات و باشوور دەکەن.

لە کتێبی «کوردستان و کورد لە بەڵگەنامەکانی بریتانیا»دا کە «و.

کوردی، لە لاپەڕە ١١٩ و ١٢٠دا سەبارەت بە چاپەمەنی و حیزب و تاقمەکانی کوردی زانیاری باش کۆ کراوەتەوە. لە بەشێکی دیکەی ئەو کتێبە سەبارەت بە حیزبی هیواش زانیاری باش دراوە کە لێرەدا وەک پالپشتێک بۆ قسەکانی دوکتور «عەزیزی شەمزینی» و زانیاری پتری خوێنەران پێشکەش دەکرێ.

لە لاپەڕە ١١٩ بەپێی راپۆرتی Fo371/52702 Research Fo, 22 March 1946 Appendix [B] کە رێکەوتەکەی بەرامبەرە دەگەڵ رۆژی جومعە ٢ی خاکەلێوەی ١٣٢٥، دەڵێ: «گرینگترین چاپەمەنییەکانی کوردی ئەوانەن:

١- هاوار - ئۆرگانی «کۆمەڵەی خۆیبوون» کە لە لایەن سەرۆکەکەی «جەلادەت بەدرخان» لە شاری حەلەب چاپ دەبێ. چاپەکەی تا شەڕی دووهەمی جیهانی درێژەی هەبوو بەلام لە کۆتایی شەڕدا جێی خۆی دا بە گۆڤارێکی دیکە بە ناوی «رووناک».

٢- نیشتمان - یەکەم جار لە سالی ١٩٤٣ «کۆمەڵەی ژیانی کورد» چاپی کرد. لە شاری تەورێز و بە یارمەتی شووڕەوی چاپ و لە سلێمانی بلاو دەکراوە.

٣- ئازادی - ئۆرگانی کوردە شیوعییەکان ،شوێنی چاپ نادیار،چەند ژمارەی لە سلێمانی لێ بلاو کراوەتەوە.

٤- یەکێتی تێکۆشین - ئۆرگانی کوردە شیوعییەکان، لە بەغدا بلاو دەبۆوە، لە راپۆرتی وەزارەتی [دەرەوەی] بریتانیادا هاتووە:«ئەم گۆڤارە دەگەڵ رۆژنامەی «وەحدەت ئەننیزال» بە زمانی عەرەبی و «رزگاری کورد» و «شۆڕش» بە زمانی کوردی پێوەندی هەبووە...»

لە لاپەڕە ١١٩ و ١٢٠دا ئەو جار باسی حیزب و تاقمەکانی کوردی دەکا و بەپێی راپۆرتی[C] Ibid Appendix باسی ٥ حیزبی گرینگ دەکا کە ئێمە بە گوێرەی پێوەندییان بەم بەشە لە نووسراوەکانمان باسی سێ دانەیان دەکەین:

١- «ژیانی کورد»: سالی ١٩٤٣ دامەزرا. رۆژنامەیەکی[گۆڤارێکی] بە ناوی «نیشتمان» بلاو دەکردەوە. ئامانجی ئەو یەکێتی گەلی کورد بوو. لەگەڵ ئاغا و دەرەبەگە کوردەکان و بیر و بۆچوونیان بەربەرەکانی هەبوو بەلام بۆچوونی کۆمۆنیستی نەبوو. تێدەکۆشا پێوەندی لەگەڵ «حیزبی هیوا» لە سلێمانی و «کۆمەڵەی خۆیبوون» ساز بکا...

٢- «هیوای کورد» ڕێکخراوێکی نهێنی بوو کە ساڵی ١٩٣٩ لە سلێمانی دامەزرا. زانیاری پتر لە بارەی چالاکییەکانی لە بەر دەست نییە.
٣- «رزگاری کورد» - ساڵی ١٩٤٥ و لە بەغدا بوونی خۆی ڕاگەیاند. لایەنگری کوردەکانی ئێران بوو و لە مافی کوردەکانی عێراق بەرگری و ڕۆژنامەیەکی بە ناوی «رزگاری» چاپ دەکرد.
لە لاپەڕە ١٢٩ باسی کوودتای نیزامی «بەکر سیدقی» ئەفسەری کورد دەکا کە لە ئۆکتۆبری ١٩٣٦ دژی حکوومەتی «یاسین ئەلهاشمی» بەڕێوەچوو و هاتنە سەر کاری «حیکمەتی سولەیمان»ی لێکەوتەوە و پاشان دەڵێ: «بەکر سیدقی» بۆخۆی کرا بە فەرماندەی گشتی ئەرتەشی عێراق. ئەو کوودتا نیزامییە رووحێکی تازەی وەبەر « کوردە نەتەوەخوازەکان »ەوە نا. فەرماندەیی «بەکر سیدقی» دروست هاوکات بوو لەگەڵ دامەزراندنی «حیزبی هیوا» لە لایەن ڕۆشنبیرانی کورد.
ناوی «هیوا» لەبەر شانازی کردن بە حیزبێکەوە ساز بوو کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم لە لایەن کوردەکانی تورکیا بە ئامانجی سەربەخۆیی کوردستان دامەزرابوو. ئەندامانی حیزبی تازەی «هیوا» ئەوانە بوون: «ڕەفیق حیلمی»، «ئیسماعیل حەقی»، «تۆفیق وەهبی»، «مەعرووف جیاوک »، «ئەمین ڕەواندزی»، «ئیسماعیل حەقی شاوەیس» [ڕەنگە ناوی ئیسماعیل حەقی بێ کە دووپات بۆتەوە]. لە ئەفسەرەکانیش: «مستەفا خۆشناو»، «عیززەت عەبدولعەزیز»، «نووری مەلا حەکیم»، «نووری مەعرووف» و «نووری ئەحمەد تەها» و هەروەها: «ڕەفیق کۆیی» و «محەممەد ساڵح»، «عەبدوڕڕەحمانی قازی»، «ماجید مستەفا»، «شێخ قادری بەرزەنجی». (ئەو حیزبە دوو لق بوو، تاقمی یەکەم (باڵی ڕاست) کە زۆرینە بوون و باوەڕیان بە هەواداری و لایەنگری بریتانیا بۆ گەیشتن بە خودموختاری بوو... تاقمی دووهەم (باڵی چەپ) بوون کە لایەنگری شیوعییەکان بوون و باوەڕیان بە شۆڕشی سۆسیالیستەکان هەبوو کە لە ساڵی ١٩٤٤ دامەزرابوو و ئۆرگانێکی هەر بەو ناوە هەبوو. هاوکاری نێوان ئەو دوو حیزبە «رزگاری کورد» و «شۆڕش» زۆر باش بوو، بەڵام لە ئەنجامدا بزووتنەوەی سیاسی کوردەکان بە ڕابەرایەتی

گەلی کورد وەک عادەتی لەمێژینەی، ئەو جاریش رووی کردە سەرۆک عەشایرەکان هەتا داخوازییەکانی خۆیان بە زۆری چەک وەدی بێنن. ئەوە لە کاتێکدا بوو کە لە تێکۆشانی دیپلۆماتیکی دەرەوەشدا نەیتوانی سەرنجی دنیا بەرەو کوردستان و مەسەلەکەی رابکێشێ...»

گۆڤاری «رۆژنامەنووس»یش لە ژمارە ١ی - ٢٢ی ٤ی ٢٠٠٤ لە وتارێکدا لە ژێر ناوی «ئیندێکسی رۆژنامەوانی نهێنی کوردی تا ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ - بەشی یەکەم کە لە لایەن کاک «رەفیق سالْح ئەحمەد» ئامادە کراوە، باسی رۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەم سەردەمی دەکا. ئەو نووسراوەی خوارێ کورتەیەکە لەسەر ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەی کە لە سالْەکانی ١٩٤٢ هەتا ١٩٤٥ دەرچوون کە سەرنج‌دان بەو گۆڤارانە، زانیاری پتر و روونترمان سەبارەت بە رووداوەکانی ئەو سەردەمە دەخاتە بەردەست.

لاپەڕە ٢٣٠ باسی گۆڤاری «دەنگی راستی» دەکا. ئەم گۆڤارە لە سالْی ١٩٤٤ لە لایەن لقی سلێمانی کۆمەلْەی ژ.ک بلاو کراوەتەوە و دوو ژمارەی لێ‌دەرکراوە.

رۆژنامەی «ئازادی» یەکێکی دیکە لە بلاوکراوەکانی ئەو سەردەمە بووە کە ژمارەی (١)ی لە نیسانی ١٩٤٤ بلاو کراوەتەوە و تا سالْی ١٩٥٦ هەر درێژەی هەبووە و لەو سالْەدا ناوەکەی بووە بە «ئازادی کوردستان». ئەم رۆژنامەیە زمانحالْی «حیزبی شیووعی عێراق»/ لقی کورد بووە.

لە لاپەڕە ٢٣١ی «گۆڤاری رۆژنامەنووس»یش دوو بلاوکراوەمان هەلْبژاردووە:

١- «یەکێتی تێکۆشین»، ئەم بلاوکراوەیە لە هەولێر و لە نێوان سالْەکانی ١٩٤٤ و ١٩٤٥ چاپ کراوە و (٣) ژمارەی لێ بلاوکراوەتەوە. «یەکێتی تێکۆشین» زمانحالْی «کۆمەلْەی کۆمۆنیستی عێراق - لقی کورد» بووە. لە سەر ژمارە ٢ی ئەو بلاوکراوەیە، ئەم رستانە نووسراوە: «مردن بۆ فاشیست، ژیان بۆ نیشتمانی سەربەست»، «تێکۆشین بۆ بەهێزکردنی جەبهەی وەتەنی بۆ ئازادی و سەربەستی کورد».

٢- «شۆڕش» سالْی ١٩٤٥ لە هەولێر چەند ژمارەیەکی بە زمانی کوردی و بە تیراژی چەندسەد دانەیەکی لێ دەرچووە و ئۆرگانی «حیزبی شۆڕش» بووە.

٥

# ناساندنی ناوی نهێنی ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) و ڕەمزی چەند شارێک

## ناساندنی ناوی نهێنی ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک)

لەمێژ بوو بەهیوا بووم لیستێکی تەواو لە ناوی نهێنی ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) کۆبکەمەوە و لە پەنایەک و بە ڕێکوپێکی بڵاوی بکەمەوە. لە هەر جێیەک ناوێکم بیستبا یادداشتم دەکرد. کتێبەکەی کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» (نگاهی بە تاریخ مهاباد) نزیک بیست ناوی نهێنی تێدا بڵاو کراوەتەوە. کاک دوکتور «هیمدادی حوسێن»یش لە کتێبەکەی خۆیدا زۆربەی ناوە نهێنییەکانی هەر لە کتێبەکەی کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» وەرگرتووە و چەند دانەیەکیشی بە پرسیار دیوەتەوە. ئەو لیستەی ئێستا لەم کتێبەدایە، جگە لەو ناوانەی کە لە کتێبەکانی ئەو دوو بەڕێزەدا بڵاو کراونەوە، هێندێکیانم لە کتێب و گۆڤارەکاندا دۆزیوەتەوە و چەند دانەیەکیشیان بۆچوونی خۆمن. ئەوەی دەمێنێتەوە زۆربەی هەرەزۆری بەرهەمی چەندین جار دانیشتن لەگەڵ مامۆستای بەڕێز کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان»ە. لە بەشی تێبینییەکان لە خودی بڵاوکراوەکانی سەردەمی (ژ.ک) و کۆماری کوردستان کەلکم وەرگرتووە و ئەگەر

نییە هەرچی لەو لیستەدا ناوی هاتبێ، حەتمەن ئەندامی (ژ.ک)ە و یا ئەگەریش ئەندام بێ، ناوی نهێنی یا راستەقینەکەی دروست بێ، بەڵام ئەوە هەوڵێکە بەو هیوایەی بە رەخنە و تێبینی وردی خوێنەرانی کورد کارەکە پوختەتر و دەوڵەمەندتر بێ و هاندەرێکیش بێ بۆ ئەو کەسانەی لە سەر ئەندامانی تری (ژ.ک) لە هەر دوو بەشی رۆژهەڵات و باشووری کوردستان زانیارییان هەیە، تا بۆ روون بوونەوەی پتری ئەو لیستە و ناوی ئەندامان و لایەنگرانی نەناسراو، هەوڵێکی زیاتر بدرێ و چی تر بە نەناسراوی نەمێننەوە.

گرینگی ئەو کارەش لەوەدایە کە بە روون بوونەوەی ناوی نهێنی یا ژمارەی ئەندامەتی یا ناوی راستەقینەی هەرکام لە ئەندامانی (ژ.ک)، زۆر گرێکوێرەی مێژووی پڕ لە سەروەری خەباتی ئەو سەردەمی پێ دەکرێتەوە و روون دەبێتەوە کە بۆ وێنە: ئەندامانی دامەزرێنەر چەند کەس بوون؟ کێ لە رووداوێکی مێژوویی ئەو سەردەمیدا بەشدار بووە؟ و زۆر شتی دیکەش. جا هەر بۆیە دیسان داوا لە خوێنەران دەکەم تەنانەت ئەگەر یەک ناویش لە ناوی ئەو ئەندامانە بزانن، بە هێندی بگرن و بۆ چاپەکانی دیکەی ئەو بەرهەمە بە چەشنێک رایبگەیەنن. ئەگەر بەپێی ئەو ناوە نهێنییانە بێ کە لە گۆڤارەکانی «نیشتمان» و «هاوار» و «ئاوات» و «گڕوگاڵی منداڵانی کورد» و «هەڵاڵە»دا ناویان هاتووە، ئەوە دەکرێ بڵێین ناوی راستەقینەی زۆربەی هەرەزۆری نووسەران دیاری کراون. ئەگەرچی دیسان دەڵێم کە مەرج نییە حەتمەن هەموو ناوەکان دروست بن. با ئەوەش بڵێم کە چەندین کەس لە ئەندامانی کۆمەڵەی «هیوا»ش ناویان کەوتووەتە نێو لیستی ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک)، بەڵام تێبینییان لەسەر نووسراوە و ئەوە بەو مانایە نییە چونکە لەم لیستەدان ئەندامی (ژ.ک)یش بن.

## ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ک

| ڕیز | ناوی نهێنی | ناوی ڕاستەقینە | ژمارەی ئەندامەتی | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | نەریمان | حوسێن زێڕینگەران (فرووهەر) | ١ | یەکەمین سەرۆکی کۆمەڵەی (ژ.ک) بوو تا نیزیک دوو ساڵ. |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢ | ع. بێژەن | عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی | ٢ | سەرنووسەری گۆڤاری «نیشتمان» یەکێک لە چالاکترین ئەندامانی کۆمەڵـــــەی ژ.ک. و لــــــە دامەزرێنـــەرانی یەکـــەمی ئـــەو کۆمەڵەیە بوو. |
| ٣ | کاوە | میرحاج ئەحمەد | ٣ | خەڵکی کوردستانی باشوور و لە دامەزرێنـــەرانی کۆمەڵـــەی (ژ.ک) بووە. |
| ٤ | ق.م.رەوادی / ق.م | مەلا قادری مودەڕڕیسی | ٤ | سەرنووسەری گۆڤاری «گرۆگاڵی منداڵانی کورد» |
| ٥ | ع. راد | عەبدوڕڕەحمانی ئیمامی | ٥ | |
| ٦ | ع. ساسان | میرزا عەلی ریحانی | ٦ | دەستەی هەیئەتی ناوەنـدی ژ.ک بـوو. هــەر ئـەو کەســەی کـاک «محەممەدی شاپەسەندی» دەڵـێ «لە ئەندامانی دامەزرێنەری ژ.ک بووە.» کاک عوبەیـد دەڵـێ: «ع. ساسان» ناوی نهێنی میرزا «عەلی ریحـــانی» بـووە و «راژۆ» نـــاوی نهێنی ئەو لە کۆمەڵەی «هیـوا»دا بووە، هەرچەند قسەش هەیە کـە ع. ساســـان نـــاوی نهـێنی کـــاک «وەهابی بلووریان»ە. |
| ٧ | م. نادری | محەممەد دڵشادی رەسووڵی | ٧٦ | |
| ٨ | ئا. ئا. رژدی | مامئەحمەدی ئیلاهی | ٢٤ | |
| ٩ | خ.م. شاباز | محەممەدخەلیلی مووەففەقی | | «کاپیتان»ی ئەرتەشی کوردستان بووە. |
| ١٠ | م.س. تووس | محەممەدی سەلیمی | ١٣ | لە دیـــاری ژمـــارە ٢ی کۆمەڵــــەی |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | نیشتمانی کورد» ناوی بەم جۆرە هاتووە «هەیئەتی ناوەندی (مەرکەزی) کۆمەڵەی ژ.ک ئەم سیپارەیە پێشکەشی گیانی (روح) لاوی رەحمەتی م.س.تووس ئەندامی ژمارە ١٣ی کۆمەڵە ئەکات». |
| ١١ | م.ش. ئازەر / م. ئازەر/ م.ئا | محەممەدی شاپەسەندی | ٨٢١ | بۆخۆی دەڵێ لە دامەزرێنەرانی ژ.ک نەبووە و دواتر بۆتە ئەندام. بەرپرسی گۆڤاری «ئاوات» و نووسەری گۆڤارەکانی سەردەمی کۆمەڵەی ژ.ک و کۆماری کوردستان بووە و لە گۆڤاری «ئاوات»دا بە ناوی (م.ئازەر) و (م.ئا) نووسراوەی هەیە. (نووسەر) |
| ١٢ | برای راست | حاجیرەحمانئاغای ئیلخانیزادە | ٦٧ | |
| ١٣ | ع. هەژار | عەبدوررەحمانی شەرەفکەندی | ٢٠ | |
| ١٤ | م.ش. هێمن | سەیدمحەممەدئەمینی شێخولئیسلامی | ٥٥ | هەم ناوی نهێنی کۆمەڵەی (ژ.ک)ی بووە و هەم نازناوی شێعری. |
| ١٥ | م.ح. لاو | سەدیقی حەیدەری | ١٠ | ئەندامی شووړای هەیئەتی ناوەندی ژ.ک بووە. |
| ١٦ | ع. سیامەک | عەبدولقادری دەباغی | ٥٧ | لە ژمارە ٥ی نیشتمان ناوی هاتووە کە یەکەم لقی کۆمەڵەی (ژ.ک)ی لە کوردستانی باشوور و لە شاری سلێمانی دامەزراندووە. |
| ١٧ | ع. زۆراب | عەلی خوسرەوی | ٣٧ | پێم وایە «ع.خوسرەوی»ش هەر ناوی کاک «عەلی خوسرەوی»یە کە سەرۆکی لقی لاوانی (ح.د.ک) بووە. |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | ژیر | سەید سالحی ئەییووبیانی مەرکەزی | | |
| ١٩ | ئا.ت. ئارام | سەید تەهای ئەییووبیانی مەرکەزی | ١١٤٩ | بڕوانە لاپەڕە ٣١٤ی ئەم کتێبە، ئێری ٤ی کۆتایی. |
| ٢٠ | م. بەیان | محەممەدئەمینی خاتەمی | ٧١ | |
| ٢١ | خاڵە مامە | حاجی سەید حەمەدەمینی بەرزەنجی (خاڵەمین) | | |
| ٢٢ | س.ح. حەمیدی گرشاسب/ م.ح | سەید محەممەدی حەمیدی | | سەرنووسەری گۆڤار و رۆژنامەی «کوردستان» و گۆڤارەکانی «هاوار» و «ئاوات» بووە. |
| ٢٣ | عاشق | شێخ محەممەدی حیسامی | | روون نییە ناوی نهێنی لە (ژ.ک)دا بووە یا نازناوی شێعرێتی؟ |
| ٢٤ | ع. مەولەوی | عەزیزی مەولەوی | | |
| ٢٥ | ح. خەمناک، ح. قزلجی | حەسەنی قزلجی | | بڕوانە ل٥ی پێشەکی "ئاڵەکۆک"، چاپی ١٣٢٤و ل١٦-١٩ی ژ٣ی گۆڤاری «هەڵاڵە» کە ح. قزلجی سەرنووسەری بووە. |
| ٢٦ | م. س. قزلجی | محەممەدسادقی قزلجی | | ناسراو بە «قازی کاکە حەمە»ی بۆکان |
| ٢٧ | م. نەژادی | مستەفا نەژادی | | ئەندامی کارا و تێکۆشەری (ژ.ک) و لە گۆڤاری «هەڵاڵە»ی ژمارە( ١) نووسراوەی هەیە. |
| ٢٨ | عەتری | محەممەدی نووری (کلۆلانی) | ٨٥ | لە لاپەڕە ١٧ی کتێبەکەی (شەوێک و خەوێک)دا دەڵێ: «ئەندامی ژمارە ٨٥ بووم». |
| [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] | [illegible] |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | مەهاباد). روون نییە ژمارەی ئەندامەتی (٩٠)ە یا (٩٥)، بەڵام زۆرتر وێدەچێ ٩٠ دروست بێ. |
| ٣٠ | م.م. عیشقی | محەممەدی مەجدی | | |
| ٣١ | فەرمان | عەبدولعەزیزی زەندی | ٧٨ | سەرۆکی کۆمەڵەی ئازادیخوازانی کورد بوو و دواتر بوو بە ئەندامی (ژ.ک). |
| ٣٢ | م. ئاریا | مەنافی کەریمی | ٢٧ | لە ژمارە ٢ی نیشتمان‌دا بە م. ئاریا ٢٧ ناسێندراوە کە میداڵی ئاڵای کوردستانی وەرگرتووە. لە «نیشتمان»ی ژمارە ٧و٨و٩شدا نووسراوە ژمارە ٢٦. (نووسەر) |
| ٣٣ | هێدی | میرزا ئیبراهیمی ئیبراهیمیان | ١٨ | یەکەمین یاریدەدەری سەرۆکی کۆمەڵەی ژ.ک و ئەندامی دەستەی لاوان. |
| ٣٤ | ع. هونەر | عەباسی حەقیقی | | شاعیری ناودار و خەڵکی بۆکان. |
| ٣٥ | هومێد | سەعیدی زەرگەیی | | لە ژمارە ٢ی گۆڤاری «گرۆگاڵی منداڵانی کورد» شێعری نووسیوە. پێم وایە نازناوی شێعرێتی. |
| ٣٦ | هۆگر | ڕەحیمی سەیفی قازی | | (بڕوانە ل٣٦، ژ١١ی ڕوانگە: کاک مەنافی کەریمی) و کاک عوبەید |
| ٣٧ | بارام | عەلی مرادی | ١٨ | ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک و بەرپرسی دەستەی لاوانی لادێی ئیندرقاش. (کاک عوبەید) |
| ٣٨ | بینایی | پێشەوا قازی محەممەد | | بەپێی بەڵگەی لاپەرە ١٠٩ی کتێبەکەی کاک حامیدی گەوهەری، پێشەوا هەتا ١٣٢٣/٧/١١ (١٩٤٤/١٠/٢) ئەندامی ژ.ک نەبووە و دواتر وەک ئەندامەکانی دیکە سوێندی خواردووە و بۆتە دووهەم سەرۆکی ئەم کۆمەڵەیە (نووسەر). |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | کاک ئەحمەدی شەریفی دەڵێ: «قازی محەممەد» ئەندامی ژمارە ٤٠ی ژ.ک بووە. (لاپەڕە ٣٦ی گۆڤاری روانگەی ژمارە ١١). |
| ٣٩ | ئاگری | سەعیدی هومایوون | | |
| ٤٠ | کاک | مەلا ئەمجەدی عوسمانی | | خەڵکی گوندی «قەڵای رەسوولەسیت» لە ناوچەی چۆمی مەجیدخان بووە. بڕوانە ژمارە ٦٦ی گۆڤاری مەهاباد. (نووسەر) |
| ٤١ | هەڵکورد | سەید محەممەدی سەیدی | ٩٧ | سەرۆکی دەستەی «هەڵۆ» لە یەکێک لە گەڕەکەکانی مەهاباد بووە. سەرۆکی دەستەی «باز» خاڵەمەلای داودی بووە. (کاک عوبەید) |
| ٤٢ | چکاوەند | محەممەدی مەولوودیان | ٤٥ | مەشهوور بە «کاپیتان» سەرۆکی ئەمنییەتی مەهاباد و ناوچە بووە. (کاک عوبەید) |
| ٤٣ | مەمۆ / کورد | کەریمی یاهوو (کاکەمەم) کاکەمەمی کورد | ٢١ | سەرۆکی پەیوەندییە گشتییەکان و ئینتیزامات وئەمنیەتی ناوچەی عەشایری بووە. (مامۆی پیر)یشیان پێدەگوت. (کاک عوبەید) هەڵبەت رەنگە ژمارەکەی دروست نەبێ چونکە کاک مەنافی کەریمی ژمارە ٢١ بووە. (نووسەر) |
| ٤٤ | س.ئا. ئازەر | سەدیقی ئەنجیری ئازەر | | روون نییە دەستەی لاوانە یا ئەندامی (ژ.ک). کاک عوبەید لە جێگایەکی دیکەدا دەڵێ: «سەرۆکی لقی لاوانی ح.د.ک بوو و ناوی نهێنی «ئاگریان» بووە».<br>بەڵام لە لاپەڕە ١٢ی ژمارە (١)ی «هاواری نیشتمان» کە هەر بۆخۆشی بەرپرسی بووە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | هەیە کە پێم وایە هەر ئەو ناوەی دوایی دروستە. |
| ٤٥ | راماو | سەید عەبدولقادری ئەییووبیانی مەرکەزی | | کاک عوبەید دەڵێ: شێعریشی هەبووە. |
| ٤٦ | ئاورپارە | میرزا عەبدوڵلای نەهری | | کاک عوبەید دەڵێ: «ئەندامی نهێنی و لەمێژینەی ژ.ک بووە.» |
| ٤٧ | یاوەر | حاجی مستەفا داودی | | |
| ٤٨ | پاکۆ | حاجی سەید عەبدوڵلا ئەییووبیانی مەرکەزی | | |
| ٤٩ | حیلمی | مستەفا موئمینی | ١٢١ | لە هەیئەتی ناوەندی (ژ.ک)دا و نووسەری ئەو کۆمەڵەیە بوو کە دلشاد و زەبیحی گیران، لە جێگای ئەوان کاری دەکرد.(کاک عوبەید) |
| ٥٠ | ق.ق.ق. پیاو | میرزا قاسمی قادری قازی | ١٠٥٣ | سەرۆکی «پەیمانی سێسنوور». بڕوانە ل. ١٩٠و ٣١٤ی ئەم کتێبە. |
| ٥١ | م.س. خوێنین | سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی | ١٠٢٠ | رابیتی نێوان دوو کۆمەڵەی (ژ.ک) و (هیوا) |
| ٥٢ | هەڵۆ | شێخ عوبەیدیللای زینوێ | | ناوی نهێنی لە کۆمەڵەی (ژ.ک) بووە و لە کۆمەڵەی «هیوا»شدا ناوی نهێنی «ع. جانگیر ئەندامی ژمارە ٧١٦» و بەشدار لە پەیمانی «سێسنوور». (کاک عوبەید) |
| ٥٣ | ع. هووشەنگ | سەید عەزیزی شەمزینی | | ئەندامی ژمارە ٧ی «هیوا» و بەشدار لە پەیمانی «سێسنوور». (کاک عوبەید) هەڵبەت کاک عوبەید لە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | وتووێژێکی دیکەدا دەیگوت: «هووشەنگ» ناوی نهێنی «عیززەت عەبدولعەزیز»ە لە کۆمەڵەی «هیوا»دا چونکە حازر نەبوو ببێتە ئەندامی ژ.ک. |
| ٥٤ | گەرناس | محەممەدحوسێنی سەیفی قازی | | کاک عوبەید (دڵنیا نیم. نووسەر) |
| ٥٥ | کواد | میرزا خەلیلی خوسرەوی | | ئەندامی ژ.ک بووە. ڕەنگە ئەو ناوە هەر«قوباد» بێ. کاک عوبەید |
| ٥٦ | گەنج | سەید عەبدولقادری گەیلانیزادە (ئالی گەیلانیان) | | |
| ٥٧ | ئاواڵ | مستەفا ساوجبلاغی | | ژ.ک بووە و لە لاپەڕە ٣ی ژمارە ٧و٨و٩ی «نیشتمان»شێعری بڵاو کردۆتەوە. بە ڕەمزی شارەکەیڕا (ئا/ک) دیارە کە خەڵکی بۆکانە. کاک عوبەید دەڵێ: «ئەوە شێعری ئەو نییە بەڵام ناوی نهێنییەکەی دروستە.» پێشتر کاک عوبەید دەیگوت ئەو ناوە نهێنییە ئی یەکێک لەو ئاغایانەی «فەیزوڵلایەگی»یە. |
| ٥٨ | م. ئیرەج | مەحموودی وەلیزادە | ٢١٥ | لە لاپەڕە ١٠ی نوسخەی ئەسڵی «نیشتمان»ی ژمارە ٧و٨و٩دا ناوی هاتووە و نووسراوە: «م. ئیرەج ئەندامی ژمارە ٢١٥ و... بۆ پێشکەوتنی کاری گۆڤارەکەمان زۆر زەحمەتیان کێشاوە...» و دواتر بوو بە وەزیری کشتوکاڵی کۆماری کوردستان. |
| ٥٩ | ئا.ف. پرشینگ | سمایلی فەرروخی | ١٠٧٥ | بڕوانە دێری کۆتایی ل ٣١٤ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | محەممەدئەمینی ئەییووبیانی مەرکەزی (ئەمازادە) | | و معـاوینی سـەرۆک کۆمـار و وەزیـری لەشساغی (بێهداشـت) بووە بەڵام ژمارەکەی پێم وایـە هەڵەیە و ژمارە ٦ دروستە کە بـە هەڵـە ژمـارە ١٦ یـا ٢٦ی بـۆ نووسراوە. |
| ٦١ | زانا | عوسمانی دانیش | | ناوبراو ئەنـدامی ژ.ک و خەڵـکی سـلێمانی بـووە و لـە پێـشەکی کتـێبی «کـورد لـە گەمـەی سۆفیەت»دا کـاک «نووشـیروان» دەڵێ: ئەو نـاوە نهێنییـە نـاوی نهێنی مامۆستا «زەبیحی»یە. لـە لاپـەڕە ٥٣٢ی کتـێبی «ژیـان و بەسـەرهاتی زەبیحـی»شـدا سەبارەت بە مامۆسـتا زەبیحـی دەڵێ: «هەندێ وتاری بـە زمـانی عەرەبی هەر لـە سـەر کۆمـاری کوردستان بە ناوی «زانا»وە بـۆ «خەبات» نووسی». |
| ٦٢ | هەوین | مەلا شێخ عیززەددینی حوسێنی | | ژ.ک بووە و ئەم زانیارییـەم لـە وتووێـژی خـۆی لەگـەڵ چەنـد کەسـێکدا لـە ئینتێرنێـت وەرگرتووە. |
| ٦٣ | ئاسن | سەید محەممەدی سەیدنیزامی (سەیدپیرە) | | سەرۆکی گشتی شارەوانی |
| ٦٤ | م.م. هووشەنگ | محەممەدڕەسوولی میکائیلی | ١٦ | ژمارەی ئەندامەتی دروسـتە. لـە «نیشتمان»ی ژمـارە ١دا شـێعری بڵاو کردۆتەوە. ئەو ژمارەیـە بـۆ ژمـارە ئەندامـەتی «سـەید محەممـەدی ئـەییووبیان»یـش نووسراوە بەڵام پێم وابـێ ژمـارە |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | ١٦، ژمارەی ئەندامەتی کاک محەممەدی ئەبیووبیان نەبووە. (نووسەر) |
| ٦٥ | زرینگ | سەید کامیلی ئیمامی | | دڵنیا نیم نازناوی شێعری پێشوویەتی یا ناوی نهێنی لە (ژ.ک)دا. |
| ٦٦ | م. فەرروخ | محەممەدی یاهوو | ١١ | ئەندامی هەیئەتی ناوەندی ژ.ک. |
| ٦٧ | شاعیرێکی بەناوبانگ/ بوێژێکی ناودار | مەلا مارفی کۆکەیی | | لە ژمارە ٣ و ٤ی «نیشتمان»دا بە ناوی «شاعیرێکی بەناوبانگ» و لە لاپەڕە ١٩ی ژمارە ٥ی گۆڤاری «نیشتمان»ی ڕێبەندانی ١٣٢٢شدا بە ناوی «شاعیرێکی بەناوبانگ» شێعری بڵاو کردۆتەوە. لە لاپەڕە ٢٠ی ژمارە ٦یشدا ناوی نهێنی «بوێژێکی ناودار»ە. (نووسەر) |
| ٦٨ | شپرزە | شێخ نافیع مەزهەر | | خەڵکی سەقز بووە. دڵنیا نیم. ڕەنگە ئەوە نازناوی شاعیرێکەی بێ. (نووسەر) |
| ٦٩ | ڕووناک | محەممەدی قادری | ٥٢ | لە لاپەڕە ٣ی گۆڤاری ژمارە ٢ی «نیشتمان»دا نووسراوە: «لە شاری (ش - SH) - ڕووناک ئەندامی ژمارە ٥٢ کە لە لایەن هەیئەتی ناوەندییەوە بۆ سەرۆکی ئیدارەی محەللی موعەیەن کرا». بە بڕوای من دەبێ ئەو شارە شنۆ بێ و ئەو کەسەش کاک محەممەدی قادری بێ کە خەڵکی شنۆ بووە. هەڵبەت کاک عوبەیدیللا دەڵێ: «ڕووناک ناوی نهێنی میرزا ئیبراهیمی ئەفخەمی، ئەندامی لقی لاوانی کۆمەڵەی ژ.ک |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٧٠ | م.خ. بارزانی | مەجیدی خوسرەوی | ٦٤ | لە لاپەڕە ٣ی ژمارە ٢ی «نیشتمان»دا دەڵێ: «لە شاری (غ. G) بارزانی ئەندامی ژمارە ٦٤بۆ سەرۆکێتی ئیدارەی محەللی تەعین کراوە و چاوەنواڕی گەیشتنی ڕاپۆرتی عەمەلیاتی ئەکەین.» لە پشتی بەرگی ژمارە ٥ی «نیشتمان»یش لە نێو ئەو کەسانەی یارمەتی ماڵییان بە ژ.ک. کردووە (دەسیاوی بۆ چاپ) دووهەم کەس (م.خ. بارزانی)یە. بە بڕوای من ئەو کەسە کاک «مەجیدی خوسرەوی»یە کە خەڵکی نەغەدە بووە. (نووسەر) |
| ٧١ | ئافەرین | مامۆستا ڕەفیق حیلمی | | کاک عوبەیدیللا ئەییووبیان دەڵێ: «سەرۆکی کۆمەڵەی «هیوا» و ناوی نهێنی لەو کۆمەڵەیەدا (ئافەرین) بووە.» |
| ٧٢ | خ. شێواو | خالید حیسامی | | سەرەتا نازناوی شێعری «شێواو» بووە و پاشان گۆڕیویەتی و کردوویەتە «هێدی». لە بڵاوکراوەکانی سەردەمی ژ.ک. ناوی نەهاتووە بەڵام لە ڕۆژنامەی «کوردستان»ی سەردەمی کۆماردا نووسراوەی هەیە. روون نییە ئەوە ناوی نهێنی لە (ژ.ک)دا بووە یا نازناوی شێعرێتی. (نووسەر) |
| ٧٣ | پرشەنگ | هاشمی شیرازی | ٢٢ | بۆخۆی لە لاپەڕە ١٠١ی کتێبەکەیدا (خاطرات دکتر هاشم شیرازی) دەڵێ: «ئەندامی ژمارە ١١ بووم.» لە لاپەڕە ٢٩ی گۆڤاری |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | (هاوار - هاواری کورد) وتارێک لە عەرەبی کراوە بە کوردی و لە ژێرەوە نووسراوە: «لە لایەن (ب.پرشەنگ) کراوە بە کوردی» جا نازانم دوکتور شیرازی عەرەبی زانیوە یان نا. کاک عوبەیدیللا ئەییووبیان دەڵێ: «د. شیرازی ئەندامی ژمارە ١٩ بووە. بە بڕوای من ژمارە ٢٢ دروستە هەرچەند تەواو دڵنیا نیم. کاک عوبەید دەڵێ: «یا ژمارە ١٢ بوو یا ١٩ بەڵام خودی د. شیرازی دەڵێ: ژمارە ١٩ مامۆستا هەژار بوو کردیان بە ٢٠ و «رەحمانی حەلەوی»یان کرد بە ١٩» |
| ٧٤ | م.ئا. حەریق | سەید محەممەدی ئەسحابی | | لە لاپەرە ٢٠ی ژمارە ٢ی «نیشتمان»دا شێعری بلاو کردۆتەوە. کاک سەید محەممەدی سەمەدی و د.هیمدادی حوسێن و کاک نووشیروان دەڵێن: ناوی نهێنی «سەید محەممەدی ئەسحابی»یە بەڵام کاک عوبەید دەڵێ: جگە لەو دوو ناوە نهێنییەی «سەید محەممەدی ئەییووبیان» کە کاکم بوو، ناوی «م.حەریق»یش هەر ئی وی بوو. |
| ٧٥ | سەدیق بەکری | سەدیقی عەلایی | | خەڵکی نەغەدەیە و لە ژمارە ٣ی گۆڤاری «گڕوگاڵی منداڵانی کورد» نووسراوەی هەیە. روون نییە (ژ.ک) بووە یان نا، بەڵام لە بلاوکراوەکانی سەردەمی کۆماری |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٧٦ | فانی | مامەندئاغای میرئاودەلی | | (مامەندئاغای میرئاودەلی) (١٩١٠ - ١٩٧٣) ڕیاوە روون نییە نـاوی نهێنی بووە یان نازناوی شێعری. لـە ژمـارە ٢و٣و٤ی «نیـشتمان» شێعری هەیـە. لـە ژمـارە ٣و٤دا هاتووە کە بە هۆی ئەندامی ژمارە (٢٠٠)ەوە شێعری بۆ بەرپرسـانی گۆڤاری «نیشتمان» ناردووە. لـە لاپەڕە ١٠ی ژمارە (١)ی «هـاواری کورد»یشدا شێعری هەیە. |
| ٧٧ | ق. چووبینە | قاسمی وەتەمیشی | | لە پـشتی رووبـەرگی ژمـارە ٥ی «نیشتمان» لە ریـزی ژمـارە ٧دا نـاوی هـاتووە کـە پـارەی بـۆ یارمـەتی بـە ژ.ک نـاردووە. بـە بروای من رەنگە ئەو ناوە نهێنییە ناوی کاک قاسمی وەتەمیشی بێ، هەرچەند تـەواو دڵـنیاش نـیم. (نووسەر) |
| ٧٨ | ئا.ع. دڵسۆز | ئەنوەر عەبدوڵلا | | تەواو دڵـنیا نـیم ژ.ک بووبـێ، بـەڵام بـە روونی لـە ژمـارە ١ی گۆڤـــاری «کوردســــتان»دا نووســـراوەی هەیـــە و خەڵـــکی کوردستانی باشوورە. |
| ٧٩ | ح.م | حەسەنی مودەڕریسی | | خەڵکی بۆکان بووە و لە ژمـارە ١ هـەتا ٣ی گۆڤـاری «هەڵاڵـە»دا نووسراوەی هەیە. تـەواو دڵـنیا نیم ژ.ک بووە یان نا. (نووسەر) |
| ٨٠ | وردی | محەممەدتۆفیق وردی | | خەڵـکی «کۆیـە»ی کوردسـتانی باشوور بووە و لـە ژمـارە ٢و٣ی گۆڤـاری «گڕوگاڵـی منـداڵانی کورد»دا نووسراوەی هەیە. تەواو دڵنیا نـیم ژ.ک بـووە یـان نـا. (نووسەر) |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٨١ | سوار | مستەفا خۆشناو | | خەڵکی کوردستانی باشوور بووە. کاک عوبەید دەڵێ: «ئەگەر هەڵەم نەکردبێ «سوار» ناوی نهێنی کاک «مستەفا خۆشناو» لە (ژ.ک)دا بووە و ناوی نهێنی لە «هیوا»شدا «فەرەیدوون» بووە یا بە پێچەوانە». |

## دەستەی لاوانی کۆمەڵەی ژ.ک

| ریز | ناوی نهێنی | ناوی راستەقینە | ژمارەی ئەندامەتی | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | هێدی/قومری | سەید عوبەیدیللای ئەییووبیان | ١ | کاک عوبەید دەڵێ: «دامەزرێنەر و سەرۆکی دەستەی لاوان بووم. ئەووەڵ جار ناوی نهێنی من «هێدی» بوو. کاک «ئیبراهیمی ئیبراهیمیان»یش کە ئەندامی ژ.ک بوو ناوە نهێنییەکەی هەر «هێدی» بوو. شێعرێکی من بە نازناوی «قومری» لە لاپەڕە ١٨ی ژمارە ٢ی «نیشتمان»دا بڵاو بۆتەوە. خاڵەمین شێعرێکی نووسیوە کە ئەو بابەتە و ناوی منیشی تێدایە: بیستوومە پێشەوای مە قازی محەممەدە / دا تێکەوە لە مەی، بە مەیە نیشەکەم بزووت / کاکی حەریق و هێدی ئی هێمن و منی / بابی فەقیر و بێکەس و بێدەستەڵات و رووت.» کاک عوبەید دەڵێ: لەو شێعرەدا |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | «ئاگریک»ە کە ناوی کاکە محەممەدمە. |
| ٢ | ئاریا | مستەفا بارنجی | | |
| ٣ | مێدیا | غەنی بلووریان | | |
| ٤ | ئاکۆ | عەبدوڕڕەحمانی ڕەسوولی | ٥ | برای کاک دڵشادی ڕەسوولی |
| ٥ | کەڵانتەر | حوسێنی ساڵحیان | ٢١ | کوڕی کاک لەتیفی ساڵحیان |
| ٦ | لاو | قادری ڕیحانی | | |
| ٧ | پاس | فەتاح چاوشێت | ١٥ | |
| ٨ | بەهار | حاجی هاشمی ئانەوازادە | ١٩ | |
| ٩ | سوارە | ئەحمەدی ئەعلبەندی | ٢٥ | زۆر دڵنیا نیم. (کاک عوبەید) |
| ١٠ | پۆڵا | حوسێنی فەتاحی قازی | | |
| ١١ | دڵڕوون | عەلی فەرهادی | | ناوی نهێنی «کاوان»یش هەر ئەو بووە. (کاک عوبەید) |
| ١٢ | تەم | محەممەدی داودی | | نووسەری دەستەی «باز» بوو. هاتە ناو دەستەی «لاوان» و کوڕی خاڵەمەلای داودی بووە |
| ١٣ | هەیار | چووکەڵ گەوهەری | | بابی کاک حامیدی گەوهەری |
| ١٤ | ئاژۆک | سولەیمانی شافعی | | |
| ١٥ | ئاگری | ئیسماعیلی پوورئازەر (شایەگان) | | من دڵنیا نیم چونکە ناوی کاک سەعیدی هومایوون بە نازناوی «ئاگری» بووە بەڵام کاک عوبەید بۆ سەدیقی ئەنجیری و چەند کەسێکی دیکەش دەڵێ «ئاگری» ناوی نهێنییان بووە. بەڵام کاک عوبەیدیلا لە زۆر جێگایان دەڵێ: «وا هەیە ناوێکی نهێنی لە هەردووک لقی کۆمەڵەی (ژ.ک)دا |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | | هەبووبێ کە ئەوە ئاساییە» (نووسەر) |
| ١٦ | کاکە سوورە | عەبدولخالەقی خوسرەوی | | |
| ١٧ | قامکی | هاشمی مووسازادە | | |
| ١٨ | رووناک | میرزا ئیبراهیمی ئەفخەمی | ١١ | خەڵکی بۆکان |
| ١٩ | ئاوات | خەلیلی سەدیقی | ١٤ | |
| ٢٠ | ئەنووشیروان | عەبدورڕەحمانی کابانی | ٤ | |

لێرەدا بەگوێرەی ژمارەی گۆڤارەکان، ناوی ئەو کەسانەی لە گۆڤاری ١ هەتا ٩ی «نیشتمان» و چەند گۆڤارێکی دیکەدا کە ناویان نەزانراوە، دەنووسمەوە هەتا خوێنەری کوردم هەرنەبێ لە پشکنینی دووبارەی ئەو نۆ ژمارەیە یارمەتییەک دابێ.

لە ژمارە (١)ی گۆڤاری «نیشتمان»دا لە لاپەڕە ٢٤ ناوی «سام» و «جاهد» کە لە بەشی «دەسیاوی بۆ چاپ» واتە یارمەتی بۆ چاپی «نیشتمان» پووڵ و پارەیان داوە، روون نەبۆوە.

لە ژمارە ٥ی «نیشتمان»دا دیسان هەر لەو بەشەی پێشوو، ناوی «ە. ئارێز» یا «ە. ئازیز؟» نەزاندرا.

لە ژمارە ٦ی ئەو گۆڤارە دووبارە هەر لەو بەشەی پێشوو، ئەو ناوانە نەزاندرا: «ع. فەرزانە»، «ح.ر. سەخی»، «ئا. ئازاد»، «ئا. ئا. ئازا»، «ق. چووبینە». هەر لەو ژمارەیە و لە لاپەڕە ١١ دا ناوی «ئا. ک: پشتیوان ١٠٤٢» نەزاندرا.

بە بڕوای من هەرچەند تەواویش دڵنیا نیم، رەنگە «ق. چووبینە» یا کاک «قاسمی وەتەمیشی» بێ یا کاک «قادری حامیدی». ناوی «پشتیوان»یش هەر لە

ئەندامێکی خەڵکی شاری «بۆکان»ە، چونکە هەروەک دواتر باسی دەکەین «ئا، ک» رەمزی شاری «بۆکان»ە.

لە ژمارە ٧و٨و٩ی «نیشتمان»دا ناوی دووکەس روون نییە: «ئا.ک: ع. مرۆ ٦٧ (کە ئەو ئەندامەش خەڵکی بۆکانە)، لە لاپەڕە ١٨شدا وتارێک لە لایەن «بیستوون»ناوێک نووسراوە کە ئەویش ناوی راستەقینەی نەزاندرا.

ئەم چەند زانیارییەش رەنگە یارمەتیدەرێک بێ بۆ ناسینی پتری چەند ئەندامێک کە زانیاری وردتریان لە سەر نەبووە.

«ح. مەولائی» لە ژمارە (١)ی «هاواری نیشتمان»دا نووسراوەی هەیە.

«ب. شیرین» لە ژمارە ٢ی گۆڤاری «کوردستان»دا نووسراوەی هەیە.

لە لاپەڕە (١)ی کتێبی «حکوومەتی کوردستان و کورد لە گەمەی سۆڤیەت»دا کاک «نووشیروان مستەفا ئەمین» نووسیویەتی: «(ب. ئەلوەند - بەکر عەبدولکەریم حەوێزی)»، ناوبراو لە کۆماری کوردستاندا بەشداری بەرچاوی هەبووە بەڵام روون نییە ئەو ناوە ئی چ سەردەمێکی خەبات و تێکۆشانێتی و ئایا ناوی نهێنی (ژ.ک)ە یا «ح.د.ک» یا... .

«مەلا سەعیدی مەلا عەلی»: لە ناو ئەو لیستەی کە ٢٣ی ٢ی ١٩٤٤ لە لایەن بەرپرسی بەشی راگەیاندنی کۆمەڵەی (ژ.ک) واتە مامۆستا «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» بۆ سەرکۆنسوولی یەکێتی سۆڤیەت لە تەورێز نێردراوە ناوی «مەلا سەعیدی مەلا عەلی» هاتووە. دەقی ئەو لیستە لە لاپەڕە ٦٢٤ و ٦٢٥ی کتێبەکەی کاک «عەلی کەریمی» و لاپەڕە ٥٠ی کتێبەکەی کاک «حامیدی گەوهەری»دا هاتووە و لە ژمارە ٢٠ی ئەو لیستە نووسراوە: «محەممەد سەعید مەلا عەلی، هەولێر، گەنج».

کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» سەبارەت بەو کەسە دەڵێ: «هەولێری بووە، ساڵی ١٣٢٧ (١٩٤٨) دەگەڵ من لە بەندیخانە بوو.(لە مەهاباد). ئەویان بە عینوانی ئەوە کە بێمۆڵەت هاتۆتە ئێران و عێراقییە، گرتبوو. پیاوێکی زۆر زرینگ بوو، ئەندامی (ژ.ک) بوو، هاتوچۆی ئەمدیو و ئەودیوی دەکرد. ئینسانێکی خۆڕێکخەر بوو، رووناکبیریش بوو و کوردایەتیشی دەکرد. لەگەڵ ئەو ئاغایانەی «کیتکە»ی نێوانی هەبوو. زۆرجار دەیانگرت بەڵام زۆر

دەسڕۆیشتوو بوو (پارتی قەوی بوو) زوو ئازادیان دەکرد. لە زیندانێ بە منی دەگوت ئەمن لە شای ئێرانێ دەوڵەمەندترم.»

دیسان بە قسەی کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان»: «کاک عەبدوڕڕەحمانی لەشکری و کاک سولەیمانی شافعی لە ئەندامانی لقی لاوانی (ژ.ک) بوون. ئەو دوو کەسە وێڕای خۆی لە دامەزرێنەرانی دەستەی لاوان بوون. کاک «ڕەحمانی کابانی»، کاک «سەیفوڵلای نانەوازادە» (سەهبا)، کاک «عەبدوڵلا حەکیمزادە»، کاک «فەتاحی حامیدی»ش ئەندامی دەستەی لاوانی (ژ.ک) بوون.

کاک «عەزیزی کوردپوور» ئەندامی (ژ.ک) بوو. سەرۆکی گەڕەکی هەرمەنیان بوو. کاک «مارفی پوورزەریف» و کاک «عەبدوڵلا لاوەیی» و کاک «ساڵحی مەستانی» و کاک «عەلی خادمی»ش ئەندامی (ژ.ک) بوون.

کاک «محەممەدعەلی سوڵتانی» لە لاپەڕە ٤٨٨ و ٤٨٩ی بەرگی دووهەمی کتێبی «احزاب سیاسی و انجمن‌های سری در کرمانشاه» و لە بەشی «کۆمەڵەی (ژ.ک) لە کرماشان»دا دەڵێ: «لە هەلومەرجی دوای خەرمانانی ١٣٢٠ و گۆڕانکاری فکری و کۆمەلایەتی و پەرەستاندنی تێکۆشانی حیزبی و هاوکاری نیزیکی حیزبە سیاسییە چەپەکان دەگەڵ دەوڵەتی ئەوکات و بەشداری وەزیرەکان لە کابینە، لقەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە کوردستانەوە گەیشتە «کرماشان» و «کەڵهوڕ» و «پشتکۆ» هەتا «لۆڕستان» چالاکییەکانی خۆی پەرە پێدا. «میرزا عەبدوڵلای مودەبیر» مەشهوور بە «ئاغا گەورە»... سەرۆکایەتی لقەکانی سنە و کرماشان و کەڵهوڕ و لۆڕستانی بەئەستۆوە بوو. چەند کەس لە ڕووناکبیران و سیاسەتمەداران، لقی کرماشانیان بەڕێوە دەبرد. خوالێخۆشبوو «میرزا ئیبراهیمخانی نادری» وەک دەبیری (سکرتێر) کۆمەڵەی (ژ.ک)ی لقی لۆڕستان و کرماشان و پشتکۆ و کەڵهوڕ چالاکی هەبوو. مامۆستای خوالێخۆشبوو «سەید محەممەدتاهیری هاشمی» سەرۆکی لقی ناوچەی کرماشان و جێگری سکرتێری کۆمەڵەی (ژ.ک)ی [ئەو بەشە] بوو. یەکێک لە قازییەکانی دادگا ڕاوێژکاری ناوچەی کرماشانی بەئەستۆ بوو و «ڕەشید باجەلان» لە وەکیلە (مەحامی) پایە یەکەکانی دادگا لە عێراق کە لە «خانەقین» نیشتەجێ بوو، بێجگە لە بەرپرسێتی

و بەرپرسێتی پێوەندی حیزبی لە بەغدا تا خانەقین و کرماشان و... دەگەڵ دەفتەری ناوەندی [مەهاباد] پێ ئەسپێردرابوو. لە کاروباری سیاسی و فەرهەنگی ئاگادارییەکی تەواوکەماڵی هەبوو و بە زانایی زانستی لە چوارچێوەی چالاکی خۆیدا بەناوبانگ بوو...».

لە لاپەڕە ٤٩١یش باسی چوونی «میرزا عەبدوڵلای مودەبیر» و «ئیبراهیمی نادری» لە پاش ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان بۆ مەهاباد دەکا.

لە لاپەڕە ٤٩٤یش باسی مامۆستا «سەید تاهیری هاشمی» دەکا و دەڵێ ناوبراو دوای ڕاگەیاندنی کۆمار، پێوەندی لەگەڵ شووڕای ناوەندی کۆمەڵە لە کورتی دا و هەر بۆیە نەچۆوە مەهاباد و دواتر بە یەکجاری خۆی لە کاروباری سیاسی کێشاوە و خەریکی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە و دەرسدانەوە بوو.

کاک «حەسەنی سەییدزادە» لە وتارێک لە ژێر ناوی «کۆمەڵەی ژ.ک و ڕێکخراوی نهێنی لە کرماشان و لۆڕستان» کە لە گۆڤاری «هەشتاوهەشت»دا بڵاو بۆتەوە، لە لاپەڕە ٢٢٨دا دەڵێ: «یەدوڵلاخانی ڕەزایی کەڵهوڕ» کوڕی «عەبدوڵلاخان (زەعیم سوڵتان) بەرپرسی (ژ.ک)ی ناوچەی «کەڵهوڕ» و «پشتکۆ» بووە. «ڕەشید ئیسماعیل باجەڵان» ناسراو بە «ڕەشید باجەڵان» کە محامی بووە لە شاری خانەقین سەرپەرشتی پێوەندییەکانی ڕێکخراوە ناوچەییەکانی (ژ.ک)ی بەئەستۆوە بووە...».

کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» سەبارەت بە ئەندامانی (ژ.ک)ی لقی کرماشان و... دەڵێ: «ساڵح ئۆقلیدۆس خەڵکی کرماشانێ بوو. پێم وایە ئەندامی لقی لاوانی کۆمەڵەی ژ.ک بوو. لە سەردەمی کۆماردا لە بەڕێوەبەرایەتی فێرکردن و بارهێنان کاری دەکرد. زۆر کوردپەروەر بوو. دۆستی «ئیبراهیمی نادری» و «مەحموودی مەحدوود» بوو. «کازمی»ناوێکیش بوو کرماشانی و ڕەفیقی «ساڵح ئۆقلیدۆس» و ئەفسەری کۆمار بوو. «مەحموودی مەحدوود» چووبوو بۆ لای «شێخ مەحموود» و «حەمەڕەشیدخان» و «مەحموودخانی کانیسانان»، ناوبراو زۆر تێگەیشتوو و دۆستی «میرزا عەبدوڵلای مودەبیر» بوو و ماوەیەک لەگەڵ یەکتر هاومەنزڵ بوون. «مەحدوود» نووسەر، نەقاش و زۆر چالاک بوو. لە منداڵییەوە کوردایەتی دەکرد.» سەبارەت بە مامۆستا «سەید تاهیری هاشمی»ش

دەیگوت: «لە سەروبەندی شۆڕشی ساڵی ١٣٥٧ی هەتاوی (١٩٧٨) ئێران «سەید تاهیر»م دیت لێی پرسیم: «ئەرێ «زەبیحی» ماوە؟» گوتم: بەڵێ، چۆنە دەپرسی؟ گوتی: «ئەمن «ژ.ک»ی دەستی «زەبیحی»م».

## ناوی نهێنی و رەمزی چەند شارێک

«ئا. ل. ب» رەمزی شاری «سابلاغ» (مەهاباد)ە. هەڵبەت با ئەوەش بڵێم کە دوو پیتی (ل.ب) چەند پیتی هەڵبژێردراوی ناوی شاری سابلاغە، واتا (ل.ب)ێی سابلاغ بۆتە ناوی رەمزی شارەکە.

«ئا. ک» رەمزی شاری «بۆکان»ە. (بڕوانە هەموو ئەو ناوە نهێنییانەی ئەو دوو پیتەیان لە پێش ناوەکەیە، بۆ وێنە «ئا.ک: برای راست ٦٧» کە ناوی نهێنی «حاجی رەحمانئاغای ئێلخانیزادە»یە کە ئەویش خەڵکی شاری بۆکان بوو.

«ب. ئا. م» رەمزی شاری «سلێمانی»یە.

لە لاپەڕە ١٠ی ژمارە ٥ی گۆڤاری «نیشتمان»دا هاتووە: «لەم مانگەدا «سیامەک» ئەندامی ژمارە ٥٧ دانیشتووی شاری «ئا. ک» سەفەرێکی بۆ شاری «ب.ئا.م» کردووە و ئیدارەیەکی محەللی تەشکیل داوە. ئەوە یەکەم شارە کە کۆمەڵەی ژ.ک لە پارچە کوردستانێکی دەرەوەی مەنتیقەی خۆی ئەندامی لێ وەرگرتووە. لەو ئاگایانەی پێمان گەیشتووە گەنجانی بەشی (ب) لە کوردستانی گەورە زۆر داوخوازی ئەندامەتی کۆمەڵی ئێمەن...» شیکردنەوەی ئەو بەشەش بەپێویست نازانم چونکە لە بەشەکانی پێشوودا ئەوەمان روون کردۆتەوە کە مەبەست لەو کەسە کێیە و روونکردنەوەی پێویستمان لە سەر نووسیوە، تەنیا ئەوەندە زیاد دەکەم کە مەبەست لە (ب) کە هەم لە رەمزەکە و هەم لەو بەشەدا کە دەڵێ: «گەنجانی بەشی (ب)...»دا هاتووە، هەمان «باشوور»ی کوردستانە کە بە عێراق لکێندراوە.

مەبەست لە شاری «ش»، «شنۆ»یە و شاری «غ»ێش «نەغەدە»یە. (بڕوانە لاپەرە ٣ی ژمارە ٢ی «نیشتمان»).

کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» ڕوونکردنەوەیەکی سەبارەت بەو ڕەمزانە هەیە و دەڵێ: «لەو ڕەمزانەدا مەبەست لە «ئا» «ئازەربایجانی ڕۆژئاوا»یە و مەبەست لە «ل: ب» شاری «سابلاغ» یا مەهابادی ئێستایە. ئەگەر پیتێکیش دوای ئەوانە هاتبێ ئەوە یەکێکە لە پیتەکانی ناوی ئەو شوێنە کە ئەندامەکە تێیدا نیشتەجێ بووە.» کە ئەو بۆچوونە زۆر وێدەچێ دروست بێ، با چەند نموونەیەک بێنینەوە:

لە لاپەڕە ٢٢ی ژمارە ٣و٤ی «نیشتمان»دا نووسراوە: «ئا.ک. ت: ع. هەژار ٢٠». هەروەک دەزانین و پێشتریش گوتمان «ئا.ک» ڕەمزی شاری بۆکانە. مامۆستا هەژار بۆخۆی لە چێشتی مجێوردا دەڵێ: «من لە بۆکان بووم و دواتر هاتمە مەهاباد.» بەر لە وەی ماڵی بێتە مەهاباد لە بۆکان ببووە ئەندامی (ژ.ک)، هەر بۆیە زۆر جار لە لیستی ئەو شارەدا ناوی دەهات. دوای دوو وشەی «ئا.ک» وشەی «ت» هاتووە و لە ژێر ئەویش خەتێک کێشراوە کە بە بڕوای من یەکەمین پیتی ناوی گوندی «تەرەغە»یە کە مامۆستا هەژار لەوێ لە دایک بووە و بەشێکی زۆری سەردەمی لاوەتی تێدا ژیاوە. دیسان لە لاپەڕە ٢٣ی ژمارە ٣و٤ی «نیشتمان»دا نووسراوە: «ئا.ل.ب - ل: م.ش. هێمن» لە ژێر پیتی (ل)ێی دووهەم خەتێک کێشراوە. پێشتر گوتمان کە مەبەست لە «ئا.ل.ب» شاری سابلاغ یا مەهابادە، ئەو (ل)ێیەی خەتی لە ژێر کێشراوە و لە دوای ناوی ڕەمزی شارەکە هاتووە، پیتێکی ناوی گوندی «لاچین»ە کە شوێنی لەدایکبوون و ماڵە بابی مامۆستا «هێمن»ە.

لە دانیشتنێکی ڕۆژی ١٣٨٤/١٠/٢٦ لەگەڵ کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» باسی ڕەمزی گەڕەکەکانیش هاتە گۆڕێ کە ئەو بەشە کورتەیەکە لەو زانیارییانانە:

«لە سەردەمی ژ.ک. لە مەهاباد، تەنانەت گەڕەکەکانیش ناوی ڕەمزیان هەبوو، بۆ نموونە «دەستەی هەڵۆ» ناوی نهێنی گەڕەکی «هەرمەنیان» و گەڕەکی «حاجی حەسەن» بووە. گەڕەکەکانی «قووڵەقەبران» و «شوانان» و «ڕەزگەیان» و «مزگەوتی شادەروێش» ناوی نهێنییان «دەستەی باز» بووە. خەڵک شەوانە بە نۆرە لەو گەڕەکانە کێشکیان دەکێشا. سەرۆکی «دەستەی باز» «خاڵەمەلای

داودی» و سەرۆکی «دەستەی هەڵۆ»ش «سەید محەممەدی سەیدی» بوو. سەید محەممەد لە «مەیدانی ئاردی» خانوویەکی هەبوو، لەوێ لە نیزیک ماڵە خۆی سالۆنێکی (ژوور) گەورەی بۆ کۆمەڵەی (ژ.ک) دروست کردبوو. دواتر ئەندامەکانی ئەو کۆمەڵە پەرەیان ئەستاند و گەڕەکەکان بوونە حەوت دانە. دەستەکانی دیکەم لەبیر نەماوە بەڵام لەبیرمە گەڕەکی «رەزگەیان» جودا بۆوە و کاک «مستەفا خاتەمی» کرا بە سەرۆکی گەڕەکەکە. گەڕەکی «هەرمەنیان»یش جوێ بۆوە و کاک «عەزیزی کوردپوور» کرا بە سەرۆکی. گەڕەکەکانی لای «مزگەوتی سەیدنیزام» و «خانەقای شێخ عەلاوەدین»یش بوونە دەستەیەکی سەربەخۆ بەڵام ناوی دەستەکەیانم لەبیر نەماوە.» تەنیا تێبینییەکی کە لە سەر ئەو قسانەی کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» پێویستە باسی بکرێ، ئەوەیە کە رێکەوتی دامەزرانی ئەو ناوە رەمزییانە دەگەڕێتەوە سەردەمی رووداوەکانی دوای خەرمانانی ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی (مانگی ئووت و سێپتامبری ١٩٤١ی زایینی) کە بە هۆی بارودۆخی نالەباری ئێران دەسەڵاتی ئەو ناوچەیە تا رادەیەکی زۆر کەوتە ژێر دەسەڵاتی خەڵک و حکوومەتی ناوەندی هیچ ئاسەوارێکی لەو نێوەدا نەماو و دواتریش کۆمەڵەی (ژ.ک) دامەزرێندرا.

٦

# سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی کێ بوو؟

بۆ روونبوونەوەی پتری ئەو مەبەستە کە سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی (م.س. خوێنین ئەندامی ژمارە ١٠٦٠ی کۆمەڵەی ژ.ک) کێ بووە، سەرەتا با ئاورێک لە کتێبە مێژووییەکان بدەینەوە:

لە بەشی پەراوێزەکانی کتێبی «کۆماری ١٩٤٦ کوردستان» وەرگێردراوی کاک «سەید محەممەد سەمەدی» لە لاپەرە ٢٤٤ لە زمان مەلا «قادری مودەڕریسی»یەوە هاتووە: «رابیتی حیزب (کۆمەڵەی ژ.ک) «سەعیدی حەمە قالە» ناوێک بوو. یەکەمین کۆبوونەوە کە بوو بە هۆی سازکردنی بنەما و نوتفەی (ژ.ک) لە باغی «ئەمینولئیسلام» بوو کە ئەورۆ بیمارستانی «سیل»ی مەهاباد لەو شوێنە هەڵکەوتووە.»

کاک غەنی بلووریان لە لاپەرە ٥٤ی کتێبەکەیدا (ئاڵەکۆک) دەڵێ: «دووسێ رۆژ پاش گەڕانەوەی قازی لە تەورێز زانیم کە میرحاج و مستەفا خۆشناو خۆیان کۆ کردۆتەوە لە بارەگای (ژ.ک) برۆن. پرسیارم لێکردن: ئۆغر بێ؟ [گوتیان] هێندێک گیروگرفت هەیە دەمانهەوێ بچینە باخی سەعیدی حەمەقالەی. کاک سەعید [لە] لایەنگرانی کۆمەڵە بوو. باخەکەی بە باخی «مەعاریف» دەناسرا و لەوبەری باخی عەزیزئاغای هەڵکەوتبوو کە ئێستا «نەخۆشخانەی سیل»ی لێ دروست کراوە.»

کاک غەنی لە درێژەی ئەو قسانەی کە لەگەڵ میرحاج و مستەفا خۆشناو کردوویەتی دەڵێ: «میرحاج گوتی: داوات لێ دەکەین جارجارە وەرە باخی کاک سەعید و سەرمان لێ بدە.» لە پاش ئەو قسانە باسی ئەو کەسانە دەکا کە لە باخی کاک سەعید کۆ دەبوونەوە کە ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کە سەعیدی حەمەقالە کەسێکی ئاسایی نەبووە.

کاک عەلی کەریمی لە کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی عەبدوڕەحمانی زەبیحی» (مامۆستا عولەما) لەگەڵ چەند کەس بە شێوەی ڕاستەوخۆ یا نامە وتووێژی کردووە. یەکێک لەو کەسانە کاک «سەلاحی موهتەدی»یە. کاک سەلاح لە لاپەڕە ٣٦٧ و ٣٦٨دا باسی «مامقادر» ناوێک دەکا و بە کورتی دەڵێ: «مامۆستا هەژار و من لەگەڵ جەماعەتی تایبەتی دەوروبەری مەلا مستەفا لە ماڵی کاکە زیاد میوان بووین... من لەگەڵ مامۆستا هەژار بۆ نوستن و حەسانەوە دەچووینە ماڵی مامقادر کە زۆر خۆشەویست و بەڕێز بوو لە لای کاکە زیاد و هەر لە بەشێک لە قەسرەکەی کاکە زیاددا گۆشەیەک بۆ ژیانی خۆی و ماڵ و منداڵی تەرخان کرابوو. چەند ڕۆژی یەکەم نەمدەزانی مامقادر کێیە بەڵام دەمزانی کوردی ئێرانە و ناشیهەوێ زۆر لەسەر ڕابردووی خۆی قسە بکا. ماڵی هەژار ئاوەدان بێ چما دەیهێشت کەس بە نهێنی و نەناسراوی بمێنێتەوە؟ بەڵێ مامقادریش لە کۆنەپیاوەکانی دەوری جومهووری کوردستانە و هەر ئەو کەسەیە کە من زۆرم شت لەسەر بیستووە. ئەوە «سەعیدی حەمەقالە»ی مەشهوورە کە دەگوترا یەکەمین و تەنیا ترۆری سیاسی دەوری جومهووری ئەنجام داوە و تەقەی لە «مەحموودیان» کردووە و دوای ڕووخانی کۆمار ڕووی کردۆتە کوردستانی عێراق. ماوەیەک لە پشدەر و بیتوێن خەریکی کشتوکاڵ و تووتنەوانی و سەوزیخانەداری بووە و سەرەنجام بە ناوی «مامقادر» لە لای کاکەزیاد لە کۆیە خۆی گرتۆتەوە. مامقادر دەوڵەمەند نەبوو، بە کاری ڕۆژانە و ئارەقی ناوچاوانی خۆی لە ڕێگای باغەوانی و گوڵکارییەوە دەژیا، بەڵام هەرچیم لە هەرکەس بیستووە یا لە هەر کتێبێکدا خوێندبۆوە، لەسەر جوامێری و ماڵخۆشی و پیاوچاکی و دڵپاکی هەموویم لەو پیاوە و ژنومنداڵە مێهرەبانەکەیدا بەدی کرد

لە لاپەڕە ٣٩٦ی هەمان سەرچاوەی پێشوو، ئەوجار کاک «یۆسفی ریزوانی» بە نامە وەڵامی چەند پرسیاری کاک عەلی کەریمی داوەتەوە و سەبارەت بە مامقادر دەڵێ: «... بۆ بەیانی مەحموودیان تیرۆر و شەهید کرا. قاتڵەکان مامقادر و هاشم سەعید بوون. دوای کۆماری کوردستان هاتنە عێراق و مام قادر لە کۆیە و رانیە مایەوە و کاک هاشم لە هەولێر...»

کتێبی «ژ.ک چ بوو؟ چی دەویست؟ و چی لێ بەسەرهات؟» نووسینی کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» لە لاپەڕە ١٥دا لە زمان «مەلا قادری مودەڕڕیسی»دەڵێ: «وە رابیتی (ژ.ک) لەگەڵ حیزبی «هیوا»ی عێراق، «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی» بوو کە بەراستی بێغایەتی زەحمەت دەکێشا.»

کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» نامیلکەیەکی دیکەی وەک تەواوکەری سەرچاوەی پێشوو نووسیوە. ئەو نامیلکەیەی لە حەقدە لاپەڕە و لە زمان مەلا قادری مودەڕڕیسی، پاییزی ١٣٦٣ (١٩٨٤) لە مەهاباد و لە ژێر ناوی «ئاورێکی دیکە لە ژ.ک»دا بلاو کردۆتەوە. مەلا قادری مودەڕڕیسی لە لاپەڕە ٨دا لە بەشی «مێژووی دامەزراندن و هەوڵەکانی کۆمەڵەی ژ.ک» دەڵێ: «رێکەوتی ٢٢ی ٥ی ١٣٢١ (= ١٣ای ئووتی ١٩٤٢) دوای نیوەڕۆ، ماندوو و شەکەت دوای وەرگرتنی قەندوشەکر بۆ خەڵکی شار و عەشیرەتەکانی دەوروبەر لە بەڕێوەبەرایەتییەکەمان بەرەو ماڵێ دەڕۆیشتمەوە کە لە سەر رێگام یەکێک بانگی کردم، کاتێک ئاوڕم داوە دیتم سەعیدی حەمەقالەی بێستانچییە. هاتە پێش و گوتی: سێ میوانمان لە دەرەوە بۆ هاتووە، کاریان بە ئێوە و چەند کەسێکی دیکەیە، فەرموو با بڕۆینە بێستانەکەی من... لە سەر رێگا شەهید «محەممەدی نانەوازادە»م دیت کە هاوکارم بوو. ئەو و یەکدوو کەسی دیکەش هاتن و وێڕای ئەوان چووینە باغی «ئەمینولئیسلام» (شوێنی ئێستای نەخۆشخانەی بنبڕکردنی نەخۆشی سیل لە مەهاباد)... کە چووین دیتمان لە ناوەڕاستی باغەکە لە ژێر دارەگوێزێک سێ کەس خەریکی نانخواردن بوون. پاشان گوتیان بۆ ئێمەش نان بێنن. «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی»ش لەوێ بوو. وا دیار بوو کە پێشتر ناسیاوی لەگەڵ میوانەکان هەبووە. ئێمەی بە ئەوان ناساند. سێ کەسەکە یەکەم سەرهەنگ میرحاج، دووهەم مستەفا خۆشناو و سێهەمیشم

لەبیر نەماوە. هەرسێک لە عێراق خوێندبوویان و ئەندامی حیزبی هیوا بوون و ڕاسپێردرابوون لقی حیزبەکەیان لە مەهاباد دامەزرێنن. بابەتەکە لە هەر لایەنێکەوە شی کرایەوە. لە کۆتاییدا ئێمە پێمان باش نەبوو لقێک لە حیزبی هیوا بین و گوتمان ئێمە لەمێژە بیر لە دامەزراندنی وەها ڕێکخراوەیەک دەکەینەوە بەڵام ئەو شێوە پێشنیارەی ئێوە ناتوانین قەبووڵ کەین...» لە لاپەڕە ۹شدا دەڵێ: «دوای دوو ڕۆژ لە «باغی خیزی» کۆ بووینەوە و پێکهاتین بە جودا کۆمەڵەیەک بە ناوی (ژ.ک) دامەزرێنین.»

کاک «نووری شاوەیس» لە لاپەڕە ۳۵ی بیرەوەرییەکانی خۆی لە کتێبێک لە ژێر ناوی «پەنجا ساڵ خەبات لە کوردستان»دا کە لە لایەن کاک «عومەری فارووقی» کراوەتە فارسی، دەڵێ: «لەو ماوەیەدا هەمزە عەبدوڵڵا دیسان چووە مەهاباد و «مەلامستەفا بارزانی» دیتبوو. مەلا مستەفا پێی گوتبوو تێبکۆشێ کەسایەتی تێکۆشەر و زانا بۆ لای حیزب [ی دێموکراتی ئەودیو] رابکێشێ... هەمزە عەبدوڵڵا و عەلی عەبدوڵڵا نێردرانە هەولێر، هەمزە عەبدوڵڵا پەیکێکی هەبوو (= تەتەر یا رابیت) بە ناوی «مەلا سەعید» کە رابیتی نێوان ئەو و قازی محەممەد و مەلامستەفا بوو. ئەو مەلا سەعیدە پەیتاپەیتا نێوان مەهاباد و هەمزە عەبدوڵڵا هاتوچۆی دەکرد.»

کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» لە لاپەڕە ۱۸۸ی کتێبی «ئاوڕێک لە مێژووی مەهاباد»، لە زمان «مەلا قادری مودەڕیسی»یەوە دەڵێ: «ئێوارەی ڕۆژی ۲۳ی ۱۱ی ۱۳۲٤ی هەتاوی بوو. لە شوێنی چاپخانەی کوردستان (شوێنی ئەوڕۆی چاپخانەی مووەففەقی مەهاباد) کە شوێنی کاری من بوو، دیتم «س.ح.ق» (مەبەستی کاک سەعیدی حەمەقالەی بێستانچییە) کە سەردەمێک ‹رابیتی کۆمەڵەی ژ.ک لەگەڵ حیزبی «هیوا»ی عێراق› و پاشان بوو بە پێشمەرگە و چووە نێو هێزی چەکدارییەوە، جاروبار دەهاتە چاپخانە و سەری منی دەدا، بە پەشۆکاوی و پەرێشانییەوە هاتە نێو ژووری چاپخانە...» پاش ئەوە زۆر بە وردی لە زمان خودی کاک سەعیدی حەمەقالەوە باسی چۆنیەتی تێرۆری کاک غەفووری مەحموودیان کراوە.

«ئەبولحەسەنی تەفرەشیان» لە لاپەڕە ۱۲۷ و ۱۲۸ی کتێبی «قیام افسران

مەبەستی ئێمە بێ. «تەفرەشیان» یەکێک لەو ئەفسەرانە بوو کە دوای سەرهەڵدانی ئەفسەرانی خوراسان و سەرنەکەوتنی سەرهەڵدانەکەیان وێڕای چەند ئەفسەری دیکە یارمەتی حکوومەتی ئازەربایجانی ئێرانیان دەدا. ناوبراو لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی لە پاش رووخانی حکوومەتەکەی «پیشەوەری» هاتنە مەهاباد پێتەختی حکوومەتی کوردستان، بەڵام ئەو حکوومەتەش بەداخەوە سەری نەگرت و ناوبراو لەگەڵ بارزانییەکان بۆ نەغەدە و شنۆ پاشەکشەیان کرد و هەتا خۆبەدەستەوەدانیان بە عێراق لەگەڵ «مەلامستەفا بارزانی» و پێشمەرگەکانی مانەوە. نووسەر لە بەشی «بارزانییەکان»ی کتێبەکەیدا باسی «سەعید» دەکا. با بزانین چۆن لە بارەیەوە دەدوێ: «کەسێکی دیکە کە دەکرێ چارەنووسەکەی سرنجڕاکێش بێ، لاوێک بوو بە ناوی «سەعید». ئەم لاوە لە کوردەکانی عێراق بوو و هەر پازدە رۆژەی جارێکی دەهاتە شنۆ. ئەو لە راستیدا رابیت و تەتەری «حیزبی رزگاری» عێراق لەگەڵ عێلی بارزانی بوو. «مەلامستەفا» سەرۆکی شانازی (ئیفتیخاری) ئەم حیزبە بوو. «رۆژنامەی رزگاری» بە زمانی کوردی بە شێوەی نهێنی چاپ و بڵاو دەکراوە. ئەو رۆژنامەیە هەفتانە بوو. سەعید هەر کات دەهاتە شنۆ چەند نوسخە لەو رۆژنامەی لەگەڵ خۆی دەهێنا.

سەعید لاوێکی ئازا و نەترس و بەجەرگ بوو. هەر پازدەرۆژەی جارێک سەروسەکوتی پەیدا دەبوو. ئێمە دەمانزانی کەنگێ دێ. زۆرتر سەعات چوار یا پێنجی دوانیوەڕۆ پەیدا دەبوو. یەکێک لەو شتانەی پێیەوە دەخافلاین چاولێکردن لە هاتنی ئەو بوو کە لە نێو ئەو بەفرە زۆرەی بەرزاییەکانی پشت شنۆوە دەهات. بەرەبەری ئێوارێ رەشاییەکمان دەدی کە لە نێو ئەو بەفرە سپییەدا دەتلاوە. بە تاقی تەنیا و بەپێیان لە نێو ئەو بەفر و سەرمایە تەنیا بە داردەستێکەوە ئەو رێیەی دەپێوا. ئەو دەهات و گیرفانەکانی پڕ بوو لە رۆژنامە و رێسا و فەرمان و پەیام بۆ مەلا مستەفا کە وەڵام و بیروڕای وەردەگرت. زۆر جار پووڵ و پارەیەکیشی بۆ عێلی بارزان دەهێنا. دوای جێبەجێکردنی کارەکانی شەوێ لە لای ئێمە دەنوست و بۆ سبەینێی ئەوێڕۆژێ، هەر بەو رێگایەدا کە پێیدا هاتبوو دەگەڕاوە و لە نێو بەفریدا ون دەبوو. لە تەواوی ئەو ماوەیەی کە

ئێمە لە کوردستان بووین، سەعید زۆرتر لەگەڵ ئێمە بوو. بەتایبەت دوای ئەوەی کە نێوان ئەرتەشی ئێران و بارزانییەکان شەڕ ساز بوو، هەر لە نێو عێل [ی بارزان]دا ماوە، تا سەر سنووری عێراق لەگەڵ ئێمە بوو. لە سنوور پاش مەئمووریەتێکی کە مەلا [مستەفا بارزانی] پێی ئەسپاردبوو، چۆوە عێراق، ‹لەوێ گیرا و کەوتە بەندیخانەوە›. تەجروبە و پێوەندی ئێمە لەگەڵ کوردەکان ئەو هەستەی لە ئێمەدا ساز کرد کە کوردەکانی عێراق رووناکبیریان پترە و باوەڕمەندترن.»

سەبارەت بە سەعیدی حەمەقالەی یەکەم پرسیارم لە وتووێژەکاندا لە بەڕێز «ئەییووبیان»ەوە دەست پێکرد کە لە وەڵامدا گوتی: «دەمناسی بەڵام وەبیرم نایەتەوە، بەڵام لە دیتنێکی دیکەدا گوتی: کە ئەو کەسە بە بێشک هەر «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی» بوو کە خەڵکی مەهاباد بوو.»

کاک «سەدیق ساڵح» لە کتێبی «یادگار و هیوا چەپکە گوڵی وەفادارییە بۆ مامۆستا برایم ئەحمەد» لە لاپەڕە ۹۱ تا ۹٤وتارێکی لە ژێر ناوی «مامۆستای نەمر ئیبراهیم ئەحمەد بە خامەی خۆی» نووسیوە کە بەپێی پێوەندی بە باسەکەی ئێمەوە چەند بەشێکی لێرەدا دەنووسینەوە: «مانگی ئاغستۆسی (= گەلاوێژ)ی ۱۹٤٤ بوو. لە سلێمانی ئەوقاتیم ئەکرد، رۆژێک مامۆستا ئیسماعیل حەقی شاوەیس... لەگەڵ عوسمان دانش کە لاوێکی کوردی چالاک بوو هاتنە لام و پاش ئەوەی کە مامۆستا شاوەیس باسی رووداوەکانی کوردستانی رۆژهەڵاتی بۆ کردم وتی: ئێمە هەردووکمان چەند کەسێکی کەش لە سلێمانی بووین بە ئەندامی ئەو رێکخراوەی کە وا لە مەهاباد بە ناوی کۆمەڵەی (ژ.ک) واتە ژیانەوەی کوردەوە دروستکراوە لە لایەن کوردە دڵسۆزەکانی ناوچەکەوە و ئێستە ئێمەش ئەمانەوێ لقی خۆمان دامەزرێنین و حەز دەکەین کە تۆش لەم کارە پیرۆزەدا لەگەڵمان بیت. لە دوای ئەم قسانە نامەیەکی دامێ کە بە ناوی کۆمەڵەی (ژ.ک)ەوە بۆ من نووسرابوو و تیایا داوی بوونە ئەندامیان لێ کردبووم. مامۆستا شاوەیس وتی کە وا نامەی وەها بۆ هەندێ کوردی ناسراوی کەش هاتووە، منیش پێم وتن کە بەر لە هەموو شتێ پێویستە پرۆگرامی کۆمەڵەکە ببینم،

بچووک زۆربەی ناوەڕۆکەکەیم زۆر بەدڵ بوو بەتایبەتی گیانی کوردستانێتی‌یەکەی. دوای ئەمە بڕیارم دا کە هاوکاری بکەم لە دامەزراندنی (لق)ەکەدا. بۆ ئەم نیازە لە ڕۆژی دانراوا (١٥) کەسێ لە ماڵی مامۆستا ئیسماعیل کۆ بووینەوە، بەداخەوە هەر ناوی ئەمانەیم لە بیر ماوە: ١) کاک سەدیق شاوەیس برای مامۆستا، ٢) شاعیری نیشتمانپەروەری ناودار کاک فایق بێکەس، ٣) خاتوو بەهێ مارف، ٤) حەمەعەلی مەدهۆش، بەرگدووروو شاعیری ناسراو، ٥) کاک عەزیز میرزا ساڵح بەڕێوەبەری قوتابخانەی هەڵەبجە... هەر لەو کۆبوونەوەیەدا لێژنەیەکی (٥)کەسی هەڵبژێردرا بۆ بەڕێوەبرنی کاروباری لق، بە گشتی دەنگ و بێ داخوازی خۆم منیان کرد بە بەرپرسیاری ئەو لێژنەیە و بڕیاری ئەوەش درا کە من بە نامەیەک سەرکردایەتی (ژ.ک) لە کۆبوونەوەکە و دامەزراندنی لق و هەڵبژاردنی لێژنەکە ئاگادار بکەم. هەروەها لە بارەی پێشنیازەکانی خۆشمانەوە لەمەڕ هەندێ لە بەندەکانی پێڕە و پرۆگرامی کۆمەڵە، کەوا لە کۆبوونەوەکەمان لەسەری ڕێک کەوتبووین کورتەیەکیان پێشکەش بکەم. منیش بەم کارە هەستام و نامەکەم بۆ سەرکردایەتی نارد و ئەوەندەی پێنەچوو وەراممان بۆ هاتەوە لە بارەی بڕیارەکانەوە هەموویان پەسند کردبوو، داوای دەس بە چالاکی کردنیان لێ کردبووین... تا لە ناوبردنی کۆمارەکەمان و لە سێدارەدانی قارەمانە نەمرەکانی و لەکارکەوتنی حیزبی دێموکراتی کوردستان لەسەر ئەو ڕێبازە ڕۆیشتین و لە چالاکی خۆمان نەکەوتین... لە ئەندامانی لقەکەمان تەنیا مامۆستا ئیسماعیل شاوەیس و کاک عوسمانی دانش چاویان بە پێشەوا و زەبیحی و ئەندامانی کەی سەرکردایەتی دێموکرات کەوتبوو و پێوەندی‌یان کردبوو لەو کاتەدا کە لقەکەمان ناردنی بۆ ئەودیو دوای گۆڕانی (ژ.ک) و دامەزراندنی (ح.د.ک.ا). مامۆستا شاوەیس دوای نزیکەی مانگێ گەڕایەوە، بەڵام دانش تا دوای هەڵکردنی ئاڵای کۆماری کوردستانیش بۆ ماوەیەک لەوێ مایەوە وەک نوێنەری لقەکەمان.»

لە کۆتایی‌دا مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە لاپەڕە ٩٤دا دەڵێ: «تەتەری ئێمە ناوی (سەعید) بوو، لاوێکی خەڵکی سلێمانی لە بنەماڵەی شاعیری ناودار (مەحوی) تا بڵێیت پیاوێکی دڵسۆز و پاک و لەخۆبوردوو بوو، یەکێ بوو لە

ئەندامە نەبەزەکانی (ژ.ک) و پاش ئەویش هی پارتی. لە دوای کارەساتی مەهاباد بەداخەوە بە جۆرێکی نەزانراو ئەویش لە ناو چوو. لــە ساڵــەکانی (٥٠)دا. / ٣ی ٤ی ١٩٩٧.»

کاک «سەدیق ساڵح» لە لاپەڕە ٩٤دا، لــە خــوار ئــەو وتــارە لــە بەشــی پەراوێزەکاندا نووسیویەتی: ٣- ســەبارەت بــە دیــوێکی ژیــانی خەباتگێڕانــەی (سەعید) تەتەری ژ.ک و پارتی، بڕوانە: (سەعید تەتەری نەناسراوی کوردایەتی). لە خوار ئەو پــەراوێزەش نووســیویەتی: گۆڤــاری (هــەزار مێــرد)، ژمــارە ١٠، کانوونی یەکەمی ١٩٩٩.

هەر ئەو وتارەم وەبەر چاو کەوت، کەوتمە هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی و کەس نەما و شوێن نەما سۆراغی ئەو گۆڤارەی لێ نەپرسم و نەچم. لە کۆتاییدا هەموو کارەکەم راگرت و بە تەلەیفوون و ئیمەیل پێوەندیم بــە بنکــەی ژیــن لــە سلێمانی و بە کاک «رەفیق ساڵح» و کاک «سەدیق ساڵــح»ەوە گــرت و داوام لــێ کردن کە ئەگەر ئەو گۆڤارەیان لە بەر دەستدایە، زەحمەتی ناردنەکەی بکێــشن. ئەوە بوو کە بە پیر داواکارییەکەم هاتن و لە١٢ی٥ی١٣٨٥، ٣ی ئاگۆســتی ٢٠٠٦، وتارێکیان لە رێگای ئیمەیل بۆ ناردم. بەڵام کاتێک چاوم لــە وتارەکــە کــرد بــە سەرسوڕمانەوە دیتم وتارەکەی مەبەستی من نییە. ئــەم وتــارە لــە ژێــر نــاوی «دیسان سەعیدی تەتەر» بوو لــە ١٢ لاپــەڕەدا کــە بەداخــەوە نــاوی نووســەر و سەرچاوەکەشی بە سەرەوە نەبوو و لە دوو سێ جێگاش قسە و باسەکە کۆتــایی پێنەهاتبوو و پەراوێزەکانیشی هەڵبڕابوون. دوای ئەوەی کە خوێندمــەوە دیــتم ئەویش هەر باسی «سەعید» ناوێکە و مەبەستەکەی ئێمە دەگرێتەوە بەڵام وتــارە داواکراوەکەی من نەبوو. ئەو جار بە هۆی ئەو دۆست و برادەرانەی هــاتوچــۆی ئەودیویان دەکرد داوای وتاری بلاوکراوە لە گۆڤاری ژمارە ١٠ی «هەزارمێرد»م کرد کە بۆم پەیدا کەن. دیسان کارەکەم پەکی کەوت، دەستم راگرت تــا بەخۆشــییەوە ئەو وتارەشم لە رۆژی جومعە ٢٤ی ٦ی ٨٥ (١٥ی سێپتامبری ٢٠٠٦) بە زەحمەتێکی زۆر بە دەست گەیی.

چونکە بەر لە وەدەســتهێنــانی ئــەو وتارانــە وتوویــژم لەگــەڵ کــاک

شتی دیکەش رادەگرم و وتوویژەکەی کە لەگەڵ کاک «رەحمانی خانزادیّ» پێکم هێنابوو دەخەمە بەر دیدەی خوێنەران و لە پاش ئەویش شیکردنەوە و بەراوردی ئەو دوو وتارە و چەند قسە و بیروڕایەکی دیکە لەگەڵ قسەکانی ناوبراو و ئەو کتێبانەی کە پێشتر باسمان کردن، دەست پێدەکەین.

بۆ روونکردنەوەی زیاتری ئەو بابەتە رێکەوتی ٢٦ی ١١ی ٨٤، بەرامبەر دەگەڵ ١٥ی فێورییەی ٢٠٠٦ چوومە خزمەت کاک «رەحمانی خانزادیّ» (نیک‌نەفس) کە ژنبرای کاک «سەعیدی حەمەقالە»یە. کاک رەحمان سەبارەت بە ژیان و بەسەرهاتی کاک «سەعیدی حەمەقالە» گوتی: «ناوی بابیم لە بیر نییە بەلام پێم وایە ناوی قادر بوو و ناوی دایکیشی گوڵیّ بوو. ناوی خۆی سەعید و ناسناویان «پاکرەوان» و لێرە مەشهوور بوو بە «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی». لە سەردەمی دەسەلاتی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە شوێنی «بیمارستانی سیل» بێستانی هەبوو. لەویّ کوڕێکی لەگەڵ بوو بە ناوی «عەبدولعەزیزی عیشقی ئیلاهی» کە بە عەزیزی باغەوان مەشهوور بوو. زۆر جار «میرحاج» و چەند ئەفسەری کوردی ئەودیوی کە هاتبوونە ئێرە دەچوونە لای کاک سەعید. لەویّ چادری بۆ هەڵدابوون و پێکەوە قسەیان دەکرد. کاک سەعید زۆر خوێندەوار و بەسەواد بوو و کتێبخانەیەکی چاکی هەبوو کە هەمووی فەوتا و کوردایەتیشی زۆر پێخۆش بوو فارسی چاک دەزانی و هێندێکیش عەرەبی دەزانی. بەر لەوەی رابکاتە ئەودیو، لەویّ فەقیّ بوو هەر بۆیە «فەقیّ سەعید»یشیان پیّ دەگوت. (لێرەدا کاک قادری برازای کاک سەعید کە لە وتوویژەکەدا ئامادە بوو) گوتی: «کاک «عوسمانی دانیش» موعەللیمی من بوو، مامم (کاک سەعید) رەخنەی لەویش دەگرت. زۆر خوێندەوار بوو و کتێبی زۆر دەخوێندەوە. ئەمن لە جەریانی کودتای دوکتور موسەددیق هەموو کتێبەکانیم لە تەندووری هاویشت و سووتاندم.ئەو رابیتی کۆمەڵەی «هیوا» و کۆمەڵەی (ژ.ک) بوو.» کاک رەحمان لە درێژەی قسەکانی‌دا گوتی: «جا هەر لەبەر ئەو هاتوچوویەی بۆ ئەودیو، لەگەڵ کوردەکانی عێراق ئاشنا ببوو و دۆست و ناسیاوی چاکیشی پەیدا کردبوو. دوای ئەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک) دامەزرا، زۆربەی ئەو ئەفسەر و بەرپرسانەی هاتبوونە مەهاباد و کاک سەعید لەویّ لەگەڵیان ئاشنا ببوو، سەریان دەدا و لە لای ئەو

دەمانەوە، جا هەر لەبەر ئەو ئاشنایەتی و دۆستایەتییە بوو کە ببووە رابیتی کۆمەڵەی (ژ.ک) و کۆمەڵەی «هیوا». لێرەدا کاک قادری پاکڕەوان (برازای کاک سەعید) گوتی: «مامم لەگەڵ براکەی خۆی کاک محەممەد کە باوکی من بوو و بە حەمەقالە مەشهوور بوو، پێکەوە لە حەسارێکیدا بوون. ماڵمان کۆڵانێک خوار حەمامی مۆرەکی لە نیزیک سێڕای وەفایی بوو. ئەمن منداڵ بووم لە نێو شاری قسە بڵاو بۆوە کە مامە سەعیدم «غەفووری مەحموودیان»ی کوشتووە. ئەمن لە ماڵێ بووم، مامم هاتەوە، تفەنگێکی بڕنوو و دەمانچەیەک و فیشەکدانێکی پێوەبوو، هەر هاتەوە یەکڕاست چووە دیوەکەی خۆی. دایکم واتە براژنی مامەسەعیدم چووە دیوەکەی و زۆری لێ تووڕە بوو و بەگژێدا هات. مامم هیچی نەگوت، چون شتەکە بۆ حاشا نەدەبوو. با ئەوەش بڵێم کە کاتێک ئاغای مەحموودیان کوژرا، ئەوە بە قورعە (تیروپشک) بوو، ناوی مامم وەدەرکەوت، دەبوو ئەو، ئەو کارەی کردبا.» لە پاش قسەکانی کاک قادر، کاک رەحمان گوتی: «لێرە کە کاک سەعید قاچاغ بوو، زەمانی قازی محەممەدی بوو، هەڵاتە دێی «گەسگەسک» لەوێ بوو بە بێستانچی «سەید تەهای گەسگەسک». نیزیک دوو ساڵان لەوێ ماوە. مانگایەک و هێندێک شتمان بۆ برد. لەوێ کابرایەک بە ناوی «ساڵحی مەستانی» کە لەوێ سەرباز بووە دەیناسێتەوە و راپۆرتی لێدەدا. کەسێکی دیکە کە ناوی کاک «رەحمانی کابانی» بوو، ئەویش هەر خەڵکی مەهاباد و دەگەڵ ئەو «ساڵحی مەستانی»یە لە یەکشوێن پێکەوە سەرباز بوون. خودی ئەو سەربازە بۆ کاک رەحمانی کابانی دەگێڕێتەوە کە «مام سەعید»ی دیوە و ناسیوێتەوە و گوزاریشی لێداوە. کاک رەحمان هەستی کوردایەتی زۆر بوو، شەوێ بەدزێوە رۆیشتبووە نێو دێی گەسگەسک و بە مام سەعیدی گوتبوو فلانەکەسێک راپۆرتی لێداوی، بەر لەوەی بگیرێی هەڵێ، گوتبووشی نابێ کەس بزانێ کە من بە تۆم راگەیاندووە و دەبێ برۆمەوە. زستان بوو کاک سەعید هەر ئەوێشەوێ دەچێتە دێیەک بە ناوی «بندرە» و لەوێ بە هۆی دۆستێکی دەچێتە دێی «گردەسوور». ئەو دوو دێیە هەردووک لە نیزیک شاری «پیرانشار»ن. ماوەیەک لەوێ بە ژن و منداڵەوە

لەجیات قەرزێ لێ گێڕابۆوە؟! بەڵێ لە گردەسووریش بۆیان نەدەگوزەرا. مام سەعید چووە «خەلان»ێ کە لەودیوی سنووری کوردستانە و لەگەڵ «حەمەسەرشکاو» و «مرادەکەچەڵ» و «محەممەدەقەڵەو» یەکتریان گرتەوە کە ئەوانیش هەر پێشمەرگە بوون و قاچاغ. «شێخ عەلاوەددین»ی خەلانێش لەوێ دەبێ. لە سەر حەوزێ هاتبوون دەست و چاویان بشۆن و خۆ فێنک کەنەوە، پۆلیس دەیانگرێ و یەکسەر دەیانباتە کەرکووک.» کاک رەحمان لە درێژەی ئەو بابەتەدا گوتی: «مام سەعید بۆخۆی بۆ منی گێڕاوە کە: «لە کەرکووکێ چونکە من خوێندەواریم هەبوو دەیانناردم بۆ کڕینی شتومەک و پێداویستییەکانی بەندیخانە. ئەمنیش ماوەیەکی زۆر شتم دەکڕی و پاشان دەگەڕامەوە بۆ زیندان کە تەواو لێم ئەرخەیان بوون و ناسیانم، ئەوجار بۆ جارەکانی دیکە کارم هەر ئەوە بوو هەر جارەی لە کەسێکی کە زانیبام کوردە پرسیارێ بکەم ئەرێ ئەگەر بۆ لای کوردستانێ بڕۆی دەبێ بە کێها دێهات و جادەدا بڕۆی؟ وردەوردە هەموو گەڕەکەکانی کەرکووکم ناسی کە کوێ کوردە و کوێ عەرەبە. پاش ئەوەی تەواو شارەزا ببووم و لەو نێوەشدا لەگەڵ بەرپرس و پۆلیسەکانی زیندان ناسیاویم پەیدا کردبوو، رۆژێکی هەڵاتم و نەچوومەوە. شەووڕۆژێکم پێچوو گەیشتمە «کۆیە». لەو نێوەیدا ئاو هەبوو بخۆمەوە بەڵام لەو ماوەیەدا نانم نەخواردبوو.» کاک رەحمان دیسان لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: «لە کۆیە ناردبوویانە لای کاکەزیادی کوڕی «حەمەئاغای کۆیە». کاکە «زیاد»یش کردبوویە باغەوانی خۆی و پاش ماوەیەک ناردبوویە لای «هەباسئاغای سەرکەپکان» کە سجیل (ناسنامە)ی بۆ وەرگرێ. ئەوە بوو کە بە ناوی «قادر» ناسنامەیان بۆ وەرگرت و مەشهوور بوو بە «مام قادری باخچەوان.» پاش ماوەیەک لە لای کاکە زیادیش نامێنێتەوە و دەچێتە رانییە و لەوێ خانوویەکی لە «حەمەبێکراس»ی دەکڕێ کە ئەویش بە ئەسڵ خەڵکی مەهاباد و زڕبرای «مەلاکەریمی قازی» بوو. کە شەڕی دەوڵەت و کورد دەستی پێکردووە، کاک سەعید دیسان ئاوارە بۆوە و بەماڵەوە هاتە «حاجی ئۆمەران». پاش ماوەیەک کە وڵات هێمن بۆوە گەڕاوە رانییە. لە شەڕی دووهەمدا ئەوجار هاتە سەر سنووری سەردەشت و ماوەیەک لە دێیەک بە ناوی «گۆڕەشێت» دانیشت و بۆ جاری سێهەم ئەوجار لە ساڵی ۱۳٥٤ی هەتاوی

(١٩٧٥) وێڕای مەلا مستەفا و خەڵکی دیکە هاتنەوە. سەردەمێک لە مەهاباد بوون و پاشان چوونە دێیەک بە ناوی «شیوەڕەش» لە لای خانێ، مام سەعیدیشیان لەگەڵ بوو. دوای ڕۆیشتنەوەی بۆ ئەودیو، تا شۆڕشی ئەودواییە (١٩٩٠) دەستی پێنەکردبوو لەوێ ماوە، کە شۆڕش دەستی پێکرد دیسان ئاوارە بۆوە و سەرێکی مەهابادیشی داوە. ساڵی ١٣٦٩ یا ١٣٧٠ (١٩٩٠ - ١٩٩١) سێ چوار ڕۆژ دوای چوونەوەی بۆ ئەودیو لە ڕانییە ئەمری خودای کرد. کاک سەعید دوای ئەوەی ئاوارەی ئەودیویش بوو دەستی لە کوردایەتی هەڵنەگرت و لەگەڵ کاک «سولەیمانی موعینی» و تێکۆشەرانی دیکە پێوەندی هەر مابوو. حەوت کوڕ و کچێکی هەبوو کە دوو کوڕی بە ناوی «عەلی» و «وریا» پێشمەرگە بوون و شەهید بوون. خێزانی خوشکی منە و ناوی «مەنیج»ە و ئێستاش هەر ماوە. کاک سەعید لەو دیویش لە ترسی دەوڵەت حەسانەوەی نەبوو و زۆر جاران لە ترسی ئەوەی دەوڵەت زەختی بۆ نەهێنێ دەچووە دێیەک بە ناوی «کەرسۆنان» لە پەنا «ڕانیە» و جاری وابوو شەش مانگ لەوێ دەماوە، چونکە دەوڵەت دەیگوت دەبێ کوڕەکانت بێنییەوە و دیارە ئەوەش بە کاک سەعید نەدەکرا.»

قسە و بیر و ڕای کاک «ڕەحمانی خانزادێ» و کاک «قادری پاکڕەوان» لێرەدا کۆتایی پێدێ. بەڵام بەر لە وەی قسەی کاک ڕەحمان لەگەڵ ئەو دوو وتارەی پێشتر ئاماژەم پێ کردن لە بەریەک ڕابنێین، تەنیا ئەو جێیانەی گرینگی تایبەتیان هەیە و پێوەندییان بە باسەکەی ئێمەوە زۆرترە دەنووسمەوە، دوای ئەویش دەست دەکەین بە بەراورد کردنیان.

با بزانین وتاری «دیسان سەعیدی تەتەر» لەو بارەوە چ دەڵێ: ئەو وتارە لە لاپەڕە ١دا دەڵێ: «مەلامحەممەدی ڕەشی ناسراو بە «مەلای ڕەش» کوڕی ساڵحجانی و خەڵکی دێی «داراغا»ی سەر بە ناحیەی سەرچنارە بە منداڵی خراوەتە بەر خوێندن و دوا جار بووە بە فەقێی «مەلا عەبدوڕڕەحمانی پێنجوێنی» و ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرتووە. ناسناوی «ڕەش»ی لەوەوە هاتووە کە ڕەشتاڵە بووە. مەلا محەممەد هەر دوو برای هەبوون، عەبدوڕڕەحیم و قادر.» لە پەراوێزی ژمارە ٢ی ئەو قسانەدا هاتووە: کاک قادری ئەحمەد خێلان

شوێن گەڕاوە و دوا جار لای شێخ عەلائەددینی بیارە گیرساوەتەوە و ئیجازەی لێ وەرگرتووە... بەڵام نەبیستراوە شێخ عەلائەددین ئیجازەی مەلایەتی دابێ.» لە لاپەڕە ٢دا دەڵێ: «سۆفی سەعیدی وەتراقچی (= کەسێک کە کۆنەفرۆشە و کەلوپەلی وەک گوریس و لەغاو و پاشکۆی ولاغ و لباد دەفرۆشێ) خەڵکی دێی «مایاوە» مەنسووبی شێخ حەسەنی پیری قەرەچێوار بووە، بە هۆی پێوەندی دینداری و خواپەرەستییەوە، دۆستایەتییەکی گەرمی لەگەڵ «مەلامحەممەد»دا هەبووە، بە رادەیەک دڵبەستەی بووە «حەلیمە»ی کچی لێ مارە کردووە.

مەلا محەممەد لەو ژنە هەر «مەسعوود»ی بووە. عەبدوڕڕەحیمی برای کاتێک مردووە، «مریەم»ی کچی شیرەخۆرە بووە. بۆیە هێناویەتیە لای خۆی و لەگەڵ مەسعوودی کوڕیدا کە چەند مانگێکی کەم لە مریەم بچووکتر بووە، گەورە و پەروەردەی کردووە و پێی خوێندووە و، «گوڵە»ی دایکیشی داوەتەوە بە شوو، چونکە گەنج بووە. ئەگەر مێژووی لەدایکبوونی مریەم (١٩٠٩)، وەک لە ناسنامەکەیدا تۆمار کراوە، راست بێ، کە زۆر رێی تێ ئەچێ لەبەر ئەوەی لە لای مەلای رەش ژیاوە و گەورە بووە، مێژووەکە بەڕاستی نووسرابێ، ئەوا ئەبێ مەسعوودیش کەم و زۆر لە هەمان ساڵ (١٩٠٩) یان لەو دەوروبەرە لە دایک بووبێ.» لە لاپەڕە ٢ و ٣دا باسی ئەوە هاتووە کە مەلای رەش خەریکی کشتوکاڵ بووە. لە کۆتایی ئەو لاپەڕەیەشدا دەڵێ: «بە نەخۆشی زەحیری سەری ناوەتەوە و تەرمەکەی براوەتەوە بۆ دێی «قەرەتۆغان» و لەوێ نێژراوە.» لە لاپەڕە ٣ ئەوجار باسی «مەسعوود» دەکا لە زمان «مەلا عوبێد» و دەڵێ کە:«[مەسعوود] وێڕای ئەو لە لای باوکی خوێندوویانە و [مەسعوود] هەر لە سەرەتاوە حەزی لە خوێندن نەکردووە و بایەخێکی زۆری پێنەداوە... جگە لە وە وەک دەرئەکەوێ هەر لە منالیەوە گیانێکی بەرهەڵستی سەختگیریی هەبووە. بۆیە کە گەورە بووە و چاوی کراوەتەوە، دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە و هەڵاتۆتە ناوچەی پێنجوێن و لە لای کوێخا رەسووڵ ناوێک بووە بە رەنجبەر. [پاڕاگرافی پێشووتر باسی لێ دەکا و دەڵێ: «مەلا حەسەنی عەللاف» مامۆستای دەرسی دینی مەسعوود بووە و لە گەڵی توندوتیژی نواندووە و رەق بووە. رەنگە ئەوە هۆیەکی ملنەدانی مەسعوود بۆ دەست هەڵگرتن لە خوێندن بووبێ.] بە سۆراخ

دۆزیویەتیەوە و هێناویەتە لای خۆی. بەڵام مەسعوود دابین نەبووە و، پاش ماوەیەکی تر دیسان خۆی دزیوەتەوە و ئەمجار بە یەکجاری سەری خۆی هەڵگرتووە و لە کەس‌وکار و خزمەکانی دوور کەوتۆتەوە.»

ئەوەی زۆر جێگای سەرنجی ئێمەیە پاراگرافی دوای ئەو قسانەیە کە دەڵێ: «زانیاری سەبارەت بە ژیانی لەوە بە دوای مەسعوود کە ئەوی زانراوە ئیتر ناسناوەکانی «سەعید» و «وەستا عەزیزی کارگەچی» و «کاکەی درێژ» و «سەعید مەهابادی» هەبوون، کەم و پچڕپچڕە.»

واتە مەسعوودی کوڕی مەلا محەممەدی ڕەش ئەو ناسناوانەی هەبووە. لە پاش ئەم قسانە نووسەر دەڵێ: «ئەمەی خوارەوە چەند مشتێکە لە خەرمانی پڕ بەزەکەتی ڕەنج و تێکۆشانی ئەو نەمرە» و لە لاپەڕە ٤ و ٥ قسەی چەند کەسێکی سەبارەت بە مەسعوود هێناوە کە لە لاپەڕەکانی دیکەدا ئەوجار بە «سەعید» ناوی بردووە. لاپەڕە ٤ دەڵێ: «مامۆستا کەریم زەند، سالانی ١٩٣٩ تا ١٩٤٠ کە سەعید لە هەڕەتی لاویدا بووە، ئەم لە خانەقای مەحوی دیویە کە بنکەی کۆمەڵی (برایەتی) بووە. بۆیە دوور نییە پێوەندی پێوە هەبووبێ. هەر بە قسەی ئەو ئەندامی حیزبی (هیوا) بووە.

سەردەمی کۆماری کوردستانیش لە مەهاباد، لە دێی «دزە»ی ناوچەی مەرگەوەڕ سەید عەبدوڵلای گەیلانیدا دیویە، پاشتر کە ئەم لە حکوومەت قاچاغ بووە و لە دێی «چۆیسە» دەرسی بە منداڵەکانی شێخ قادر وتوەتەوە، سەعیدی لەو ناوە دیوە خەریکی کارگەچێتی (= پیشەی دروستکردنی سەرکلاو و کیفی تفەنگ و پەستەک و کەپەنک و...) بووە و دەستێک رانک‌وچۆغەی پێشکەش کردووە. هەتا ئاگاداریشە کە سەعید کێش‌وهەوری و سرکەیی و مشکی لە ئێرانەوە هێناوە و بە هۆی کەریمی حاجی مەلا مارفی برای دکتۆر ئەوڕەحمانەوە لە سلێمانی ساخی کردۆتەوە.»

هەر لە لاپەڕە ٤ و لە درێژەی ئەو وتووێژانەدا دەڵێ: «سەعید دوای رووخانی کۆماری کوردستان و کۆبوونەوەی بارزانییەکان و ئاوارەی تری ئەمدیو لە «شنۆ» و سەرسنوور، وەک پێشتر چەندین جار بۆ کاری پێویست و ناچاری

کردووە: «جارێک کۆمەڵێک خەڵکم لەوێوە هێنایەوە دیوی عێراق و لە رێگا لە دیانە گیرام. ئەو دەفتەرەیان پێگرتم کە بە رەمز ناوی بەشداران و گەورە و دۆستانم تێدا تۆمار کردبوو. دوو شەو و دوو رۆژ بەستمیانەوە و هیچیان نەدامێ. بردیانمە کەرکووک و ئەمجا بەغدا. چوار تا پێنج مانگێک ئازار درام. قاچم لە گەرماندا وەخت بوو کرم تێی‌بدات. نائیب عەریفێکی کورد لەو بەندیخانەیەدا جاروبار یاریدەی ئەدام و شتێکی بۆ ئەهێنام. بە راسپاردەی پزیشک ماوەیاندام لە ژووری زیندان بێمە دەر و رۆژانە دوو سەعاتێک بگەڕێم. ئەڕوانم ئەوە هەر چوار ئەفسەرەکەی مەهابادن، عیززەت و خەیرولڵا و قودسی و خۆشناو لەوێن. نۆ مانگ لەوێ مامەوە، و هێنامیانەوە بەندیخانەی کەرکووک. ئەوکاتە ماڵە بارزانیەکان لە قوتابخانەیەکی چۆلکراوی لای مەیدانی «ئیشەک» بوون. لەوێشەوە برامە هەولێر. دوایی لە رێگای رەوانەکردنەوەدا هەڵاتم.»

لە لاپەڕە ٥دا دەڵێ: «کاک مەلا عوبێد بیریەتی کە سەعید دوای رووخانی کۆمار هاتۆتەوە و سەرباری ئەو تێکشکانە سیاسیە گەورەیە کە ئەوسا جۆرە نائومێدیەکی لە دڵی خەڵکدا چاندبوو، ئەو کۆڵی نەدا و تێکۆشیوە تا تێکەڵی کاری حیزبایەتی بکات. بەڵام ئەم لەبەر باوکی رازی نەبووە، بۆیە ئەویش وازی لێهێناوە و رۆیشتووە. تەنانەت چەندین جاریش لەگەڵ خوالێخۆشبوو «هەمزە عەبدوڵلا»دا دیویە.» هەر لە لاپەڕە ٥دا دەڵێ: «هەر کاک قادر [ی ئەحمەدخیلانی] لە زمانی کۆمەڵێکی وەک کەریمی رەشە ناسکە و عارفی مەلاعەزیز و کەریم قەشانی و ئەحمەد خەیات و چەند کەسێکی تری شیووعی خەڵکی سلێمانیەوە کە ساڵی ١٩٤٩ گیرابوون و لەگەڵ سەعیددا لە بەندیخانەی سلێمانی بوون، گێڕایەوە: «سەعید کە گیرابوو، ناسنامەیەکی ساختەی پێبوو تا نەناسرێتەوە. ئەو کاتە ژمارەیەکی زۆری ئەندامانی حیزبی شیووعی عێراق دەستگیر کرابوون و خرابوونە بەندیخانە.»

دیسان لە لاپەڕە ٥دا، مامۆستا «عەبدوڕڕەقیب یۆسف» لە زمان «نەعیمە خان» دەڵێ: «نەعیمە خان وتی: کە کاکم «ئیبراهیم ئەحمەد» ژنی هێنا «سەعید» فەرشێکی گەورەی لە ئێرانەوە بۆ هێنا» لاپەڕە ٦ دەڵێ: «سەعید ساڵانێکی ژیانی بە کارگەچێتی و بە ناوی وەستا عەزیزەوە لە کانی پانکە بەسەر بردووە و لە

ساڵی ١٩٥٣ کە خاڵە محەممەد سەعیدبەگی سەلیمبەگی جاف بەماڵەوە هاتووەتە «سەیدسادق»، لەو ناوە دیویە وا باسی دەکات: «سەعید سەڵت بووە و دووکانی هەبوو، خۆی دەرنەئەخست کە حیزبییە و هیچی ئاشکرا نەدەکرد. بە ئەقڵ ئەمزانی ئەم کابرایە شتێکی ژێربەژێری هەیە. لێمان ئەمین نەبوو. وەستا عەزیز کەڵەگەت و بەخۆوە بوو، ئەو وەختە ٣٥ - ٤٠ ساڵ بووبێ. خەڵک ئەیانوت بە شەو دەفتەری بە دەستەوەیە لەبەر چرادا تەماشای دەکات و دەیخوێنێتەوە.»

دیسان هەر لە لاپەڕە ٦ باسی ئەوە دەکا کە: ماموٚستا «برایم ئەحمەد» و «حیلمی عەلی شەریف» و «سەعید» خانوویەکیان بەکرێ گرتبوو و بەیەکەوە بوون و هەروەها باسی گواستنەوەی کەلوپەل و ئامێرەکانی سەعید دەکا کە دوو جاران بەپەلە رایانگواستوون و شاردوویانەتەوە چونکە بە قسەی سەعید حکوومەت بە شوێنی ئەوی زانیوە.» (لێرەدا قسەکە هەڵبڕاوە و بە نیوەچڵی ماوەتەوە). پوختەی لاپەڕە ٧یش ئەوەیە کە: سەعید دوای کانی پانکە دەچێتە سوورداش و ئەحمەد قادری ئامۆزای کە ئەوکات بیست ساڵێک بووە سێ مانگ کارگەچێتی لەگەڵدا کردووە و لە بناری شارەزوور و ئەحمەد قادری دەڵێ: «هەستم ئەکرد بە بیانووی ئەم ئیشەوە شتی تر ئەکات» هەروەها کاک قادری ئەحمەد خیلان سەعیدی لە دەوروبەری ١٩٥٦ لە کەرکووک دیوە کە گوایە خەریکی کاسبی وەک میوە فرۆشتن بووە و پێوەندی بە کەسانێکی وەک شێخ حوسێنی سەید ئەحمەدی خانەقا هەبووە کە ئەندامێکی دیاری پارتی بوو.»

لە کۆتایی لاپەڕەی ٧دا هاتووە: «قادری ئەحمەدخیلان نامەیەکی سەعیدی کاتی گەڕانەوەی مەلامستەفا بارزانی لە ساڵی ١٩٥٩ بۆ عێراق، بۆ بردۆتە ئوتێلی «سەمیرامیس» لە بەغدا» (لێرەشدا قسەکە هەڵبڕاوە و پاشماوەکەی نەهاتووە).

لاپەڕە ٨ پوختەکەی ئەوەیە کە سەعید تا سەردەمی کۆماریش لە عێراقدا هەر مابوو و لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوول لێی بیستراوە کە خەریکی

ویستوویەتی بە قسەی خۆی گەنجینە بدۆزێتەوە و بەرهەمێک بۆ کورد پەیدا بکات. نووسەر دەڵێ: «برایان قادر و مەحموودی ئەحمەدخیلان و ئامۆزا و نەوەکانیان ئەڵێن: «سەعید بۆ ئەو مەبەستە خەریکی تەقاندنەوەی ئەشکەوتێکی «قەڵای جۆڵندی» ناوچەی «چەمی ڕێزان» بووە بە سەریدا تەقیوەتەوە و رووخاوە و ژێر بەرد و خۆڵ کەوتووە و گیانی دەرچووە. ماوەیەک لەوە بەدوا شوان هەستی بە بۆساردی ئەوناوە کردووە. ئیتر کە خەڵکی دێیەکی نزێک چوون گەڕاون تەرمەکەیان دۆزیوەتەوە و ناشتوویانە، ئەگەرچی نەیانناسیوە. هەتا ئەو سەردەمەی شۆڕش بەڕێز «مامجەلال» لەو ناوچەیە بووە و دەفتەرەکەی باخەڵی سەعیدیشی کەوتووەتە لا.»

هەر لە لاپەڕە ٨ مامۆستا عەبدوڕڕەقیب یۆسف نووسەری ئەو وتارە گەشتێکی بۆ شوێنەوارەکانی «دۆڵی زەرزی» و بەتایبەت قەڵای جۆڵندی کردووە بەقسەی «کاک حوسێنی حاجی مەحموود»ی خەڵکی دێی زەرزی جارێک چەند ساڵ لەمەوبەر یەکێک تەقەمەنی تێدا تەقاندۆتەوە و بە سەریدا رماوە و لە ئاکامدا بەوە گەیشتوون کە ئەوە هەر ئەو «سەعید»ەیە کە ئەوان مەبەستیانە.»

وتارەکەی نووسەر بەو چەند دێڕە کۆتایی دێ و دەنووسێ: «سەعید مرۆڤێکی کەڵەگەتی گەنمڕەنگی چاوبرۆڕەشی چوست و چالاک و سەربزێو و کردە بووە و، خزمە نزیکەکانی ئەڵێن خوالێخۆشبوو «مەلا مستەفا» هەر لەبەر خۆشەویستی و دڵسۆزی و بە شیرینی ئەو «کاک مەسعوود»ی کوڕی وا ناو ناوە. کوڕە گەنجەکانی کەسوکاری سەعید هەم ئاگاداری ئەم وردە هەواڵانەن و هەم بە شانازییەکی زۆرەوە ناوی دێنن و یادی ئەکەنەوە. سەعید تا گۆڕ غەریب بوو، بە سەڵتی ژیا، یادی بەخێر».

وتاری «دیسان سەعیدی تەتەر» لێرەدا کۆتایی دێ . وتارەکە لە دوو سێ جێگا رستەکانی هەڵبراون و پەراوێزەکانیشی تا ١٧ دانە هاتووە کەچی ئەو وتارەی وەدەست من کەوتووە هەتا ژمارە ٩ی تێدا. ئەگەرچی ناوی نووسەری بەسەرەوە نییە بەڵام وێدەچێ بەرهەمی لێکۆڵینەوەی مامۆستا «عەبدوڕڕەقیب یۆسف» و کاک «سەدیق ساڵح» بێ.

## شیکردنەوەی وتاری «سەعید تەتەری نەناسراوی کوردایەتی»

ئـەم وتــارە هـ ەروەک پێــشتر باسمــان کــرد لــە ژمــارە ١٠ی گۆڤــاری «هەزارمێرد»دا چاپ کراوە. وتارەکە لە نۆ لاپەڕەدا و لــە لایــەن کــاک «ســەدیق ساڵح» نووسراوە و کەوتۆتە لاپەڕە ٨٣ هــەتا ٩١ی گۆڤــارەکە. بــا بــزانین ئــەو وتارەش سەبارەت بە سەعید چۆن دوواوە. نووسەر لە لاپەڕە ٨٤دا دەڵێ: «سەعید ناسناوی حیزبی «مەسعوودی مەلا محەممەدی ڕەش»ی خەڵکی «قــەرەداغ»ە، تــا ئێستا ژیاننامەی تەواو و ئاستی خوێندەواری و زۆر وردەکاری دیکــە ســەبارەت بەو روون و ئاشکرا نین ئەوە نەبێ کە «هەمزە عەبدوڵــلا» گوتوویــەتی: «ساڵــی ١٩٤١ کە بۆ خۆشاردنەوە و شــوێنەونی لــە لایــەن ســەید ئەحمــەدی خانــەقاوە نێردرامە دێی «گۆپتەپە» لای شێخ عەبدوڵلای باوکی عەلی عەسکەری، ناسـیم. خوێندەوار بوو، فارسی و کەمێک عەرەبی دەزانی، ئەوسا لە هــەرەتی لاویــدا و یەکجار گورجوگۆڵ و لەخۆبردوو و چاونەترس بوو.» کــاک ســەدیق ساڵــح لــە پەراوێزی ئەو بەشەدا لە لاپەڕە ٩١ دەڵێ: «هێنــدەی ســۆراخم کــردووە، هێــشتا دەستم بــە بنەماڵــەی ســەعید یــا نــەوەیــان یــا ئاگادارییــەکی بەســەرهاتیان ڕانەگەیشتووە تا ژیاننامەکەی ساغ بکەمەوە.» لــە درێــژەی ئــەو پەراوێزەشــدا دەڵێ: «سێزدە سەعات و نیو بیرەوەری مامۆستا «هەمزە عەبدوڵلا»مان لە ســەر ڤیدیۆ بە هاوکاری مامۆستا «عەبدوڕڕەقیب یۆسف» وە بەندە تۆمار کــردووە کــە لەودا جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە سەعید بە بێ هیچ گومانێک «قەرەداغ»ییە و چەندین ساڵ لەگەڵیدا ژیاوە.» هەر لە لاپــەڕە ٨٤دا باســی دامەزرانــدنی لقــی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە کوردستانی باشوور دەکا کە لە ئــابی ١٩٤٤ بــە لێپرســراوی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد پێک هــاتووە. پاشــان دەقــی نامــەی ڕۆژی ١٣ی ١٢ی ١٩٩٧ی مامۆستا «ئیبراهیم ئەحمەد»ی لــە لاپــەڕە ٨٤ و ٨٩ هێنــاوە کــە هــەمان نامەیە کە پێشتر لە وتاری «مامۆستای نەمر ئیبراهیم ئەحمەد بە خامەی خــۆی» و لە کتێبی «یادگار و هیوا...»دا باسمان کرد کە ئەویش هەر کاک سەدیق ساڵــح نووسیویەتی و دەڵێ: «سەعید تەتەری ئێمە بوو، لە بنەماڵەی شاعیری نــاودار مەحوی بوو، لاوێکی خەڵکی سلێمانی بوو...» نووسەر لە بەشی پەراوێزەکانــدا

لە لاپەڕە ٩١ دەڵێ: «هەواڵێکم لە کەسانێکی ئەو بنەماڵەیەی وەک کاک «سۆران مەحوی» پرسیوە. هیچ زانیارێکیان نەبووە و وەلامیان نەداومەتەوە.» دیسان لە لاپەڕە ٨٤ نووسەر دەڵێ: «بەپێی گێڕانەوەکەی هەمزە عەبدوڵلا دەبێ سەعید بەردەوام هاتوچۆی ئەودیوی کردبێ و لەوێش بووبێ.» دوای قسەکانی مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا، کاک سەدیق ساڵح بەڵگەیەکی بڵاو کردۆتەوە و بۆچوونی خۆشی لە لاپەڕە ٨٤دا باس کردووە کە دەقی بەڵگەکە کەوتۆتە لاپەڕە ٨٨. بەر لەوەی ئەو بەڵگەیە شی بکەینەوە، دەقەکەی بێ دەستێوەردان دەنووسینەوە و پاشان بۆچوونی کاک ساڵحیش دەنووسین. (ل.٨٤):

بەڵگەنامەی ژمارە: ٤٥٣، نامەی مەعاوینی کومیتەی مەرکەزی - ح.د.ک «بۆ هەموو کومیتە و مەئموورینی عەرزی راه وە مەسئوولینی حکوومەتی میللی کوردستان. بە وەسیلەی ئەم نووسراوە پێو رادەگەیەنرێت کە هەڵگری ئەم دەستوورە {سەعید محەممەد}ناو لە تەڕەف دەوڵەتیڕا موجازە هەموو جێیەکی بە سەربەستی بچێت و بێت. تکایە کە لە تەڕەف هیچ کەسێکیڕا موزایەقە و مومانیعەتی هاتوچۆی بە هیچ جۆرێک نەکرێت. وەهاب بلووریان - مەعاوینی کومیتە مەرکەزی حیزبی دێموکراتی کوردستان.» [وێنەی ژمارە ٣٣]

نووسەر لە لاپەڕە ٨٤دا دەڵێ: «ئەو بەڵگەنامەیە کە لەگەڵ ئەم گوتارەدا بلاو کراوەتەوە و ژمارە (٢)، بریتییە لە پسوولەی ڕێنەگرتن لە هاتن و چوونی (سەعید محەممەد)ناوێک بە هەموو ناوچەکادی نێو قەڵەمڕەوی حکوومەتی میللی کوردستاندا. زۆر پێدەچێ هەر مەبەست پێی «سەعید»ی لە مەڕ خۆمان بێ، بەوەدا کە لە لایەکەوە ئەودەمە ئەمدیو ئەودیوی کردووە و تەتەر بووە و ئێرە و ئەوێ گەڕاوە و، لە لایەکی دیکەوە ناوەکەیش لە ناسناوە حیزبییەکەی و ناوی باوکی (محەممەد) پێک هاتووە (ێ)ی ئیزافە نەخراوەتەوە سەریان وەک دەستووری ئێرانییەکان، وا دیارە مەبەست پێی کوردێکی ئەمدیو بووە.»

لە لاپەڕە ٨٥ دەڵێ: «سەعید تەتەری پارتی و یارمەتی پۆستەی ئێرە و ئەوێی دەهێناوە. هەمزە عەبدوڵلا لەم ڕووەوە گوتوویە: «جارێکیان ٢٧٠٠ دینارمان لێرە کۆ کردەوە، دامە سەعید و هەمووی گەیاندە دەستی مەلا مستەفا، بە بێ ئەوەی عانەیەکی بۆخۆی خەرج بکات. جاری دووەم پارەیەکی کەمتری برد

و بە سەر خەڵکیدا دابەشی کردبوو کەمێکی لێ مابۆوە و دابوویە مەلا مستەفا و لەویشەوە بە شێخ ئەحمەدی برای کە لە سیتەک بووین [١٩٤٦] سەعیدمان ناردەوە بۆ مەهاباد تا چاپخانەیەکمان بۆ بهێنێ. چاپێکی بچووکی دەستی بە ٩٠ دینار کڕیبوو هێنایەوە زۆرمان ئیش بەو چاپ کرد، لەوانە دواتر بەیاننامەیەکمان لەسەر شەهیدکردنی قازی محەممەد و هەڤاڵانی پێ چاپ کرد و بڵاومان کردەوە.» لە لاپەڕە ٨٥ و ٨٦ دەڵێ: پاش هاتنی سوپای ئێران بۆ نێو مەهاباد لە ١٧ی ١٢ی ١٩٤٦ و رووخانی کۆماری کوردستان، بارزانییەکان و کوردەکانی ئەودیو زۆرتر لە «شنۆ» کۆبوونەوە و لە پاش ئەویش باسی بیرەوەرییەکانی «ئەبولحەسەنی تەفرەشییان» دەکا کە لە ٢١ی ١٢ی ١٩٤٦ گەیشتۆتە شنۆ و باسی سەعیدی لە کتێبەکەی خۆیدا کردووە کە ئەو بەشەشمان پێشتر باس کرد کە لە کتێبی «قیام افسران خراسان»دا نووسەری ناوبراو باسی سەعیدناوێک دەکا کە هاتوچۆی ئەمدیو ئەودیوی کوردستانی کردووە. کاک سەدیق ساڵح لە بەشی پەراوێزەکاندا سەبارەت بە قسەکانی تەفرەشییان ئەوەندەی زیاد کردووە و دەڵێ: «شایانی گوتنە نووسەر بە هەڵەدا چووە کە سەعیدی بە تەتەری حیزبی «رزگاری» داناوە چونکە ئەو باسی رۆژانی لە ٢١ی ١٢ی ١٩٤٦ بەدواوەی شنۆی کردووە تا خاکەلێوەی ١٩٤٧ کە هاتۆتە دیوی عێراق و تەسلیم بە حکوومەت بووە... لە کاتێکدا حیزبی رزگاری دووەم حەفتەی ئابی ١٩٤٦ هەڵوەشاوەتەوە و ١٦ی ئەو مانگەیش «پارتی دێموکڕاتی کورد [ی] عێراق» دامەزراوە و سەرەتا رۆژنامەی رزگاری زمانحاڵی بووە.»

هەر لە لاپەڕە ٨٦دا هاتووە: «سەعید بە قسەی بەڕێزان «کەریم زەند» و «جەلال ئەمینبەگ» کە ئەو سەردەمە ناسیویانە و دیویانە، کابرایەکی روحسووک و زیتەڵە و کارامە بووە. خاڵە «عەبدوڵڵای سۆفی کەریم»یش کە دواجار لە شنۆوە لەگەڵیدا هاتووەتەوە و ئەو تا کەرکووک چاوساخی رێگای بووە، لێی دەگێڕێتەوە کە زۆر شارەزای رێگاوبان و بەکار و – کورد واتەنی – کوڕی تەنگانە بووە و چەندین ناسنامەی لە شوێنە جیاجیاکاندا بۆخۆی بەکار هێناوە تا نەناسرێتەوە. هەمزە عەبدوڵڵا کە سکرتێری پارتی بووە، لە جێیەکی

تا پێوەندی بە کوردی ئەوێوە بکات و کۆمەک و یارمەتییان لێ کۆ بکاتەوە بۆ پارتی. بە ترۆمبیل تا رومادی چووبوو، لەوێوە تا قامیشلی بە پێ بڕیبووی. لەو ناوە زۆر گەڕابوو لە یارمەتی مەعنەوی زیاتر هیچی وای چنگ نەکەوتبوو. هاتەوە.» کاک سالح لە دوای ئەو قسانەی مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا دەڵێ: «وا دیارە سەعید بەپێی ئەو بیرەوەرییانە دوای دامەزرانی پارتیش لە هەمزە جیا نەبۆتەوە و چاوساخی و تەتەری و کارئاسانی بۆ کردووە...»

لە لاپەڕە ٨٦ و ٨٧ نووسەر باسی نیازی چوونی مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا و سەعید بۆ سۆڤیەت دەکا کە سەری نەگرتووە و دەڵێ: «پاش دووەم کۆنگرەی پارتی لە ١٩٥١دا کە دوو باڵی ناکۆکی لێ کەوتەوە، سەعید هەر لەگەڵ باڵی هەمزەدا (پێشکەوتنخواز) مایەوە.» پاشان لە زمان مامۆستا هەمزە عەبدوڵلا باسی ئەوە دەکا کە ویستوویەتی لەگەڵ سەعید بچێتە سۆڤیەت کە ئەو چەند دێڕەی خوارێ کورتەی ئەو باسەیە: «حوزەیرانی ١٩٥٤ بڕیارمان دا بچینە یەکێتی سۆڤیەت تا پێوەندی بە مەلا مستەفاوە بکەین. پێشەکی هەواڵمان بۆ عەباسئاغا [ی سەرکەپکان] نارد، بە هۆی «حەمەی فەرەج ئەفەندی» کە ترۆمبێلی هەبوو چووینە سەر «زێ» و بەپێ چووینە رانیە و بووینە میوانی کوێخایەکی دۆستی حەمەی فەرەج ئەفەندی. بە شەو وەڕێ کەوتین تا گەیشتینە «سەرکەپکان» بۆ یەکەم جار عەباسئاغام دیت و ناسیم. نیزیک پازدە رۆژێک لەوێ ماینەوە داوامان لێکرد بماننێرێتە لای «سەید عەبدوڵلای گەیلانی» لە مەرگەوەڕ کە ئەویش سێ چەکدار و ئێسترێکی بۆ کەلوپەل هەلگرتن و یەکیش بۆ سواری داینێ (ل ٨٧) یەکەم شەو لە «زینوێ ئەستێرۆکان» بارمان خست بەیانی زوو بەرەو دۆڵی خانەقا و نیزیکی (گەلاڵە) بووینەوە و بە رێگایەکدا چووینە (سیدەکان) و لەوێش نەماینەوە و دوای ئەویش چووینە (کێلەشین) و سەر رووباری گادەر و دێی (خۆڕاسپێ) کە دێی سەید عەبدوڵلا و نیزیک دێی «دزێ» بوو. خێزانی سەید هەواڵی بە کوێخا حوسێندا ناردبوو کە سەید عەبدوڵلا لەوێ نییە و لە تارانە و ماوەی ١٠ رۆژ بێسوود لەوێ ماینەوە. سەعید گوتی: خۆم دەچمە تاران بیبینم. ناسنامەیەکی ساختەی ئێرانی هەڵگرت و رۆیشت. دوو نامەم پێدا ناردبوو یەکەمیان بۆ سەید کە چاوساغێکمان تا سەر ئاوی ئاراز لەگەڵدا بنێرێ و ئەوی

دیکەش بۆ «دوکتور جەعفەر محەممەد کەریم» تا یاریدەمان بدات. هەردووکیانی دیتبۆوە. سەید بۆ ئەوەی حکوومەت پێنەزانێ و نێوانی تێکنەچێ دەستی بە روومانەوە نا و دوکتور جەعفەریش سێسەد تمەنی بۆ ناردین. کە نائومێد بووین... سەعید زۆر ئارەزووی دەکرد بە جووتە و بێ چاوساغ خۆمان ملی ئەو رێگایە بگرین بەڵام من رازی نەبووم. دڵشکاو هاتینەوە «خۆڕاسپێ». کوڕێکی کوێخاحوسێن تا دیوی خۆمان لە ئاستی «حەساڕۆست»دا لەگەڵمان هات. دوو سەعاتێک بە نێو بەفردا ڕۆیشتین، من بە سوار و سەعید بە پێ. کە گەیشتینە ئەمدیوی چیا بە لاڕێدا هاتینە پردی «حافز». بەیانییەکەی بە خانەقا و «وەرتێ» و چیای کارۆخ و پڵنگاندا هاتین و گەیشتینەوە سەرکەپکان. نیزیکەی مانگێکمان پێچوو لە ئێران. پازدە ڕۆژی دیکە لە لای عەباسئاغا ماینەوە پاشان بەرەو سلێمانی بووینەوە.»

کاک «سەدیق ساڵح» لە کۆتایی وتارەکەیدا لە لاپەڕە ٨٧ سەبارەت بە چارەنووسی سەعید دەڵێ: «سەعید بە قسەی هەمزە، تا ساڵی ١٩٥٥ مابوو، ئیبراهیم ئەحمەدیش نووسیویە: «بەداخەوە بە جۆرێکی نەزانراو ئەویش لە ناو چوو لە ساڵەکانی ٥٠دا» هەرچی حاجی عەبدوڵلا سۆفی کەریمە دەڵێت: «کە لەگەڵ سەعیددا گەیشتینە کەرکووک، لێم جیا بۆوە و گوتی دەچمە بەغدا، پاشتر کە هاتەوە سلێمانی و دیم، گوتی تووشی سیل بووم. دوایی هەر بەو دەردە مرد.» هەزاران سڵاو بۆ گیانی پاکی سەعیدی تەتەری نەناسراوی کوردایەتی.»

لێرەدا وتاری گۆڤاری «هەزار مێرد»یش کۆتایی پێهات. بەر لەوەی بەراوردی کتێب و وتار و وتووێژەکان لەگەڵ یەکتری بکەم، بەپێویستی دەزانم چەند زانیارییەکی دیکە کە لێرە بە لێکۆڵینەوە و پرسیار وەدەستم هێناوە بخەمە بەر چاوی خوێنەران، پاش ئەوە هەموو بابەت و بیروڕایەکان پێکەوە هەڵسەنگێنم و بەراوردیان بکەم.

دوای ئەوەی قسەم لەگەڵ کاک «ڕەحمانی خانزادێ» و کاک «قادری پاکڕەوان» کرد و دوو وتارەکەم لەسەر «سەعیدی تەتەر» خوێندەوە، بە پرسیار تەلەیفوونی کاک «دڵشاد»م وەرگرت کە ئێستا لە شاری «ڕانییە»ی باشووری

هەڵبەت مام سەعید هەموو کوڕەکانی لە کوردستانی باشوورن و وەکوو پێشتر گوتمان دوو کوڕیشی پێشمەرگەی «یەکێتی نیشتمانی» بوون و شەهید بوون. هەرچۆنێکی بێ دوای چەند جار پێوەندی لەگەڵ کاک دڵشادی کوڕی کاک سەعیدی حەمەقالە، توانیم ئەو زانیارییانە وەرگرم کە ڕێکەوتی شەممە ٨ی ٧ی ٨٥ بەرامبەر دەگەڵ ٣٠ی ٩ی ٢٠٠٦ کاک دڵشاد پێی ڕاگەیاندم: «ناوی بابی من «سەعید» و باپیرم ناوی «قادر» بووە. نەنکم (دایکی باوکم) ناوی «گوڵئەندام» بووە. بابم لە ١ی ٧ی ١٩١٤ لە مەهاباد لە دایک بووە و لە ١٥ی ٦ی ١٩٩١ لێرە لە ڕانییە کۆچی دوایی کردووە. لە مەهابادیش ماڵمان لە کن حەمامی مۆرەکی لە سێڕای وەفایی بوو.»

پرسیارم لە کاک دڵشاد کرد بۆچی بابت بە سەعیدی حەمەقالە مەشهوور بووە؟ کە لە وەڵامدا گوتی: «بابم ناوی بابی خۆی قادر بووە، کاتێک بابی ئەمری خودای بەجێ هێنا، دایکی واتە نەنکم مێردی کردۆتەوە بە کابرایەک بە ناوی «حەمەقالە» ناوی زڕبابیشی هەر «قادر» بووە. جا کاتی خۆی بە ناوی زڕبابی بانگیان کردووە. بابم دوو برای هەبوون، «محەممەد» و «ڕەحمان» بەڵام چاکم لە بیر نییە ئایا هەرسێک لە دایک و بابێکن یان نا؟» هەر ئەو ڕۆژە واتە ٨ی ٧ی ٨٥، ئەوجار پێوەندیم بە کاک «قادری پاکڕەوان» برازای کاک «سەعیدی حەمەقالە» و ئامۆزای کاک «دڵشاد»ەوە گرت کە نیشتەجێی مەهابادە. کاک قادر سەبارەت بە کاک سەعید ئاوای گوت: «ناوی دایکی مامە سەعیدم گوڵێ بووە، بابی منیش ناوی محەممەد بووە. باپیرم واتە باوکی باوکم ناوی «قادر» بووە، بۆیە بە بابمیان گوتووە «حەمەقالە» و منیان بە ناوی باپیرمەوە کردووە. باوکم و مامم لە دایکێکن بەڵام بابیان یەک نییە. چونکە بابی من گەورەتر بوو لە مامەسەعیدم، مامميان بە «سەعیدی حەمەقالە» بانگ کردووە.» کاک قادر ئەوەشی لە قسەکانی زیاد کرد: کە کوڕێکی «کاک سەعیدی حەمەقالە»ی بە ناوی «عەلی» شەهید بوو کە لە ناسنامەکەی نووسراوە «عەلی قادر عەبدوڵلا» کە ئەوە بەپێی ناسنامەی ئەودیوی کاک سەعیدی تۆمار کراوە کە بە ناوی «قادر» ناسنامەیەکی ساختەیان بۆ دروست کردووە.»

دوابەدوای ئەو پرسیارانە وێڕای کاک قادری برازای کاک سەعید، ڕێکەوتی ١٠ی ٧ی ٨٥ (=١ی ١٠ی ٢٠٠٦) سەردانی بەڕێوەبەرایەتی «ئامار»

(نفووس)ی شاری مەهابادمان کرد. بە نامەیەک داوای «بەرگەی فەوتی» کاک سەعیدی مامی کاک قادرمان کرد. هەروەک پێشتر گوتمان ناسناوی «کاک سەعید» لە ئاماری مەهاباد، «سەعیدی پاکرەوان»ە. ئەو زانیارانەی خوارێ دەقی ناسنامەی «کاک سەعیدی حەمەقالە»ن لە ئاماری مەهاباد: کورتەی روونووسی وەفات - ژمارە ٣٧٧١٠٧ ف ١١ رێکەوتی ١ی ٣ی ١٣٧٢ لە شاری مەهاباد، سەعید بە ناسناوی پاکرەوان کوری رەسووڵ و گوڵێ، لەدایکبووی ١ی ٢ی ١٢٨٦ بە ناسنامەی ژمارە ٧٥٤٩ سەر بە حەوزەی (ناوچە) یەکی شاری مەهاباد بەهۆی پیری کۆچی کردووە. فەوتەکەی لە دەفتەری مردووەکان ساڵی ١٣٧٤ لە حەوزەی دووی شاری سەر بە بەڕێوەبەرایەتی تۆماری ئەحواڵی مەهاباد بە ژمارە ١٣٢٥ تۆمار کراوە.»

من ساڵی لەدایکبوون و کۆچی «کاک سەعیدی حەمەقالە»م بەپێی قسەکانی کاک دڵشاد و بەڵگەی بەڕێوەبەرایەتی ئاماری مەهاباد بەراورد کرد و بەو ئاکامانە گەیشتم:

کاک دڵشاد دەڵێ: بابم لە ١ی ٧ی ١٩١٤ لە دایک بووە. واتە ١ی مانگی تەمووز یا ژوئییەی ١٩١٤ کە ئەو رۆژە بەرامبەرە لەگەڵ رۆژی چوارشەممە رێکەوتی ٨ی پووشپەڕی ساڵی ١٢٩٣ی کۆچی هەتاوی. فەوتەکەشی بەپێی قسەی کاک دڵشاد و بەپێی ئەو کۆلکەی لە کوردستانی باشوور هەیەتی (١٥ی ٦ی ١٩٩١)ە کە ئەو رۆژەش بەرامبەرە لەگەڵ رۆژی شەممە رێکەوتی ٢٥ی جۆزەردانی ١٣٧٠ی کۆچی هەتاوی.

رێکەوتی لەدایکبوون و فەوتی بەپێی بەرگەی فەوتی ناسنامەی لە مەهابادیشی بەو چەشنەیە: ١ی بانەمەڕ (مانگی ٢)ی ١٢٨٦ی هەتاوی لەدایک بووە کە بەرامبەرە لەگەڵ رۆژی یەکشەممە ٢١ی ئاوریلی (مانگی٥ = نیسان)ی ١٩٠٧ی زایینی. رۆژی شەممە رێکەوتی ١ی جۆزەردانی ١٣٧٢ش کۆچی دوایی کردووە کە ئەویش بەرامبەرە دەگەڵ ٢٢ی مایس = (ئەیار)ی ١٩٩٣ی زایینی.

بە بۆچوونی من چونکە «کاک سەعید» لە مەهاباد لە دایک بووە و تا تەمەنی لاوەتی هەر لەو شارە ماوەتەوە. ساڵ و مانگ و رۆژی لەدایکبوونی بەو پێیەی لە دەفتەری بەڕێوەبەرایەتی ئاماری مەهاباد تۆمار کراوە، واتە ١ی

کراوە. بەڵام دوای تێکچوونی کۆمار و ئاوارەبوونی کاک سەعیدی حەمەقالـە بـۆ باشووری کوردستان و بەپێی قسەکانی کاک رەحمانی خانزادێ (نیـکـنـەفس) و کاک قادری پاکرەوان و کاک دڵشادی کوڕی کاک سەعید، بەهۆی کاکە «زیـاد»ی کوڕی حەمەئاغای کۆیە بە ناوی «قادر» لەوێ ناسنامەیەکیان بۆ ساز کردووە کە ئەگەر بەپێی ناسنامەی «شەهید عەلی» کوڕی کاک سەعید بـێ دەتـوانین بـڵێین ناوی کاک سەعیدی لە ناسنامەی ئەودیوی «قادر عەبدوڵڵا» بووە. بـەکورتی بـە هۆی ئەوەی کە «کاک سەعید» هەتا کۆتایی تەمەنی هەر لە باشووری کوردستان نیشتەجێ بووە، ساڵ و مانگ و رۆژی کۆچکردنەکەی ئـەودیوی دروسـتە، واتـە ١٥ی ٦ی ١٩٩١ کە لە کۆلکەی ئامار (نفووس)ی رانییە تۆمار کـراوە دروسـتە کـە ئەویشمان ساغ کـردەوە و گوتمـان بەرامبـەرە لەگـەڵ ٢٥ی جـۆزەردانی ١٣٧٠ی هەتاوی. بەوپێیە رێکەوتی لەدایکبوونی ناسنامەی لــە مـەهاباد دروسـتە و ئـی ئەودیوی هەڵەیە. بەڵام بەپێچەوانەوە رێکەوتی کۆچی لە ناسـنامەی ئـەودیوی دروستە و ئی مەهاباد هەڵەیە. بـەو چەشـنە بـە روونی دەتـوانین بـڵێین کـاک سەعیدی حەمەقالە لە ١ی ٢ی ١٢٨٦ واتە ٢١ی ئاوریلی ١٩٠٧ لە مەهاباد لە دایـک بووە و لــە تەمـەنی ٨٤ساڵـیدا لـە ٢٥ی ٣ی ١٣٧٠ی هـەتاوی و (١٥ی ٦ی ١٩٩١ی زایینی)ش لە رانییە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە.

لە کۆتایی ئەو لێکۆڵـینەوانەدا رۆژی شـەممە ١٥ی ٧ی ٨٥ (٧ی ١٠ی ٢٠٠٦) لە کاک «مەحموودی تەلعەتی»ش ئەو زانیارانەم وەرگرت. کاک مەحموود کـوڕی کاک «رەحمان»ە کە ئەویش برای کاک سـەعیدی حەمەقالەیـە. کـاک مـەحموود سەبارەت بە باسەکەی ئێمەوە گوتی: «بەڵێ کاک سەعید مامی من بـووە و بـابی من «رەحمان» براگەورەی مامەسەعیم بوو. بابم مەشـهوور بـوو بـە «رەحمـانی گوڵەشەلێ» ناوی دایکی بابم گوڵێ بوو، بەڵام ناوی بابیم لـەبیر نـەماوە.» بـۆ روون بوونەوەی زیاتریش بەڵێنی دامێ پرسیارم بۆ بکـا. ئـەوە بـوو چەنـد رۆژ دواتر بە پرسیار ئەوەشی بۆ روون کردمەوە کە ناوی بابی کاک رەحمـان (بـرای کاک سەعیدی حەمەقالە)، رەسووڵ بووە. کاک مەحموود سەبارەت بە بابی خۆی گوتی: «بابم قەدەرێکی زۆر چووە شووڕەوی و فێری زمانی رووسی بوو و نیزیک ٢٠ ساڵانیش چووە تورکیا و دوایە هاتەوە و دەرسی زمانی رووسی لە مەهاباد بە

خەڵکی دەگوت.» بەو حیسابە بە روونی بۆمان دەردەکەوێ کە قسەکانی کاک قادری پاکڕەوان دروستە و ئاماری مەهابادیش زانیارییەکانی سەبارەت بە ناوی دایک و باوک و ساڵی لەدایکبوونی کاک سەعید دروست تۆمار کردووە. بە لێکدانەوەی قسەکانی کاک قادری پاکڕەوان و کاک مەحموودی تەلعەتی بەو ئاکامە دەگەین کە کاک سەعیدی حەمەقالە، ناوی باوکی کاک رەسووڵ و ناوی دایکیشی گوڵێ بووە و لەگەڵ «کاک رەحمان» لە دایک و بابێکن. بەڵام دوای ئەوەی باوکی خۆی ئەمری خودای کردووە، دایکی مێردی بە کاک «قادر»ی باپیری کاک قادری پاکڕەوان کردووە. گوڵێ خانم لە «کاک قادر»یش تەنیا کوڕێکی بووە کە ناوی محەممەد بووە و دەبێتە زڕبرای کاک «سەعید» و «کاک رەحمان»ی و ئەو سێ برایە لەدایکێکن و لە بابێک نین (قسەی کاک قادری پاکڕەوان) چونکە کاک سەعید منداڵ بووە لە لای زڕبابی (واتە کاک قادر) ماوەتەوە. ناسنامەشیان بە ناوی زڕبابی بۆ وەرگرتووە و بۆتە (سەعیدی پاکڕەوان). کاک قادر تەنیا کوڕێکی لە گوڵێ خانم هەبووە کە ناوی محەممەد و مەشهوور بە «حەمەقالە» بووە. هەر لەسەر ئەو شێوازەش بە کاک سەعیدیشیان گوتووە «سەعیدی حەمەقالە».

## لێکدانەوەی هەموو ئەو وتار و وتووێژانەی کە سەبارەت بە «سەعیدی حەمەقالە»ن

بەپێی قسەی مەلا قادری مودەڕڕیسی و کاک غەنی بلووریان و کاک عوبەیدیللا ئەییووبیان و کاک رەحمانی خانزادێ و کاک قادری پاکڕەوان و کاک مەحموودی تەلعەتی بێ کە لەو چەند کتێب و وتووێژانەدا باسی کاک سەعیدیان کردووە، هیچ شکێک لەوەدا نییە کە یەک و رابیتی دوو کۆمەڵەی ناوبراو «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی» بووە.

لە کتێبەکەی ئەبولحەسەنی تەفرەشیان سەعید بە کوردێکی عێراقی ناو براوە. لە کتێبەکەی کاک «نووری شاوەیس»یش تەنیا ناوی بە «مەلا سەعید»

سەعیدی بە لاوێکی خەڵکی سلێمانی و لە بنەماڵـەی شـاعیری نـاودار مـەحوی ناساندووە. لە وتاری «دیسان سەعیدی تەتەر» سەعید نـاوی نهێنی و حیـزبی کەسێکە بە ناوی «مەسعوود» کە ئەویش کوڕی مەلامحەممەدی ڕەش ناسراو بـە «مەلای ڕەش»ی کوڕی سالحجانی بووە و خەڵکی دێی «داراغا»ی سەر بە ناحیەی سەرچنار لە باشووری کوردستان بووە.

نووسەری وتاری «دیسان سەعیدی تەتەر» لـە زمـان «مـەلا عوبێـد»ەوە دەڵێ: «مەسعوود حەزی لە خوێنـدن نـەکردووە و بایـەخێکی زۆری پێنـەداوە... بۆیە کە گەورە بووە و چاوی کراوەتەوە دەستی لـە خوێنـدن هەڵگرتووە.» لـە وتاری «سەعید تەتەری نەناسراوی کوردایەتی»شدا کاک سەدیق سالح دەڵێ کـە سەعید ناسناوی حیزبی و نهێنی «مەسعوودی مەلا محەممـەدی ڕەش»ی خەڵـکی قەرەداخە و تا ئێستا ژیاننامەی تەواو ئاسـتی خوێنـدەواری و زۆر وردەکـاریی دیکەی سەبارەت بەو روون و ئاشکرا نـین» پاشـان لـە زمـان مامۆسـتا هـەمزە عەبدوڵلاوە دەڵێ: «[سەعید] خوێندەوار بوو، فارسی و کەمێک عـەرەبی دەزانی» کە ئەوە لەگەڵ وتارەکەی پێشوو جیاوازی هەیە چونکە لەوێ دەڵـێ حـەزی لـە خوێندن نەبوو.... لە پەراوێزی ئەو قسەشدا دەڵێ کە تـا ئێستا نـەمانتوانیوە بەسەرهاتی سەعید سـاغ بکەینـەوە. لـە دوای قـسەکانی مامۆسـتا «ئیبـڕاهیم ئەحمەد»یش نووسەر دەڵێ: پرسیارم لە بنەماڵەی مەحوی کرد کە ئەوانیش هیچ زانیارییەکیان سەبارەت بە سەعید نەبوو کە ئەقێی خانـەقای مـەحوی بووبـێ» بەڵام هیچ دوور نییە وەک مامۆستا کـەریم زەنـد دەڵـێ: سـەعید پێوەنـدی بـە خانەقای مەحوی هەبووبێ کە بنکەی کۆمەڵی برایەتی و هیوا بووە.

لـە لاپـەڕە ٣ی وتـاری «دیـسان سـەعیدی تەتـەر» نووسـەر دەڵـێ: «ناسناوەکانی دیکەی مەسعوود، سەعید و وەستا عـەزیزی کارگـەچی و کاکـەی درێژ و سەعید مەهابادی بووە.» بە بۆچوونی من هیچ دوور نییـە ئـەو سـەعیدە هەر سەعیدی حەمەقالە بـێ، چونکـە یـەکێک لـە نـاوە نهێنییـەکانی سـەعید مەهابادی بووە.

دیسان بەپێی قسەی مامۆستا کەریم زەند کە دەڵێ: «لە سەردەمی کۆمـاری کوردستان لە مەهاباد، لە دێی (دزە)ی ناوچـەی مەرگـەوەڕ سـەید عەبدوڵـلای

گەیلانی دیویەتی» ئەوەش لەگەڵ قسەکانی کاک رەحمانی خانزادێ و لە هەمووان گرینگتر لەگەڵ ئەو بەڵگەی «پەیمانی سێسنوور» کە ئەویش هەر لە ناوچەی «دزەی مەرگەوەڕ» پێک هاتووە یەک دەگرنەوە کە سەعید بە ناوی نهێنی «م.س. خوێنین» وەک رابیتی دوو کۆمەڵە لە پەیمانەکەدا بەشداری کردووە. هەروەها ئەو جێیە لە وتاری «دیسان سەعیدی تەتەر» کە کاک قادری ئەحمەدخیلانی دەڵێ: «سەعیدیان گرتووە و بردوویانەتە کەرکووک و لە رێگای رەوانە کردنەوەدا هەڵاتووە، لەگەڵ قسەکانی کاک رەحمانی خانزادێ یەک دەگرنەوە.

لە لاپەڕە ٨٤ی گۆڤاری «هەزارمێرد»دا بەڵگەیەک بە ناوی «سەعیدمحەممەد» هاتووە کە وەک وەرەقە و ناسنامەی هاتووچۆی سەعید لە لایەن «کۆماری کوردستان»ەوە بۆ ناوبراو دەرچووە بە بۆچوونی کاک رەفیق ساڵح مەبەست لە «سەعید محەممەد» هەر «مەسعوود» بووە چونکە مەسعوود ناوی حیزبی سەعید بووە و ناوی باوکیشی محەممەد بووە (ێ)ی ئیزافی نییە وەک دەستووری ئێرانییەکان. بەڵام بە بۆچوونی من و بە پێی ئەو زانیارییانەی باسمان کردن «سەعید محەممەد» کورتکراوەی ناو و ناسناوی سەعیدی حەمەقالەیە و لە جیات «سەعیدی حەمەقالە» (سەعید محەممەد قادر) تەنیا دوو ناوی هەوەڵیان بۆ نووسیوە. بێجگە لەوەش چ پێویست دەکا ئەگەر ئەو ناوە ئی «مەسعوودی مەلا محەممەدی رەش» بێ ناوێکی حیزبی و نهێنی لە پەنا ناوی بابی ئەسڵی کەسێک وەک کارتی پسوولەی هاتوچۆی تۆمار بکرێ!

لەوەش گرینگتر ئەوەیە کە نامەکە واتە پسوولەکە بە زاراوەی موکریانی نووسراوە و «سەعید محەممەد» بە وشەی «لە تەڕەف دەوڵەتێڕا» وەک هەڵگری دەستوورەکە و رابیتی جێی متمانەی حکوومەتی میللی کوردستان ناسێندراوە و بە هەموو بەرپرسان راسپێردراوە کە لە لایەن هیچ کەسەوە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆمار پێشی پێ نەگیرێ و ئەوەندەشیان متمانە بە هەڵگری دەستوورەکە بووە کە لە دووسێ جێی بەڵگەنامەکەدا لە وشەی وەک «موزایقە و مومانیعەت» نەکردن لە ناوبراو کەلک وەرگیراوە و دەستوور دراوە کە نابێ بە

دەیسەلمێنن، ئەو «سەعید محەممەد»ە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە و لەدایکبووی شاری مەهابادە.

کاک ڕەفیق ساڵح لە پەراوێزی ئەو بەڵگەنامەدا لە لاپەڕە ٨٨ی وتاری «سەعید تەتەری نەناسراوی کوردایەتی»دا دەڵێ: «سەیر ئەوەیە کە لە ناو لیستەی ناوی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبەکەدا [حیزبی دیموکراتی کوردستان] باسی ئەم وەهابی بلووری نییە.» بەڵام بە ئاوڕدانەوەیەک لە لاپەڕە ١١ی بەرگی دووهەمی کتێبی «بەسەرهاتی سیاسی کورد» یادداشتەکانی میرزا محەممەدئەمینی مەنگوڕی، ئەوەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە: «وەهابی بلووری وەزیری داخیلە و ڕەئیسی کۆمیتەی مەرکەزی بووە» کە ئەویش پێمان دەسەلمێنێ کە کارتی پێناسەی «سەعید محەممەد» لە لایەن بەرپرسێکی گەورەی «کۆماری کوردستان» دەرچووە و مەبەست لە «سەعید محەممەد»یش هەر «سەعیدی حەمە قالە» بووە.

لە لاپەڕە ٨٦ی وتاری پێشوو نووسەر دەڵێ: «خاڵە عەبدوڵڵای سۆفی کەریم»یش دواجار لە شنۆ دەگەڵیدا هاتووەتەوە و ئەو تا کەرکووک چاوساغی ڕێگای بووە...» دواتریش کاک ڕەفیق ساڵح لە زمانی مامۆستا «هەمزە عەبدوڵڵا»وە دەڵێ «سەعید چاوساخی و تەتەری و کارئاسانی بۆ کردووە» لە لاپەڕە ٨٧یشدا دەڵێ: کاتێک مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا ویستوویەتی بچێتە سۆڤیەت بۆ ئەوەی پێوەند بە مەلامستەفا بکات، لەگەڵ سەعید بۆ ماوەیەک لە ئێران ماوەتەوە و پاشان بە هەناسەساردی گەڕاونەوە سلێمانی لەو ماوەیەشدا مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا دوو نامەی بە سەعیددا ناردووەتە تاران چونکە خودی سەعید ئامادەبوونی خۆی ڕاگەیاندووە کە بۆخۆی بچێتە تاران و پێوەندی بە «سەید عەبدوڵڵای گەیلانی» و «دوکتور جەعفەر محەممەدکەریم»ەوە بگرێ کە لە چوونی بۆ سۆڤیەت یارمەتیان بدەن و دەشڵێ کە سەعید ناسنامەیەکی ساختەی ئێرانی هەڵگرت و ڕۆیشت. بەڵام لێرەدا پرسیارێک دێتە گۆڕێ، ئەگەر سەعید خەڵکی باشووری کوردستان بێ چ پێویست دەکا کاتی چوونی بۆ یەکێک لە شارەکانی ئەودیو (کەرکووک)، یەکێکی دیکە ببێتە چاوساغی. لەوەش گرینگتر ئەوەیە کە ئەو سەعیدەی مامۆستا هەمزە عەبدوڵڵا دەڵێ ناسنامەی ئێرانی

هەڵگرتووە و بە پێداگری خودی سەعید ڕۆیشتۆتە تاران، ئەدی بۆ لە ئێران کەس نەبۆتە چاوساغی؟ کە ئەو بابەتەش دیسان پێمان دەسەلمێنێ کە سەعید خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووە و هۆیەکەشی ئەوە بووە کە فارسی زانیوە هەر بۆیە لەو بەشەی کوردستاندا پێویستی بە چاوساغ نەبووە.

## ناساندنی «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی»

ئەگەر بەکورتی بمانەوێ باسی بۆچوونی ئەو چەند کەسە بکەین کە لەسەر کەسایەتی «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی» دواون، چ ئەوانەی لە کتێبەکاندا باسیان کردووە و چ ئەوانەی وتوویژم لەگەڵ کردوون، بەوە دەگەین کە هەموویان لە یەک بابەتەوە بۆچوونێکیان هەیە کە ئەویش ئەوەیە: ناوبراو خەڵکی مەهاباد بووە و لە ئەندامانی هەرەتێکۆشەر و زەحمەتکێشی کۆمەڵەی ژ.ک و رابیت و تەتەری ئەو کۆمەڵە و کۆمەڵەی هیوا بووە. ئەگەرچی ناتوانین یەکلایەنە بڕیار لەسەر ئەوە بدەین کە ئەو کتێب و وتارانەی دیکە کە لەسەر «سەعید»ناوێک بیرەوەریان نووسیوە، مەبەست هەر ئەو «سەعید»ەیە کە ئێمە باسی دەکەین، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە زانیاری زۆر ورد لەسەر شوێن و ڕێکەوتی لەدایکبوون و کۆچی ئەو کەسایەتییە و هەروەها چارەنووسی لەو کتێبەی ئێمەدا روون بۆتەوە و زانیارییەکی پوخت و پاراو بە خوێنەر دراوە؛ هەروەها ئەو زانیارییانەی ئاوا بە وردی و بە روونی لە سەرچاوەکانی دیکەدا باسیان لێنەکراوە و سەرەڕای ئەوانەش زۆربەی ئەو بابەتانەی لەو چەند کتێب و وتارەی دواییدا باسی «سەعید»یان کردووە، لەگەڵ بەسەرهاتی «سەعیدی حەمەقالە»ی یەک دەگرنەوە؛ دەتوانین بڵێین ڕەنگە ئەو کەسەی کە لەو دیو ناوی تەواوی «مەسعوودی مەلا محەممەدی ڕەش» بووە و دەڵێین ناوی حیزبی و نهێنی «سەعید» بووە، هەر ئەو «سەعید»ە بێ کە ئێمە باسی دەکەین. چونکە تەنانەت بۆ نووسەری ئەو لێکۆڵینەوانەش کە لەسەر ئەو «سەعید»ەی دوایی وتاری نووسیوە، تەواو روون نییە کە مەبەست لەو «سەعید»ەی کە «تەفرەشیان» و

ئەحمەد» و... باسی دەکەن، «مەسعوودی مەلامحەممەدی ڕەش» بۆ و بابەتەکان بە شک و گومانەوە باسیان لێکراوە. بەڵام دیسانیش سەرەڕای هەموو ئەو بۆچوونانە لەو بڕوایەدام ئەگەرچی زۆر بابەتی ئەو قسە و بیرەوەرییانەی کە «تەفرەشیان» و مامۆستا «نووری شاوەیس» و مامۆستا «ئیبراهیم ئەحمەد» و ماموستا «هەمزە عەبدوڵڵا» و دوو وتارەکەی «سەعید تەتەری نەناسراوی کوردایەتی» و «دیسان سەعیدی تەتەر»، لەسەر کەسایەتی «سەعید»ناوێک نووسیویانە، لەگەڵ بەسەرهات و تێکۆشانی «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی» یەک دەگرنەوە، بەڵام ڕەنگە «مەسعوودی مەلامحەممەدی ڕەش»یش یەکێکی دیکە لە ڕابیتەکانی سەردەمی ژ.ک و کۆماری کوردستان لەگەڵ کوردستانی باشوور بێ و بەسەرهاتی لەگەڵ ئەو سەعیدەی ئێمە تێکەڵ بووبێ و یا لە بنەڕەتەوە و لەگەڵ «سەعیدی حەمەقالە»ی خەڵکی مەهاباد یەک نەبن و دوو کەسایەتی جیاواز بن. ڕەنگە دواتر کەسێکی دیکە بتوانێ زانیاری پتر و بەبەڵگەتر سەبارەت بە پەیک و ڕابیتەکانی ئەو سەردەمە کۆ بکاتەوە و زانیاری بەپێچەوانەی ئەم نووسراوانەی ئێمە بدا بە خوێنەران، بەڵام بەپێی هەموو ئەو زانیاریانەی ئێمە، ژیاننامەی ئەو «سەعید»ەی مەبەستی ئێمە کە لە پەیمانی «سێسنوور»یش بەشدار بووە و دەوری ڕابیتی گێڕاوە، بەو چەشنە بۆ ئێمە ساغ بۆوە:

«سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی» ناوی باوکی ڕەسووڵ و ناوی دایکی گوڵێ بووە. لە ۱ی بانەمەڕی ۱۲۸٦ی هەتاوی (۲۱ی نیسانی ۱۹۰۷) لە مەهاباد لە دایک بووە و ناسنامەکەی بە سەعیدی پاکڕەوان بۆ وەرگیراوە و تۆمار کراوە. منداڵ بووە کە باوکی فەوتی کردووە و برایەکیشی لە باوکی خۆی هەبووە کە ناوی ڕەحمان و لە خۆی گەورەتر بووە و هەر لە تەمەنی لاوەتیدا چۆتە هەندەران (سۆڤیەت و تورکیا) و پاش ماوەیەکی زۆر گەڕاوەتەوە مەهاباد. پاشان دایکی مێردی بە کابرایەک بە ناوی «قادر» کردۆتەوە و سەعیدیشی لەگەڵ خۆی بردۆتە ماڵە مێردی دووهەمی و ناسنامەیان بە ناوی پاکڕەوان بۆ وەرگرتووە. کاک سەعید لە باوکی دووهەمی و لە دایکی خۆی برایەکی دیکەی بە ناوی «محەممەد» هەبووە. کاک محەممەد مەشهوور بووە بە حەمەقالە و کاک سەعیدیشیان بە ناوی ئەویەوە بانگ کردووە. دواتر چونکە کاک سەعید لە

تەمەنی لاوەتیدا هەر خەریکی بێستانچێتی بووە بە «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی» ناوبانگی دەرکردووە. سەعیدی حەمەقالە کوردێکی زۆر دڵپاک و تێکۆشەرێکی نەناسراو و ئەندامێکی کارامەی کۆمەڵەی (ژ.ک) و دواتر «کۆماری کوردستان» بووە. ناوی نهێنی لە سەردەمی دەسەڵاتی کۆمەڵەی (ژ.ک)، «م.س. خوێنین»، ئەندامی ژمارە ١٠٦٠ بووە و دەوری رابیتی رۆژهەڵات و باشووری کوردستانی گێڕاوە و بەشداری پەیمانی سێسنووریش بووە. دوای تێکچوونی کۆماری کوردستان بە یارمەتی کاکەزیادی کوڕی حەمەئاغای کۆیە و هەباس‌ئاغای سەرکەپکان ناسنامەیەکیان بە ناوی «قادر عەبدوڵلا» بۆ وەرگرتووە. بۆ ماوەیەک لە لای کاکە زیاد باخچەوانی کردووە، بۆیە لەو دیویش بە «مامەقالەی باخچەوان» ناوبانگی دەرکردووە. دوای چەندین جار ئاوارەبوون لە رانیەی باشووری کوردستان گیرساوەتەوە و لە تەمەنی ٨٤ساڵیدا لە رۆژی شەممە رێکەوتی ٢٥ی جۆزەردانی ١٣٧٠ی هەتاوی بەرامبەر دەگەڵ ١٥ی ٦ی ١٩٩١ی زایینی هەر لەو شارە کۆچی دوایی کردووە.

بەو جۆرە ناوی ئەو کەڵەپیاوەی کۆمەڵەی (ژ.ک)مان بۆ روون بۆوە و بە بێ هیچ شک و گومانێک دەتوانین بڵێین «م.س. خوێنین، ئەندامی ژمارە ١٠٦٠» ناوی نهێنی کاک «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی»یە کە رابیتی نێوان دوو کۆمەڵەی ژ.ک و هیوا بووە. بەجەرگی و ماندوویی‌نەناسی و کوردایەتی ئەو پیاوە گەورەیە بۆ هەموو ئەو کەسانەی ناسیاوی بوون روون و ئاشکرایە.

هەزاران سلاو لە گیانی پاکی ئەو تێکۆشەرە نەناسراوەی کۆمەڵەی ژ.ک کە وەک کۆتری نامەبەر دەوری «پەیک»ی لە نێوان سنوورە دەسکردەکان گێڕاوە و تا سەر لەو رێبازەدا و هەر لەو رێگایەشدا بە سەربەرزی سەری ناوەتەوە.

گــوارێکی ادبی و تایخی و کومەلایەتی کــوردی یە

زمارە ١ | سالی یەك | ١ خەزەل وەری ١٣٢٤ ـ ٢٣ اکتبر ١٩٤٥



جنابی شیخ عبدالقادر

زیرەیان بەستبو لە پێش چاوی منا گشتی هەمو

ئەم شەهیدانەی کە خنکاون بە صد ئازارەوە

وێنەی ژمارە ١: ئەسلی گۆڤاری ئاوات «لاپەڕەی یەک - ڕووبەرگ»

# آوات

خوزگه روژیه هابا تا ایمه گیانی خوشه‌ویست ✿ کرد با مانه ( ئیثا ر ) ی ئیشتمانی خوشه ویست
هه ستنه یه دەس دەنه یەك بو نه جاتی ئیشتمان ✿ خوینی خاوین و بریژن لاوەکانی خوشەویست



پەرای ژ ـ ك پیشكەوتن

وێنەی ژمارە ٢: لاپەڕەی تەبلیغاتی گۆڤاری ئاوات

خاوەن امتیاز و مدیری مسئول : محمد آذر

آوات مانگی دوو جار بلاو ئەکرێتەوە

# آبونە

| | |
|---|---|
| آبونەی ٢٤ ژمارە | ٢٤٠ ریال |
| بو مەلا و قوتابی کان | ١٨٠ ریال |
| هەر دانەی بە | ١٠ ریال |

آبونە پێشەکی وەر دەگیرێ

ئەم ژمارەیە دا :

| | |
|---|---|
| نویسندگان فارسی بخوانند | م.ج |
| سواری رەش پوش | م . آذر |
| برای دوورم | » » |
| ای ملتی آوارە | ر . ه |
| لە سەرئەو بەخشنورحمە | امستەی |
| کچە لادیی | هیمن |
| لاوی... | » » |
| محاکمەی هیتلر | آذر |

چون ئەو مجلەیە پوولی آبونە نەبیت هیچ گونە در آمدیکی نیە تکاتە خوینەرە خوشەویستەکان ئەکەین بە گەیشتنی ئەو ژمارەیە پولی آبونەمان بو بنیرن .

لە ژمارە ٢ آوات دا مقالاتی جالب و اشعار شیرین و آبدار دەخوینن وە

بەنا بە خوای مەزن




آمانجی ایمه

« کۆشش لە پێناو سەرخستنی کورد »
« و زیاندنەوەی فەرهەنگی کوردە »

گۆوارێکی ادبی و تاریخی و کومەلایەتی کوردیە

ژمارە ١ سالی یەك ١ خەزەلوەی ١٣٢٤ ـ ١٩٤٥

# نویسنده گان فارسی بخوانند !

ح . م

قسمتی از اکراداز چهاهزار سال پیش از میلاد مسیح تاکنون همشیه خودرا کرد معرفی کرده و مورخین آنهارا بلفظ کرد یاد نموده اند . واین قسمت کردهای هستند که از طرفی آرارات یعنی کوه ( گودی ـ جودی ـ آگری ) آمده اند ودر امتداد دجله وفرات غربا تا سوریه و حرمات و سواحل دریای مدیترانه و شرقا تاخلیج فارس و سواحل دریای عمان پراگنده اند .

قسمتی ازاکرادنیزدر چهارهزار سال پیش از میلاد ، باهندوها ـ اروپائیها ـ پارسها ـ در یك جا بوده اند که از این محل اصلی بسمت خاور ایران واز آنجاهم بجنوب بحر خزر و تا منطقه آذربایجان و نواحی اسپهان و همدان ولرستان پراگنده شده اند ، و این کشور پهناوررا « مادایا » یا « میدیا » گفته اند ؛ وکلمه « مادا » در قرن نهم پیش از میلاد بر پنج قبیله کرد . لر . خزر . دیلم گیل اطلاق شده وکلمه کرد مقدمتر برآنست ، پەهد ژ ژ پ گروه کرد از ایران امروزه به کردستان کنونی آمده اند و این مانع از این نیست نه درهنگام آمدن ایشان یك گروه دیگر هم ویا چند تیره دیگر مختلط بنام کاردو در کردستان مرکزی زندەگانی کرده ویا گروه جدید امتزاج یافته باشند .

حقوق سیاسی و مناسبت کرد با پارس

از سوابق تاریخی و آراء خاور شناسان روشن است که کرد و پارس هردو آری نژاد و باهم برادر و ازیك پدرند ، کردها که همیشه به سلحشوری وشجاعت معروف بوده اند گاهی با پارس مشترکا وگاهی بەتنهائی دارای استقلال سیاسی واقتصادی واجتماعی ثابت و معین بوده اند

وێنەی ژمارە ٤: ئەسڵی گۆڤاری ئاوات «لاپەڕەی سێ»

## ٤

هنگامیکه کورد اقتداریافته پارس تابع او بوده است ( حکومتهای گوتی ، کاسی ، کیان ، ماد اشکانیان و ...) و در هرزمان که پارس مقتدرشده کرد مطیع او بوده است ( حکومت پیشدادیان هخامنشی و ... )

### خط کردی

کردان ازحدود قرن دهم پیش از میلاد تا امروز دارای خط وکتابت وادبیات بوده اند وافکار خود را باحروف ( ماسی سورانی ) ویونانی وآرامی وسریانی و میخی نوشته اند . پس ازغلبه اسلام بجای آنها حروف کوفی معمول گردید واکنون نیز بجای حروف کوفی خط نستعلیق و حروف لاتینی درکردی معمول است .

### زبان و ادبیات کردی

اکراد با لهجات متعدد تکلم نموده و میکنند وتمام آن لهجه هارا زبان کردی میگویند وجملگی از یك ریشه سرچشمه گرفته اند . بعضی از مستشرقین میگویند که زبان اکراد مادها همان زبان اوستا بوده است . ( استرابون ) یونانی میگوید که ماد و پارس زبان همدیگر را بخوبی میدانستند واین خود دلیل است براینکه این دو زبان باهم فرق داشته و از یکدیگر متمایز بوده اند .

اکثر مورخین مصرحند باینکه زبان مادها همین زبان « کرد مکری » بوده است چنانکه « زند واوستا » که به زبان مادی نوشته شده خیلی نزدیك بلهجه مکری است ویا همان زبان مکری است ، این نظریه از طرف « هیوارت » و « دارمستتر » وبعضی دیگر ازمتتبعین تأیید شده است . ونتیجه این است که زبان اوستای زردشت وزبان کردی مادی است .

زبان پارسی هم دران دوره همان زبان بوده که در آثار « استخر فارس » نوشته شده است ، اما وقتیکه دراکتشافات اخیر حاصل شده معین است که کردها کلمات زیادی از عربی داخل زبان خود نکرده اند وشکل افعال خود را حتی المقدور حفظ نموده اند ، امابعکس زبان فارسی که در این قسمت بسرحد افراط رسیده است و رابطه خود را با اصل فارسی قدیم سست کرده چنانکه حالا نوشتن کاغذ بزبان کردی ساده وخیلی آسان است اما بسه زبان فارسی ساده چندان آسان نیست واگر نوشته شود غالبا از کلمات نامربوط وخرده درآورد تشکیل خواهد یافت ، حتی در کردی اورامی که در کوهستان واقعند و بهتر توانسته اند رابطه خود را بااصل زبان کردی حفظ کنند ؛ برای زن ومرد افعال متفاوت دارند. مثلا میگویند « فرهاد آما » و « شیرین آماینی » یعنی فرهاد آمد و شیرین آمد « فرهاد لوا » و « شیرین لواینی » یعنی رفت ، که زبان فارسی فاقد این امتیاز است . از منابع دجله فرات تاخلیج فارس درقلمرو زبان کردی بوده است ومرکز این زبان اول « آرارات » بعد « زاگروس » بعد از آن « اسپاهان » پس « نهاوند » بعد « همدان » یك وقتی هم « مداین » بوده است ، بنا براین می توانیم بگوئیم که لغت کردی

۵

درتمام ولایات ایران قدیم عمومیت داشته است . فارسی قدیم و زبان « اوستائی » یعنی زبان کردی مادی و « سانسکریت » هر سه از زبان مشترک آری متولد شده‌است ، بعضی گمان کرده اند که زبان کردی یک لهجه مشتق از فارسی است سر « سیدنی‌سمیت » مؤلف‌کتاب تاریخ آشور می‌نویسد که این‌گمان اشتباه است زیرا زبان‌کردی دارای‌تطورات منطقی و قدیمی است و از زبان فارسی قدیم « لوحه داریوش » خیلی قدیمتر است بهمین دلیل علما می‌توانند بگویند که زبان کردی در قرن ششم قبل از میلاد یک زبان مستقلی بوده که هنوز زبان پهلوی بوجود نیامده است (با بعضی تصرفات از تاریخ کرد و کردستان جناب آقای آیت‌الله مردوخ استفاده شده است )

این اواخر دربعضی ازروزنامه‌های تهران‌مقالاتی بقلم‌جناب آقای دکتر سحابی استاد دانشگاه تهران‌و بعضی‌دیگر از چاپلوسان مزور و مزدور ایرانی وکرد نما انتشار یافته و افتراآت و اکاذیبی‌با شاخ و برگ را باکراد ایران نسبت داده‌اند :

۱ــ خیلی زحمت کشیده‌اند که اثبات کنند اکراد ایرانی هستند .

۲ــ اکراد خیال تجزیه ایرانرا درسر میپرورانند .

۳ــ اکراد متمرد هستند و بقوانین و اوامر دولت سر فرو نمی‌آورند .

۴ــ اکراد هیچوقت‌امشردا دارای استقلال نبوده اند ! .

۵ــ زبان شیرین ونیرومند کردی مخلف ویا مشوش زبان فارسی است .

هر چند درضمن مقدمه جواب هر یک ازاین افتراآت داده‌شد ولی باز میخواهیم بطریق اجمال‌و تفصیل باین پنج فقره جواب‌داده وبربطلان هریک اقامه برهان نمائیم :

اما قسمت اول و دوم وسوم : ما اقوال آقای دکتر سحابی‌راکه یکی از شخیصترین‌نژاد پاک اکراد است بالاتر ازآن میدانیم که باو نسبت افتراء یا کذب بدهیم وآنچه نوشته‌اند شاید تحت تأثیر بعضی از هوچیگران وقلندران پدرقترت که‌بعضیها خودرا کردهم معرفیمیکنند وبعضیها خودرا روزنامه‌نویس و مجله نویس و مؤلف بشمار آورده‌اند ومیخواهندباین هوچیگریها دمقام‌ومنزلتی بدست‌بیاورند واقع شده‌باشند ویا واقعا خواسته‌است اظهارعقیده بکنند والبته عقیده محترم‌است وهرکسی عقیده‌خودرا باید بموقع اظهارکند ؛ ولی میگوئیم ای آقایان‌محترم : اکراد ایران عموما معتقد هستندکه‌اکراد کلیتا خواه‌در زیر پرچم‌ایران زندگی کنند یا درزیرپرچم دیگران ازپاکترین نژادهای ایران هستند و این‌خاک پاک مهد نیاکان آنهاست ، ایران‌میهن وزادگاه عزیز وارجمندآنهاست . اکرادایرانرا ازهزارها سال پیش ازآزادی جداگیران بدعت‌های نکدازی زیر راه سرپستی وتمامیت ارضی‌ایران

وێنەی ژمارە ٦: ئەسڵی گۆڤاری ئاوات «لاپەڕەی پێنج»

٦

فداکاریها وجانبازیها وخونریزیها کرده‌ایم ، ومانند شیر ژیان پیکر خود را هدف تیر دشمن قرار داده ونگذاشته ایم بیگانه بااین زمین مقدس پا بگذارد وتا جان داریم در نگهداری آن می‌کوشیم ، ایران و سلطنت ایرانرا از آن خود و خود را ازآن او میدانیم زیرا اولین سلسله شاهان ایران « ماد » یا « کرد » بوده‌اند و پس از مرگ اسکندر مقدونی‌که کشور دچار هرج ومرج واختلافات داخلی گردیدسلاطین بزرگ اشکانیان‌کرد اختلافا ترا ریشه‌کن کردند ومدت پانصد سال امپراطوری‌و شوکت ایرانرا نگهداری و به باوج عظمت رسانیدند ، پس ازغلبه اسلام که بنیاد استقلال ایران ازهم پاشیده‌شد سلسله‌ها از اکراد در ایران کوشیدند که ازنو ایران بزرگ را درعالم زنده کردند ، اکراد قانون اساسی ایران احترام وارج میگذارند اطاعت شاه ودولت را برخود واجب‌میشمرند، اما کسانی که‌اکنون مصدر امور دولتی ایران هستند بظاهر برای عوامفریبی خودشانرا ایرانی وایراندوست معرفی‌می‌کنند درصورتیکه اینها دشمن ایران وقانون اساسی ومزدور بیگانه هستند . این آقایان سرتیپ هوشمند های‌بی‌اصل ونسب وفاشیست را به‌جان‌ومال و ناموس اکراد انداخته‌اند ازهیچگونه نامردی درحق به اکراد دریغ نمی‌کنند . دو سال‌قبل سرتیپ هوشمند افشار پس‌از تخریب شهر سقز سبب‌شد که‌قصبه بانه‌را طعمه آتش نمودند واکنون اهالی‌وعده زیادی از بیگزادگان آنجا درخاک بیگانه بسر میبرند وچند ماه قبل باتانک وتوپ ومسلسل وهواپیماهای بمب‌افکن به اورامان مریوان برای‌فرونشاندن آتش کینه‌اش تاخت زن‌ومرد و پیرزن وبچه‌را ازدم تیغ و گلوله وبمب‌گزرانید وخانه وکلبه‌محقر آنهارا هدف‌بمب‌قرار داد و همه را از بیخ در آورد وچند نفر از بیگزاده‌گانرا به اتومبیل بست و نابودشان کرد .

یك خلیفه جناب شیخ محمد فرزند مرحوم شیخ حسام‌الدین که‌برای اصلاح وجلوگیری‌از خونریزی به نزد هوشمند رفته بود به‌دار کشید ، هرچند بشاه و روزنامه ها واولیای دولت تلگرافات نمودندو دادرسی خواستند کسی به‌آنهاجواب نداد تا اینکه خانواده نماند که آسیبها و کشته‌ها بخود ندید آنوقت سرلشکر جهانبانی را فرستادند که کار آنهارا اصلاح کندو اوپس‌ازمراجعت‌دستور داد بافسران و سربازانی که اورامانی و مریوانی را بسیار کشته اند مدال بدهندسربازان بهلاك رفته‌را شهید میناممند ، یا کسراد قوچان بجنورد فشارهای سخت‌آورده‌اند که‌معلوم نیست که‌روزگارشان به‌چه‌روزسیاهی سر می‌کشد .

آقایان شما درنوشته‌ها وانتشارت خودتان اکراد را اصیلترین نژادایرانی مینامید وازحیث دین و اخلاق وآداب و سخاوت و شجاعت به‌نیکی یاد می‌کنید ولی‌درعمل آنهارابه‌نجایعی که‌در دوره‌حجر سابقه‌ندارد نابود می‌کنید وبه‌دین و پیشوایان‌دینی آنها فحش می دهد .

بقیه در صفحه ۱۲

# سواری رەشپوش

م . آذر «١»

«ئاشنایی لەسەر روو بوو گەورەترین قارەمانی شەڕی دمشق و وەختێکی ڤایی لادا هاتە ناو ژماری گەورەترین ژنانی گیتی .»

وەختێکی «خالید ابن ولید» سەرداری بەناو و «ابو عبیدە» سەر لشکری بە تدبیر لە شەڕی رومیان دمشقیان دەورە دابوو خەڵکی شار کە خۆیان دەورەدراو و ئیرەکانی خۆیان بە ... دیت؛ خەبەریان لە خالید نارد کە لە مقابل وەرگرتنی مبلغێکی زور دەس لە شار هەڵگری؛ بەلام خالید وەرامی دانەوە : «من لێرە ناروم تا وەختێکی مسلمان دەبن . یا قبولی جزیە و مالیات دەکەن . یا خود بو شەر حاضر دەبن .»

لەو وە : نالە لایەن «هرقل» ەوە لەشکرێکی گەورە بو یاری اهلی شار گەیشت . خالید فەرمانی خوساز کردنی بە لەشکرەکەی خوی دا و «ضرار ابن الازور» ی بە فەرماندەیی پێنج ٠٠ ارسواری شەرکەر بوشەر لە گەل ... ووی تازە نەفەس و تازە گەیشتوی روم نارد ضرار آمادە بوو و لەسەر لەمەشرا کە لەبرانی رومیکان لە هەژمار دالە لەشکرەکەی ئەو زۆرترن؛ سوێندی خوارد ئەگەر تێوە شەر بکات .

مسلمانەکان چون ... یان بیست یەکجاری ... هاوێشتە سەر شەر ، فەرماندەی عرب لەشکرەکەی لە بوسە دنا . وەختێکی لشکری روم نزیك بونەوە ضرار لە بوسە هاتە دەر و نیزەیەکی گرتە دەستو پەلاماری برد و نیزەیەکی وەهای لە آلا هەلگری سپای روم دا لەنەسەکەی کەوتە خوار و صلیبەکەی لەدەس بەر بووە .

ضرار وەك بریسکە خوی لە رومیان دا و چەند کەسی لی‌خستن ، لەو وەختە دا چاوی بە ئەرادەی لەشکر کەوت کە لە ژیر سیبەری صلیبێك دا دەروا و پیاوێکی چ ر شان و قەوی صلیبەکە بە دەستەوەیە ؛ ضرار تەمای لەوکرد و بە پەلامارێك صلیبەکەی سەرەوژیر و ... کە «وردان» ی ناو بوو هەلات .

لەو بەینە دا کوری وردان باسکی چەپی ضراری بە تیر بریندار کرد ، ضراریش بی وەی دەربەندی برینەکە بیت ؛ وەك پلینگی بریندار خوی گەیاندی ئەوجار کە کوری وردان مەرگی هاتە پیش چاو و تەمای بوو رابکا . بەلام ضرار ... ی نەدا و گەیشتە سەری ؛

«١» لە مجلەی اطلاعاتی هەفتەگی وە وەرگیراوە

وێنەی ژمارە ٨: ئەسلی گۆڤاری ئاوات «لاپەرەی حەوت»

... نیزەکەی وەسەی لەپشتی دوا کە لە سینگی دەرکەوت . ضرار کوششی کرد نیزەکە لەپشتی بینێتەوە دەر وەلی نووکی نیزەکە لەپشتی دا بەجی ما و نیزەکە بی نووك هاتەوەدەر.

لەشکری روم چون دیتیان نیزەی ضراربی نووك ماوە و چە لەسبابیکی شەری لە پشی پی نیە ؛ لە هەمو لایەکەوە دەورەیان دا ئەسیریان [illegible]کرد .

مسلمانەکان کە ئەوەیان دیت بەدل شکاویکی زور خەیالی را گرتنیان هەبوو ؛ ل
کە رافع ابن‌عمیرە «یەکیك لەسەردارەکان» هاواری کرد : « ئەی لەشکری اسلام دەس لە داوێنی صبر بەر مەدەن و پایەداری بکەن ؛ خو ئەگەر سەرداری ایوە اسیر یا کوژرابیت خوا زیندوی هەتا هەتایە ..

ئەو جار خالید لە گەل لەشکرەکەی خوی بو [illegible] ئەو لەشکرەچو ناو مەیدانی شەر و پەلاماریکی سەختی بو سپای روم برد .

لەو وەختە دا سەربازەکان چاویان بەسواریکی رەشپوش کەوت کەنیزیکی دریژی بەدەستەوەیە و مەردانە شەر دەکات . سواری رەشپوش ، سەرپێچیکی سووی بەسەرەوە بوو لە پشا پیشی مسلمانەکان وەك بریسکە پەلاماری دەبرد ریزی رومیانی تیك دەشکاند پیاو ولەسپی دوژمنی سەرەو ژیر دەکرد کەسێش ئەوی نە دەناسی .

سواری رەشپوش لە ناو لەشکری روم دا وون بوو بەلام هیندەی پی نە چوو وەدەر کەوتەوە و هیندەی کوشتار کردبو ئەواوی کراسەکەی دەتلی خوین بوو .

رافع خوی گەیاندە خالید و لیی پرسی : « آیا دەزانی ئەوسوارەی لە پیش لەشکرەوەشەردەکات ؛ [illegible] ؟ کە لە ریی جهاد دا ترخیکی بو گیانی خوی دانانی » خالید گوتی منیش لە فکری ناسینی ئەودام ، و سەر لی سور ماوی آزایی ئەوم .

خالید شەریکی سەختی [illegible]کرد و بەلام لە هەمو جیگەیەکیش چاوی لەو سوارە هەل نەبری تا نیزیکی بووە ولیی پرسی : « ئەی سوار تو کیی وخەلکی کوی ؟ جوابیکی نە بیستەوە . مسلمانەکان کوتیان ئەی سوار ، ئەوە خالید امیری لەشکرە کە پرسیارت لی دەکا . قابت لادە تا بتناسین و بو پاداشتی ئەو آزاییە احترامی گەورەبیت بگرین . ؟ وەرامیکیان نە بیستەوە . خالید خوی هاتە پیش و گوتی : « ئەی سوار پاکەی سوت دەشارییە ، رووت دەرخە تابتناسین .

ئەو جار خوار هاتەقسە و گوتی : « شەرم دەکەم خوم بەایوە بناسینم چوون من ژنکی دلسووتاوم . من « خەولە » خوشکی ضرارم ، کە بو رزگاری برای خوم شەر دەکەم »

خالید لە بیستنی ئەم قسەیە فرمیسکی هەلوەراند و گوتی : « ئەوا من بە تەواوی لەشکرەوە پەلامار ئەبەم ؛ شایەد برای تو نەجات بدەم . »

خەولە گوتی : « منیش هەر وەها لە پیش لەشکرەوە شەر دەکەم »

٨

لەپاش ئەم قەرارە؛ خالید لە لایەکەوە ورافع ابن عمیرە لە لایەکی ترەوە پەلاماریان برد .

خەولە لە چاریش لە مەیدانی شەر دابو و هاواری دەکرد: « ضرار لەکوییە کەڵای بینم ، کەس و کاردەڵای ژنی ! ئەی تاقە بری من . ئەی کوری دایکی من ، لە دووری خوت تەپشت ئەمن هەڵ گرتوە .»

گالی نیوە ڕەژ ، هەر دوو ئەنگەر دەستیان لە شەو هەڵگرت و گەرانەوە جێی خویان ! ئەوجارخەولە دەستی کرد بەپرسیار چون لە هیچ کەس خەبەری ضراری نەبیست ! گریا و گوتی: « ئەی برا . بریا دەمزانی لە کویستانانیان راگرتوی؟ یا بە بەندی آسن ماندوویان کردوی . بریا دەمزانی ! ئایا ئویان هاویشتوی یا بە خوینی خودکیان سوورکردوی . آیا بەلیزە کەتەی تویان بریوە یا بە تیغ سەرکیان بریوە . ؟

بریا خوشکت فیدای تو و تو لە بەند رزگا بایت ! ئەگەر چوویە دولنیای تر لە منەوە رەسوولی خوا سەلام بکەیە » .

لەو پەیدە هێندێک لە رومیان بە دیل گیران ، خالید لە ئەوان تیگەیشت کە ضراریان لەگەل سەد سوار ناردوە « حمص » تا لەویرا بولای امپراطوری بەرن .

---

چەند سوار لە نەیزە هەڵ بردی . پیاویکیان سواری ئەسپ کردوە لەحەمولایەکەوە دەوریان گرتووە . ئەم پیاوە تریە ، بی وەی چاو لە تەماشای رفاوی ئەوانە بکات ؛ ئەلی :

ــ آیا کەس هەیە لەمەوە بەکەس و کار وخەولەی خوشکم خەبەر بکەیەنی . بلی من ئەسیر کراوم و دەستیان بەستوم ، کافرەکان و رومیان دەوریان داوم و ئەیانەوی بەو حالە بو رومم بەرن . ؟ ئەوا بو ، ئەی دلبرە لەخەم و حەسرەتی خەم ، ئەی فرمیسکی گەرم بەسەر گوڵەماوەرە خوار . آیادەبی جاریکی تر چاوم بەکەس وکار و خەولەی خوشکم بکەوێتەوە . ؟ !

لە ئاکاو لە پەنا ئاپەشدا سیپک دەر پەری سواری رەشپوش پەلاماری بو رومیان برد و دەنگی رافع بەم جورە بە گوێی ضرار گەیشت :

ــ خوا دوعای توی قبول کرد : ئەو خوشکت ئەو سوارە رەشپوشە بو آزادی تو شەر دەکات .

رومیان شکان و ضرار آزاد بوو و ناوی خەولەش خوشکی ضرار هەتا ئەو ناوی گەورە ژنانی گیتی .



قسەی ئەستەق

هەمیشە کاربکەن و بکوشن تا کراسی افتخا و گەورەیی پوشین ، هەمیشە لە پیش چاوتان بیت کە افتخاراتیکی تازە وە دەس بین ؛ افتخاراتی رابردو وەک شمشیری ژەنگاویە لە رەونق کەوتوە .

شەکسپیر

٩

وێنەی ژمارە ١٠: ئەسلی گۆڤاری ئاوات «لاپەڕەی نۆ»

١٣

---

له تکبیر تحرم تا سلام ی فرضی پسر مند و ب
به لغتیی رضای غفار یه دعوا بـه حق مثـو ب
ئەگـه لیمت قبوله یانه هیچه پی ی ئەیم محجـو ب
خوا ئەم حکەی به مرجع بو علیهم دوایی مغضو ب
بشد و حدی تجویدی و لا الضـا لین گـویا کەم

بنا یی چاك « اشکه » ی عقلت هه بی راجع به پینجیـسه
به خشتی دقتی وەستا هلالی طـا قی تا مبنـه
حکه وا بو دەستی اخلاصت به رێئی حمد دا بینه
له پاش آیاتی سبعه ی فـاتحه لازم بـه آمینه
ترحم حکـه به حـالی « اشکەی »بو هەردوتا کەم

• • • • • ✿ • • • • •

روژی ئەمری کن له ریگەی قل هو الله احـد
شارەزا بووم زور به چـاکی تا به الله الصمـد
لـم یلد یا خو و لـم یولد هه مو کەس حالیه
تی گه یشتوم بو و لم یکن له کفوا احـد

واجب التعظیم فردی بی مثـال و بی معین
قـەت شەریکی نه بوه نـا بی هه ی ازل هەر تا ابد
هەرچی هه یه بی گراوه هەرچی مایل بیی لەبی
مـا تشاءت جی ه جی یه بی دژ و بی بلـد

دوزەخ و جنت مکان لا مکان مـا فیـهـا
نـا طق و نـا هق نبـا تـات آسمـانی بی عمد
اشـ ـهی بیا پەس بی لا چـو زور مخو فـو مەنزلت
تـا له خزمەت منزلی قورآنەوه بوت دی مەدەد

---

حمـدی

باڵی کیشاوه به سەر حسنا له دوو لاوه برو وەڵێهرماگەیه مقامیك پیلەسەرچاوه برو
رتبەی بالا به انسانی بچوکی قەت مه دەن چوون له روەی روژا برانه تیغی کیشاوه برو
رەنگەقەت اهلی; محبت یەك کەسی لیدەرنەچی تیغی را کیشـا وه امری کوشتنی داوه برو

✿ ✿ ✿ ✿ ✿ ✿ ✿

وێنەی ژمارە ١٤: ئەسڵی گۆڤاری ئاوات «لاپەڕەی سێزدە»

٥١

# محاکمەی هیتلر ؟!

« لەمە سەرگوزەشتی هیتلرە لەناو جهنمدا کە »
« بە وەسیلەی بیسیم بو ایمەیان مخابرە کردوە »
« و ئەوا ایمەش بوخوینەرە خوشە ویستەکانی »
« درج لەکەین تائەلیجەی بەدکرداری کەسانیکی »
« فکری جهانداریان لە سەردایت ! لەهەمو »
« کەس معلوم بیت .

بە قلم : م. آذر

روژی . . . لە ناو جهنمدا دەگەرام بەلکو خەبەریکی آزەم دەس کەویت و بو مجلە کەی مخابرە بکەم .

لەناکاو دیتم لەلایەکەوە کارکەرانی جهنم یەکیکیان دەورە دارە و رەکیشی دەکەن بو لای طبقەی هەرەژیروی جهنم ، کەئەوەمدیت پرسیم چەباسە ؟ . کوتیان گویا هیتلرە ، منیش بە دەمهەراکەوە رویشتم دیتم لە پیشاپیشی مأمورەکان جەژانی ناکی دوزەخ بولای طبقەی هەرەژیروتریف ئەبا هیتلریش بەحالیکی پەریشان و پەشوکاو هەر پیا ی بەدەس یەکیکەو ەبەدوای مالکدا رای دەکیشن ، چوومەپیش وسلاوم کرد ، مالکیش جوابی دامەوە و کوتی جنابی هیتلر بو ئەوەی لەدەس متقین رزگار بیت لە برلین خوی کوشتوە ، بیروەی ئەزانی رزگاری لە دەس خوای گەورە غیرە ممکن و نیلتەو بدی گیتی پاش مردن پاداشی دەدریتەوە .

بەلی بەکورتی جنابی صدری اعظم آدلف هیتلر ؛ تەشریفی هینا ناو طبقەی ژیروو رنە سەر کورسیکی آگرین کە لەپیشدا بوی آمادە کرا بوو قەرای گرت . و من ومالک لـە لەنیشتی وچەند نەفەر بەگورزی آگرینەوە لەدەوری راوەستابون ، پاش تاویک سەری هەلینا ودەوروپشتی خوی تەماشاکرد و چوون منی وەک اهلی گیتی عانەیش جاو رووی تی کردم وپیش هەمو شیاک لیی پرسیم : لیرەدا پەناگای هەوایی هەیە ؟ کوتم پەناگات بو چی یە ؟ کوتی لەمەوی لەوەختی حملەی هەوایی متفقین داخوم پشیرمەوە ! ، جوابم داوە : لەمتفقین معلوم بوەکە لو تەسلمی دیوان عدالت کراوی و ئەزانی خوا جزای نیک وبەدت دەداتەوە ایتر بە شویتنا نایەن خاتر جەم بە .

لەوجار کە لەترسی خطری هەوایی ! رزگاربو لیی پرسیم ترکی ، چونە کـە خەمگین لیت ؟ هەگە لوش وەکەمن لەناو آگر نیت رناسوونیی ؟ کوتم خیر ! آگر کار لـە من ناکات ، کوتی چونە ... ... لەناو جهنم دایت و آگر کاری لی نەکا ؟ جوابم

وێنەی ژمارە ١٦: ئەسڵی گۆڤاری ئاوات «لاپەڕەی پازدە»

## ١٦

داوە : چونکە من لە گیتی دا وەك تو هەوای جیهانگیریم نە بوو و نە بوومە باعیسی خوێنی رێژی ملیونها ژن و پیاو ، حەقی کەسم پامال نە کردووە ، بەڵکوو « حەقی »ن لەژێر پێی دە سی پەروەرەکانی تو دایە . « گوناهکار نیم ! » بەڵام ئاگر کارم لی ناکات .
ــ ئەدی تو چکارەی کە وایە بۆچییان هێناویە ایرە .
ــ من یەك لە « کوردم » و بە ئیختیاری خوم هاتوومە ایرە ، و لە لایەن مجلیکە وە مأمور کروم تا اخباری جهنم بو مجلە کە مخابرە بکەم .
ئەو جار رووی لە مالك کردو پرسی ئەوەکی یە ئەو مأمورانە بو لەدەوری راوەستاون ؟
مالك کوتی : من مالکی جهنم و مأموری پذیرایی لە میوانانی جهنمم ! و ئەو گورزە دەستانەش پاداشی کردەوەی گیتی تو دەدە نەوە .
ــ بو مەگەر بیروەی محاکمە بکرێم مجازاتم دەکەن . گوایە ایرەش وەك دنیا دەرەبەگی و بگرەی لیوە بیت . پێش محاکمە مجازات چلون دەبیت و کی بەم تو یەتی ؟
ــ ئەگەر چی مجازاتی تو لە ئیرایە پێش محاکمە بیت چوون تولە گیتی دا ئەگەوە چووکە کانت پێش خەتا وبی گوناه پامال کردو وە وەکو برایەعاملە بە مثلت لە گەل بکری ! بەلام لەسەر ئەمەشا ایمە تومحاکمە ئەکەین ایجا پاش محکوم بوون جە زات دە دریتەوە .
من کە زانیم ئەگەر هیتلر سەرگەری محاکمە بیت و مختی وەرای پرسیارێك منی نایت ! بەجنابی مالکم عرض کرد : تکات لی دەکەم چەند سەعاتێك لە محاکمەی دەس رابگرە تا من چەند پرسیارێکی لی بکەم .
ــ لە بەر خاتری تو وچوون دەزانم کە تو پرسیارەکانت بو گیتی مخابرە دەکەی و اهلی گیتی دەی بینن لە بەر ئەوە ئەوا دوو سەعات دەس رادەگرم ، تا اهلی گیتی خەبەرەکانی تو بخوێننەوە و بزانن ئەنیجەی بەدکاری و زوڵم چیە و انسان پاش مردن بە چ سەر نوشتێك گرفتار ئەبی .
ئەوجار رووم لە جنابی هیتلر کرد و پرسیم آیا دەتوانی وەرامی چەند پرسیارێکی من بدەیە ؟
ــ هەرچەند لە بڕێن اجازەی ملاقاتی خەبەرنێشارانم نەدەدا . بەلام ئیمرۆ چارەم نیە و هەرچی پرسی جوابت دەدەمەوە .
ــ لەو هەموو بگیر و بکوژە کە تو لە گیتی خست و هەزاران آوالی گەنجانت لە خاك پولهان و روولە روت لە ناو دایکانی جیهان خست چ نەتیجەیەکت لی دەرکەوت
ــ پاش ئەو هەموو گیرە و کیشەیە لیم معلوم بوو کە « ورەی » ملشکانی لە دوایە !
ــ کەی لیت معلوم بوو لە ئەوردا سەر ناکەویت . ؟
ــ وەختێکی نیشتمان پەروەری و گیانبازی و ئازادی « سوپای سوور » م بانگ بکەیت بوچی پەلامارت بو « روسیە » برد ؟

١٧

ئەنتیجەی خەیانەتی هاوکارەکانم بوو ، چوون منیان وا حالی کردبوو کە ئەبروی ئەلمان لە ماوەیەکی زور کەمدا دەتوانی روسیە داگیر بکا و پاش داگیر کردنی روسیە ئەو جار کاری ئنگلیس و امریکاش زوو دەبڕێتەوە ، وابوو کە فەرمانم دا لە ماوەی چەند حەوتودا ئەبێ روسیە داگیر بکرێ . !!

ـ جگە لەوە آیا شتێکی تر ئەبێ بە هوی شکستی تو . ؟

ـ بەلێ ئەوەی هاوریزە ! زستانی کەهەموجارلە آسمانی ئێران وە دەرد ئەکەون و وەك فڕۆکەی شیت حوقەیان دەهات ؛ ئەوانیش بە باروت روحیە ملتی المانیا متزلزل وپشتی منیان شکاند .

ـ تو کە دەتزانی آخری کار لە مردن زیاتر نیە بوچی خوت کوشت وتەسلیم نەبوری ؟

ـ مردنم لەدیلی پی چاتر بوو . !

ـ آقای خەبەر نێگار وەك بوخوت دەزانی ایستا فکرم بلاوە و چوون چەند دقیقەیەکم زیاتر نەماوە بو وەختی محاکمە ؛ تکات لی دەکەم دەستم لی هەلگری •

ـ ئەوجار جنابی هیتلرلەبەرخویەوە کوتی : خوایە لە دەس سوپای سوور و حەملەی هەوایی رزگار بووم بەلام لەدەس خەبەر نیگاررزگارنەبووم ولە جهنمیش بڕێنم دەکوڵێتەوە •

« خوینەرە خوشەویستەکان ؛ چوون محاکمە هیتلر دەس پێ نەکرابوو خەبەرنیگارەکەمان لە رەندەی آگایی حاصل کردبوو بوی مخابرە کردین و لە ژمارەی دوایی دا جریانی محاکمەکەشی دەنوسین .

بقیە از صفحه ٦ — نویسندگان فارسی بخوانند

شما تمام آثار فرهنگی کردستانرا نابود کردید و درعوض چندباب دبستانرا بازنمودید ، که جز سوء اخلاق چیزیرا به بچەهای اکراد نیاموخت از بهداری بهیچوجه اثری نیست مردم درآتش امراض گوناگون جان میدهند ودر فقرو بیچارگی میسوزند ، سه نفر از اهل مهاباد که چند ماه قبل برای امورات شخصی بسه رضائیه رفته اند ژاندارمهای « بالانیش » هرسەرا دستگیر و یکسره به تهران فرستاده واکنون در قصر قاجار بسر میبرند وتاکنون ازآنها سئوالی نشده معلوم نیست به چه گناهی زندانی شده اند .

شما معتقد هستید که باید مامورین تمام نقاط کردستان را ازتهران بفرستید وهیچگونه حق و مزایارا برای اکراد قائل نمیتواند باشید هم راضی نیستید میگوئید اکراد عیال تجربه ایرانرا درسر میپرورانند ؛ خواهش میکنم معرفی فرمائید اکرادی که خیال تجزیه ایرانرا درسر دارند کیستند وکجائی هستند و مدرکتان چیست ، شما خیال میکنید کەاگر مامورینرا بجای فرستادید هرانی کرانست مردم آنسامان را در نظر دولت بدتر جلوه دهد بهتر انجام وظیفه کردەاست ؛ چرا هوشتانرا جمع نمیکنید و فکر اساسی بحالخود وجامعه نمیکنید ؟ دولت باید بردبار باشد ؛ مردمرا تربیت کند وزندگیشانرا تامین نماید صرفنظر داشته باشد و با محبت عاطفه بەمردم بنگرد تا حب میهن و دولت در قلوب افراد جایگزین گردد .

بقیه در صفحه ١٩

وێنەی ژمارە ١٨: ئەسڵی گۆڤاری ئاوات «لاپەڕەی حەڤدە»

۱۹

بقیه ازصفحه هفده نویسندگان فارسی...

ترا بخدا شما این اخلاق‌را دارا هستید؛ حاشا وکلا شما ازکلیه مزایای اخلاقی وملت ـ پروری محروم هستید باز هم می‌گوئید اکراد متمرد هستند.

اما راجع بقسمت چهارم که اکراددارای استقلال بوده‌اند یا نه؟ محتاج به اقامه دلیل و برهان نیست کـه اکـراد پیش از میلاد «حکومت کیان و ماد و..» و بعداز میلاد «حکومت اشکانیان» وبعداز اسلام «حکومت اخشیدیه‌وروادیان و پیشدادیان وایوبیه و زندیه و..و..» سلطنت و بلکه امپراطوری نیز داشته‌اند و در هنگامیکه رشته‌امور مملکتی در دست اکراد نبوده‌است باز از آزادی داخلی و خودمختاری‌محروم نبوده اند.

اما راجع بقسمت پنجم که آیا زبان کردی مختلف و یا مشتق ازفارسی است یا اینکه زبان مستقلی است؟: در مقدمه از اقوال و آراء مستشرقین روشن کردیم که زبان کردی دارای منورات قدیمی وحقیقی است و از زبان فارسی خیلی قدیم و کهنه‌تر است و رابطه خود را با اصل کردی قدیم بهتر از فارسی حفظ کرده است.

اگر کسی بخوبی زبان کردی بداندو بخواهد بزبان کردی ساده رساله‌هاو بلکه کتابها بنویسد [illegible] در هزار محتاج استعمال واژه بیگانه نخواهد شد؛ کسانی که در میان‌عشایر سیاحت کرده‌اند و زبان کردیرا هم دانسته باشند می‌دانند که واژه‌های صحیح کردی هیچ گونه مشابهتی با فارسی امروزه ندارد و میسر نیست ریشه آنرا در فارسی پیدا کنند؛ ادبیات کردی با این عقب افتادگی دارای علو و پایه‌ایست که هنوز زبان فارسی با این پیشرفتیکه کرده است فاقد آنست و این لغات فارسی‌که در زبان کردی دیده میشود در اثر اینست که در این چند قرن اخیر تحصیلات اکراد منحصر به عربی و فارسی شده‌بود بویژه‌که استعمال واژه‌های بیگانه در سالهای پیش یك افتخار شمرده میشد و با این‌حال واژه های کردی هنوز بجای خود برقرار و از بین نرفته اند.

[illegible] از نویسندگان‌دم‌از «امپراطوری زبان فارسی» میزنند؛ دانسته نیست که این جمله [illegible] چه؟ امپراطوری زبان فارسی‌چه‌معنی دارد؟ این‌جز اوهام وخیالات شاعرانه [illegible]؛ بفرض‌اینکه تمام دنیا بفارسی حرف‌بزنند ولی فارسی زبانان بطوریکه [illegible] سیاسی و اقتصادی نداشته‌باشند و یا در زیر چنگال بیگانه زبون باشند چه [illegible] میشود؛ و آیازبان آنها را در ردیف‌ملل زنده‌قرار می‌دهد؟؛ نوشتن و [illegible] و زبان بوی‌آنها ازحیث‌ادبیات بپایه‌زبان‌فارسی‌نمیرسد پس‌چرا [illegible] دنیا در زیردست آنها می‌باشند؟؟ دراتحاد جماهیرشوروی حداقل‌بیست [illegible] میخوانند وهمگی رسمیت‌دارند؛ زبان‌فرانسه در دنیا رسمیت‌دارد و بقول [illegible] امپراطوریست معهذا دولت‌فرانسه دربرابر ارتش‌المان درمدت کمی از پا [illegible] اتحادجماهیر شوروی پس‌از چهار سال جنگهای خونین المانرا با این [illegible] که [illegible] از پادرآورد ونام‌نازی وفاشیست را درعالم محو و نابود

بقیه در صفحه بعد

وێنەی ژمارە ٢٠: ئەسڵی گۆڤاری ئاوات «لاپەڕەی نۆزدە»

بقیه از صفحهٔ قبل — نویسندگان فارسی

و سر زمین روسیه و سایر دول اروپائی متصرفی آلمان از چنگال خونخواران نجات دادند! و دولت ایران که نویسندگانش خیال تشکیل امپراطوری زبان فارسی را درسر میپرورانند نتوانست سه روز در برابر حمله متفقین مقاومت کند!! پس بر ما واجبست از این خیالات و اوهام بی‌سر و ته دست بکشیم و کوتاه‌ترین راه را در پیش گیریم که زودتر بسر منزل مقصود برسیم ؟ امروز روزگار برقست باید هر کاری را از کوتاه ترین راه آغاز کنیم ؟ کرد ارمنی اگر بزبان مادری دانش بیاموزند پنج سال در تحصیل پیش می‌افتند . مجبور کردن ملل غیرفارسی برای اینکه بزبان فارسی بخوانند و بنویسند باین میماند که جنگاوران را مجبور کنند که درمقابل تانك و توپ و هواپیما و غیره که اسلحه دنیای تازه می‌باشند با شمشیر و تیر و کمان که اسلحه عصر کهن میباشند بدفاع برخیزند ، اگر هر ایرانی قسمت آزاد باشند چه زیانی بامپراطوریت خیالی زبان فارسی میرسد ؟ ما اگر از حقایق تاریخی و از واژه‌های کردی و فارسی امروزه که عینا ازهم جدا و بلکه مناسبت باهم ندارند چشم بپوشیم و قبول کنیم که زبان کردی مخفف یا مشتق از فارسی است خواهیم گفت که زبان فارسی در اثر نفوذ زبان عربی بی‌اندازه عقب و اکثر واژه‌های ویژه خودشرا از دست داده است ولی زبان کردی سادگی خود برقرار و واژه بیگانه درآن نفوذ نمود است اگر هم کلمات بیگانه در زبان شهر نشینها استعمال شود باکی نیست زیرا که زبان عشایر و دهاتیها بحالت خود پایدار است! پس بیائید مردانه زبان کردی را آزاد کنید که ادبیاتش ترقی کند که شما نیز بتوانید واژه‌های ازدست رفته زبان فارسی را در کردی جستجو کرده و مورد استعمال قرار دهید آنوقت می‌توانید بگوئید که ایرانیها دارای زبانی هستند که بتمام معنی ایرانیست «١»

---

«١» توضیح : درصفحه قبل سطر ٣٧ بعداز کلمات امریکای شمالی « بزبان انگلیسی است » و صحیحش اینست « نوشتن و خواندن ممالک متحده امریکای شمالی بزبان انگلیسی است و ... »

---

به بونەی نواقصاتی چاپی ئەگەر هەڵەو کورتیەکو چاو پێکەوی لیمان ببورن! خوامان پێخۆش بێت لە ژمارە ٤ دا رضایتی خاطری خوێنەرە خوشەویستەکان بەجێدێنین .

ژمارە ٣ . آوات و لە پەڕ ئەچی بخوێننەوە و سوودی لێوەرگرن .



بژی کورد و کوردستانی گەورە!

J.K

# نیشتمان

بلاو کەرەوەی بیری کومەلەی ژ ـ ک

گوڤاریکی ئەدەبی ، خویندەواری ، کومەلایەتی ، سیاسیو مانگی کوردی

ژمارەی ٧ - ٨ - ٩ سالی یەکەم خاکەلیوە ، بانەمەر ، جوزەردانی ١٣٢٣

سلطان صلاح الدین ایوبی

**وێنەی ژمارە ٢٢**

**ئەسڵی گۆڤاری نیشتمان ـ ژمارە ٧ و ٨ و ٩ «ڕووبەرگ» بەر لە دەسکاری کردن**



الله

ژ ، ك

بۆی کوورد و کووردستانی گەورە

نیشتمان

بلاوکەرەوەی بیری کۆمەڵەی ژ ـ ك

گۆواریکی ئەدەبی ، خوێندەواری ، کۆمەڵایەتی ، سیاسیو مانگی کووردی

ژمارەی ٧ ـ ٨ ـ ٩ سالی یەکەم ئاگەلیرە ، پووشپەڕ ، جۆزەردان ١٣٢٣

سلطان صلاح الدين ايوبي

وێنەی ژمارە ٢٣



هەر کەس جنیو بدایە کە سپك پیە ی دەلی برو
بی غیرەتیت وەکوو زلی دەر بیت زنا نە ابی
گوانی لە گیتیا وەکوو لەو دوو کچە کور بك
بو نیشتمان لە داری سپا سەت نبنا نە بی!
لەو دوو لە مامە بوون بە فیدای نیشتمانی کورد
لەی خوزگە بەو کوڕەی وەکو لەو دوو کیا بە بی

وێنەی ژمارە ٢٤

گۆڤاری نیشتمان ـ ژمارە ٧ و ٨ و ٩ «دەسکاریکراو»

«ئەو وێنەیە لە جیات دوو لاپەڕەی ٩ و ١٠ی نوسخەی ئەسڵی دانراوە»

لاپەرەی-١٠ **نیشتمان** ژمارە-٧،٨،٩

# لە ناو کو مەلەدا

°° زور لە میژ بوو بریار درابوو کونفرانسیک لەنیوان ایمەو کومەلی «هیوا» دا بو هاوبرسەکی لەبابەت هیندیک مسائل تەشکیل بدریت ، روژی ئەم اجتماعە دەبوو لە لایەن کەمەلی هیوا بەعلووم بکریت ، هەرکەنوینەرانی کومەلی ناو براو آمادەبوو نی خوبان بەایمە راگەیاند نوینەرانی ایمەش رەوانە بوون ؛ دوای ٣روز گوفتوگو و مذاکرە لە سەر اقتراحی نوینەرانی ایمە پەیمانیک بەناوی پەیمانی « سیە سنوور » لە لایەن نوینەرانی هەر دوولا بوزیاد کـردنی کوششت وایجادی پیوەندیەکی زەمینی سیا سی امضا کرا .

نوینەرەکانی کومەلەی هیوا لەم کونفرانسە دا عبارەت بوون :

١ ـ ع . هور شەنگ ئەندامی ژمارە٧

٢ ـ ع . جانگیر لەندامی ژمارە ٧١٦

کومەلەی ایمەش لە لایەن ئەو ئەندامانە :

١ ـ ق.ق.ق. پاو ئەندامی ژمارە ١٠٥٣ سەروکی نوینەران

٢ ـ ع. هەزار لەندامی ژمارە ٣٠

٣ ـ ع. بیژەن لەندامی ژمارە ٢

ئەمثیل دەکرا : م.س.خوینین ١٠٦٠رابطی نیوانی ایمەو هیوا بوو تا کونفرانس تەشکیل درا کومەلە لەکوششتی ئەم لاوە آزایەو هەروەها لە گشت لە ندامەکانی ئەم کونفرانسە گرینگە کە بی گومان لەدوایی دا دەبیتە فەصلیکی گەورە دە میژوی فەعالیەت و کوششتی دوو کومەلە دا ، سوپاس و تشکر دەکا .

( پەیمانی سیەسنوور ) لە لایەن هەیئەتی استشارەی ادارەی ناوەندی ی « ژ . ک » پەسند کراوە بەم زووانە دەگەل نسخەی پەسندکراوی ناوچەی (هیوا)مبادلە دەکریت .

°° م لیوەج لەندامی ژمارە ٣١٥ و ا . آرام ئەندامی ژمارە ١١٤٩ بو یێنی گـەو تنی کاری گوـوارەکەمان زور زەحمەتیان کیشاوە لە طرف ادرەی ناوەندیوە رەسمیاً تقدیر یان لیکراوە

°° ژ.ف پرشینگ لەندامی ژمارە ١٠٧٥ ی (آ:ك) بو توسعەی چاپخانە زوری کردیت کردوە کومەلە سوپاسی دەکا .

**وێنەی ژمارە ٢٦**

**ئەسڵی گۆڤاری نیشتمان ـ ژمارە ٧ و ٨ و ٩ «وێنەی لاپەڕەی ١٠»**

**ناوی بەشدارانی پەیمانی سێ سنوور لەو لاپەڕەدا بڵاو کراوەتەوە**

# فهرست



و ٥٣ لیلە پاسی دیکەش دەخویندریتە وە

وێنەی ژمارە ٢٧

گۆڤاری نیشتمان «دەسکاریکراو» ـ ژمارە ٧ و ٨ و ٩ «لاپەرەی پێرست»

کورد

* هـاوار *



ژمـاره

١



[رەزبەر]

١٣٢٤

شمسی

**وێنەی ژمارە ٢٨**

**وێنەی رووبەرگی گۆڤاری هاوار کە لەودا (ی کورد) بە دەستنووس پێوە لکێندراوە**

# ✿ هاواری کورد ✿



ژمارە

١



ڕەزبەر

١٣٢٤

شمسی

وێنەی ژمارە ٢٩

KOMELHEY J. K.

Idarey

Jimare

Berwari 19



کۆمەڵەی ژ. ک.

ئیداری

ژمارە

بەرواری

( Remz — رمز )

بژی کورد و کوردستانی گەورە!

**وێنەی ژمارە ٣١**

**وێنەی نامەی مامۆستا زەبیحی بۆ کۆنسوولی سۆڤیەت لە تەوریز «لاپەڕەی دوو»**

بژی كوردها و كوردستانی گه‌وره !



# بەناوی یەزدانی گەورە و بەرز

## بەیان نامەی ژمارە ٣١٢ روژی دوویەمی خەزەل وەری ١٣٢٣

لەم روژانەدا رادیوو روژنامەكانی ایرانت بلاویان كردەوە كە حكوومەتی یەكیەتی سوورەت دەیەوی لە باكووری ایرانت دا بودەر هێنانی « نەوت » لەلایەن حكوومەتی ایران ناوچەكانی باكووری بو تەرخان بكریو امتیازی بدریتێ، بەلام حكوومەتی سپلەی ایران چارش لەهەموو چاكەیێكی كە لەم سی سالی دوا ییدا لەلایەن یەكیەتی سوورەت دەربارەی كرابو ،پشیو ئەم داوایەی لی قبول نەكرد ، ایمە كە ئێزیكەی ٣ میلیونی نەتەوەكمان لە بەش كرانە نارەوایەكەی كوردستانی گەورەدا كەوتوتە ناو سنووری ایران تاچنیكی سنوور لە نیوان پارچەكانی كوردستان هەل نەگیراوە و حەقی مەشرووعی خومانت نەدراوەتەوە دەست لە تەواوی و ولاتانی توركیا ، ایرانت و عراق خومان بە حاوەت بە نەبوار علاقە ) دەزانین و حەتمان هەیە لە هەموو كار و باریك بكولینەوە لەگەل زیاتی خومان پیكی هەل بكیشین ئەوالە سوور ( اطراف ) ی داوای حكوومەتی یەكیتی سوورەت و وەلامی حكوومەتی ایران ئەو چەند و وشەی خوارەوە بلاو دەكەینەوە

ئەم وەلامەی كە لەلایەن حكوومەتی ایران دراوەتەوە بە نوبەری یەكیەتی سوورەت بە هیچ كلوجیك لەگەل قازانجی نەتەوەكانی ایرانت بەرآوەردنە كراوە دیارە قازانجی ٣ میلیون نەتەوەی كوردیش لەم جوابە دالەبەر چاو رانەگیراوە ، نەتەوەی كورد ناتوانی لەسەر ئەم هەموو جەور ستەمەی كە تا ایستا لیەی كراوە بیینی كەداو خوازی حكوومەتیكی وەكو یەكیەتی سوورەت كە هەمیشە لە پیناو خوشی ژیانی نەتەوە بچووكەكاندا تیدەكوشی لەلایەن پیاویكی نەفامی وەكو « ساعید » سەروك وەزیری ایران رەد بكرێتەوە و ببێتە مایەی آزاری و ولاتیكی كە ٣ میلیون كوردی تیدا دانیشتووە

كومەلەی ژ . ك حكوومەتی یەكیتی سوورەت

---

آگادار دەكا ٩ میلیون نەتەوەی كورد بەتایبەتی

---

كوردەكانی ایران لە بریاری حكوومەتی ایرانت

---

دەربارەی نەدانی امتیازی نەوتی باكور بیزارە و

---

بە هیچ باریك موافقەتی ئەم بیرەی حكوومەت ناكا

---

آ • ل • ب • هه‌یئه‌تی ناوه‌ندی كومه‌له‌ی ژ•ك

وێنەی ژمارە ٣٢

دەقی بەیاننامەی ژمارە ٣١٢ی كۆمەڵەی ژ.ك

٢ی خەزەڵوەری ١٣٢٣



**وێنەی ژمارە ٣٤**

**پێشەوا قازی محەممەد**



وێنەی ژمارە ٣٦: مامۆستا عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی



وێنەی ژمارە ٣٧: مامۆستا محەممەدئەمینی شێخولئیسلامی «هێمن»



وێنەی ژمارە ٣٨: مامۆستا عەبدوڕڕەحمانی شەرەفکەندی «هەژار»





وێنەی ژمارە ٤٠

لە راستەوە: مامۆستا زەبیحی – کاک محەممەدی شاپەسەندی - مامۆستا حەسەنی قزڵجی

«ئاوات» کچی کاک محەممەدی شاپەسەندی



وێنەی ژمارە ٤١: شێخ عوبەیدیللای زینوێ



وێنەی ژمارە ٤٢: کاک محەممەد دڵشاد رەسووڵی





وێنەی ژمارە ٤٤: مامۆستا هەژار و مامۆستا زەبیحی



وێنەی ژمارە ٤٥: ئەندامانی چاپخانەی کومەڵەی ژ.ک لە تەورێز
راوەستاو لەراستەوە: ١- محەممەدی شاپەسەندی ٢ و ٣- (نەناسراو)
دانیشتوو لە راستەوە: ١- نەناسراو ٢- خەلیلی ساوجبلاغچی «خانە» ٣- زەبیحی ٤- نەناسراو



وێنەی ژمارە ٤٦: ١٣٢٥ی هەتاوی – ستادی فەرماندەهی حکومەتی کوردستان
راوەستاو لە راستەوە: ١- بەکر عەبدولکەریم (حەوێزی) ٢- رەحمانی وەیسی ٣- ئەحمەد...
٤- نەناسراو ٥- مستەفا سوڵتانیان ٦- نەناسراو ٧- عەزیزی مەنسووری قازی ٨- میرزا وەهابی
قازی ٩- عەلی خوسرەوی ١٠- محەممەدئەمینی شەرەفی ١١- محەممەددڵشادی رەسووڵی
١٢- میرزا رەشیدی خوسرەوی ١٣- میرزا مەحموودی وەلیزادە ١٤- سەرهەنگ مستەفا خۆشناو
دانیشتو لە راستەوە: ١- خەلیلی خوسرەوی ٢- عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی ٣- شوکری قەدری
جەمیل پاشای دیاربەکر ٤- پێشەوا قازی محەممەد ٥- غەنی خوسرەوی ٦- حاجی کاکە رەحمانی
سرگیس (مامەش) هێندێکیش دەڵێن هەمزە ئاغای نەڵۆسی ٧- میرزا مەنافی کەریمی



وێنەی ژمارە ٤٧: ڕێوڕەسمی هەڵکردنی ئاڵا لە مەهاباد

«٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٤ی هەتاوی بەرامبەر بە ١٧ی دێسامبری ١٩٤٥ی زایینی»

وێنەی ژمارە ٤٨: ڕێوڕەسمی ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد - ١٣٢٤/١١/٢

نەفەری دەستی ڕاست کە نێسێی کەوتۆتە سەر عەرز «سەعیدی حەمەقالەی بێستانچی»یە



وێنەی ژمارە٥١: مەهاباد - ١٩٤٦ی زایینی

ڕاوەستاو لە ڕاستەوە: ١- نەناسراو ٢- کاپیتان خەیروڵلا عەبدولکەریم ٣- قەدریبەگ «نەوەی جەمیلپاشای دیاربەکر ٤- سەرۆک مەلا مستەفا بارزانی ٥- عیززەت عەبدولعەزیز ٦- ئەنوەر دڵسۆز ٧- سەرهەنگ میرحاج ئەحمەد ٨- نەناسراو

دانیشتوو لە ڕاستەوە ١- وەهاب محەممەد عەلیئاغا ٢- نەناسراو



وێنەی ژمارە ٥٢

لەراستەوە: ١- حەمە موریاسی ٢- قادر کۆکەیی ٣- نەناسراو ٤- ئەحمەد حەمەدەمین ئاغای دزەیی ٥- بیستوونی مەلا عومەر ٦- هەمزە ئاغا ٧- نەناسراو ٨- شێخ لەتیفی بەرزەنجی ٩- نەناسراو ١٠- مامۆستا زەبیحی



وێنەی ژمارە ٥٣: کاک قاسمی قادری قازی



وێنەی ژمارە ٥٤: سەرلەشکر ئەحمەدی زەنگەنە

# ناوی کەسەکان

خ



د

ن



و



ه

# ناوی شوێنەکان

# ناوی بلاوکراوەکان

# ناوی پارتەکان

# ناوی نەتەوەکان

# سەرچاوەکان

## کتێبی کوردی


١- ئالاکۆم، رۆهات: خۆیبوون و شۆڕشی ئاگری، شوکور مستەفا کردوویە بە کوردی، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٠.

٢- ئەحمەد رەسووڵ پشدەری، عەبدوڵلا: یادداشتەکانم، بەشی یەکەم، چاپی یەکەم، وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی (کۆماری عێراق)، چاپخانەی دارولحورییە، بەغدا ١٩٩٢.

٣- بارگەی یاران، سەرجەمی شێعری هێمن، بەرگی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٣.

٤- بلووریان، غەنی: ئاڵەکۆک، بەسەرهاتەکانی سیاسی ژیانم، (کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: حامیدی گەوهەری)، ستۆکهۆلم ١٩٩٧.

٥- تاریک و روون، گوڵبژێرێک لە شێعرەکانی هێمن: لە بلاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، ژمارە (٥) بەغدا ١٩٧٤.

٦- حوسێن، هیمدادی (دوکتور): رۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمی کۆماری دێموکراتی کوردستان، ١٩٤٢ - ١٩٤٧، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی

٧- رەفیق حیلمی، ناهیدە: بەسەرهاتی رەفیق حیلمی، پێداچوونەوە و دارشتنەوەی: کەژاڵ ئەحمەد، چاپی یەکەم، وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی ٢٠٠٥.
٨- زەنگەنە، عەبدوڵڵا: ژیانەوە و شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا ١٩٢٤ - ١٩٢٦، پێشەکی و پێداچوونەوەی د. کەماڵ مەزهەر ئەحمەد، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر ٢٠٠٠.
٩- سەمەدی، سەید محەممەد: ژێکاف چبوو؟ چی دەویست؟ چی بەسەر هات؟، چاپەمەنی سەیدیان، مەهاباد ١٩٨١.
١٠- سوڵتانی، ئەنوەر: رۆژهەلاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا، چاپی یەکەم بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٥.
١١- شەرەفکەندی، عەبدوررەحمان (مامۆستا هەژار): چێشتی مجێور، ئامادە کردن و سەرپەرەستی بۆ چاپ: خانی شەرەفکەندی، چاپی یەکەم، پاریس ١٩٩٧.
١٢- شەمزینی، عەزیز (دوکتور): جوولانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان، وەرگێڕ لە عەرەبییەوە: فەرید ئەسەسەرد، دەزگای راگەیاندنی (ی.ن.ک)، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، چاپی دووهەم ئەیلوولی ١٩٨٥.
١٣- عەبدوررەحمان، قاسملوو (دوکتور): چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، بەرگی یەکەم، چاپی دووهەم ١٣٦٧.
١٤- قازی، ئەحمەد، دیوانی سەیفولقوزات، ئینتیشاراتی سەلاحەددین ئەییوبی، ورمێ ١٣٦١.
١٥- کارا، م.س: فرهنگ فارسی کردی - وشەبژێر(واژەگزار)، چاپی یەکەم، چاپخانەی تەعاونی ٤٢، سەنەندەج ١٣٦١.
١٦- کەریمی، عەلی: ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی (مامۆستا عولەما)، بنکەی چاپەمەنی زاگرۆس، چاپی یەکەم، گۆتێنبێرگ، سوێد ١٩٩٩.
١٧- گەوهەری، حامید: کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، چاپی یەکەم، ستۆکهۆڵم ١٩٩٩.
١٨- مەدەنی، حوسێن: کوردستان و ستراتێژی دەوڵەتان (بەرگی دووهەم)، چاپی یەکەم، شوێنی چاپ (؟)، خاکەلێوەی ١٣٨٠ی هەتاوی.
١٩- مەزهەر ئەحمەد، کەماڵ (دوکتور): تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا، چاپی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٨.

٢٠- مستەفا ئەمین، نەوشیروان: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی رۆژنامەوانی کوردی، چاپی یەکەم، چاپی وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی ٢٠٠٢.
٢١- مستەفا ئەمین، نەوشیروان: حکوومەتی کوردستان کورد لە گەمەی سۆڤیەتیدا، چاپی دووهەم، چاپی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٣.
٢٢- ناکام، سەعید: بیرەوەرییەکانی سەعید ناکام، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٣.
٢٣- هەورامی، ئەفراسیاو (دوکتور): مستەفا بارزانی لە هێندێک بەڵگەنامە و دۆکیۆمێنتی سۆڤیەتیدا «١٩٤٥ - ١٩٥٨» - یان - تۆمارێکی زێڕین لە مێژووی گەلی کورد، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠٢.
٢٤- یادگار و هیوا، چەپکەگوڵی وەفادارییە بۆ مامۆستا برایم ئەحمەد، لە بلاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی راگەیاندن، سلێمانی ١٨/٥/٢٠٠٠.

## کتێبی فارسی

١- تفرشيان، ابوالحسن: قيام افسران خراسان، انتشارات اطلس، چاپ دوم، تهران ١٣٧٧.
٢- جنبش چپ به روايت اسناد ساواک (حزب دمکرات کردستان)، ج ١، چاپ مرکز بررسی اسناد تاريخی وزارت اطلاعات، چاپ اول، تهران ١٣٧٨.
٣- جونير، ويليام ايگلتون: جمهوری ١٩٤٦ کردستان، ترجمه: سيد محمد صمدی، انتشارات سيديان، چاپ اول، مهاباد ١٣٦١.
٤- خزنەدار، جمال: راهنمای ژورناليسم ١٩٧٣ - ١٨٩٨ ترجمه: احمد شريفی، نشر کاک، چاپ اول، آذرماه ١٣٥٧.
٥- روحانی (شيوا)، بابا مردوخ: تاريخ مشاهير کرد (عرفا، علما، ادبا، شعرا)، ج ٢، به کوشش محمد ماجد مردوخ روحانی، انتشارات سروش، چاپ دوم، تهران ١٣٨٢.
٦- زنگنه، احمد (سرلشکر): خاطراتی از مأموريت‌های من در آذربايجان (از شهريورماه ١٣٢٠ تا دی‌ماه ١٣٢٥)، انتشارات شرق، چاپ دوم، تهران دی‌ماه ٢٥٣٥.
٧- سرلتی، حسام: تقويم تطبيقی يکصد و چهل و يک ساله، انتشارات زوار، چاپ اول، تهران، بی‌تا.
٨- سلطانی، محمدعلی: احزاب سياسی و انجمن‌های سری در کرمانشاه، جلد دوم، مؤسسه‌ی فرهنگی نشر سها، تهران ١٣٧٨.

٩- شاەویس، نوری (خاطرات): پنجاه سال مبارزه در کردستان، ترجمه: عمر فاروقی، نشر نذیر، چاپ اول تهران ١٣٨٠.
١٠- صمدی، سید محمد: نگاهی به تاریخ مهاباد، انتشارات رهرو، چاپ اول، مهاباد، ١٣٧٣.
١١- کوچیرا، کریس: جنبش ملی کرد، ترجمه: ابراهیم یونسی، انتشارات نگاه، چاپ اول، تهران ١٣٧٣.
١٢- محمودزاده، (آسو)، قادر (دکتر): خاطرات زندگی پرماجرای دکتر آسو (چهره مهاباد)، نشر هور، چاپ اول، تهران ١٣٧٣.
١٣- مک داول، دیوید: تاریخ معاصر کرد، ترجمه: ابراهیم یونسی، نشر پانیذ، چاپ اول، تهران ١٣٨٠.
١٤- ملازاده، حمید: رازهای سر به مهر، انتشارات مهد آزادی، چاپ اول، تبریز، پاییز ١٣٧٦.
١٥- همدی. و: کردستان و کرد در اسناد محرمانه بریتانیا، ترجمه: بهزاد خوشحالی، انتشارات نور علم، همدان ١٣٧٨.

## گۆڤار و بلاوکراوەکان

١- ئاڵای ئازادی (رۆژنامە)، خولی دووهەم، ژمارە ٢٥، هەولێر، ٣١ی ٥ی ١٩٩٢.
٢- ئاڵای ئازادی، (رۆژنامە)، خولی دووهەم، ژمارە ٢٤، هەولێر ٢٤ی ٥ی ١٩٩٢.
٣- ئاوات، گۆڤارێکی ئەدەبی ئەدەبی و تاریخی و کۆمەڵایەتی کوردییە، ژمارە ١، مەهاباد، یەکی خەزەڵوەری ١٣٢٤.
٤- دیسان سەعیدی تەتەر، (وتار)، ناوی کتێب یا گۆڤار (؟)، ناوی نووسەر (؟)، شوێنی چاپ (؟).
٥- رۆژنامەنووس، گۆڤارێکی وەرزیی تایبەتە بە کلتووری رۆژنامەنووسیی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان، ژمارە ١، هەولێر ٢٢ی ٤ی ٢٠٠٤.
٦- روانگە، گۆڤارێکی دوومانگنامەی فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، ساڵی سێهەم، ژمارە ١١، خوێندکارانی زانکۆی زانستی پزیشکی تەورێز، رەزبەری ١٣٨١.
٧- سەمەدی، سەید عەبدوڵلا، «گڕوگاڵی منداڵانی کورد»، گۆڤاری رامان، ژمارە ٤١، هەولێر ساڵی چوارەم، تەشرینی دووهەم، ٥ی ١١ی ١٩٩٩.
٨- صمدی، سید محمد: نگاهی دیگر به ژ.ک - یادداشتهای شخصی یکی از بنیانگذاران جمعیت، مهاباد، پاییز ١٣٦٣ شمسی.
٩- گزینگ، (گۆڤار)، ژمارە ١٤، سوئێد، زستانی (١٩٩٧) ١٣٧٥.

١٠- نیشتمان، ژمارە ٢، خەزەڵوەری ١٣٢٢.
١١- نیشتمان، ژمارە ٣ و ٤، سەرماوەز و ڕێبەندانی ١٣٢٢.
١٢- نیشتمان، ژمارە ٥، ڕێبەندانی ١٣٢٢.
١٣- نیشتمان، ژمارە ٦، ڕەشەمەی ١٣٢٢.
١۴- نیشتمان، ژمارە ٧و٨و٩، تەورێز - مەهاباد، خاکەلێوە، بانەمەڕ و جۆزەردانی ١٣٢٣.
١۵- نیشتمان، گۆڤارێکی کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، خوێندەواری و مانگی کوردییە، ژمارە ١، ساڵی یەکەم، مەهاباد، پووشپەڕی ١٣٢٢.
١۶- هاواری کورد، ژمارە ١، مەهاباد، ڕەزبەری ١٣٢٤.
١٧- هەزار مێرد، وەرزەگۆڤارێکی زانستییە، لە شوێنەوار و مێژووی کوردستان ئەدوێ، ژمارە ١٠، سلێمانی، کانوونی یەکەمی ١٩٩٩.
١٨- هەشتاوهەشت، وەرزەگۆڤارێکی ڕووناکبیرییە - ژمارە ٥ و ٦، ساڵی دووەم، بەهار و هاوینی ٢٠٠٦.
١٩- هەڵاڵە، (گۆڤار)، ژمارە ١، بۆکان، ڕەشەمەی ١٣٢٤.
٢٠- هەڵاڵە، (گۆڤار)، ژمارە ٣، بۆکان، بانەمەڕی ١٣٢٥.

## چاوپێکەوتن

١- بەڕێز کاک سەید عوبەیدیللا ئەییووبیان.
٢- بەڕێز کاک ڕەحمانی نیکنەفس (ڕەحمانی خانزادێ).
٣- بەڕێز ڕەعنا خانمی زەبیحی.
۴- بەڕێز کاک قادری پاکڕەوان.
۵- بەڕێز کاک قادری تەوەککول.
۶- بەڕێز کاک مەحموودی تەلعەتی.
٧- بەڕێز کاک دڵشادی پاکڕەوان.

## پێرستی پاشکۆی دوو

# گۆڤاری ئاوات

هەروەک دەزانین بەشێکی ئەم بەرهەمە (سێبەری ئازادی) بۆ گۆڤاری «ئاوات» تەرخان کراوە. لێرەدا ئەم چەند زانیارییە گرینگەی سەرنووسەر و خاوەن ئیمتیازەکەشی دەخەینە سەر و وتارەکەی پێ تەواو پوختەتر دەکەین.

لە لاپەڕە ٢٨ و ٢٩ی بەشی یەکەمی بیرەوەرییەکانی کتێبی «بیرەوەرییەکانی محەممەد شاپەسەندی»دا کاک «محەممەد» پاش ئەوەی باسی چۆنێتی وەدەستهێنانی چاپخانە و گیرانی مامۆستا زەبیحی و هاوڕێیانی دەکا، دەڵێ: «ئەگەرچی هێندێک نووسین و بابەتی ئامادە بۆ چاپ لە ژێر دەستمدا بوو، بەڵام بە ئامادە نەبوونی زەبیحی کە سەرپەرەشتیی گۆڤارەکەی بەئەستۆوە بوو [واتە نیشتمان]، نەدەکرا لە خۆمەوە دەستی پێبکەم. پاش ئەمە کەوتمە سەر بیری ئەوە، با لە خۆمەوە و لە سەر مەسئوولییەتی خۆم گۆڤارێک بە کوردی بڵاو بکەمەوە. ئەمەم بە بیرۆکەیەکی باش لێک دایەوە و جێ‌بەجێ دەستم بە ئامادەکاری کرد. بە یادی زەبیحی و بە سەردێڕی «برای دوورم!» بابەتێکم ئامادە کرد و سەردێڕی زۆر لە نووسینەکانی «زەبیحی»م لە بڵاو کراوەکانی «ژ.ک»دا تێدا گونجاند، بێ ئەوەی ناوی «زەبیحی» بێنم. هەروەها چەند بابەتێکی تر لەگەڵ چەند پارچە شێعری «هەژار» و «هێمن» و بابەتێکی دیکە بە ناوی

(ژمارە ١ی ئاوات). پێش ئەوەی مانگی (ئووت) کۆتایی بێ، (ئاوات) بلاو کرایەوە: نزیکەی سەد ژمارەم لە ناو برادەرانی حیزب و کەسایەتیەکانی ناو شاردا بڵاو کردەوە و دەوری چوارسەد ژمارە بە هۆی کاک «محەممەدی ئەنوەری» لە ناو شاردا فرۆشرا...»

لە لاپەڕە ٢٦ی بەشی دووەمی کتێبەکەشدا باسی گۆڤاری «ئاوات» هاتووە. بەڵام چونکە لە بەشەکانی دیکە کەلکمان لێ وەرگرتووە، لە دووپات کردنەوەی خۆمان پاراستووە.

لە لاپەڕە ٣٣ی بەشی دووەمدا دیسان باسی گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی دەکا و دواتر دەڵێ: «سووێدم لەم چاپخانەیە وەرگرت و بەتەنیا گۆڤارێکم دەرکرد بە ناوی «ئاوات»، ئێستا کچێکم ناو ناوە «ئاوات» بە یادی ئەو رۆژنامەیە کە تەنیا یەک ژمارەی لێ دەرچوو. شایانی باسە هەموو نووسینەکانی هی خۆم بوون، بێجگە لە چەند پارچە شێعرێک...»

لە لاپەڕە ٤٢ش دەڵێ: «هێنام بە ناوی «ئاوات» گۆڤارێکم ساز کرد، نزیکەی مانگێک کارم تێدا کرد و بڵاوم کردەوە...»

لە لاپەڕە ٧١ و لە بەشێک لە وتاری «محەممەدی شاپەسەندی لە زمانی خۆیەوە» کە کاک سدیق ساڵح ئامادەی کردووە دەڵێ: «ئێمە تا ئاخر ژمارەی «نیشتمان» لە تەورێز ماینەوە. کە لەگەڵ زەبیحی گەڕاینەوە بۆ سابلاغ، چاپخانەیەکی چووکی دەستیمان هێنا، دامانمەزراند. کە زەبیحی گیرا، ئەو چاپخانەیەم ئیستیغلال کرد. مەجەلەیەکم دەرکرد بە ناوی «ئاوات». خۆم حڕووفچینیم کرد. کاغەز لە سابلاغ نەبوو، چوومە میاندواو هێنام، بەشی ٥٠٠ دانەم هێنایەوە و تەبعم کرد. نیوەم لە سابلاغ دابەش کرد. «محەممەدی ئەنوەری میرمەحمودی» بۆی فرۆشتم. هەشت دانەم بە «محەممەدی یاهوو» دا بۆ لێژنەی ناوەندی [کۆمەڵەی ژ.ک] نارد. گوتیان شتێکی خراپت کردووە. دوایە جوابیان نارد دەست رابگرم، «ئاوات» هەر پارەی کاغەزەکەی تێچوو».

ئەگەر بمانەوێ ئەم چەند زانیارییە لە چەند دێڕدا کورت بکەینەوە دەڵێین:

گۆڤاری «ئاوات» لە دوای گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی لە «بالانیش»، چاپ کراوە، گۆڤارەکە نزیکەی مانگێک کاری بۆ کراوە.

حرووفچینییەکەی هەر کاک «محەممەدی شاپەسەندی» کردوویەتی. زۆربەی وتارەکان نووسراوەی کاک «محەممەدی شاپەسەندی»ن. ئەگەر بەپێی ئەو زانیارییانەی کاک «محەممەد» بێ، هیچ دوور نییە ئەو شێعرەی لە ژێر ناوی «ئەی میللەتی ئاوارە!» و بە ناوی نهێنی «ر. م» یا (ر.ە) لە گۆڤاری «ئاوات»دا بڵاو بۆتەوە شێعری مامۆستا «هەژار» بێ.

ئەو وتارانەی هەر بەپێی قسەکانی کاک «محەممەد» لە نێو ئەو وتارانەدا بووە کە بڕیار بووە لە ژمارەکانی دیکەی گۆڤاری «نیشتمان»دا چاپ بکرێن. (لاپەڕە ٢٨ی بەشی بیرەوەرییەکان)

گۆڤاری «ئاوات» لە تیراژی ٥٠٠ نوسخەدا، تەنیا یەک ژمارەی لێ چاپ و بڵاو کراوەتەوە.

# میرزا ئەحمەدی ئەشکەیی

لــە لاپــەڕەکانی ١٢ و ١٣ی گۆڤــاری «ئــاوات»دا شــێعرێک بــە نازنــاوی «ئەشکەیی» چــاپ کــراوە کــە لــە شــیکردنەوەکانیدا لــە لاپــەڕەکانی ٤٧ و ٦٢، گوتوومانە ئەو شاعیرەمان نەناسیوە. لێرەدا کە بەخۆشییەوە چەند سەرچاوەی باشمان وەدەست کەوتووە، ئەویش دەناسێنین.

مامۆستا «گیــوی موکریــانی» لــە لاپــەڕە ١٢٣ی بــەرگی یەکــەمی کتــێبی «کەشکۆڵی گیو» و لە بەشی ناساندنی «ئەشکەیی» شاعیردا دەڵــێ: «ئەشــکەیی، نێوی ئەحمەد کوڕی محەممەد کوڕی شەریف لە تیرەی سمایلــە کوێرەیــە و لــە ساڵی ١٨٩٩دا لە ئەشکان هاتۆتە دنیاوە و قورئــانی پــیرۆزی خــەتم کــردووە و زمانی فارسی و تورکیشی خوێندووە. لە تەمەنی بیست ساڵیدا هەوەســی شــێعر دانانی دەکەوێتە سەری و دەستی بە غەزەل خوان[ی] کردووە. خاوەنی دیــوانێکی کوردی و فارسی ٢٠٠ لاپەڕەییە. ماوەی نۆ ساڵ لە قەڵادزێدا مامۆستا دەبێت، لە دواییدا بە زۆری دەیکەنە موختار. تەخەللوسی شێعری «ئەشکەیی»، «موختــار» و «لافاو»ە». لە پاش ناساندنیشی شێعرێکی بە نــاوی «خــوێنی جگــەرم»، وەک نموونەی شێعرەکانی هێناوە کە لێرەدا وەک خۆی دەینووسینەوە:

خوێنی جگەرم ووشکە لە نێو قالبی تەردا ... لەم گێژییەم ڕۆیشتووە ڕوحم لە خەتەردا
وەک کۆمەگی ئەسحاب لەسەر فەتحی دژی شام ... سێ خاڵی هێنا سەرم، ئەمنی بە قڕ دا
ڕێبازی هەلاتن نییە، ناچارە ئەسیرم ... ڕۆژ ماتم و شەو ئێشکەچیم تاکوو بە فەردا
لێو تاقەتی بزوان و زمان فرسەتی هاوار ... تێماوە دەروون نەفس و دڵی هەر دوو بە شەڕ دا
رووم کردە خەیالات و تەدابیر و تەفەننون ... بۆ مان و نەجات و فەرەجی زیبا گەردا
ڕوانیمە عەقڵ یەعنی ئەتۆ بێژە دەڵێی چی ... بە دژی لە هەموو قووەتێ خۆی ئەمنی خەبەر دا
لەم بەینە ئەگەر بووٚ بە هەرا «ئەشکەیی» دزبی ... هەر لا کە زەبوون بوو لە سەر ئەم دینە و بەردا

کاک «فەرەیدوونی حەکیمزادە»، لە لاپەڕە ٢٧٢ی کتێبەکەی (سردشت در آئینە اسناد تاریخی)دا ئەو شاعیرەی ئاوا ناساندووە: «میرزا ئەحمەدی ئەشکی، لە غەزەل هۆنینەوە بە زمانی کوردی، شاعیرێکی بەزەوق و هەستناسک بووە. ساڵی ١٢٧٨ی کۆچی مانگی، لە دێی «ئەشکان» لە دایک بووە و ساڵی ١٣٢٠ی هەتاوی [١٩٤١ی زایینی] لە شوێنی لە دایک بوونی کۆچی دوایی کردووە.»

دوای پرسیار و چاوەڕوانییەکی زۆر، بەخۆشییەوە بە هۆی برادەرێک، کاک «ئەحمەد» و کاک «عەلی عەبدوڵلاپوور»م ناسی. ئەو دوو بەڕێزە بران و خەڵکی دێی «ئەشکان»ن و پێم وابێ ئەگەر بە هەڵە نەچووبم برازای میرزا «ئەحمەدی ئەشکەیی»ن. کاک ئەحمەد دەیگوت: «من بە ناوی میرزا «ئەحمەد»ەوە کراوم. لەو وتارەی «کەژاڵ ئیبراهیم»دا نووسراوە، میرزا ئەحمەد چوار منداڵی هەبووە بەڵام وا نییە، پێنج منداڵی هەبوو، سێ کوڕ و دوو کچ... کوڕەکەی دیکەی ناوی «عەلی»یە. کوڕێکی لە سۆئێدە.» ئەو دوو خۆشەویستە دوو شێعر و وتارێکی «کەژاڵ ئیبراهیم»یان سەبارەت بە ئەشکەیی شاعیر بۆ ناردم. کەژاڵ خانم لە وتارێکیدا کە لە ژێر ناوی «لافاو کێیە؟!» لە ژمارە ٢٦٤ی ساڵی دووهەمی پاشکۆی ئەدەب و هونەری ١٥ی ٤ی ١٩٩٢ بڵاوی کردۆتەوە، زانیاری باشی لە سەر ئەو شاعیرە کۆ کردۆتەوە و دەڵێ: «لافاو... ناوی «ئەحمەد محەممەد شەریف» لە ساڵی ١٩٠٠ی زایینی لە دێی «ئەشکان» لە ناوچەی پشدەر لە دایک بووە. هەر لە منداڵییەوە وەکوو زۆربەی شاعیرانی دی خراوەتە بەر خوێندن لە لای مەلا و فەقێیان.

لە ساڵی ١٩٥١ کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی قەڵادزێ دەنێژرێ. «لافاو»ی شاعیر هەر لە منداڵییەوە لە ژیان و گوزەرانیدا ئازار و ستەمی ژیانی زۆر چێشتووە و هەژاری و نەداری بە باڵایدا بڕاون، بۆیە ئەویش بۆ بژیوی ژیانی خۆی و خێزانەکەی رووی کردۆتە کار و کاسبی و عەتاری. هەر لەو رێگەیەشەوە دووکانەکەی بۆتە جێ ژوانی کۆڕ و دمەتەقێی شاعیرانی وەکوو قانع، فانی، هێمن و شاعیرانی نزیک خۆی. لافاوی شاعیر لە زمانی فارسی و عەرەبی دەستێکی باڵای هەبووە. چەندەها شیعری بە فارسی و عەرەبی هۆنیوەتەوە. چونکە سەوداسەری شاعیرانی وەکو سەعدی شیرازی و خەیام و (ابوالعلای معری و المتنبی) بووە.

لە شاعیرانی خۆشمان هەمیشە پەیوەست و پەیوەندی لەگەڵ قانع هەبووە. بەتایبەتی لە پێنجوێنەوە هاتۆتە لای و مامەندئاغای فانی و هێمن هەمیشە لە نامە گۆڕینەوە بوون لەگەڵی.

ئەم شاعیرە کوردپەروەرە هەمیشە خۆشەویستی خاکەکەی کاری تێکردووە بۆیە چەندەها شیعری لەم رووەوە داناوە، جگە لەوەش شیعری ئایینی و کۆمەڵایەتی و دڵداری هەبووە.

هەر ئەو شیعرانەش تووشی ئێش و ئازاریان کردووە و لە بەندیخانەیان شاد کردووە. چەند جارێکیش لە سەردەمی پاشایەتیدا ئاگادار کراوەتەوە کە واز لەو کارە بهێنێ و شیعر دژی رژێمەکەیان نەنووسێ. هەروەها (کاپتن لاین) ئەو کاتەی کە لە کەرکووک دانیشتووە چەند جارێک پەیوەندی لەگەڵ کردووە و پێی وتووە چیدی دوژمنایەتیمان مەکە با تووشی کێشە و ململانێی سەخت نەبین لەگەڵ یەکدی. شاعیری چاونەترس لافاو، ئازا بووە و ئەو بەربەرەکانیەی زیاتر سووری کردووە لە خەبات و تێکۆشان؛ دەچووە ناو جووتیاران و دەربارەی سیاسەتی ئینگلیز قسەی بۆ دەکردن کە ئینگلیز مەبەستی چی‌یە و چ دەکا؟

هەر لەم رێگەیەشەوە چەند جارێک بانگ کراوە بۆ کەرکووک. مامۆستای بەڕێز بۆ بژیوی ژیانی روو دەکاتە «مەرگە» و لە وێشەوە بۆ «قەڵادزێ». هەر زوو دەوڵەمەندەکان پەیوەندی پێوە دەکەن تاکوو کوڕەکانیان فێری خوێندن بکات کە ئەو کاتە قوتابخانەی لێ نەبووە و دەوڵەتیش هێشتا نەهاتبۆوە ناوچەکە.

ئەویش بە دڵێکی فراوانەوە داواکەیان پەسند دەکات و منداڵەکانیان فێری خوێندەواری دەکات.

شاعیر زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ هاوڕێیان و شاعیرانی بردۆتە سەر. بۆ خوێندنەوە و وریابوونەوە دژی زوڵم و زۆرداری بووە بۆیە لەگەڵ مامەندئاغا شێعرەکانیان بۆ یەکتر ڕەوانە کردووە. زۆر بەداخەوە لافاوی شاعیر تووشی نەخۆشی سیل دەبێت و ماوەیەکی زۆر ڕەوانەی نەخۆشخانەی «کەرکووک»ی دەکەن و لەوێ لە سەر جێگە دەمێنێتەوە. دواتر دەیهێننەوە بۆ قەڵادزێ. بەڵام نەخۆشیەکەی لێی پیس دەکات و ئەمری خوا بەجێ دەهێنێ. لافاوی شاعیر چوار منالی لە پاش بەجێ دەمێنێ، دوو کوڕ و دوو کچ. [کوڕەکان] ناویان حەسەن و حوسێن و کچەکانیش خەدیجە و هەمین. هەر دوای خۆشی خێزانەکەی «گوڵئەندام» چاو لێک دەنێت و ماڵئاوایی دەکات.

لافاوی شاعیر نازناوی بۆخۆی دانەناوە، بەڵکوو دوای مردنی هاوڕێیەکی لە سەر کێلەکەی ئەو نازناوەی بۆ دەنووسێ و هەتا ئێستاش هەر بە لافاو ناسراوە.

ئەمەش کۆپلەیەکە لە شێعرێکی بڵاونەکراوەی:

لافاوی میللەت بێت و هەڵبستێ     لە کەند و کۆسپا هەرگیز ناوەستێ
هەرکەس بەرکەوێ مەیتە و قوڕاوی     بەسە ئیستعمار خەیاڵپلاوی»

کەژاڵ خانم لە کۆتایی وتارەکەی‌دا دەڵێ ئەو وتووێژەی لە سلێمانی و لەگەڵ کوڕی «لافاو»ی شاعیر پێکهێناوە، بەر لە وەی کۆچی دوایی بکات.

دوو شێعرەکەی دیکەش کە کاک ئەحمەد و کاک عەلی بۆیان ناردبووم یەکیان غەزەلێکی ١٥ بەیتی و ئەوی دیکەشیان ٣ بەیتە.

لە پێشەکی غەزەلی یەکەمدا ئەو چەند دێڕە نووسراوە: «کەلامی میرزا ئەحمەدی ئەشکەیی نامەیەکە بە سوورەتی شێعر ناردوویەتی بۆ لای مامۆستای کۆیی. لەو غەزەلەدا زۆر جیناس و وردەکاری بەکار بردووە. تەنانەت مەلای کۆ[یە]، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کۆیەکۆ فەرموویەتی ئەم کابرایە یا هیچ نازانێ

یا هەموو شت ئەزانێ. جا بۆ بیرەوەری ئەو دوو زاتە بە نموونەی ئەدەبی کوردی، دەقی غەزەلەکەی نووسرایەوە.»

ئەو شێعرەش وەکوو شێعرەکەی نێو گۆڤاری «ئاوات» زۆرتر رەنگی ئایینی پێوە دیارە هەتا خۆشەویستی و...

لە بەیتی یەکەمدا دەڵێ:

«لە تاقیبی حەقیقەتدا کەسێ زانایی ئەسرارە
لە ناحەق لا بە حەق مولحەق حەقایق بینە، بێدارە»

لە بەیتی سێهەمیشدا دەڵێ:

«بە جەهدی حاسڵی تەحسیل و ئیستیحسال مەحسوولی
موحەسسیل حەوسەڵەی حاسڵ بە ئەسڵی ماحەسەڵ دیارە»

لە بەیتی دوازدە هەتا کۆتاییشدا دەڵێ:

«بە حوکمی عیلم و حیلم و سەبر و شوکری تۆوە سەربەرزین
وەئیللا جاهیلی وەک «ئەشکەیی» گومڕایە بێچارە
ئیلاهی تا لە دنیا عەمر و زەیدێ بێ، سەلامەت بێ
ئەبا مەسعوودی ئیبنولحاج کە بۆ دین مەرجەعی کارە
جەسارەت بوو کە من کردم بە کوردی وا لە سوێت مردم
نەفامی بوو لە دەستم چوو، قوسوورم عەفووە ئەمجارە
چ بێژی «ئەشکی» ئەشکی کورتە ئەشکی خۆی ئەبێ بڕێژێ
ئەگەر ماوم لە گەرماوم بە گەرمئاوێ سەرەو خوارم»

بۆ لێکدانەوەشی نووسراوە: «ئەشکی ئەوەڵ ئیشارە بە نازناوی خۆیەتی. ئەشکی دوایی بە مانای پەل و قاچ و قول، ئەشکی سێهەم واتە فرمێسکی غەم و پەژارە. ئەڵێ ئەڕێژم فرمێسکی گەرمم هەتا ماوم ـ ئەگەر ماوم، لە گەرماوم ـ واتە ئەو گوندەی کە لێی بووە گەرماو بووە کە وا لە بەر بێتووشەوەیە. ـ بە گەرمئاوێ ـ واتە بە ئاوی گەرمی فرمێسکم کە لە چاوم سەرەوژێر هەڵئەڕژێ ئەبێ لەم گەرمابە واتە حەمام خۆ خاوێن بکەمەوە چونکە ـ العینان تجریان لمن لە العینان تجریان.» ئەو سێ بەیتەی شێعری دووهەمیش ئەگەرچی نازناوی

«ئەشکەیی» تێدا هاتووە بەڵام لەبەر لەنگی بە پێویستم نەزانی لێرەدا بینووسمەوە.

## شیکردنەوەی سەرچاوەکان

کاک «فەرەیدوونی حەکیمزادە» بۆ ساڵی لە دایکبوونی ئەشکەیی دەڵێ ساڵی ١٢٧٨ی کۆچی مانگی (هیجری قەمەری) لە دایک بووە. ئەو ساڵە بەرامبەرە لەگەڵ ١٢٤١ی کۆچی هەتاوی و ١٨٦٢ی زایینی. دواتریش دەڵێ ساڵی ١٣٢٠ی کۆچی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە کە ئەو ساڵەش بەرامبەرە لەگەڵ ساڵی ١٩٤١ی زایینی. بەو پێیە دەبێ ٧٩ ساڵ ژیابێ. بەڵام رەنگە بە هۆی هەڵەی چاپی ١٢٧٨ی کۆچی هەتاوی، بە کۆچی مانگی واتە (هیجری قەمەری) چاپ کرابێ. بۆیەش پێم وایە هەڵەی چاپییە و هەڵەی نووسەر نییە چونکە بۆ ساڵی کۆچ کردنەکەی کۆچی هەتاوی دەکار کردووە نەک کۆچی مانگی.

کەژاڵ خانمیش دەڵێ ساڵی ١٩٠٠ی زایینی واتە ١٢٧٩ی هەتاوی «ئەشکەیی» شاعیر لە دایک بووە و ساڵی ١٩٥١یش کە بەرامبەرە لەگەڵ ١٣٣٠ی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە.

مامۆستا «گیوی موکریانی» دەڵێ ساڵی ١٨٩٩ی زایینی واتە ١٢٧٨ی هەتاوی لە دایک بووە.

بە بڕوای من چونکە مامۆستا «گیوی موکریانی» لە سەردەمی ژیانی شاعیردا ژیاوە و بێونەبێ دیویەتی و جگە لە وانەش هۆگرییەکی زۆری بە کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر شاعیرانی کورد بە گشتی هەبووە، ئەو زانیاریانەی لە کتێبەکەیدا باسی کردوون زۆر جێگای متمانەترن. جا هەر بۆیە پێم وابێ ساڵی ١٨٩٩ی زایینی ساڵی لە دایک بوونی میرزا «ئەحمەد ئەشکەیی» بووە. چونکە زانیارییەکانی وتاری کەژاڵ خانمیش لە کوڕی خوالێخۆشبوو (ئەشکەیی) وەرگیراوە و ئەویش ساڵی ١٩٥١ی زایینی بە ساڵی کۆچکردنی داناوە کەوایە هەر ئەو ساڵە ساڵی کۆچی ئەو شاعیرەیە.

شوێنی لە دایکبوونی بە گوێرەی سێ سەرچاوەی پێشوو، (جگە لە

«ئەشکان»ی سەر بە شاری سەردەشت بووە. ئەوەی پێویستە لە وتارەکەی کەژاڵ خانم زیاد بکرێ ئەوەیە کە ئەو شاعیرە جگە لە «لافاو» نازناوەکانی «موختار» و «ئەشکەیی»شی هەبووە کە ئەو دوو نازناوەی دیکەشی دەگەڕێتەوە سەر ئەو زانیارییانەی کە لە کتێبەکەی مامۆستا «گیو»دا باسی لێ کراوە.

## ناساندنی ئەشکەیی شاعیر

میرزا «ئەحمەدی ئەشکەیی» کوڕی محەممەد کوڕی شەریف لە تایفەی «سمایلە کوێری»یە. ساڵی ١٨٩٩ی زایینی بەرامبەر دەگەڵ ١٢٧٨ی هەتاوی لە دێی «ئەشکان» لە دایک بووە. «ئەشکان» کەوتۆتە ناوچەی «ئالان»ی سەردەشت و لە خوار گوندی «بێتووش»ە و ئاوایییەکانی دەوروبەری بریتین لە: «ئەشکانی سەروو»، «هەرزنێ»، «مەزناوێ» و «دۆڵ ئالان»؛ لەو دیویشەوە دراوسێی شاری «قەڵادزێ»یە. بە نازناوەکانی «لافاو»، «موختار» و «ئەشکەیی» شێعری نووسیوە.

ساڵی ١٩٥١ی زایینی کە بەرامبەرە لەگەڵ ١٣٣٠ی هەتاوی بە نەخۆشی ئازارەباریکە واتە «سیل» و لە تەمەنی ٥٢ ساڵیدا لە شاری «قەڵادزێ» کۆچی دوایی کردووە و هەر لەو شارەش نێژراوە.

# گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی

هەروەک دەزانین لە لاپەڕە ٩٩ هەتا ١٣٦ی ئەم کتێبە (سێبەری ئازادی) بۆ شیکردنەوەی ڕێکەوتی گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی تەرخان کراوە. لێرەدا کە بەڵگەی دیکەشمان وەدەست کەوتووە، بەپێی توانا ئەو بابەتانەی پێوەندییان بەم باسەوە هەیە دەخەینە سەر و شیکردنەوەکانی پێشووی پێ دەوڵەمەند دەکەین.

لە لاپەڕە ١١٢ی کتێبی «ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا بە پێی بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤی یەکێتی سۆڤیەت» کە کاک دوکتور «ئەفراسیاو هەورامی» لە ڕووسییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، «حەسەنۆف» سەر کۆنسوولی سۆڤیەت لە ورمێ دەڵێ: «... لە وەڵامی پرسیاری مندا کە ئایا ئەو ڕێکخراوەی ئێوە [مەبەست کۆمەڵەی ژ.ک] بەرنامەی هەیە؟ ئێلخانیزادە گوتی: بەڵێ و بەڵێنی پێدام نوسخەیەکی بەرنامەکەمان بۆ بێنێ.

١٣ی ئەیلوول بۆ دووەم جار ئێلخانیزادە ئەمجارەیان لەگەڵ «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی»دا هاتەوە لام. نوسخەیەکی لە پرۆگرامی پارتیەکەی خۆیان بە زمانی کوردی بۆ هێنام...» ئەم راپۆرتە ساڵی ١٩٤٤ نووسراوە کە وایە ١٣ی ئەیلوولی ١٩٤٤ مامۆستا «زەبیحی» و کاک «قاسمی ئێلخانیزادە» چوونە کۆنسوولگەری سۆڤیەت لە ورمێ. ئەو ڕۆژە بەرامبەرە لەگەڵ ڕۆژی چوارشەممە

بۆ دەسەلمێنێ کە مامۆستا «زەبیحی» و هاوالانی دوای «پەیمانی سێ سنوور» و گەڕانەوەیان لەو پەیمانە نەگیراون. دەنا ئەگەر دایبنێین مانگی خەرمانانی ١٣٢٣ گیرابن و ٨ مانگیش لە زینداندا بووبن، ئەوە کاتی ئازادبوونەکەیان دەکەوتە ڕۆژەکانی کۆتایی مانگی بانەمەڕی ١٣٢٤. ئەوە لە کاتێکدایە کە بەپێی هەواڵی «ڕۆژنامەی کوردستان» لە ٣ی ڕەشەمەی ساڵی ١٣٢٤ واتە ٢٢ی فێورییەی ١٩٤٥ ئازاد کراون.

دیسان لە لاپەڕە ١٢٤ی سەرچاوەی پێشوودا بەرپرسی کۆمەڵەی پێوەندی کولتووریی سۆڤیەت لەگەڵ ئازەربایجانی ئێران دەڵێ: « عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی و قاسمی ئێلخانیزادە ڕێکەوتی ٢ی شوباتی ١٩٤٥ هاتنە لام و داوایان لێ کردم ئیجازەیان بدرێتێ ڕێکخراوەی پەیوەندی کولتووری لەگەڵ سۆڤیەتدا لە کوردستان دروست بکەن و سەربەخۆیش بێ...» ڕێکەوتی ٢ی شوباتی ١٩٤٥ بەرامبەرە لەگەڵ ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ١٣ی ڕێبەندانی ١٣٢٣ کە ئەوەش ئەو داوایەی پێشوومان پتر دەسەلمێنێ.

دیسان هەر لەو سەرچاوەیەدا و لە لاپەڕەکانی ١٤٦ و ١٤٧ و ١٤٨دا «ڤیلچیفسکی» ڕاپۆرتێکی بۆ هاوڕێ «گ. م. دیمیترۆڤ»، سکرتێری کومیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤیەت ناردووە کە لە بەشێکیدا بەم چەشنە باسی گیرانی مامۆستا «زەبیحی» کردووە: «... ئینگلیزەکان توانییان بە سەرۆکایەتی ڕاستەوخۆی پالکۆنیک «کینگ» کە ڕاوێژکاری سیاسی ئینگلیزە لە کەرکووک و مووسڵ، دەست بە تێکدانی پارتی ژێکاف بکەن و باڵی ڕاستی ژێکاف کە لە فێئۆداڵ و تاجیرە گەورەکان پێک هاتووە، دژی باڵی چەپ هان بدەن. هەروەها باڵی ڕاستی ژێکاف داوا لە پارتی ژێکاف دەکات واز لە سیاسەتی دژی ئینگلیز بێنێ و لە پارتی توودەی ئێران دوور بکەوێتەوە. باڵی ڕاستی ژێکاف لەم کاتەدا دژی باڵی چەپی پارتی ژێکاف بە سەرۆکایەتی زەبیحی بلۆکێکیان بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵ ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوەکانی ئازەربایجانیدا کە هەوڵیان دەدا لە یەکەم ڕۆژی دەسپێکردنی بزووتنەوەی نەتەوایەتییەوە لە ئازەربایجانی ئێران پیشانی بدەن گوایە ناوچە کوردیەکانی باکوور و ڕۆژئاوای ئێران (هەر لە کۆنەوە) هی ئازەریەکان بووە، دامەزراند. هەر ئەم تاقمەی باڵی ڕاستی ژێکاف بۆ ڕێکخستنی ڕێکخراوی ژێکاف لە ناو شکاکەکاندا، زەبیحییان ناردە ئەو ناوچەیە. ناسیۆنالیستە ڕاستڕەوەکانی ئازەری بەتایبەت نوێنەرانی کۆنەپەرەست و ناسراوی مەجلیسی ئێران ـ وەک سەرتیپ زادە [سەتارزادە

دروستە] و خەلعەتبەری و کەسرەوی تەبریزی رۆژنامەنووس ـ کە لە مەبەستێکی سەفەری زەبیحی ئاگادار بوون، توانییان بە یارمەتی کۆنەپەرەستانی ئێران زەبیحی بگرن و بە تاوانی چالاکیی دژی دەوڵەتی ئێران و پارچەپارچە کردنی وڵات، موحاکەمەی بکەن. دووبەرەکی لە ئاستی سەرکردایەتی ژێکاف‌دا بوو بە هۆی ئەوەی وا بزووتنەوەی کورد لە کوردستانی ناوەندیدا کە لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٤٥ بە دواوە سەری هەڵدابوو، بەبێ سەرکردایەتی بمێنێتەوە.»

لە لاپەڕە ١٤٨یش لە درێژەی بۆچوونەکانیدا دەڵێ: «... ئەم لێک بڵاوبوونە مەسەلەی گیرانی «زەبیحی»ی سکرتێری ئەم پارتەی بەدواوە بوو کە کاتی گەشتەکەی بۆ لای کوردەکانی باکوور ـ رۆژئاوای ئێران لە نیزیکی شاری رەزائیە ـ لە لایەن پۆلیسی ئێرانەوە گیرا. پۆلیس چاپەمەنیی پارتی ژێکافی بە زەبیحی گرتووە کە بووە بە هۆی تاوانبار کردنی زەبیحی بە راپەڕین دژی دەوڵەتی ناوەندی. کاربەدەستانی ئێرانی دەیانەوێ ناوبراو موحاکەمە بکەن. ئێستا زەبیحی نزیکەی ساڵێکە لە زیندانی تاراندایە. دەنگوباسی زۆر لە سەر ئەوە هەیە کە پێدەچێ گرتنی زەبیحی لە لایەن پۆلیسی ئێرانەوە بە دەسیسەی باڵی راستی ژێکاف بووبێ، بۆ ئەوەی بەم چەشنە لە رەقیبی باڵی چەپی ژێکاف ئازاد بین.»

کاک دوکتور «ئەفراسیاو هەورامی» لە لاپەڕە ٩٩ی کتێبی «رووداوەکانی رۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی سۆڤیێتیدا (١٩٤٥ ـ ١٩٤٧)» لە بەشێک لە شیکردنەوەکانی ڤیلچفسکی‌دا دەڵێ: «... بەڵام زەبیحی بەپێی هەموو ئەو بەڵگانەی کە لە ئارشیڤەکانی یەکیەتی سۆڤێت دەرمهێناون و بڵاوم کردوونەتەوە، لە لایەن سۆڤیەتەکانەوە جێی باوەڕ و متمانە نەبووە. هەمیشە دەستیان ناوە بە روویەوە و دژی بۆچوونەکانی بوون...» کەچی نازانم بۆچی کاک دوکتور «یاسین سەردەشتی» کە پەراوێزی بۆ ئەم کتێبەی کاک «ئەفراسیاو» نووسیوە لە رووی چ بەڵگەنامەیەکەوە دەڵێ کە «قازی محەممەد»، «زەبیحی» بەگرتن داوە. کاک دوکتور «یاسین» لە پەراوێزی لاپەڕە ١٣٨ و ١٣٩دا دەڵێ: «... حکوومەتی کوردستان «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» وەک چاوەدێری جێبەجێ کردنی ئەو رێککەوتننامەیە [رێککەوتننامەی سەربازی ٢٦ی مایسی ١٩٤٦ نێوان

ئـــەو ڕێککەوتننامەیـــەوە ڕەفتاریـــان کـــرد و تەقەمـــەنی و چـــەکیان نـــاردە پادگانەکانیان، هێزەکانی کـورد بـەرەنگاریان بوونـەوە و چەنـدین سـەربازی ئێـرانی لـەو پێکدانانـەدا کـوژران. زەبیحـیش بـە ڕاپـۆرت سـەرەوەی لـەو پێشێلکارییەی ئێرانیەکان ئاگادار کردۆتەوە. ئەو زەبیحییەی کە نووسەر وای بۆ دەچێ گوایە قازی محەممەد بەگرتنی دابێ!!»

بەڵام بە بڕوای من کاتێک دەتوانین تاوانێکی ئاوا قورس و گـران بخەینـە ئەسـتۆی کەسـێکی وەک «قـازی محەممـەد» کـە سـەرچاوە و بەڵـگەی زۆر باوەڕپێکراومان لە بەر دەستدا بێ.

بـە ئاوڕدانەوەیـەک لـە بەڵـگەنامەکانی سۆڤـیەت و ئینگلـیس بۆمـان دەردەکەوێ لە هیچ کوێ «قازی محەممەد» لە سەر ویستی خـۆی سـەبارەت بـە گۆڕینی کۆمەڵەی (ژ.ک) بە حیزبی دێمۆکڕات یا هەر حیزبێکی دیکـە ڕەزامەنـدی خۆی دەرنەبڕیوە. هەموو بەڵگەکان وا نیشان دەدەن کە ڕووسەکان ئەوەنـدە لـە نهێنیکاری و ئامانج و تێکۆشانی کۆمەڵەی (ژ.ک) ترساون کە بۆ لـە نێـوبردنی ئەو کۆمەڵە و ئاژاوە نانەوە لە هیچ شتێک نەپرینگاونەوە. ئەگەر ئەوەشیان لـە دەست نەهاتبێ لانی کەم وایان کردووە دروشمەکانی پـێ بگـۆڕن. ڕاپۆرتـەکانی بەرپرسانی پایەبەرزی سۆڤیەت و ئینگلیس ئەو داوایانە تـەواو دەسـەلمێنن کـە ڕووسەکان بەتایبەتی و بە ئانقەست یـەک لـە هـەزاری ئـەو یارمەتییـەی بـە ئازەرییەکانیان دەکرد بە (ژ.ک)یان نەکردووە. هەر بۆیە بە بڕوای مـن مامۆسـتا «زەبیحـــی» بــە ئاگــاداری ڕاســتەوخۆی ڕووســەکان و هاوئاهــەنگی لەگــەڵ «سەرلەشکر زەنگەنە» کە لە ورمێ دایمە پێکەوە دیداریان هەبووە، گـیراوە. بـا ئەوەش بڵێم کە دەسەڵات وهێزی ڕووسەکان چ لـە ناوچـەی کوردسـتان و چ لـە ناوەندی ئێران زۆر لەوانە پتر بـووە کـە نـەتوانێ لـە گواسـتنەوەی مامۆسـتا «زەبیحی» و هاوڕێیانی بۆ تاران بەرگری بکـا یـا تەنانـەت دوای ناردنیـان بـۆ تارانیش نەتوانێ زوو ئازادیان بکا. گیرانی مامۆستا «زەبیحی» قۆناغی یەکـەمی جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی درێژخایەنی ڕووسەکان بووە و دەستوورەکەشی لە لایەن بەرپرسانی پایەبەرزی سۆڤیەت هاتووە. هەڵـبەت هـەرگیز حاشـا لـە وە ناکرێ کە ڕەنگە مامۆستا «زەبیحـی» وەک سـکرتێری کۆمەڵـەی (ژ.ک) دوژمـنی ناوخۆییشی هەبووبێ، بەڵام بە هیچ جۆرێک لەگەڵ بیر و بـاوەڕ و کەسـایەتی کەسێکی وەک «قازی محەممەد» ناگونجێ کە مامۆستا «زەبیحی» بە گـرتن دابـێ.

بەپێی زۆربەی ئەو بەڵگە و کتێبە مێژووییانەی بڵاوکراونـــەوە، پێـــشەوا «قـازی محەممەد» لە ماڵی بابی «دڵـــشادی رەسووڵـــی» ســـوێندی بـــۆ کۆمەڵـــەی (ژ.ک) خواردووە و ناوبراوی زۆر خۆش ویستووە. لەوەش گرینگتر کاک «قاسمی قادری قازی» خزمی «پێشەوا قازی» بووە و یەکێک لە دڵسۆزترین ئەندامانی کۆمەڵـــەی (ژ.ک) و مامۆستایانی قوتابخانەکانی مەهاباد بووە.

پرسیارەکە لێرەدایە ئاخۆ دەکرێ و لەگەڵ عەقڵ دەگونجێ کەسایەتییەکی وەک «قازی محەممەد» خزم و کەس و خۆشەویستانی خۆشی لەبەر گۆڕینی نـــاو و دروشمی حیزبێک بە گرتن بدا؟!

# چاپخانەی کۆمەڵەی (ژ.ک) و کوردستان

بەخۆشییەوە لەم دواییانەدا کتێبی «بیرەوەریەکانی محەممەدی شاپەسەندی» کەوتە دەستی خوێنەران. لەو کتێبەدا زۆر بە وردی سەبارەت بە هەر دوو چاپخانەی کۆمەڵەی «ژ.ک» و «کوردستان» باس کراوە.

ئەگەرچی لە چەند جێگایەکدا بۆچوونەکانی کاک «محەممەد» یەک ناگرنەوە، بەڵام لێکدانەوەی ئەو زانیارییانە بەشێکی گرینگی مێژووی چاپ و چاپەمەنی و تەنانەت شێوەی هەڵسوکەوتی رووسەکانمان بۆ روون دەکەنەوە. با بزانین لەم بارەوە چ نووسراوە:

لە لاپەڕە ٢٩ و لە بەشی «چاپخانەی کوردستان لە مەهاباد»دا دەڵێ: «پاش بڵاو بوونەوەی «گۆڤاری ئاوات» کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵە بە هۆی کاک «محەممەدی یاهوو» وەڵامیان ناردبوو، سەرزەنشتیان کردبووم کە بۆچی بێ پرس و ئیجازەی ئەوان «گۆڤاری ئاوات»م بڵاو کردۆتەوە؟! ئینجا ویستبوویان ئاگادار بم بەم زووانە ئامێری چاپ کە کاربەدەستانی شووڕەوی بەڵێنیان دابوو، دەگاتە مەهاباد. بۆیە پێویستە ئامادەکاری بکەم بۆ راهێنانی کادری پێویست بۆ وەگەڕخستنی ئەم ئامێرە. زووتریش رووبەڕووی کاروانسەرای «سەیدعەلی» جێگای ئامادە کرابوو بۆ دامەزراندنی ئامێرەکە و ئیدارەی چاپخانە و هەروەها ئیدارەی «رۆژنامەی کوردستان». لە ئۆکتۆبری ١٩٤٥دا ئامێرەکە گەیشتە

مەهاباد، ماوەی دوو هەفتە دوو ئەندازیاری رووسی خەریکی دامەزراندنی بوون. لەو ماوەیەدا کارگەرەکان خەریکی دابەشکردن و جووررکردنی پیتەکان و مەشقکردن و راهێنان لە سەر دەزگای پیتەکان بوون و لە ماوەیەکی کەمدا چاپخانە ئامادە کرا...»

لە لاپەڕە ٣١یشدا دەڵێ: «بەر لە دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان، ئۆکتۆبەری ١٩٤٥ لە یەکەمین کۆنگرەی حیزبی دێموکراتی کوردستان‌دا لە مەهاباد، بڕیاری دەرکردنی «رۆژنامەی کوردستان» پەسند کرابوو...» لە لاپەڕە ٢٦ و ٢٧ی پاشکۆی ژمارە ١ و لە بەشی «چۆنێتی دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان»دا پاش ئەوەی باسی گۆڤاری ئاوات و چۆنێتی بلاوبوونەوەکەی دەکا دەڵێ: «پاش بلاو بوونەوەی ئاوات، «محەممەدی یاهوو» وەلامی بۆ هێنام کە لیژنەی ناوەندیی «ژ.ک» و زیاتر لە هەمووان «حاجی مستەفا داودی» لێم نارازین. چونکوو دەبوو بۆ دەرکرانی ئاوات ئیمتیاز وەربگرم و پرسیان پێ‌بکەم. وەلامم دایەوە من ئەو ئیشەم بۆ هاتنەوەی زەبیحی دانابوو. بەلام دەمەویست توانای خۆم بۆ ئەم ئیشە تاقی بکەمەوە. پاش یەک دوو هەفتە بە شوێنیاندا ناردم و پێیان راگەیاندم پێویستە واز لە دەرکردنی «ئاوات» بێنم؛ چونکوو چاپخانەی گەورەمان بۆ هاتووە و دەبێ کادری پێویست ئامادە بکرێ. لە خۆم زیاتر کەس نەبوو حرووفچینی بزانێ. ناچار چەند کەسم پەیدا کرد و لە ماوەیەکی کەمدا فێری ئیشەکەم کردن. سەدیق ناوێکیش کە لە عێراقەوە هاتبوو، لە سەر مەکینەکەی چاپ لای «سەیید حوزنی» ئیشی کردبوو، [لە لاپەڕە ٧٢ی بەشی دووەمدا دەڵێ ناوی «سەدیق بەکری» بوو] خستمانە سەر مەکینە و ئا بەم جۆرە چاپخانەی کوردستان کەوتە ئیش کردن. لام وایە نەخشەی کاری چاپخانە، گۆڤاری «کوردستان» بوو.»

لە لاپەڕە ٢٧ی پاشکۆی یەکەمدا لە بەشی «بروانامە» دەڵێ: «کاتی رووداوەکانی ورمێ، زەبیحی لە سابلاغ نەبوو، ئەسناد و کەلوپەلی سکرتاریەت لای من دانرابوو. <شەوێکیان «سەدیقی حەیدەری» هاتە لام و وتی «سەید عەبدوللای ئەفەندیی شەمزینی» دەیەوێ لە «ورمێ» چاوی بە نومایندەی سۆڤێت بکەوێ، پێویستە بۆی ئامادە بکەین> وا بوو بە زمانی فارسی بۆمان نووسی و

لە لاپەڕە ٣٣ی پاشکۆی ژمارە ٢دا دیسان باسی ئەوەی دەکا کە گلەییان لێ کردووە و پێیان کوتووە بۆچی بێ پرس «گۆڤاری ئاوات»ی بڵاو کردۆتەوە دواتر دەڵێ: «هێندەی پێنەچوو بانگیان کردم بۆ ناوەندی «ژ.ک» وتیان چاپخانەی کوردستان گەیشتووە و داوایان لێ کردم، دەست لە هەموو شتێ هەڵبگرم و خۆم تەرخان بکەم بۆ چاپخانەی کوردستان کە لە سۆڤیەتەوە بۆمان هاتووە. <لەم کاتەدا هێشتا حیزبی دێموکرات دانەمەزرابوو>»

بەڵام دوو لاپەڕە ئەولاتر و لە لاپەڕە ٣٥دا بە پێچەوانەی قسەکانی پێشووتری لە وەڵامی ئەو پرسیارە کە: «[چ]یادگاریتان لەگەڵ پێشەوا قازی محەممەددا [هەیە]؟» دەڵێ: «جارێکیان لەگەڵ قازیدا لە تەورێزەوە هاتووین [-دەهاتینەوە] بۆ سابلاغ، «مەنافی کەریمی»یشمان دەگەڵ بوو. مەناف وەزیر بوو <لەو سەفەرەی کە «چاپخانەی کوردستان»مان لە تەورێزەوە هێنا بۆ سابلاغ>، لە ڕێگا ئۆتۆمۆبیلەکەمان وەرگەڕا بەڵام بێ زیان بووین.»

لە درێژەی ئەم باسەدا و لە لاپەڕە ٤٣دا دیسان بەپێچەوانەی قسەکانی پێشووی کە گوتوویەتی پاش بڵاوبوونەوەی گۆڤاری «ئاوات» لە لایەن کۆمەڵەی (ژ.ک) بۆ کومیتەی ناوەندی بانگ کرام، ئەوجار دەڵێ: «... کە بە شوێنیاندا ناردم، پێیان گوتم: <ئێمە مەسەلەیەکمان لە بەر دەستدایە دەمانهەوێ چاپخانەیەکی باش بۆ حیزبی دێموکراتی کوردستان حازر بکەین> و لە تۆ زیاتر ئێمە کادرمان نییە. ئەتۆ دەبێ خەریکی ئەو ئیشە بی. لە بەرامبەر کاروانسەرای «سەید عەلی» (کاروانسەرایەکی دیکە هەبوو... تێلگرافی نەبوو) خەریکی سازکردنی مەتبەعە بووم. ئەوجار وەک دەورە دەورەیەکم کردەوە بۆ ئەو لاوانەی کە دەیانهەویست فێری حرووفچینی بن... هەوەڵ ژمارەی «کوردستان»مان دەرکرد. هاتین گۆڤاری دیکەشمان ساز کردن، تەقریبەن پێنج شەش گۆڤارمان هەبوون...»

لە لاپەڕە ٥٨یشدا دەڵێ: «لە کاتی کۆماری کوردستاندا کە چاپخانەی کوردستان هات (رووسەکان هێنابوویان) دوو مهەندیسی لەگەڵدا بوون. کۆمیتەی ناوەندی ژ.ک منیان بانگ کرد و گوتیان کە لە تۆ زیاتر کەس سنعەتی (تەکنیکی) چاپ نازانێ. تۆ بەرپرسی ئەو چاپخانەی؛ دەبێ کرێکاری تەواومان بۆ رابێنی. دەستم پێکرد و خۆم حازر کرد نزیک بە ٢٠ شەوو [رۆژ] مەتبەعەکەم ساز کردو

دەستمان پێکرد. یەکەم نموونەی کارمان «گۆڤاری کوردستان»[ی] ژمارە یەک بوو. بۆ نموونە کە بزانین چاک کار دەکا، ناکا. ئەوە بوو کە لەو مەجەللەیەمانڕا دەست پێکرد. دوایی رۆژنامەی کوردستان هات. رۆژنامەی کوردستان، رۆژنامەیەکی رەسمی حکوومەتی میللی بوو کە بە دوو رۆژ جارێک دەردەچوو و زمانی حاڵی کۆماری کوردستان بوو.»

لە لاپەڕە ٧٢شدا دەڵێ: «کە چاپخانە تازەکە هاتە مەهاباد، نێوبەتاڵ بوو <دوو موهەندیسی چیکۆسلۆفاکی هات [ن]، نزیکەی دوو مانگ خەریکی بوون تا جووریان کرد. نەیاندەهێشت کەس هاتووچۆیان بکا> کە تەواو بوون ئیشیان پێ کرد و رۆیشتن. چاپخانەکەی بۆکان بچووک بوو، وەک ئەوە بوو کە «ئاوات»م پێ چاپ کرد. ئێمە یەکێکمان دەست کەوت لای خوالێخۆشبوو «حوزنی موکریانی» ئیشی کردبوو، ناوی «سەدیق بەکری» بوو پێم وایە خەڵکی لای خۆمان بوو، [رەنگە مەبەستی مامۆستا «سەعید ناکام»یش بێ] ئەو مەکینەیەی بەڕێوە دەبرد. منیش ١٠ کەسم فێری حرووفچینی کرد. بۆخۆشم سەروبەندی جەریدەکەم دەبەست و جێبەجێ مەقالەکانم هەر یەکە لە جێی خۆی دادەنا. جگە لەوە ئەوراقی حکوومی و بەیاننامە و هەموو بڵاوکراوەکانی دیکە لەوێ چاپ دەکرا...»

## شیکردنەوەکان:

ئەو چەند بابەتەی کە سەبارەت بە هێنانی «چاپخانەی کوردستان» باسمان کردن زۆر وردەکاری دەخۆ گرتووە. ئەگەر بە کورتی باسیان بکەین دەڵێین: بەپێی قسەکانی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» (لاپەڕە ٢٩ی بەشی بیرەوەریەکان)، «چاپخانەی کوردستان» لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٤٥ گەیشتۆتە مەهاباد. ئەم رێکەوتە بەرامبەرە لەگەڵ مانگی خەزەڵوەری ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی. دیسان هەر لەو لاپەڕەیەدا هاتووە کە دوو ئەندازیاری رووسی لە ماوەی دوو هەفتە چاپخانەکەیان دامەزراند. لە لاپەڕە ٥٨ی بەشی دووەمیشدا دەڵێ: دوو موهەندیسیان لەگەڵ بوو. لە لاپەڕە ٧٢شدا دەڵێ: «دوو موهەندیسی

کرد. نەیاندەهێشت کەس هاتووچۆیان بکا...» ئەگەر لە هێندێک بۆچوونی جیاوازی نێو کتێبەکەی کاک «محەممەد» چاوپۆشی بکەین، بۆ ئەو بەشە بەو ئاکامە دەگەین کە لە مانگی خەزەڵوەری ١٣٢٤ هەر دوابەدوای دەرچوونی ژمارە یەکی گۆڤاری «ئاوات»، «چاپخانەی کوردستان» هاتۆتە مەهاباد، دوو موهەندیسیشیان لەگەڵ ناردووە کە چاپخانەکە دامەزرێنن.

لە لاپەڕە ٣١ی بەشی بیرەوەرییەکاندا هاتووە کە پاش دەرچوونی گۆڤاری «ئاوات» لە لایەن کومیتەی ناوەندی کۆمەڵەی (ژ.ک) گلەیی لێکراوە کە بۆچی بە بێ پرسی ئەوان ئەم گۆڤارەی چاپ و بڵاو کردۆتەوە. دوو هەفتە پاش دەرچوونی گۆڤارەکە بانگیان کردووە هەتا لە «چاپخانەی کوردستان»دا کار بکا و چەند کەسێک فێری حرووفچینی بکات. لە لاپەڕە ٣٣ی بەشی دووەمیشدا دەڵێ بۆ کۆمیتەی ناوەندی (ژ.ک) بانگ کراوە و داوایان لێکردووە بچێ لە «چاپخانەی کوردستان» کار بکا. هەروەها دەڵێ لەم کاتەدا هێشتا حیزبی دێموکرات دانەمەزرابوو.

تا ئێرەش بۆ هەمووومان روون دەبێتەوە کە «چاپخانەی کوردستان» بەر لە چاپی گۆڤاری «ئاوات» گەیشتۆتە مەهاباد، واتە پێش مانگی ئۆکتۆبری ١٩٤٥، بەڵام سەیر ئەوەیە کاک «محەممەد» لە لاپەڕە ٣٥ و ٤٢ی بەشی دووەمدا جارێک دەڵێ «چاپخانەی کوردستان»مان وێڕای «پێشەوا قازی محەممەد» و کاک «مەنافی کەریمی» لە تەورێزەوە هێناوەتە مەهاباد. دواتریش (لاپەڕە ٤٣) دەڵێ بۆ کۆمیتەی ناوەندی (ژ.ک) بانگ کراوە و پێیان گوتووە کە دەمانهەوێ چاپخانەیەکی باش بۆ حیزبی دێموکرات ساز بکەن.

هەروەک هەمووومان دەزانین، ژمارە ١ ی گۆڤاری «کوردستان» لە ١٥ی سەرماوەزی ١٣٢٤ (٦ی دێسامبری ١٩٤٥) لە «چاپخانەی کوردستان» چاپ و بڵاو کراوەتەوە. خودی کاک «محەممەد»یش لە لاپەڕە ٥٨، بەشی دووەمی کتێبەکەی خۆیدا دەڵێ: «نزیک بە ٢٠ شەو و رۆژ مەتبەعەکەم ساز کرد. دەستمان پێکرد و یەکەم نموونەی کارمان گۆڤاری «کوردستان»ی ژمارە ١ بوو. بۆ نموونە کە بزانین چاک کار دەکا، ناکا. ئەوە بوو کە لەو مەجەللەیەمانڕا دەست پێکرد...»

لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ کە ئەگەر ئەو قسەیەمان قەبووڵ بێ کە «چاپخانەی کوردستان» لە ئۆکتۆبری ١٩٤٥ (خەزەڵوەری ١٣٢٤) هاتبێ و دوو

مانگیشی خەریک بوون هەتا دایمەزرێنن، ئەدی چۆنە کە لە گۆڤاری «کوردستان»دا نووسراوە کە حیزبی دێموکرات دوای دامەزراندنی لە یەکەم ڕۆژی مانگی خەزەڵوەری ١٣٢٤ بەیاننامەی خۆی بڵاو کردۆتەوە.

ئەو دەمی بە دوو ئاکامی جیاوازی دیکەش دەگەیشتین: یەکەم ئەوە کە بەو حیسابەی وێناچێ بەیاننامەکە لە «چاپخانەی کوردستان» چاپ کرابێ. بەڵام ئاکامی دووەم هەموو بۆچوونەکانی دیکەمان ڕەت دەکاتەوە، با بزانین چۆن: لە لاپەڕە ٢٧ی پاشکۆی ژمارە یەکدا کاک «محەممەد» دەڵێ کە هەموو ئەسناد و کەلوپەلی سکرتاریەت لە لای ئەو داندرابوو. مامۆستا «زەبیحی»ش لەبەر ڕووداوەکانی ورمێ لە سابلاغ نەبووە. لەو ماوەیەدا شەوێکیان کاک «سەدیقی حەیدەری» چۆتە لای و گوتوویەتی (بڕوانامە)ی بداتێ، چونکە «سەید عەبدوڵڵای ئەفەندی شەمزینی» لە ورمێ چاوی بە نوێنەری سۆڤیەت دەکەوێ و دەیهەوێ ئەو (بڕوانامە)شی بداتێ. دواتر دەڵێ ئەوانیش وەریانگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی و داویانە بە کاک سەدیقی حەیدەری. لە لاپەڕە ٧٢شدا دەڵێ کە دوو موهەندیسە «چیکۆسلۆڤاکی»یەکە دوو مانگ خەریک بوون تا چاپخانەیان دامەزراند. لەو ماوەیەشدا بە قسەی کاک «محەممەد» نەیانهێشتوە کەس هاتووچۆیان بکا. تا تەواو بوون ئیشیان پێ کردووە و دوایە ڕۆیشتوون.

لێرەدایە کە بۆچوونەکان دەگۆڕدرێن. من پێم وایە ئەو بڕوانامەیە هەمان «بەیاننامەی کۆمەڵەی دێموکراتی کوردستان» بووە کە دوای ئەوەی بۆ ڕووسەکانیان بردووە، بەرپرسەکانیان دەستووریان داوە هەموو وشەکانی «کۆمەڵە» لە نووسراوەکەدا لابردرێن. دواتریش هەر بەو موهەندیسانە و هەر بەو چاپخانەی کە بۆخۆیان ناردبوویان، بە دوور لە چاوی بەرپرسانی ئەو حیزبە تازەیە چاپی بکەن. هەر بۆیەش بووە کە نەیانهێشتووە کە کەس بچێتە لایان، دەنا بۆچی دەبێ کەسانێکی هاتوون تاقمێک فێری شێوەی چاپ و کارکردن لە چاپخانە بکەن و لە لایەن دەوڵەتێکەوە مەئموور کراون بۆ ئەو کارە، نەهێڵن کەس بیانبینێ.

ئەگەر ئەو بۆچوونەشمان ڕاست بێ، دیسان دەگەڕێینەوە سەر بۆچوونی پێشوومان کە گوتمان ئەو چاپخانەیە پێش چاپی گۆڤاری «ئاوات» واتە پێش

ڕوونکردنەوەی ڕێکەوتی هێنانی چاپخانە بۆ مەهاباد لە لایەک لە دیاری کردنی ڕۆژ و مانگەکانی کۆتایی تەمەنی خەباتی کۆمەڵەی (ژ.ک) و هەڵوەشاندنەوەی ئەو کۆمەڵەیە نزیکمان دەکاتەوە، لە لایەکی دیکەشەوە ڕێکەوت و شوێنی چاپی بەیاننامەکە و هەروەها هۆکاری گۆڕین و لابردنی وشەی «کۆمەڵە»مان بۆ روون دەکاتەوە. من لەو بڕوایەدام یەکێک لەو هۆکارانەی کە ئیمزای «پێشەوا قازی محەممەد» بە ژێر بەیاننامەکەوە نییە، هەر ئەوە بووە کە «پێشەوا» بە گۆڕین و لابردنی ئەو وشەیە رازی نەبووە و ئەو کارەی بە دەستێوەردانی ئاشکرا لە کاروباری کوردەکان زانیوە.

# چۆنێتی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی ژ.ک و بەیاننامەی کۆمەڵەی دێموکراتی کوردستان

لە لاپەڕە ٣٥٠ی کتێبی «ڕۆژنامەی کوردستان ـ مەهاباد ١٣٢٤ ـ ١٣٢٥ی هەتاوی (١٩٤٦)»دا، کاک «ڕەفیق ساڵح» و کاک «سەدیق ساڵح» بەو چەشنە باسی بەیاننامەی ڕاگەیاندنی «کۆمەڵەی (حیزب)ی دێموکراتی کوردستان»یان کردووە و دەڵێن کە نوسخەی دەستنووس و چاپکراوەکەیان لە بەڕێز دوکتور «کەمال فوئاد» وەرگرتووە. وێنەی دەستخەتەکە بۆ یەکەم جار لە مانگنامەی بەدرخان بڵاو بۆتەوە.

دوو نموونەکەشیان بەو چەشنە ناساندووە: «یەکەمیان ـ دەستخەتە بە دوو ستوون لە سەر لاپەڕەیەکی پێوانە A3 (٧ و ٢٩ × ٤٢ سم) بە خەتی نەستەعلیقی فارسی، ستوونێک بە کوردی و ئەوی‌تر بە فارسی نووسراوە. بەشی خوارەوەی هەر دوو ستوونەکە بە سێ ڕیز ناو و ئیمزای (٣٩) کەسی وەک دامەزرێنی کۆمەڵە (حیزب)ی دێموکراتی کوردستان لێ دراوە. ئیمزای «قازی محەممەد» لە لای سەرووی دەستی چەپی ڕیزەکانە. هیچ مێژوویەک بەم بەیاننامەیەوە نییە.

دووەمیان ـ لە چاپدراوە، بە شێوەی چاپەکەیدا دەرئەکەوێ کە لە

لاپەڕەیەکی پێوانە (٧ و ٢٩ × ٨ و ٥٠ سم) ڕێک خراوە. ئەوەندە نەبێ کە ناوەکان لەمیان‌دا (٧٢)ە و بە ١٠ ڕیز نووسراون، هەڵەی چاپ و چەند گۆڕانکارییەکیشی تێدا کراوە.»

لە بابەت ڕێکەوتی چاپی بەیاننامەکەش دەڵێن: «ئەوەی زانراوە حیزبی دێموکراتی کوردستان، ١ی خەزەڵوەر (ئابان)ی ١٣٢٤ی هەتاوی (١٩٤٥/١٠/٢٣) بەیاننامەی دامەزرانی خۆی لە مەهاباد بڵاو کردۆتەوە. بۆیە بێ‌گومان ئەبێ هەر دوو نموونەی بەیاننامەکە پێش ئەو مێژووە ـ لانی‌کەم ـ بە ماوەیەک داڕێژرابێ و ئامادە کرابێ و ئیمزای لێ درابێ. دوور نییە سەرەتا هەر ئەو (٣٩) کەسە بە گشتی لە ناسراوانی ناوچەی موکریان بوون، ئیمزایان لە سەر کردبێ، پاشان ئەو ناوانەی تری لێ زیاد کرابێ؛ کە بە گشتی لە سەرانی ناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجانی ڕۆژاوا (غەربی) بوون سەرەنجام کۆی ناوەکان بووبنە ٧٢»

بۆ بەڵگەی دامەزرانی (ح.د.ک)ش لە پەراوێزی هەمان لاپەڕەدا «گۆڤاری کوردستان»ی ژمارە ١ی ڕێکەوتی ١٥ی سەرماوەزی ١٣٢٤ (٦ی دێسامبری ١٩٤٥)یان کردۆتە پاڵپشتی بۆچوونەکەیان.

ئەوەی جێگای سەرنجە و خوێنەر لە یەکەم چاوخشاندنی بە سەر بەیاننامەکەدا هەستی پێدەکا جیاوازی نێوان بەیاننامە دەستخەتەکە و چاپکراوەکەیەتی. کاک «ڕەفیق ساڵح» و کاک «سەدیق ساڵح» بۆچوونی خۆیان ئاوا دەربڕیوە: «جێی سەرنج ئەوەیە کە ناوی ڕێکخراوەکە لە دەقی کوردیی دەستخەتەکەدا هەر (کۆمەڵە)یە، لە کاتێکدا پێم وایە سەرەتا ویستراوە بۆ وەفاداری و نیشانەی دامەزراندنی لەسەر بنچینەی و داروپەردووی (کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان ـ ژ.ک) وەک خۆی بهێڵرێتەوە. ئەمە سەرباری ئەوەی کە تا ئەو ئەمە و بگرە دواتریش (کۆمەڵە) وەکوو زاراوەیەکی کوردی هاوتا بۆ (حیزب) بەکار هێنراوە. لەبەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی دروست شک نابرێ، ڕوون نییە ئاخۆ بۆچی ئەم دەستکارییە کراوە و (کۆمەڵە) کراوەتە (حیزب)؟! ئەم خاڵە شایانی لێوردبوونەوەیە»

بۆ شوێنی چاپەکەش دەڵێن: «مەهاباد ئەو دەمە چاپخانەی لێ نەبووە، بۆیە زیاتر ڕێی تێ‌ئەچێ بەیاننامەکە برابێتە شاری تەورێز کە هەلومەرجێکی هاوشێوەی کوردستان و چاپخانەی هەبووە؛ لەوێ لە چاپ درابێ. بەڵگەی ئەوەی

کــە کارگــەرێکی چاپخانــە لــە چــاپی داوە کــوردیی نــەزانیوە، ئەوەیــە لــە نووسینەوەی‌دا هەڵە بەتایبەت لە ناوەکاندا کراوە...»

ئەوەی لە تێبینییەکانی کاک «رەفیــق» و کــاک «ساڵــح»دا مــاوە باســی بکەین، ئەوەیە کە ئــەو دوو بــەڕێزە دەڵــێن جگــە لــە «ســەدیقی حەیــدەری» و «محەممەدئەمینی شەرەفی» و «محەممەدی یاهوو» کە لە ئەندامانی رێبەرایــەتیی (ژ.ک)ن کەسی دیکە بەیاننامەکەی ئیمزا نەکردووە. لە نووسخەی لــە چاپــدراوی بەیاننامەکەشدا ئیمزا و ناوی «قازی محەممەد»ی پێوە نییە.

منیش بــەپێــی تــوانــام بــڕیــارم دا بــۆ روونکــردنــەوەی هــۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە چەنــد ســەرچاوەیەکی بەردەســتم کــەلک وەربگرم بەڵام بەر لەوەی هیچ شیکردنەوە و تێبینییــەکم لــە بابــەت قــسەکانی داهاتوودا هەبێ، دەمەوێ هۆکار و ئامانجی خۆم بــۆ شــیکردنەوەی ئــەو بەشــە ئاشکرا بکەم ئەویش ئەوەیە کە رووسەکان بە رواڵەت ببوونە تەنیا دەوڵەتێک کە بە قسەی خۆیان یارمەتی گەلانی چەوساوە و یەک لە وان کوردیــان دەدا. بــەڵام هەر کە دیتیان ئامانج و دروشمەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) لەگەڵ بەرژەوەندی ئەوان یەک ناگرێتەوە هەرچی لەو ماوەیەدا کردیان جگە لە جاسووسی و ئاژاوە نانەوە و ناکۆکی سازکردن، فەرق و جیاوازی دانان و تاڵان کردنی ســامانەکانی گــەلی کورد و لەخشتە بردن و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک) و دواتر پشتبــەردانی کۆماری کوردستان لەبەر بەرژەوەندییەکانی خۆیان؛ هیچ قازانجێکی بــۆ گــەلی کورد نەبوو. دیتمان کە لەگەڵکوو حکوومەتی ئێران بەڵــێنی ئــەوەیان دانــێ کــە ئیمتیازی نەفتی باکووریان بدەنێ چۆن پشتی کوردیان بەردا.

ئەوەی لەمەولا باسی دەکەین هەمووی دەگەڕێتەوە سەر ئەو بۆچوونانەی سەرێمان. بەو هیوایەی توانیبێتمان گۆشەیەکی خەیانەت و فریوی رووسەکان و دواتر ئینگلیسییەکان بەرامبەر بە کورد و کوردستان خستبێتە روو.

ئەو بەشەی خوارێ دەقی نوســخەی دەســتخەتی بەیاننامەکەیــە. چونکــە دەقی نووسراوەکە بە زاراوەی موکریان نووسراوە و بە بڕوای من شەخسی قــازی محەممەدیش نووسیویەتی، لە لایەکی دیکەشــەوە نوســخە کــوردی و فارســییە چــاپکراوەکــەی لــە چەنــد جێگــای گرینگــدا جیاوازیــان لەگــەڵ نوســخەی دەستخەتەکەدا هەبوو؛ من لە رووی خودی دەستخەتەکەی بەیاننامەکەی...

دەسکاری و تەنیا بە ڕێنووسی ئێستای زمانی کوردی نووسیوەتەوە. ئەوەی دوای بەیاننامەکەش باسی لێوە دەکەین ئەو سەرچاوانەن کە لەو بابەتە دواون. دواتریش چەند بەڵگەی دیکە لەسەر سیاسەتی رووسەکان بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک) دەهێنینەوە:

*بە ناوی خودای بەرز و بێ هەمتا*

*بەیاننامەی کۆمەڵەی دێموکراتی کوردستان*

*هاونیشتمانان، برایان*

*ئاگری شەڕێ تەواوی دنیای داگرتبوو کە بە بۆنەی دوژمنانی سەربەستی و پامالکەرانی دێموکراسی هەڵایسابوو بە هێزی باسکانی بەقەووەتی سەربازانی ئازادی موتتەفیقینی گەورەی ئێمە کوژاوە. دنیای دێموکراسی غالب، دنیای فاشیستی کە دەیەویست میلەل و نەتەوانی دنیایە بەردەست و یەخسیری چەند نەفەر بێشەرم و فەعالی مایشا بکا، بە یەکجاری بەزی و هەلات.*

*بە جۆرێکی چاوەنۆڕی دەکرا بۆ ئازادی میلەل و نەتەوانی دنیایە ڕێگا ئاواڵە بووە. ئەورۆ تەواوی نەتەوەکانی دنیایە لە گەورە و چکۆلە دەیانەوێ لەو ڕێگایەوە کە بۆ سەربەستی ئەوان ئاواڵە بۆتەوە فائیدە بەرن و لەو وەعدانەی کە لە مەنشووری تاریخی ئاتلانتیک‌دا درابوو بەهرەوەر بین.*

*هەڵسوڕی ئوموری خۆیان بە دەستەوە بگرن و کاری خۆیان بە ئارەزووی خۆیان پێک بێنن. ئێمە کوردان کە لە ئێراندا دەژین چەند ساڵ و بەڵکی چەند قەڕنە بۆ ئەستاندنی حەق و ئیختیاری میللی کێشەمان کردووە و خۆمان کردۆتە گاوگەردوون، بەدبەختانە کاربەدەستانی موستەبیدی ئێران بە هیچ جوورێک حازر نەبوون قسە حیسابییەکانی ئێمە ببیسن! حەتتا لەو حەقەی کە لە قانوونی ئەساسی‌دا بۆ ئەیالات و ولایاتی ئێران داندراوە نەیانهێشتووە فایدە وەرگرین! و هەمیشە جوابی ئێمە گوللە و بۆمب و تۆپ و گیران و دەربەدەری و لە داردان و یەخسیری بووە!!! بەتایبەتی لە دەورەی بیست ساڵەی دیکتاتۆڕی ڕەزاخانیی حەتتا لە پۆشینی لیباسی خۆمان ئازاد نەبووین! و بەزۆری سەرنێزەی ساحێبمەنسەبەکانی دز و خائین و تالانگەر تەواوی بوون و ژیان و ئابڕوو و نامووسی ئێمەیان ون و پێ پەست کرد! و بۆ لە بەین بردن و هەڵکەندنی ڕیشەی نەسلی ئێمە بە هیچ جۆرێک لە پەستی و وەحشیگەری ڕانەوەستان! ئاخر*

ئێمەش بەشەرین، ئێمەش تاریخ و زمان و عادات و ئاداب و رێ و شوێنێکمان هەیە کە بەوانە گیرۆدە و پێبەستین. بۆچ دەبێ حەققی ئێمە پامال بێ؟ بۆچ ناتوانین لە نێو ماڵی خۆماندا ئازاد و سەربەخۆ بین؟ بۆچ بە ئێمە ئیجازە نادرێ بە زمانی کوردی منداڵانی خۆمان لە بەر خوێندن بنێین؟ بۆچ نایەڵن کوردستانیش وڵاتێکی خودموختار بێت کە بە ئەنجوومەنی ولایەتی هەر وەکوو قانوونی ئەساسی مەعلوومی کردووە ئیدارە بکرێ؟ هاووەتەنانی خۆشەویست دەبێ بزانن «حەق نادرێ و دەستێندرێ». ئێمە دەبێ بۆ ئەستاندنی حەق و ئیختیاری میللی جێگای خۆمان ملە بکەین ئەو ملەیەش یەکێتی و پاڵوێکدان و تەشکیلات و چوونە پێشی پێویستە.

بۆ ئەو مەرامە پاکەیە کە کۆمەڵەی دێموکراتی کوردستان لە مەهابادێ داندراوە و دەستی بە کار کردووە. هاونیشتمانە خۆشەویستەکانمان پێویستە ئێوەش چاو و گوێی خۆتان بکەنەوە و لە دەوری کۆمەڵەی میللی خۆتان خڕ ببنەوە بۆ وەرگرتنی حەققی مەشرووعی میللی گیان بووردن و فیداکاری پێویستە.

کۆمەڵەی دێموکراتی کوردستان رەهبەر و رێنوێنی ئێوەیە تەنیا لە ژێر ئاڵای ویدایە کە میللەتی کورد لە بەڵای لەبەین چوون و نەمان رزگار دەبێت و بوون و نامووس و ئابرووی میللی دەمێنێ و ئەو مووەففەق دەبێ کە لە نێو سنووری دەوڵەتی ئێران سەربەخۆیی میللی خۆی بە دەست بێنێ. هاووەتەنانی ئێمە بێجگە لە حەقی مەشرووعی ئینسانی خۆمان چی دیکەمان ناوێ.

ئارەزووی ئێمە لەو بەندانەی ژێرەوەدا بخوێننەوە و بە تەواوی میللەتی کوردی رابگەیێنن.

ئەوەیە ئارەزووی ئێمە:

١ـ میللەتی کورد لە ئێراندا لە هەڵسووڕان و پێکهێنانی کاروباری جێگای خۆی ئازاد بێت و لە سنووری دەوڵەتی ئێراندا خودموختار ببێ.

٢ـ بتوانێ بە زمانی کوردی بخوێنێ و لە وڵاتانی کوردیدا کاروباری نووسین لە ئیدارەکانی دەوڵەتیدا هەر بە کوردی بێ.

٣ـ ئەنجوومەنی ولایەتی کوردستان کە وەکوو قانوونی ئەساسی دەڵێ جێبەجێ داندرێ لە هەموو کارەکانی ئیجتماعی و دەوڵەتیدا چاوەدێری بکا و

*٤ـ مەئمووریني دەوڵەتي هەر دەبێ لە خەڵكي محەل بێ.*

*٥ـ بە بۆنەی قانوونێکی کوللی لە مابەینی رەعییەت و ئەربابدا سازشت بەجێ بێت کە دوا رۆژی هەردووکیان تەئمین ببێت.*

*٦ـ بەتايبەتي کۆمەڵەی دێموکڕات [ی] کوردستان سەعی دەکات لە مابەینی میللەتی ئازەربایجان و ئەو نەتەوانەی کە لە ئازەربایجاندا دەژین (ئاسۆری و ئەرمەنی و غەیرە) لە موبارێزەدا یەکێتی و برایەتی تەواو بەرقەرار بێت.*

*٧ـــ کۆمەڵەی دێموکڕات [ی] کوردستان بە بۆنەی ئیستیفادە لە سەرچاوانی و کانگایەکانی تەبیعی زۆری کوردستان و سەرکەوتنی ئوموری جووتیاری و بازرگانی و پەرەپێدانی ئومور[ی] فەرهەنگی و لەشساغی بۆ چاکی حاڵی ئیقتیسادی و مەعنەوی میللەتی کورد ملەی دەکا.*

*٨ـ ئێمە دەمانەوێ ئەو نەتەوانەی کە لە ئێراندا دەژین بتوانن بۆ سەعادەت و سەرکەوتنی نیشتمانی خۆیان کۆششت بکەن.*

*«بژی کوردستانی خودموختاری دێموکڕات ـ محەممەد قازی»*

بەیاننامەکە لێرەدا کۆتایي پێدێ و دوای نووسراوەکە ئیمزای ئەو کەسانەی پێوەیە کە ئامانج و دروشمەکانی حیزبی تازەیان پەسند کردووە.

هەروەک دیتمان لە نێو ئەو بەیاننامەیەدا لە ٦ جێگا ناوی حیزبی تازەدامەزراو بە « کۆمەڵەی دێموکڕاتی کوردستان» هاتووە. چونکە من نوسخە دەستخەتەکەم کردۆتە بنەمای ئەم لێکۆڵینەوە، بەپێویستم نەزانی دەقی نوسخە کوردی یا فارسییە چاپکراوەکەی ئەوکات سەرلەنوێ بنووسمەوە. تەنیا ئەوەندە دەڵێم کە گرینگترین جیاوازییەکان گۆڕینی وشەی (کۆمەڵە) بۆ (حیزب)ە. کە ئەوەش وێناچێ شتێکی ئاسایی بێ. با بزانین سەرچاوەکان لەو بارەوە چییان نووسیوە:

سەرەتا بە کتێبی «رۆژهەلاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا» دەست پێدەکەین.

لە لاپەڕە ١٢١ و لە بەڵگەنامەی ژمارە Fo 371/ 52401/ 125690دا کە بە قسەی کاک «ئەنوەری سوڵتانی» (وەرگێڕی کتێبەکە) دەبێ لە سەرەتا یا خود ناوەڕاستەکانی ساڵی ١٣٢٥ (١٩٤٦)دا نووسرابێت هاتووە: «هەواڵی عەشیرەتی و

ناوچەیی کوردستانی ئێران ـ راپورتەکان وا دەگەیێنن کە عاقیبەت «کۆمەڵەی کورد Komal – e Kurd» سەری هەڵداوە و «میاندواو» و «بۆکان»یان گرتووە و بەرەو «سەقز» تا «سەرا» رۆیشتوون...»

راپۆرتی دوومم بە ژمارە 25338 – 45478 /Fo 371 کەوتۆتە لاپەرە ١٢٣ی سەرچاوەی پێشووە. بۆ تێبینی راپۆرتەکەش نووسراوە: راپۆرتی شەش مانگەی تەورێز ـ ئەم راپۆرتە ساغکەرەوەی راپۆرتی پێشوو (٤ی مارچی ١٩٤٥)ە و ماوەی نێوان یەکەمی مارچ تا ١٥ی ئۆگۆستی ١٩٤٥ دەگرێتە بەر.

«کاروباری کوردان ـ لە ماوەی شەش مانگی رابردوودا، سەرنج بەرەو «کۆمەڵە» کشاوە کە رێکخراوەیەکی سەربەخۆی کوردە و وا دەردەکەوێ کە کۆمەڵی پێشووتر واتە «ژ.ک»ی لە خۆیدا تواندبێتەوە. کەسایەتییەکانی کۆمەڵە، هەمان کەسایەتی ژێکافن و ناوەندەکەش، هەمان ناوەندی ئەوی پێشووتر واتە مەهابادە. گومان لەوەدا نییە کە لە ماوەی چەند مانگی رابردوودا لایەنگرانی بزووتنەوەی سەربەخۆیی کورد روو لە زیادبوون بووە و لە لایەن روسەکانەوە زیاتر هان دراون. باشترین یارمەتییەک کە رووسەکان پێیان کردبێتن، بەرگری کردنیان بووە لە پلانی گرتنی مەهاباد لە لایەن هێزەکانی ئێرانەوە لە مانگی مارچدا. ئەگەر «سەرتیپ هووشمەند ئەفشار» بچوایەتە ناو مەهابادەوە و بنکەی چاوەدێرییەکی ئێرانی لەوێ دامەزراندایە و قازی محەممەدی وەدەرنایە یا خود بیگرتایە، ئەوا بزووتنەوەکە تووشی نشوستی جیدی دەهات...»

لە لاپەرە ١٧٥ هەتا ١٧٩ بەڵگەیەکی گرینگی پەیوەندیدار بە بابەتەکەی ئێمەوە هاتووە. بەڵگەکە بە ناوی «رۆژ ژمێری تەورێز» و بە ژمارە 25338 – 45478 /fo 371 ژمارە ١٧ ـ لە ٤ تا ٢٥ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥ ئامادە کراوە. لە لاپەرە ١٧٧ و ١٧٨ و لە بەشی «کاروباری دیکەی کوردان»دا بەم چەشنە باسی «بەیاننامەکەی کۆمەڵەی دێموکراتی کوردستان» کراوە:

«حیزبی دێموکرات لە سەر ئوسوولی خودموختاری پێدادەگرێ و بە راشکاوی پشتگیری لە مەسەلەی سەربەخۆیی کوردستان دەکات. لە بەرانبەردا خەڵکەکەش هەموویان بوونەتە دیموکراتی.

یەکەم بەرهەمی دیارییەکانی رووس بۆ قازی محەممەد کە سەرجەم دەبێ <چاپخانەیەک و دوو تەن (٢٠٠٠ کیلۆ) کاغەز بێت، بریتی بووە کە مەرامنامەی حیزبی دێموکراتی کوردستان. بەڵگەنامەکە، کە هاوتەرتیب لە دوو ستوونی فارسی و کوردیدا چاپ کراوە>، دوای چاوخشاندنێکی سەرەتایی بەو زوڵم و زۆرانەدا کە رابوردوو دیکتاتۆرەکانی ئێران کردوویانە، ئەم داخوازییانە ئاراستە کراون: ١ـ کوردستانێکی خودموختار لە نێو سنوورەکانی دەوڵەتی ئێراندا. ٢ـ کەڵک وەرگرتن لە زمانی کوردی لە قوتابخانە و ئیداراتی کوردستاندا. ٣ـ هەڵبژاردنی دەستبەجێی شۆرای ئەیالەتی کوردستان بۆ ئەوەی چاوەدێری هەموو کاروبارێکی کۆمەڵایەتی و حکوومی بکات. ٤ـ هەڵبژاردنی کاربەدەستانی دەوڵەتی تەنیا لە کوردان بن. ٥ـ دانانی یاسا بۆ بەڕێوەبردنی پێوەندییەکانی نێوان وەرزێر و خاوەن زەوییەکان. ٦ـ هاوکاری لەگەڵ رەگەزەکانی دیکەی ئازەربایجان، وەک ئەرمەنی و ئاسۆری و هتد... بۆ ئەوەی یەکیەتی و برایەتی باڵ بە سەر وڵاتدا بکێشێ. ٧ـ دەرهێنانی کان و سەرچاوە سروشتییەکانی کوردستان بە سوودی خەڵکەکە خۆی. مەرامنامەکە بە ئاواتەخوازی بۆ سەرکەوتوویی هەموو نەتەوەکانی ئێران کۆتایی پێ دێت.»

پێم وا نییە ئەو راپۆرتە هیچ شیکردنەوەیەکی بوێ. تەنیا بەپێویستی دەزانم رێکەوتی راپۆرتەکان بەپێی ساڵی هەتاوی لێک بدەمەوە چونکە لەو بڕوایەدام لێکدانەوەی ئەو رێکەوتانە نزیکمان دەکاتەوە لە کاتی دەرچوون و چاپی بەیاننامەکە. راپۆرتی «رۆژژمێری تەورێز» رووداوەکانی ٤ تا ٢٥ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥ی لە خۆ گرتووە کە ئەو رێکەوتە بەرامبەرە لەگەڵ رۆژی پێنجشەممە ١٢ی رەزبەری ١٣٢٤ هەتا رۆژی پێنجشەممە ٣ی خەزەڵوەری ١٣٢٤.

دوکتور «عەزیزی شەمزینی» لە ل١٦٣ و ١٦٤ی کتێبی«جووڵانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان»دا دەڵێ: «دوای بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی «ژ.ک»... لە یەکەمین کۆنگرەی حیزب [ی دێموکراتی کوردستان]دا کە لە ٢٥ـ ٢٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٥دا بەسترا، بڕیاری دەرکردنی راگەیاندن و پرۆگرامێکی تایبەتی درا...»، دواتر بەکورتی باسی بەندەکانی پرۆگرامەکە دەکا، رەنگە ئەو نووسراوەیە زانیارییەکی باش بێ بۆ ئەوەی بتوانین رێکەوتی دەرچوونی بەیاننامەکە روون بکەینەوە. کە رێکەوتی ٢٥ هەتا ٢٨ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥

بەرامبەرە دەگەڵ ١ هەتا ٦ی خەزەڵوەری ١٣٢٤ی هەتاوی. بە بڕوای من ڕەنگە لە ماوەی ئەو شەش ڕۆژەدا هەم پەیڕەو و پڕۆگرامەکە و هەم بەیاننامەکە هاتبێنە سەر کاغەز و دوای باس و لێکدانەوەش بڵاو کرابێنەوە.

لە لاپەڕە ١٧٣ هەتا ١٧٥ی کتێبی «مستەفا بارزانی لە هەندێک بەڵگەنامە و دۆکیومێنتی سۆڤیەتیدا ١٩٤٥ ـ ١٩٥٨»یشدا کە کاک دوکتور «ئەفراسیاو هەورامی» لە ڕووسییەوە بۆ کوردی وەرگێڕاوەتەوە، دەقی ٢١ مادەی بەرنامە و پڕۆگرامی حیزبی دێموکراتی کوردستان بە وردی باس کراوە. لاپەڕە ١٧٣ بەو دێڕانە دەستی پێکردووە: «بە ناوی خوای مەزن ـ پڕۆگرامی حیزبی دێموکراتی کوردستان ـ سەرماوەزی ١٣٢٤، کانوونی یەکەم: ١٩٤٥، مەهاباد، چاپخانەی کوردستان.» لە لای چەپی ئەو نووسراوەیەش ئەو دێڕە هاتووە: «نهێنی لە کوردییەوە وەرگیراە» لە کۆتایی ٢١ مادەکەش‌دا و لە لاپەڕە ١٧٥ نووسراوە: «وەرگێڕ لە کوردییەوە بۆ ڕووسی: کاپیتان (نەقیب) فیلچفسکی ١٩٤٦/٤/١٦» کە ئەو ڕۆژەش بەرامبەرە لەگەڵ ٢٧ی خاکەلێوەی ١٣٢٥ی هەتاوی. لە لاپەڕە ٨١ هەتا ٩٠ی کتێبی «حکوومەتی کوردستان ـ ڕێبەندانی ١٣٢٤ ـ سەرماوەزی ١٣٢٥ کورد لە گەمەی سۆڤیێتی‌دا» کاک «نەوشیروان مستەفا ئەمین» دوو بابەتی پەیوەندیدار بەو بەشەی باس کردووە. لە لاپەڕە ٨١ تا ٨٣ وەرگێڕدراوی بەشی فارسی بەیاننامەکەی هێناوە.

لە لاپەڕە ٨٣ و ٨٤ دا لە بەشی «هەوەڵ کۆنگرەی حیزبی دێموکرات»دا دەڵێ: ««کوردستان» گۆڤاری «بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دێموکراتی کوردستان» لە ژمارەی یەکەمی ساڵی یەکەمی‌دا کە لە ١٥ی سەرماوەزی ١٣٢٤ بەرامبەر ٦ی دیسامبەری ١٩٤٥ لە ژێر ناونیشانی «حیزبی دێموکراتی کوردستان» نووسیویەتی: «لە دوای ئەوە لە هەوەڵی مانگی خەزەڵوەر (ئابان)ی ١٣٢٤ حیزبی دێموکراتی کوردستان لە مەهاباد داندرا و بەیاننامەی خۆی بڵاو کردەوە، لە ڕۆژی ٢ی ٨ی ١٣٢٤دا هەوەڵ کۆنگرەی خۆی کە تێکەڵ بوو لە سەران و نوێنەرانی کوردان بە تەرتیبی ژێروو... تەشکیل دا و لە لایەن سەران و ڕەوشەنفکرانی حیزبەوە نوتقی زۆر چاک دایر بە دێموکراتی و یەکێتی ئیراد کرا...»

کاک نەوشیروان لە درێژەی شیکردنەوەکانیدا سەبارەت بەم باسە لە لاپەڕە ٨٦دا دەڵێ: «ئەگەرچی یەکەمین بەیاننامەی خۆناساندنی حیزب بە خەڵک و دانانی یەکەمین مەرامنامەی و هەوەڵ کۆنگرەی لە سەرەتای مانگی

ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژدا ئاهەنگ ئەگێڕێ. هۆی ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە (ح.د.ک) خۆی بە درێژەی (کۆمەڵەی ژ.ک) دائەنێ و (ژ.ک)ێش وەکوو خۆی لە ڕۆژژمێرەکانیدا نووسیوێتی لە ٢٥ی گەلاوێژدا دامەزرابوو...»

ئەوەی لێرەدا پێویستە هەڵوێستەیەکی لەسەر بکەین ئەوەیە کە وا وێدەچێ بەپێی «گۆڤاری کوردستان» ڕێکەوتی ١ی خەزەڵوەری ١٣٢٤ (١٣٢٤/٨/١) بەیاننامەی دامەزراندنی حیزبی دێموکرات و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک) بلاو کراوەتەوە کە ئەو ڕێکەوتە بەرامبەرە لەگەڵ ڕۆژی سێ شەممە ٢٣ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥ی زایینی. سبەینێی ئەو ڕۆژەش واتە ٢ی ٨ی ١٣٢٤ کە بەرامبەرە لەگەڵ ٢٤ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥ کۆنگرەی یەکەمی (ح.د.ک) بەستراوە.

ئەوەی لەو بەشەدا ماوە باسی لێبکەین لاپەڕە ٨٧ تا ٩٠ی کتێبەکەیە کە دەقی ٢٢ بەندەکەی مەرامنامەی (ح.د.ک)ی تێدا بلاو کراوەتەوە کە ئەو بەشە پێوەندی بە باسەکەی ئێمەوە نییە. بەڵام وەک تێبینییەک ئەوەندە دەڵێین کە هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوە نییە کە بیسەلمێنێ یەکی خەزەڵوەری ١٣٢٤ بەیاننامەی حیزبی تازەدامەزرێندراو چاپ کرابێ. چونکە خودی گۆڤاری «کوردستان»یش نووسیویەتی لەو ڕۆژەدا بلاومان کردەوە، دیارە پێش ئەو ڕێکەوتە چاپ کراوە.

هەڵبەت دەقی ئەو پێڕەوپڕۆگرامە لە لاپەڕە ١٠٩ هەتا ١١١ی کتێبی «جەمهوریەتی کوردستان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و سیاسییە»دا کە کاک «مەحموودی مەلاعیززەت» نووسیویەتی هاتووە. دەقی وەرگێڕدراوی بەیاننامەکەش (لە فارسی بۆ کوردی) لە لاپەڕە ١٠٤ هەتا ١٠٦دا نووسراوەتەوە. ئەو بابەتانەی کە لە کتێبی «مستەفا بارزانی...»دا گرینگییان هەیە ئەوانەن: ١ـ ڕێکەوتی پڕۆگرامەکە مانگی سەرماوەز یا کانوونی یەکەمی (١٩٤٥)ە کە دیارە ئەو ڕێکەوتە مەودایەکی وای لەگەڵ بەیاننامەکە نییە. وادیارە ئەو پڕۆگرامە بە ماوەیەکی کەم دوای دەرچوون و بلاوبوونەوەی بەیاننامەکە چاپ کراوە. ٢ـ شوێنی چاپەکەیە کە نووسراوە: مەهاباد: چاپخانەی کوردستان.

بەڵام چونکە چاپخانەی کوردستان درەنگ هاتۆتە مەهاباد وا دیارە ئەو پڕۆگرامەش هەر وەک بەیاننامەکە لە جێگایەکی دیکە و چاپخانەیەکی دیکە لە دەرەوەی مەهاباد و ناوچەی کوردستان چاپ کرابێ. بەڵگەشمان لاپەڕە ٤ی ژمارە ٣ی «ڕۆژنامەی کوردستان»ە کە لە بەشێکیدا دەڵێ: «ڕۆژی ٢٠ی ١٠ی ٢٤ ساتی

٥[ی] پاشنیوەڕۆ لە ئیدارەی رۆژنامە و گۆڤاری «کوردستان» بە مناسبەتی کردنەوەی ئەو ئیدارە و بلاوکردنەوەی هەوەڵ ژمارەی رۆژنامەی کوردستان جێژنێکی بەشەوکەت گیرا...» هەروەک دەزانین ژمارە ١ی «رۆژنامەی کوردستان»یش هەر لەو رۆژەدا کە بەرامبەرە لەگەڵ رۆژی پێنج شەممە ١١ی ژانوییەی ١٩٤٦ چاپ و بلاو بۆتەوە.

لە لاپەڕە ١٦٨ هەتا ١٧٠ی کتێبی «رۆژهەلاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا...» دەقی وتوویژی «پێشەوا قازی محەممەد» کە رێکەوتی ٢٢ی کانوونی یەکەم (بەرامبەر لەگەڵ ١ی بەفرانباری ١٣٢٤) لەگەڵ سەرنووسەری رۆژنامەی فەرمان (ئاغای شاهەندە) پێکی هێناوە هاتووە، ناوبراو لە وەلامی ئەو پرسیارە کە ئایا راستە قازی محەممەد لە گەڕانەوەی لە سەفەری باکۆ چاپخانەی هێناوە؟ بەو چەشنە لە لایەن پێشەواوە وەلامی دەدرێتەوە: «دەزگای چاپخانە لە تەورێز کڕاوە و تاقیکردنەوەی زۆر ئاسانە» دواتریش پێشەوا باسی دروشم و داخوازیەکانی حیزبی تازەدامەزراوی کردووە و هەروەها ٦ خاڵی گرینگی بەیاننامەکەی بۆ باس کردوون.

هەڵبەت دەقی ئەو وتوویژە بە شێوەی دروستی خۆی (نەک وەک ئەوەی رووسەکان لێیان هەڵکڕاندووە) لە لاپەڕەکانی ١ و ٤ی ژمارە ١ و لاپەڕە ٢ی ژمارە ٢ی رۆژنامەی «کوردستان»دا چاپ کراوە.

لە لاپەڕە ٤ی ژمارە ١ی رۆژنامەی کوردستان کە لە لاپەڕە ٤ی کتێبی «رۆژنامەی کوردستان»دا چاپ کراوە لە درێژەی وتاری «گفتوگۆی جەنابی قازی محەممەد پێشەوای بەرزی کوردستان دەگەڵ خاوەنانی رۆژنامەی تاران»دا لە لایەن یەکێک لە بەرپرسانی رۆژنامەکانی تاران ئەو پرسیارە کراوە کە: «لە تاران دەلێن جەنابت چەند کەست بۆ باکۆ ناردووە لەوێ چاپخانە و کاغەز و ئەسلەحەیان هێناوە و تەشکیلی حیزبی کۆمۆنیست و داوە؛ ئایا راستە؟» پێشەوا لە وەلامدا دەلێ: «ئەم قسانە کاربەدەستانی لەشکری بۆمان هەڵدەبەستن ئەوانە راستنین. کاغەز و چاپخانەمان لە تەورێز کڕیوە و ئێوەش دەتوانن لەو جێگای لێمان کڕیوە، ئاگادار بن؛ تەشکیلی حیزبی کۆمۆنیست درۆیە، شتێک هەیە ئێمە لە کوردستاندا هەر وەکوو قانوونی ئەساسی ئێران ئیجازە دەدا خەڵک بە

تەواوی مەعنی ئازادی عەقیدەیان هەیە و حیزبێکی ئاشکرامان هەیە ئەویش فیرقەی دێموکراتی کوردستانە»

دواتر «پێشەوا لە وەڵامی ئەو پرسیارەشدا کە: «مومکین دەبێ کە مەرامی فیرقەی دێموکراتی کوردستانمان بۆ بەیان بفەرمووی؟» باسی خاڵەکانی بەیاننامەکە دەکا کە ئەو خاڵانە هەمان بەندەکانی بەیاننامەکەی پێشوون.

سەرچاوەی دواترمان لاپەڕە ٣٥ هەتا ٤٦ی کتێبی «چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی» دوکتور «عەبدوڕڕەحمانی قاسملوو»یە. لە لاپەڕە ٣٥ هەتا ٣٨ دەقی وەرگێڕدراوی بەیاننامەکەی (فارسی بۆ کوردی) لە خۆ گرتووە. لە لاپەڕە ٣٨ تا ٤٦یش لەسەر بەیاننامەکە قسە کراوە و شیکردنەوەی پێویستی لە سەر نووسراوە. ئەوەی جێگای سەرنجە لاپەڕە ٤٥ و ٤٦ی ئەم کتێبەیە کە لەودا بەو چەشنە لە بابەت نووسەری بەیاننامەکە و هەروەها گۆڕینی کۆمەڵەی ژ.ک بە حیزبی دێموکڕات باس کراوە: «لێرەدا پێویستە ئیشارە بە راستییەکی دیکەش بکرێ، وا دەردەکەوێ کە نووسینی ئەم بەرنامەیە لە ئەستۆی قازی محەممەد بووە. قازی محەممەد لە ئاخری تێکۆشانی کۆمەڵەی ژ.کدا بوو بە ئەندامی کۆمەڵە و زۆر زوو دەرکەوت کە شەخسییەتێکی بەرچاو و هەڵکەوتووی ئەو رێکخراوەیە. بۆیە هەرچەند درەنگتر لە زۆر کەسی دیکە چووبوو بۆ نێو کۆمەڵە، بەکردەوە بوو بە بەڕێوەبەری کۆمەڵەی ژ.ک. کاتێک حیزبی دێموکراتی کوردستان دامەزرا، دەرکەوت قازی محەممەد زیاتر لە هەر کەسێکی دیکە ئەو زەروورەتە و ئەو پێویستییە تێگەیشتبوو کە کۆمەڵەی ژ.ک بە تەرکیبی خۆی بە شێوەی رێکخستنی خۆی ناتوانێ وەڵامدەری خەباتی گەلی کورد لە کوردستان بێ. هەر بۆیەش قازی محەممەد لە هەمووکەس زیاتر دەستی لە دامەزراندنی حیزبی دێموکراتی کوردستاندا هەبوو. لە هەموو کەس زیاتر تەئسیری هەبوو بۆ ئەوەی بەرنامەیەکی ئەوتۆ بۆ ئەم حیزبە دابڕێژێ... ئێمە ئێستا زۆر بەباشی تێدەگەین چ بەرپرسایەتییەکی گەورە و چ زەحمەت و تێکۆشانێکی بێوچان کەوتبووە سەر شانی قازی محەممەد.»

لە لاپەڕە ٧ی کتێبی «رۆژنامەی کوردستان...»، کە ژمارە ٢ی رۆژنامەی «کوردستان»ی رۆژی شەممە ٢٢ی ١٠ی ١٣٢٤ (١٣ی ژانویەی ١٩٤٦)ی تێدا چاپ کراوە، شێعرێکی مامۆستا هەژار لە ژێر ناوی «هەژار و مانگی بەفرانبار» لە

لاپەڕە ٣دا چاپ بووە. لە پێشەکی شێعرەکەشدا بە ناوی حیزبی تازە واتە «کۆمەڵەی دێموکراتی کوردستان» ئیشارە کراوە و تێیدا هاتووە: «لە کاتێکا دوو برای خۆشەویست و ئەندامی بەرزی کۆمەڵەی (دێموکرات) مرۆ و پشتیوان لە سەفەری کابەی هاتنەوە بۆکان (هەژار) ئەو شێعرانەی خوێندەوە.»

لە لاپەڕە ٣١٦ی کتێبی «ڕۆژنامەی کوردستان...» یا هەمان لاپەڕە ٤ی ژمارە ٧٩ی ڕۆژنامەی «کوردستان» و لە درێژەی وتارێکی «سەید محەممەدی حەمیدی»دا لە ژێر ناوی «موباریزەی ئازادی و دێموکراسی ئێمە پێی دە پێنجەمینساڵی خۆی نا» دوای ئەوەی کورتە باسێک لەسەر نەهامەتی و زوڵم و زۆری دوژمنانی کورد دەکا، ئەوجار باسی سازبوونی نیهزەتێک دەکا کە کوردی پێ بووژاوە و توانی دەسەڵاتی خۆی بگرێتە دەست خۆی. لە کۆتایی وتارەکەیدا دەڵێ: «لە ئاخریدا بە ئیخلاسێکی لە ئەندازە بەدەر و قەلبێکی پڕ لە شووری نیشتمانپەرستی جێژنی پێنجەمین ساڵی موقەددەسمان بە حوزووری موبارەکی زاتی ئەقدەسی پێشەوای موعەززەم و هەموو برا کوردەکانی ڕۆژهەڵات عەرز دەکەم و لە خودای بێ هاواڵ دەپاڕێمەوە کە پێشەوای بەڕێزمان موەففەق و پیرۆز کات کە لە سایەی ویدا چاوی هەموو برا کوردێک بە فێنکایی دێموکراسی روون و هەموان لە نیعمەتی ئازادی بەشدار بن. لە دواییدا دەڵێم بژی و هەر سەربەرز و پیرۆز بێت پێشەوای زانا و بەڕێزمان و هەر پایەدار بێت <کۆمەڵ و دێموکراتی کوردستان>.»

لەو دوو ژمارەیەی «ڕۆژنامەی کوردستان» ڕاستییەکی زۆر گرینگمان وەدەست دەکەوێ ئەویش ئەوەیە کە وادیارە ئەگەرچی لە بەیاننامە چاپکراوەکەی « کۆمەڵەی دێموکراتی کوردستان» ناوی کۆمەڵەی لێ دەرهاویژراوە بەڵام بە حوکمی ئەوەی شەخسی «قازی محەممەد» و زۆربەی لایەنگرانی بە ئاشکرا ڕایانگەیاندووە کە ناوی حیزبی تازە «کۆمەڵەی دێموکراتی کوردستان»ە تا ماوەیەکی زۆر ئەو حیزبە هەر بەو ناوە ناسراوە. ئەوەی روون و ئاشکرایە ئەوەیە کە بەیاننامەکە لە مەهاباد چاپ نەکراوە. بۆئەو بابەتەش دوو بۆچوون هەیە، یەکەم: ڕەنگە لە تەورێز چاپ کرابێ دووهەم: ڕەنگە روسەکان لە وڵاتی خۆیان چاپیان کردبێ و دواتر هێنابێتیان بۆ مەهاباد.

بەڵگەی بۆچوونی یەکەممان ئەوەیە کە وا دیارە ئەو کەسەی

کوردی زانیوە بەڵام زاراوەی سۆرانی چاک نەزانیوە. بە بۆچوونی من رەنگە ئەو کەسەی ئەو بەیاننامەی چاپ کردووە رووسییەک بووە کە هاتووچۆ و شوێنی کارکردنی لە ناوچە کوردنشینەکانی بە زاراوەی بادینی (شکاک) زۆرتر بووە.

ئەگەر ئاورێک لە لاپەرە ٣٥٥ی کتێبی «رۆژنامەی کوردستان» بدەینەوە و سەرنج بدەینە بەشی چاپکراوی کوردی بەیاننامەکە رەنگە تا رادەیەک بێینە سەر ئەو بۆچوونەی سەرێ. لە ژمارە ١و ٢و ٥و ٦ی بەشی «ئەوەیە ئارەزووی ئێمە»دا هەموو کارکردەکانی (فیعل)، «بێ» و «ببێ» و «ببێت» بوونە «بێشیە»، «ببیشت» و «بێشت». هەروەک هەموومان دەزانین لە زاراوەی بادینیدا «بشێت» مانای «ببێت»ی زاراوەی سۆرانی دەدا.

دەتوانین ئەوەش بە بۆچوونی یەکەم و دووەممان زیاد بکەین کە لەبەر ئەوەی رووسییەکی کوردیزان ئەو بەیاننامەی چاپ کردووە یا بە سەر چاپکردنەکەی راگەییوە، لەبەر ئامانجی خۆیان کە لە ناوبردنی «کۆمەڵەی ژ.ک» بووە، نەیانهێشتووە تەنانەت ناوی کۆمەڵەش بە ناوی حیزبی تازەوە بمێنێ.

ئەگەرچی جوان دیارە کە کاتی خۆی کە بەیاننامەکە دەرچووە، بۆ رەزامەندی ئەندامان و لایەنگرانی کۆمەڵەی (ژ.ک)ئەوکارە کراوە و ناوی «کۆمەڵە» لە جیات «حیزب» دەکار کراوە. نووسینەکانی پێشوومان لە بەشی «چۆنییەتی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی ژ.ک» تەواوی ئەو بۆچوونانەمان دەسەلمێنن. هیچ دوور نییە گلەیی «پێشەوا قازی» لە رووسەکان کە هەموو جارێ لە دانیشتنی لەگەڵ ئەفسەرانی ئینگلیس دەریبڕیوە، هەر لەبەر ئەو چەشنە کارانەی رووسەکان بووبێ. دەنا سوور و ئاشکرایە کە تەنانەت «پێشەوا»ش رازی بە گۆڕینی ناوی «کۆمەڵەی ژ.ک» بە «حیزبی دێموکرات» و دواتر گۆڕینی دروشمەکانی نەبووە. بەڵام لە لایەک لەبەر یارمەتی نەدانی هیچ هێزێک بە کورد (بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی) و هەروەها نەبوونی هێزێکی ئەوتۆ کە لە نێو خودی کوردستاندا بکرێ پشتی پێببەستی و لە لایەکی دیکەشەوە فشاری لە رادە بەدەری رووسەکان بۆ گۆڕینی ناو و دروشمەکانی «کۆمەڵەی ژ.ک» کورد و سەرکردایەتی کورد بە پێچەوانەی بیر و بۆچوون و ئارەزوو و هیواکانی ناچار کرا (ژ.ک) هەڵوەشێنێتەوە. با بۆ ئەو بابەتەش ئاورێک لە چەند سەرچاوە بدەینەوە:

لە لاپەڕە ٦ی کتێبی «رۆژنامەی کوردستان» کە ژمارە ٢ی رۆژنامەی «کوردستان» کەوتۆتە ئەو لاپەڕە و لە بەشی دووەمی وتاری «گفتوگۆی جەنابی قازی محەممەد پێشەوای بەرزی کوردستان دەگەڵ خاوەنانی رۆژنامەی تاران»دا و لە لاپەڕە ٢دا «پێشەوا» لە وەڵامی ئەو پرسیارە کە «لە نێو کوردستان حیزبی کۆمەڵە هەیە؟» دەڵێ: «کۆمەڵە یانی حیزب و شتێکی واش لە ئێراندا نییە. فەقەت لە عێراق حیزبێک بەو نێوە هەیە ئەمما بە مە مەربووت نییە.» دەقی ئەو وتووێژە لە لاپەڕە ١٦٨ هەتا ١٧٣ی کتێبی «رۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی...»یشدا و لە ژێر ناوی سەرنووسەری رۆژنامەی «فەرمان» لەگەڵ رێبەری کوردەکاندا بڵاوکراوەتەوە. لە لاپەڕە ١٧٠ تا ١٧٣ی کتێبی «رۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا ـ بەپێی بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤی یەکێتی سۆڤیەت»دا دەقی وتووێژی رۆژنامەنووسی هەواڵدەری «تاس» لەگەڵ «پێشەوا قازی» کە رێکەوتی ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ بەرامبەر بە (٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٥ی هەتاوی) لە تەورێز دەگەڵی پێک هاتووە، بڵاو کراوەتەوە کە لەودا دوای ئەوەی بە کورتی باسی مێژووی خەباتی کوردستان و زوڵم و زۆری حکوومەتە یەک لە دوای یەکەکانی ئێران دەکا، لە لاپەڕە ١٧٢دا دەڵێ: «کاربەدەستان و مووچەخۆرانی ئێرانی لە کوردستان هەڵاتن و ئێمە بێ دەسەڵات ماینەوە و کەڵکمان لەو هەلومەرجە لەبارە وەرگرت بۆ یەکگرتنی هێز و خێڵەکانی کورد. لەم ماوەیەدا ئێمە پارتی ژیانی کورد (ژیانەوەی کوردستان)مان پێک هێنا کە رێکخراوێکی نهێنی بوو و بۆچوونێکی ناسیۆنالیستانەی هەبوو و مەبەستی پێکهێنانی دەوڵەتێکی گەورەی کوردستان بوو. دەسەڵاتدارانی ئێران بێگومان هەوڵی چاندنی دوژمنایەتی نێوان خێڵەکانی کوردیان دەدا. بەڵام بە کۆتایی هاتنی شەڕ، هەموو هەوڵەکان بە رێگەی دێموکراتیدا رۆیشتنە پێش. <پارتی ژیانەوەی کوردستان لە لایەن ئێمەوە هەڵوەشێندرایەوە و «حیزبی دێموکراتی کوردستان»مان رێک خست.> بە دروستبوونی حیزبی دێموکراتی کوردستان، ئێمە بە یەکجاری کۆتاییمان بە دوژمنایەتی نێوان خێڵەکان و بە داخوازیی رێبەرایەتیی خێڵەکانمان بۆ دەسەڵات وەرگرتن هێنا.» لە پەراوێزی ئەو بەشەدا دوکتور «هەورامی» نووسیویەتی: «قازی محەممەد بە هەواڵدەری تاسی گوتووە: ئێمە پارتی «ژ.ک»مان هەڵوەشاندەوە. گەرچی قازی

هەڵوەشاندنەوە و گۆڕینی ناوی «ژ.ک»ی بەدڵ نەبوو، بەڵام بەسەریدا سەپێندرا.»

بۆچوونی دووەممان بۆ ئەوە کە دەڵێین ئەو بەیاننامەیە لە رووسیە چاپ کراوە بەڵگەیەکە کە پێشتر باسمان کرد، ئەویش لاپەرە ١٧٧ی کتێبی «رۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا»یە کە لەودا هاتووە: «یەکەم بەرهەمی دیارییەکانی رووس بۆ قازی محەممەد کە سەرجەم دەبێ چاپخانەیەک و دوو تەن (٢٠٠٠ کیلۆ) کاغەز بێت، بریتی بووە لە مەرامنامەی حیزبی دێموکراتی کوردستان. بەڵگەنامەکە ـ کە هاوتەرتیب لە دوو ستوونی فارسی و کوردیدا چاپ کراوە...».

با بگەڕێینەوە سەر باسی پێشوومان و بزانین سەرچاوەکان سەبارەت بە گۆڕین و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک) چییان تێدا بڵاو کراوەتەوە.

ئەگەرچی جاروبار لە هێندێک سەرچاوەدا، چاومان بە بۆچوونی زۆر سەیر و سەمەرە و قسەی بێبەڵگە سەبارەت بە گۆڕینی کۆمەڵەی (ژ.ک) دەکەوێ، بەڵام بەراستی کاتێک بەڵگەنامەکانی سۆڤیەت و دواتر ئینگلیسمان چاو پێدەکەوێ، بەو ئاکامە دەگەین کە هیچکەس بە گۆڕینی کۆمەڵەی (ژ.ک) و هەڵوەشاندنەوەی رازی نەبووە مەگەر ئەوانەی بەرژەوەندییان لە بە هێز نەبوونی (ژ.ک)دا بووبێ.

بۆ ئەوەی قسەکانمان بەڵگەدار بێ و وابکەین خوێنەران و لێکۆڵەرانی کورد و غەیرە کورد متمانەمان پێبکەن، دیسان ئاوڕێک لە کتێبی «رۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا» دەدەینەوە. ئەو کتێبە بەپێی بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤی یەکێتی سۆڤیەت ئامادە کراوە و کاک دوکتور «ئەفراسیاو هەورامی» کۆیکردوونەوە و لە زمانی رووسی وەریگراونەتەوە سەر زمانی کوردی. ئێمەش پێدادێین و لە هەرکوێ باسێکی پێوەندیدار بە بابەتی خۆمانمان وەبەر چاو هات کەلکی لێ وەردەگرین و دەینووسینەوە.

لە لاپەرە ١٠٣، دوکتور «هەورامی» دەڵێ: «هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوە نییە کە کۆمەڵە ناوی خۆی یا گۆڕیبێ یان هەڵوەشاندنەوەی خۆی راگەیاندبێ...»

لە لاپەرە ١٠٦، دیسان دەڵێ: «سۆڤێتیەکان لە کوردستان بەڵێنی هیچ هاوکارییەکیان بە ژێکاف نەدا، بەڵام بۆ وەرگرتنی دەنگوباس کەلکیان لە

چاوپێکەوتنی نوێنەرانی ژێکاف وەرگرت؛ ئامادە نەبوون ئەم پارتییە بە ڕەسمی بناسن و وتووێژی لەگەڵدا بکەن. ئەوان هەوڵیان دەدا لە ئیش و کاری نهێنی و سەرکردایەتیی ژێکاف ئاگادار ببنەوە. سۆڤیێتیەکان کە دوو جار هێندێ کوردیان بۆ باکۆ بانگ کرد، نوێنەرانی پارتی ژێکافیان (وەک نوێنەری سیاسی) لەگەڵدا نەبوو.»

لە لاپەڕە ١٣١ و ١٣٢ بۆ بەشی مەبەست و ئەرکەکانی کۆمەڵەی ژێکاف کە لە ڕاپۆرتی کونسوولی سۆڤیەت لە ماکۆدا باسی لێکراوە هاتووە: «مەبەستی کۆمەڵە [ی ژ.ک] گەیشتن بە سەربەخۆیی کوردە، کە کوردەکانی ئێران و عێراق و تورکیا و سووریاش بگرێتەوە. ئەرکەکانی کۆمەڵە: ١ـ کۆتایی هێنان بە ڕاووڕووت و دژایەتی ناوخۆ ٢ـ یەکخستنی تەواوی کوردەکانی ئێران و عێراق و تورکیا. ٣ـ کێشەی سەربەخۆیی دەوڵەتی کوردی بخرێتە بەردەستی هاوپەیمانەکان (سۆڤیەت و ئینگلیز و ئەمریکا).»

لاپەڕە ١٣٥ لە بەشێکی «ڕاپۆرتی کۆنسولی سۆڤیەت لە ڕەزائیە ١٩٤٥» کە «هاشمۆڤ» و «عەلی ئەکبەرۆڤ» نووسیویانە هاتووە: «بە وتەی هێندێ لە کوردەکان، پارتی ژێکاف کە لە کوردستانی ئێران پێک هاتووە لە سەر بنچینەیەکی پتەو و بێ ئەوەی سیاسەتی هیچ دەوڵەتێکی بێگانە جێبەجێ بکات، دامەزرێندراوە... پارتی ژێکاف ئاڵای نەتەوایەتی بۆ کوردستان دروست کرد کە بریتییە لە سێ ڕەنگ و ڕەنگەکانیشی پێچەوانەی ئاڵای دەوڵەتی ئێران دەنوێنێ. ڕەنگی سوور لە سەرەوە، پاشان سپی و لە خوارەوە سەوزە لە ناوەندەکەشی هەتاو کێشراوە»

لە لاپەڕە ١٣٧ و لە درێژەی ئەو ڕاپۆرتەدا هاتووە: «بەپێی بڕیاری مۆسکۆ، ئێمە لە مانگی ئابەوە [گەلاوێژی ١٣٢٤ی هەتاوی] پەیوەندیمان لەگەڵ پارتی ژێکاف گۆڕیوە. لە چاوپێکەوتنەکاندا لەگەڵ ناسراوەکانی کورددا، بە شێوەیەکی قایمکارانە تێمانگەیاندوون کە ئێمە پێمان وایە بیر و باوەڕی «سەربەخۆیی بۆ کوردستان» کاتی خۆی نییە و واقعبینانە نییە، لەبەر ئەوەی ئەم بیر و باوەڕە زیاتر لە لایەن دوژمنانی کوردەوە پشتگیری لێدەکرێ؛ هەر ئەوانیش کەمتر لە هەموو لایەک بیر لە ئازادی و سەربەخۆیی گەلی کورد دەکەنەوە. ئێمە بە مەبەستی باشتر کردنی ژیانی گەلی کورد پێشنیار بە

کورد لە چوارچێوەی یاسای ئێراندا لە سەر بنچینەیەکی دێموکراتیانەی وڵات. کوردەکانیش زۆر جار لە لایەن سەرکردەکانی پارتی ژێکافەوە درۆیان لەگەڵدا کراوە و کۆمەڵە بەرەبەرە لە پێش چاوی خەڵک دەکەوێ [؟؟!!]. پارتی ژێکاف بە بڕیاردانێکی تایبەتی هەڵوەشایەوە [؟] و ئەندامەکانی سەر لەنوێ چوونە ناو ریزی پارتی تازە دروستکراو، واتە حیزبی دێموکراتی کوردستانەوە.»

لە لاپەڕە ١٣٩ و لە بەشێک لە ڕاپۆرتی ١٢ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥دا هاتووە: «کۆمیتەی کوردی ژێکاف لە ١٩٤٢دا بە دەستپێشخەریی هێندێ کوردی دێموکرات لە عێراق بۆ یەکخستنی بەربلاویی هەموو هێزە دێموکراتییەکانی بەشەکانی کوردستان پێک هاتووە. پارتی ژێکاف میراتگری پارتی (خۆیبوون)ە و نەریتی دەرەبەگی و داشناکەکانی پێوەیە[؟!].»

لە درێژەی ئەو ڕاپۆرتەدا لە لاپەڕە ١٤٠ و ١٤٩دا هاتووە: «کۆمەڵەی ژێکاف داخوازیی سیاسی و ئابووری و مافی کوردەکانی هەموو پارچەکانی کوردستانی لە بەرنامەی خۆیدا چەسپاندووە... (لاپەڕە ١٤١) «وێنەیەک کە لێرەدا پێویستە باس بکرێ کۆبوونەوەی ڕۆژانی ١٩٤٥/٤/١٩ و ١٩٤٥/٤/٢٢ی دەوروبەری مەهابادە کە بە بەشداری هێندێ فیئۆداڵ و سەرۆک هۆزی کورد پێک هاتووە. پرسیاری هەرە گرنگ کە لەم کۆبوونەوەیەدا لێکۆڵینەوەی لە سەر کراوە، چۆنیەتیی هەنگاونان لە خەباتی دژی پارتی ژێکافدا و پێشگیری لە پەرەگرتنی ئەو پارتە بووە.»

لە لاپەڕە ١٤٣ و ١٤٤دا هاتووە: «چالاکیی ژێکاف لە عێراق بە سەرکردایەتیی مەلا مستەفایە. بەپێی هەواڵی گەیشتوو لەوێش پەرەی سەندووە. سەرەتای ١٩٤٥ کۆمیتەی ژێکاف لە ناوچە کوردنشینەکانی باشوور ـ ڕۆژهەڵاتی تورکیای هاوسنووری ئێران و عێراق دەستی بە ڕێکخستنی شانەکانی خۆی کردووە. <زۆربەی ئەندامانی ژێکاف لە عێراق و تورکیا، هەروەک کوردستانی ئێران، ڕۆشنبیرانی پێشکەوتنخواز و بازرگانی بچووک، پیشەساز و کوردی ئاسایی و ئاژەڵدار و جووتیارن. هەروەها هێندێ لە هەرە پێشکەوتنخوازە فیئۆداڵەکانی کورد دێنە ریزی ژێکافەوە.>»

لە لاپەڕە ١٤٩دا ڕاوێژکاری باڵوێزی یەکێتی سۆڤیەت لە ئێران «ئا. یاکۆبۆڤ» لە نامەکەیدا بۆ سەرکۆنسوڵی یەکێتی سۆڤیەت لە ورمێ لە یەکێک لە ڕاسپاردەکانیدا دەڵێ: «لە نزیکەوە سەرنجی زیاتر بدرێتە ڕێکخراوی

کۆمەڵە[ی] «ژێکاف» و زانیاریی زیاتر لە سەر ئەندامانی سەرکردایەتی و بەگشتی ئەندامانی تری کۆمەڵە کۆ بکرێنەوە.»

لە لاپەڕە ١٥٧ تا ١٦٨یش یادداشتی ١ی ئایاری ١٩٤٥ی «هاشمۆڤ» (سەرکونسوڵی یەکێتی سۆڤیەت لە ورمێ) هاتووە کە بە کورتی بەم چەشنەیە (لاپەڕە ١٥٩ و ١٦٠): «قازی محەممەد لە پێش چاوی هەموان گوتی: کوردەکان بەتایبەتی ژ.ک دەیانەوێ نوێنەرێکی بەدەسەڵات و رۆشنبیری دەوڵەتی سۆڤیەتیان لە لا بێ تا دەوڵەتی سۆڤیەت لە رووداوەکانی کوردستان و پارتی (ژ.ک) ئاگادار بکاتەوە و بتوانێ رێنوێنی (ژ.ک) کە رێکخراوێکی تازە کوورەیە و لەوانەیە تووشی هەڵەی زۆر بێ، بکات. قازی محەممەد رایگەیاند ئاشنای بنیاتی پێکهاتەی یەکێتیی سۆڤیەتە؛ سەرەڕای ئەوەی کە خاوەن موڵکێکی گەورەیە، دەیەوێ دەسەڵاتێکی وەک کۆمەڵگەی سۆڤیەت لە کوردستانیش هەبێ گەرچی ئەو کاتە دەبێ لە موڵکەکەی خۆی جیا بێتەوە»

لە لاپەڕە ١٦٢ «هاشمۆڤ» سەرەڕای ئەو هەمووە تەبلیغات و درۆ و دەلەسەی بۆ خراپ نیشان دان و کەمهێز بوونی کۆمەڵەی (ژ.ک) لە لای بەرپرسانی پایەبەرزی سۆڤیەت کردویانە لە پاش سەردانی بۆ ناوچەی مەهاباد و دەوروبەری دەڵێ: «من بە چاوی خۆم بوونی پارتی ژێکافم هەست پێ کردووە. زۆربەی خەڵک ناوی پارتی (ژ.ک) بە (کۆمەڵە) دەبەن. زۆربەی دانیشتوانی کورد و پیاوە بەناوبانگەکانیان لایەنگریی سۆڤیەت دەکەن و بە هیوان لە خەباتیاندا بۆ سەربەخۆیی یارمەتی لە سۆڤیەت وەربگرن. کۆمیتەی کوردی (ژ.ک) خەڵک دڵنیا دەکاتەوە کە لە ئیش و کاری خۆیدا پەیوەندیی بە دەوڵەتی سۆڤیەتەوە هەیە. بەڵام هیچ پەیوەندییەک لە نێوان ئێمە و (ژ.ک)دا نییە. پێویستە بگوترێ کەسە بەناوبانگەکانی کورد لە هەموو لایەکەوە هەوڵ دەدەن پەیوەندیمان پێوە بکەن. بەڵام کەس ناوی تەواوی سەرکردایەتیی کۆمیتەی (ژ.ک) نادات و کەس باسی پەیوەندیەکانی ئەو پارتە بە پارتەکانی تری ئێران و سووریا و تورکیاوە ناکات. ئەمە پاڵمان پێوە دەنێ لەگەڵیاندا زۆر وریا بین.»

لە لاپەڕە ١٦٦ دیسان هەر لە درێژەی یادداشتەکانی «هاشمۆڤ»دا هاتووە: «کوردەکان وا تێدەگەن بە هۆی ئەو سەربەخۆیەوە، پێش هەموو شتێک لە چەوسانەوەی دەوڵەتانی ئێران و تورکیا و عێراق رزگاریان دەبێ. بەڵام ئەوانە

وا راستەقینە نییە کە شیاوی رێبەرایەتیی هەموو کوردستان بێ. کوردەکان پێیان وایە یەکێتیی سۆڤیەت یارمەتییان دەدات بۆ وەرگرتنی خودموختاری. ئەم هیوایە دەبێتە هۆی ئەوەی کە حیسابمان لە سەر بکەن و بە ئاشکرا بوارمان دەداتێ دەوری خۆمان لە ناو کورداندا پەرە پێبدەین. بەلام دەبێ بزانرێ ئینگلیزەکان سالانێکە چالاکیی گەورە لە ناو کورداندا دەنوێنن و توانیویانە پەیوەندی لەگەل هێندێ لە سەرکردەکانی کورددا ببەستن و دەوری خۆیان لە کوردستاندا پەرە پێبدەن، چۆنیەتی ئەم دەورەیان لە ناوچەکانی کوردستاندا وەک یەک نییە. لە ناوەندی کوردستان (مەهاباد، جەلدیان و شنۆ) دەوری ئینگلیزەکان دەوری ئێمەی لە کار خستووە، بەلام لەم دواییانەدا گوێیان لە دەنگی ئێمەش دەبێ [؟؟!!].»

لە لاپەڕە ١٩٥دا دەقی وتووویژی «حاجی بابە شێخ»ی لەگەل ڕۆژنامەی «ئیتلاعات»ی ڕێکەوتی ٨ی مارسی ١٩٤٧ نووسراوەتەوە کە لە بەشێکدا دەلێ: «سەرۆکی پێشووی دەولەتی خودموختاری کوردستان «حاجی بابە شێخ» بە ڕۆژنامەنووسی ئەم ڕۆژنامەیەی ڕاگەیاند: گوایە کاتێک پیشەوەری و قازی محەممەد لە باکۆ بوون، پیشەوەری و کاربەدەستانی دەرەوە پێیان لە سەر ئەوە دادەگرت کە کوردستان ببێتە بەشێکی ئازەربایجان و سەربەوی بێ. بەلام قازی محەممەد زۆر بەتوندی دژی ئەو هەلوێستە ڕاوەستا و بڕیاری لە سەر نەدا و ڕایگەیاند ئەگەر بڕیارە کوردستان سەر بە تەورێز بێ، باشتر وایە سەر بە دەولەتی ناوەندی تاران بێ. حاجی بابە شێخ گوایە ڕایگەیاندووە ڕێبەرانی کورد لە باکۆ لە ژێر گوشارێکی ئەوتۆدا بوون و قازی محەممەد تەنانەت ئامادە بوو خۆی ژارخواردوو بکات. ئەو هەروەها ڕایگەیاند: بێگانەکان سەرەنجام بەلێنییان دا قازی محەممەد ببێتە سەرۆکی کۆماری کوردی، تەنیا لەبەر ئەوە کە لە بەرژەوەندییاندا بوو قازی دژی پیشەوەری بەکار بێنن و ئەم هەلوێستە جێ پێی ئەوانی قایم دەکرد...»

لە لاپەڕە ٢٠٧دا نووسراوێکی ڕێکەوتی ١٧ی ٧ی ١٩٤٦ی «باقرۆڤ» هاتووە کە لەودا «باقرۆڤ» بە نوێنەرانی سۆڤیەت لە تەورێزی ڕاسپاردووە کە: «با قازی محەممەد کە خۆی بە مامەلە و بازرگانییەوە خەریک کردووە چیتر لە تەورێز نەمێنێتەوە، بەلکوو نوێنەرێکی خۆی دیاری بکات و تێبگەیەنرێ کە ئیتر لە

بارەگاكەی خۆی [واتە مەهاباد] دوور نەكەوێتەوە و ئەرك و مافەكانی خۆی نەداتە هیچ كەس. با تەواوی ئەوانەی بە بیانووی جۆراوجۆرەوە لە ناوەند [مەهاباد] كەم و زۆر گومانیان لە سەرە دوور بخاتەوە.»

بە بڕوای من «باقرۆڤ» مەبەستی هەرە سەرەكی و گرینگی لەو نامەیە ئەوەیە كە قازی محەممەد لە تەورێز سەر لە كاروباری ئازەرییەكان و سیاسەتی (بانێك و دوو هەوای) رووسەكان دەرنەهێنێ. هەرچی ماوەی مانەوەی بەرپرسێكی كورد لە تەورێز زۆرتر بووبا، رادەی داخوازی و ویستەكانی كوردیش زیاد دەبوو. رەنگە مەبەستیشی لەوانەی بە قسەی ئەو گومانیان لە سەرە و دەبێ دوور بخرێنەوە، ئەندامانی تێكۆشەری كۆمەڵەی ژ.ك بووبێ كە ئامادە نەبوون خۆیان بدەنە دەست رووسەكان و دروشم و ئامانجەكانیان بگۆڕن.

بەڵگەكان هەموو ئەو قسەیەمان دەسەلمێنن كە رووسەكان چۆن و چەندە (لە هەموو بوارێكەوە) بە ئازەرییەكان راگەیشتوون و چەندەش كورد و مافەكانی كوردیان وەپشت گوێی خۆیان داوە. بەڵام سەرەڕای ئەوانەش دیسان هەر لە كورد ترساون و نوسخەی فریودانیان بۆ پێچاونەوە. ئەوەتا باقرۆڤ لە لاپەرە ٢٠٨ و ٢٠٩ و لە نامەی رێكەوتی ١٩٤٦/٩/١١یدا كە بۆ (پیشەوەری و شەبستەری و جاوید و پادگان)ی نووسیوە لە بەشێكیدا دەڵێ: «قازی محەممەد ئەم دواییە چەند كێشەیەكی گرنگیشی خستوەتە بەر دەمی ئێوە، پەیوەندییان بەو بارودۆخەوە هەیە كە لە كوردستانی ئازەربایجاندا هاتۆتە ئاراوە... من دەزانم ئازەربایجانەكان و بەتایبەت كوردەكان لە ناو كێشەیەكی سەختی ئابووریدا دەژین بەڵام دەبێ رێگەیەكی دۆستانە بە سەریاندا زاڵ بن و هاوكاریی دوولایەنە لەم بارەیەوە پێویستە. دەبێ هەموو هەوڵێك بدرێ تا كوردەكان لە ئازەربایجانیەكان دانەبڕێن دەنا بەپێچەوانەوە لەوانەیە ئەوانە دژی ئازەربایجانیەكان بەكار بهێنرێن. لەگەڵ سڵاوی برایانەمدا ـ براتان باقرۆڤ.»

هەموو بەڵگەكانی سەردەمی دەسەڵاتی كۆمەڵەی ژ.ك و كۆماری كوردستان ئەو راستییە دەسەلمێنن كە رووسەكان لە گرتنی شارەكانی وەك ورمێ و خۆی و ماكۆ و سەردەشت و سەقز و بانە و... نەتەنیا یارمەتی كوردەكانیان نەداوە بەڵكوو بوونە لەمپەرێكی قایم لە بەرامبەریاندا. بەڵام سەیرە لە گرتنی

پادگانەکانی ئەورێز و گرتنی شارەکانی ورمێ و خۆی و ماکۆ بە هەموو جوورێک یارمەتی ئازەرییەکانیان داوە.

لە لاپەڕە ١١٨ی کتێبی «ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان...»دا «باقرۆڤ» لە نامەیەکدا کە بۆ بەرپرسانی هەرە پایە بڵێندی سۆڤیەت و یەک لە وان «ستالین»ی ناردووە دەڵێ: «هاوڕێیانی ئێمە جارێکی تر قازی محەممەدیان ئاگادار کردۆتەوە کە پێویستە بەپێی ئەو دەستوورانە بجووڵێتەوە کە پێشتر پێی دراوە و دژی سوپای ئێران هیچ هەنگاوێک هەڵنەگرێ. بۆ ئەوەی بیانوو نەدرێتە سوپای ئێران تا هێرش بکاتە سەر کوردەکان»

بەڵام کێیە باوەڕ بە دڵسۆزی «باقرۆڤ» و ڕووسەکان بەرامبەر بە کورد بکا کە وا حەکیمانە بجووڵێنەوە کە کورد هیچی بەسەر نەیە. ئەو خەمخۆرییەی «باقرۆڤ» و بەرپرسانی سۆڤیەت لەبەر خۆشەویستی کورد نەبووە بەڵکوو دەیانزانی ئەگەر کورد بۆ نموونە بیانەوێ شارەکانی سەقز و بانە و سەردەشت و... بگرن ڕەنگە لە لایەن دەوڵەتی ناوەندی ئێران زەربەی کاریگەر بخۆن و تێک بشکێن. جا ئەو کات مەسەلەکە بە بارێکی دیکەدا وەردەگەڕا و دوو بۆچوون دەهاتە ئاراوە: ١ـ بە شکستی ئیحتیمالی کوردەکان لە بەرەکانی شەڕدا پشتی ئازەربایجان چۆل دەبوو و ئەوجار نۆرەی تێکشکاندنی دەوڵەتی پیشەوەری دەهات. ٢ـ ئەگەر هات و کوردەکان ئەو ناوچانەی مەبەستیانە گرتیان، ئەوکات ڕەنگە ئەوەندە بەهێز بن کە سەرەتا لە بەرامبەر ئازەربایجاندا ڕاوەستن و دواتریش وەڵامی بەرپرسانی ڕووسی نەدەنەوە. بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیس و چەند کتێبێکی مێژوویی کوردی ئەوەمان نیشان دەدەن کە ئینگلیسییەکانیش لە گیرانی شاری سەردەشت (وەک نموونە) زۆر ترساون و پیاوەکانی خۆیان ناردۆتە ئەو شارە تا خەریکی ئاژاوە نانەوە بن و بە هیچ چەشنێک نەهێڵن ئەم شارە وەدەست کوردەکان بکەوێ.

ترسەکەشیان لەوە بوو کە ئەگەر بێتوو ئەو شارە وەدەست کوردەکان بکەوێ ئەوە ئەوکات کۆماری کوردستان دەبووە دراوسێی ئەوان و بە بۆچوونی ئەوان کوردەکانی ئەودیویان لێ هان دەدرا بۆ وەدەست هێنانی مافەکانیان وەخۆ بکەون.

بۆ ئەوەی کە قسەکانمان بەڵگەدار بکەین ئاوڕێکی سەرپێیی لە چەند سەرچاوە دەدەینەوە با بزانین سەبارەت بەو بابەتە چییان نووسیوە و چ دەڵێن: کتێبی «ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا» یەکێک لەو سەرچاوانەیە کە زۆر بە وردی باسی شارەکانی دەرەوەی کۆماری کوردستانی کردووە کە کوردەکان ویستوویانە بیانگرن.

لە لاپەڕە ٢٢٠ و ٢٢١ و لە بەڵگەنامەی ژمارە Fo371/ 52702 نێرراو لە ٣ی ئاپریلی ١٩٤٦دا لە بەشی «لە کرماشانەوە بۆ تاران» سەبارەت بە «سەردەشت» هاتووە: ئەمڕۆ بەیانی سەرتیپ هومایوونی لە سنەوە بە ڕێگەی هەواییدا هاتە کرماشان و دوای وتوووێژێکی دووروودرێژ لەگەڵ من، پاشنیوەڕۆ گەڕایەوە بۆ سنە. ناوبراو گوتی لە ڕۆژی ٢ی مارچ بەدواوە سەردەشت لە لایەن کوردانەوە ئابلووقە دراوە و تا ئێستاش درێژەی هەیە... (ل٢٢١) ئەگەر سەردەشت بکەوێتە دەستی کورد، مەترسییەکی گەورە هەیە بۆ ئەوەی کوردستانی عێراق تووشی تەنگ و چەڵەمە بێن [لەبەر ئەوەی] کۆماری کورد پێوەندێکی نزیکی لەگەڵیان هەیە. بە بۆچوونی ئەو، لە بەرژەوەندی حکوومەتی عێراقدایە کە سەربازخانەیەکی بەهێز لە قەڵادزێ، ڕووبەڕووی سەردەشت و هەروەها لە شلێر، ڕووبەڕووی بانە دابنێت و فەرماندەی هەر دوو شوێنەکە فەرمانیان پێ بدرێت کە لە پێوەندێکی نزیک و زانیاری گۆڕینەوەدا بن لەگەڵ دەسەڵاتداریەتی سوپای ئێران لە سەردەشت و بانە. بە گوێرەی ناوبراو حکوومەتی عێراق گەلێک باش دەبێت ئەگەر داوا لە حەمەرەشید بکات بگەڕێتەوە بۆ عێراق و لە دارۆخان نیشتەجێ بێت و بەڵێنی ئاسایشی پێ بدرێت. هەروەها ئەگەر گونجاو بێت، پێشنیارێکی ئەوتۆ بە مەلا مستەفا بارزانیش بکرێت کە ئەگەر بێت و حوکمی ئیعدامەکەی ئێستای هەڵبوەشێتەوە، وا هەیە بکەوێتە بیری گەڕانەوە [بۆ عێراق] هەر دوو ئەو کەسانە، گەرچی وەک لە دەرەوە دەڕوانی، لایەنگریی قازی محەممەدی مەهابادی دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیەکی بێگەڕانەوە خۆیان نەخستۆتە دوژمنایەتی هەمیشەیی لەگەڵ حکوومەتی ئێرانەوە.»

لە لاپەڕە ٢٢٧ تا ٢٢٩ و لە ڕاپۆرتی ژمارە Fo371/52702ی ڕێکەوتی ١٦ی ئاپریلی ١٩٤٦ دیسان باسی سەردەشت و بانە هاتۆتە گۆڕێ و دەڵێ: «من لە ڕۆژی

بە هۆی بارودۆخی رێگاوە نەمدەتوانی بچمە ئەوێ [؟]... وتووێژێکی دوورودرێژم لەگەڵ جەنراڵ جەهانبانی کرد کە لە سنە بوو. ناوبراو گوتی ئابلووقەی سەربازخانەی سەردەشت لە راستیدا هەڵنەگیراوە... (ل٢٢٨) جەنراڵ جەهانبانی زۆر جەختی لە سەر ئەوە دەکرد کە حکوومەتی عێراق دەبێ: ئـ ) هاوکاریی [ئێران] بکات بەوەی زۆر بهێنێت بۆ حەمەڕەشید [خان] بۆگەڕانەوەی عێراق و هەڕەشەی لێ بکات کە ئەگەر بەرپەرچی حوکمەکە بداتەوە، مۆڵگەکانی لە عێراق لێ داگیر دەکرێت. ب) بنکەی سوپایی عێراق لە قەڵادزێ و شلێر دابمەزرێت. بگەڕێنەوە بۆ تێلگەڕافی ژمارە ٤٦ی من بۆ تاران. ئەگەر ئەم کارە نەکەن، سەردەشت و وا هەیە سنە و بانەش بدرێن بەدەستەوە کە ئەنجامێکی جێگەی داخ و بەرفراوانی بۆ کوردی عێراق دەبێت[؟!!] (ل٢٢٩) گەڕانەوەی دەستبەجێی مەلامستەفای بارزانی بە گروپە کەموزۆر ئاشکرا رووسەکانەوە، تەنیا یەکەمین ئەنجام دەبێت. من بە جەهانبانیم گوت کە ئەو بۆچوونە بە تاران و بەغدا رادەگەیێنم. ٦) تکایە ئەوەی سەرەوە بە [باڵوێزخانەی] بەغدا رابگەیێنن.»

کاک «عەبدوڵڵا ئەحمەد رەسووڵ پشدەری»ش لە لاپەڕە ٤٠ی بەشی یەکەمی کتێبی «یادداشتەکانم»دا سەبارەت بەو بابەتە دەڵێ: «خەڵکی ناوچەی سەردەشت و هەموو عەشایرەکان پشتیوانی‌یان ئەکرد لە کۆماری [کوردستان لە] مەهاباد و زۆربەی زۆری خەڵک چەکیان هەڵگرتبوو لە دژی رژیمی تاران وتەنیا دوو کەس هەبوو کە بە ئاشکرا دژی کۆمار بوون و لە سوودی رژیم چەکیان وەرگرتبوو خۆیان خستبووە ناو سوپای ئێرانەوە یەکیان «حەسەنئاغای بێزیلە» و دووەمیان «مامەندی حاجی هەباس ئاغا» برازای بابەکرئاغا. ناوبراو مامەندئاغا خۆی لە ناوچەی «ئالان»[ی] خاکی ئێران دائەنیشت و بابەکرئاغاش لە پشدەرەوە هێندێ چەکداری بۆ ناردبوو تاکوو بتوانن پشتیوانی لە هێزەکانی سوپای ئێران بکەن و مەسئەلەش ئەوە بوو کە وا بابەکرئاغا بە فەرمانی ئینگلیزەکان بەو کارە هەستابوو. چونکە ئینگلیز و ئەمریکا بە یێکەوە ئەو ناوچەیان بەشێک ئەزانی لە باشووری ئێران و ئەکەوتە بەر دابەشکردنی خۆیان، ئەو دابەشکردنی کە لەگەڵ رووسیا کردبوویان لە کاتی داگیرکردنی ئێراندا... مەحموودی حاجی ئاغای هێرۆ بە پێچەوانەی هەڵوێستی بابەکرئاغا بوو. مەحموودئاغا هەموو جۆرە هاوکارێکی لەگەڵ کۆماری [کوردستان لە]

مەهابادا ئەکرد. ... بابەکرئاغا یەک دوو جار شکایەتی کردبوو لە مەحموودئاغا لای ئینگلیزەکان و پێی وتبوون کە مەحموودئاغا بۆتە شیوعی و پەیوەندی لەگەڵ کۆماری مەهابادا هەیە.»

«عەقید بەکر عەبدولکەریم حەوێزی»ش لە لاپەڕە ٨٠ی کتێبی «گەشتێک بە کۆماری مەهابادا» دەڵێ: «سەرهەنگ پزیشکیان نێوێک فەرماندار (قایممقام)ی سەردەشت بوو. ئەم کابرایە گەلێک کەڵەکچی و زمانلووس بوو، تەواو شارەزای عەقڵییەت و بیروبۆچوونی خەڵکی ناوچەکە بوو. بە پڕوپاگانتە و فرتوفێڵ خەڵکە سافیلکەکەی شار و دەوروپشتی وا تێگەیاندبوو کە کۆماری مەهاباد کۆمارێکی کۆمۆنیستانەی خودێ نەناسە و دەسەڵاتی بگاتە هەر جێگەیەک ئەوا بە توورەکەی دەبێژێ و خەڵکەکەشی قڕ دەکات، جگە لەوەی کە دەسەڵاتدارانی مەهاباد لەگەڵ رووسەکان بوونەتە یەکدەست و یەکهێز تا جەماوەری کورد لە ئایینی ئیسلام وەربگێڕن و لەم رووەشەوە، دژ بە هەموو ئایینێکی ئاسمانییە. بۆیە کەسێکی کە هاریکاری و پشتگیری لەو کۆمارە بکات کافر دەبێت...»

«دوکتور قاسملوو»ش لە لاپەڕە ١٠٢ی کتێبی «چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی»دا دەڵێ: «پاش شەڕی مامەشا ئەو هەستە لە نێو هێزی پێشمەرگەدا بەتینتر بوو کە دەبێ هێرشێکی زۆر گەورە بۆ سەر هێزەکانی لەشکری ئێران لە ناوچەی سەقز بکرێ مەبەستیش ئەوە بوو کە هێزی کۆماری کوردستان ئەوەند بچێتە پێش کە شاری سنەش رزگار بکا... بەڵام لێرەدا عاملێکی دیکە دەخالەتی کرد و بوو بە کۆسپی سەر رێگای پێشڕەوی هێزی کۆماری کوردستان بەرەو جنووب. رۆژی ٣٠ی جۆزەردانی ١٣٢٥ (٢٠ی ژوئەنی ١٩٤٦) هاشمۆف قونسوولی سۆڤییەتی لە ورمێ، چوو بۆ لای پێشەوا قازی و لە گوندی سەرا چاوی پێکەوت. داوای هاشمۆف ئەوە بوو کە هێزی کۆماری کوردستان هێرش نەکاتە سەر ئەرتەشی ئێران چونکە رەنگە شەڕێکی گەورە ساز ببێ کە یەکێتی سۆڤییەتی پێی باش نییە و ناشتوانێ هیچ یارمەتێکی نیزامی بە کۆماری کوردستان بکا...»

بەکورتی تەواوی ئەو بەڵگەنامانە ئەوە دەسەلمێنن کە زلهێزەکانی بەڕواڵەت دۆستی کورد و کوردستان جگە لە بەرژەوەندی خۆیان و لە خشتە بردنی ئەو جووڵانەوە رزگاریخوازانەی نایانەوێ نۆکەری ئەوان بکەن، هیچ

یارمەتییەکیان بە کورد نەگەیاندووە و بگرە لە ئامانجەکانیشیان دوور کردوونەوە.

یەکێکی دیکە لەو سەرچاوانەی کەمتاکورتێک باسی چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەی (ژ.ک) و چەند زانیارییەکی دیکەی ئەو سەردەمی کردووە، کتێبی «بیرەوەریەکانی محەممەدی شاپەسەندی»یە. با بزانین کاک «محەممەد» لەو بارەوە چی نووسیوە:

لە لاپەڕە ٤١دا و لە بەشی «پێشەوا قازی محەممەد و سەرکردایەتی کۆمەڵە» بە کەلک وەرگرتن لە کتێبەکەی «ئارچیباڵد رۆزڤێلت» دەڵێ: «کاتێک قازی محەممەد داوای کرد بچێتە ریزی ئەندامانی کۆمەڵە، هەوەڵ جار کۆمەڵە ئەم پێشنیارەی رەت کردەوە، ئەویش لەبەر ترسی پلە و پایە و رێز و ئیحتڕام و نفووزی بەربڵاوی کەسایەتیی خودی قازی و «بنەماڵەی قازیان»بوو تەنانەت سەرکردایەتیی کۆمەڵە بە بنەماڵەی یەکیەکی ئەندامانی و بنەماڵەی «زەبیحی»شەوە لە زووەوە پێی راهاتبوون، ترسیان لەوە بوو سیاسەتی کۆمەڵەش بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی. کاتێک ئەم داواکارییە جێبەجێ بوو، ئەوجار ئەوەی کە سەرکردایەتیی کۆمەڵە لێی دەترسا، هاتە دی: تاکە کەسێک حیزب بەڕێوە دەبا» بەڵام وا نییە ئەم تاکە کەسەی «ئارشی رۆزڤێلت» مەبەستیەتی، پێشەوا نەبوو، ئەم تاکە کەسە «جەعفەر باقرۆف»ی دیکتاتۆری ئازەربایجانی شووڕەوی بوو کە پێشەوای خستبووە ژێر گوشارەوە...»

لە لاپەڕە ٤٣ و ٤٤ و لە بەشی «کورد و رووس»دا دەڵێ: «ساڵی ١٩٤١ دوای جێگیربوونی سوپای سوور لە کوردستان لەشکری کورد نیازی وابوو هەرێمی ورمێ لە سوپای ئێران پاک بکاتەوە و هەرێمەکەی بە تەواوی بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەڵام ئەفسەرە کاربەدەستەکانی شووڕەوی لە ورمێ بەمە رازی نەبوون، ماوەیان دا بە حکوومەتی ئێران، پادگانەکانی ئەو هەرێمە بەهێز بکات تا لەشکری کورد نەتوانێ ورمێ و دەوروبەری ئازاد بکات! ئەم مەسەلەیە تەنانەت لە سەفەری ١٩٤١ی هەیئەتی کورددا بۆ باکۆ دەنگی دایەوە. باقرۆف سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجان بە توندی داوای کرد: ئەم چەکانە کە لەشکری کورد لە ئەرتەشی شا دەستیان کەوتووە، پێویستە بۆ حکوومەتی ئێران بگێڕدرێنەوە. باقرۆف تەئکیدی کرد پێویستە قانوونەکانی ئێران رێزیان لێ

بگیریٚ؟! سەبارەت بە کورد بەم جۆرە، بەڵام لە لایەکی ترەوە لە ئازەربایجان خۆیدا لەو جێگایانەدا کە حکوومەتی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان دامەزرابوو باروذۆخ بەپێچەوانەی ئەمە بوو. لە قەزوین شووڕەوی ماوەی نەدا ئەرتەشی ئێران پادگانەکانی ئەو ناوە بەهێز بکات، واتا بانێکە و دوو هەوا!»

لە لاپەڕە ٤٤یش‌دا دەڵیٚ: «دوای شەڕی «مامەشا» لە بەرەی «سەقز» هێزی کۆماری بەو نیازە بوو ناوچەکانی «سەقز» و «سەردەشت» و «بانە» پاکسازی بکات. تەنانەت شاری «سنە»ش ئازاد بکات. بەڵام کونسوڵی شووڕەوی لە ورمیٚ «هاشمۆف» بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە شارۆچکەی «سەرا» و رەسمەن ئۆلتیماتۆمی دا بە لەشکری کۆمار و رووبەڕوو پێشەوا قازی محەممەد ومەلا مستەفا و ئەفسەرە فەرماندە کوردەکانی هۆشیار کردەوە و گوتی: «کوردەکان ناتوانن زۆر پشتئەستوور بن بە یارمەتی لەشکری شووڕەوییەوە، چونکە شووڕەوی ناتوانیٚ پێش لەشکری ئێران بگریٚ. ئەگەر لە بەرەکانی تری شەڕدا هێرش بەرنە سەر کوردستان!...» بەڵام رووسان خۆیان ئاگادار بوون و لایەنی کوردیش زۆر باش دەیزانی کە راست ناکەن.»

بۆ پوختەتر کردنی ئەو باسە ئاوڕێک لە کتێبی «کۆماری کوردستان ١٩٤٦»ی «ویلیام ئیگلتۆن جۆنێر» دەدەینەوە. لە لاپەڕە ١٠٢ و ١٠٣ی ئەم کتێبەدا پاش ئەوەی باسی دامەزراندنی کۆمەڵەی پێوەندی فەرهەنگی رووسەکان لە مەهاباد دەکا، دەڵیٚ: «بەرپرسانی رووسی ناوچە، بەپێچەوانەی راسپێردراوەکانی دەوڵەتی خۆیان، لەو کۆبوونەوە خۆیان دوورەپەرێز کرد و بەڕێوە بردنیان بە خودی کوردەکان ئەسپارد. قسەکانی قازی هەروەک رابردوو هێدی، ئاقلانە و زۆر بەڕێوجیٚ دەستی پێکرا. بیری دوارۆژ و هێز و توانایی لە تەواوی قسەکانی‌دا هەست پێدەکرا. باسی سەفەری باکۆی هێنا گۆڕیٚ و سفارش و راسپێردراوەکانی «باقرۆف»ی سەبارەت بە «کۆمەڵەی ژ.ک» وەبیر هێنانەوە و گوتی کە: پێویستە ناوی کۆمەڵە بگۆڕدریٚ و چیدی کارەکانی بە نهێنی نەبن و هەموو کار و خەباتی بەپێی چوارچێوەکانی دیموکراسی بەڕێوە بچن.

لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: برادەرانی رووسی یارمەتی پێویست بە حیزبی تازەدامەزراو دەدەن. لە کۆتایی‌دا گوتی: کەس پرسیاری هەیە؟ شەرح و لێکدانەوەی پێویستە؟ وەڵامیان داوە: نەخێر، بڕیاری پێویست دراوە لەو

دانیشتنەدا سەبارەت بە چۆنێتی حکوومەتی داهاتووی کوردستانی خۆبەڕێوەبەر باسێک نەکرا. هەڵبەت زۆربەی ئامادەبووانی دانیشتنەکە ئاگاداری بەڵێنەکانی «باقرۆف» بوون. هاوکات لەگەڵ گۆڕینی ناوی «کۆمەڵە[ی ژ.ک]» گۆڕانکاری بنەڕەتی لە ناوەڕۆکەکەیدا پێک نەهات و پێکهاتەی کۆمیتەی ناوەندی بەپڕتاو نەگۆڕدرا. قازی محەممەد هەروەک لە کۆمەڵەی ژ.ک ئەندامی کومیتەی ناوەندی بوو، لە حیزبی تازەشدا تەنیا ئەندامێکی ئاسایی بوو واتە قەت نەبووە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی...»

هەتا ئێرە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ئەگەرچی بەرپرسانی سۆڤیەت لە پێناو گۆڕینی ناو پرۆگرامی کۆمەڵەی (ژ.ک) زۆر بەڵێنییان بە بەرپرسانی کورد دابوو، بەڵام دوای گۆڕینی کۆمەڵەی (ژ.ک) و گۆڕینی دروشم و کەمکردنەوەی داخوازییەکانی کوردیش، هەموو هەوڵیان ئەوە بوو کە کورد هەروا ژێرچەپۆک و بێدەسەڵات بمێنێتەوە.

با دیسان بگەڕێینەوە سەر کتێبەکەی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» و بزانین سەبارەت بە خستنە پەراوێزی مامۆستا زەبیحی لە (ژ.ک) و سەرکردایەتی (ژ.ک) و هەروەها لە وەڵامی قسەکانی کاک دوکتور «ئەمیری حەسەن پوور» چی نووسیوە. کاک «محەممەد» لە لاپەرە ١١٧ی کتێبەکەیدا و لە وەڵامی نووسراوەکانی دوکتور «حەسەنپوور» کە لە کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی»دا چاپ کراوە، دەڵێ: «هەڵپەساردنی زەبیحی پێش مەسەلەی بەیعەت، لە لایەن کاربەدەستانی شووڕەوییەوە لە تەورێز رووی دابوو. ئەوە پێشەوا قازی محەممەد بوو کە باوەشی بۆ زەبیحی و تێکۆشەرانی دیکەی وەک ئەو کردەوە و دەرگای خزمەتکردن و تێکۆشانی بۆ خستنە سەر پشت...»

لە درێژەی بۆچوونەکەی «ئارچی باڵد رۆزڤێلت»یشدا لە لاپەرە ١٢٠ و ١٢١دا دەڵێ: «بەداخەوە کاک عەلی [کەریمی] (لە لاپەرە ١٢٤ و ١٢٥دا) لەمەش بەولاوە دەبێتەوە و نامەسئوولانە دەنووسێ: «قازی محەممەد لە پێشدا بە کردەوە دەبێتە سەرۆکی کۆمەڵەی «ژ.ک»، کە ئەوە دژی مەبەستە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵە بوو کە ئاغا و شێخ و مەلا و سەیید بتوانن ببنە سەرۆکی کۆمەڵە! چونکە قازی محەممەد هەم ئاغا بوو، هەم مەلا؛ توانیی بە ماوەیەکی کورت بە کۆکردنەوەی ئیمزا لە خەڵکی سابلاغ کۆمەڵە تێک بدا و حیزبی دێموکرات لە جێگای دروست کا و ئاغاوەت و سەردار عەشیرەتەکان بوونە شۆڕشگێڕ و هاتنە

سەرۆکایەتیی حیزبی تازە و جێگای شۆڕشگێڕانی واقیعی کۆمەڵـەی «ژ.ک»یـان گرتەوە!» ڕاستی ئەم مەسەلەیە بە جۆرێکی دیکەیە. لـە سـەرەتادا بـڕیارەکانی «کۆمەڵەی ژ.ک» سەبارەت بـە مەرجـەکانی ڕابەرایـەتی هـەرچی بووبـێ، بـە نزیکبوونەوەی ڕابەرایەتی کۆمەڵە لە یەکێتیی شووڕەوی و ئاشکراکردنی زۆر لە نهێنییەکانی کۆمەڵە بۆیان (کە نەدەبوایە ئـەو هەڵـە گەورەیـە بکـرێ!!) ئیـدی کۆمەڵە لە باری واقعییەوە لەگرێژنە چووبوو... ئەوەتا دوکتور عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ (ل۲۵۱) لە زمانی زەبیحی خۆیـەوە گوتوویـەتی: «مامۆسـتا زەبیحـی ئەیوت وەختی خۆی کە ویستوویانە یەکێک بکەن بە سەرۆک، وتیان دەبێ یەکی ناودار بێ، وتی ئێمە هیچمان خەڵک نەیئەناسین و هەموو کوڕە فەقیر و گەنج و خەڵکی ناو شار... بووین» پاشتریش هەر «دوکتور عیززەدین (ل۲۵۲) ئەوە تەئکید دەکاتەوە کە «زەبیحی» پاش ئەوەی کۆمـار ڕووخـا و چـووە عێـڕاق، هـەردەم دیفاعی لە پێشەوا قازی محەممەد کردووە و داینەنواندووە.»

لە لاپەڕە ۲۵ی پاشکۆی ژمارە یەکدا دەڵـێ: «زۆر باشـم لـە بـیرە پـاش ڕێککەوتنەکەی قازی ـ پیشەوەری فشاریان خستە سـەر حکوومـەتی کوردسـتان تەنانەت دروشمی حیزب و حکوومەت لە سەر دەرگای ماشێنە حکوومەتییەکانیش بسترنەوە. بەپێچەوانە، ئازەربێجان ڕابردووی بزووتنەوەی سیاسی باشی وەک هـی زەمـانی مەشـرووتییەت و باقرخـان و سـتارخان و شـێخ محەممـەدی خەیابانی... تاد هەبوو، جگە لـەوەش سۆڤـیەت و حیـزبی تـوودە بـە هـەموو توانایانـەوە یارمـەتییان دەدا...»؛ کـاک «محەممـەدی شاپەسـەندی» دوای دەرچوونی کتێبی «چل ساڵ خەبات لـە پێنـاوی ئـازادی» «دوکتـور قـاسملوو» نامەیەکی دوورودرێژی بۆ دەنووسێ و تێبینییـەکانی خـۆی لەگـەڵ سیاسـەتی کوردیی سۆڤێتی ئەوسەردەم بۆ شی دەکاتەوە و دەڵێ کە سیاسـەتی ڕووسـەکان دۆستانە نەبووە و بگرە دژی کوردیش بوون.

لە لاپەڕە ٥٥دا و لە پاشکۆی ژمارە ۲دا لە وەڵامی ئەو پرسیارەی «کاکـشار ئۆرەمار»دا کە: ئێوە چۆن دەستتان بە کار و چالاکی سیاسی کـرد؟ دەڵـێ: «لـەو ساوە من هاتووچۆی تەورێزم دەکرد، وردەوردە بۆ کۆتاڵ کڕین بـۆ بازرگـانی و شتی وا. بابم ئەو ساڵە بەزار بوو، یانی کووتاڵفرۆش بوو.من دەچووم کووتاڵـم بۆی دەکڕێ. لە تەورێز «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی»م دیت. داوای لێ کـردم فێـری

(ئۆرگانی فەرمی کۆمەڵەی ژ.ک) من دەستم کرد بە حرووفچینی ئەوسا بە نهێنی کارمان دەکرد. گۆڤارەکەمان حرووفچینی دەکرد و پاشان دەماندا بە مەتبەعەیەکی ئەرمەنیان و چاپی دەکرد <پاش بەینێک رووسەکان دەگەڵمان باش نەبوون. ئەوان دەیانویست ئێمە بەرنامەی ئەوان ئیمزا بکەین. ئێمە رازی نەدەبووین. قازی رازی نەدەبوو، زەبیحی رازی نەدەبوو، وردەوردە لەگەڵمان تێک چوون و ئیشارەیان دا بە چاپخانەکە کە ئیدی چاپی «نیشتمان» تەئخیر بکەن (وەپاش بێخن). بۆ ئەو مەسەلەیە ئێمە مەتبەعەیەکی بچووکمان پەیدا کرد و بردمانەوە بۆ سابلاخ بۆ ئەوەی لەوە بەولاوە خۆمان «نیشتمان» چاپ بکەین> تا ئەو کاتەی کە من ئەو باسەت بۆ دەکەم ٩ ژمارەی «نیشتمان» دەرچووبوو.»

لە لاپەڕە ٥٩ و لە درێژەی وتاری «گوتوبێژ لەگەڵ نەمر «محەممەدی شاپەسەندی یادگارێکی دیکەی کۆماری کوردستان» کە «کاکشار ئۆرەمار» ئامادەی کردووە، کاک محەممەدی شاپەسەندی لە وەڵامی ئەو پرسیارە کە: «هێندێک کەس دەڵێن ناوگۆڕینی ژ.ک بەپێی داخوازیی رێبەر و پێکهێنەرانی ئەم رێکخراوە نەبوو واتە ئەڵێن قازی محەممەد بە بێ پرسی کەسانی وەک زەبیحی کارەکەی کردووە واتە ناکۆکییەک لە نێوان پێشەوا و ئەودا هەبووە، ئێوە وەکوو شاهیدێکی مێژوویی بۆ ئەم مەسەلەیە جوابتان چییە؟»؛ دەڵێ: «من لە بیرەوەرییەکانمدا ئەمەم نووسیوە: خەڵک مەسەلەکە گەورە دەکەنەوە بەڵام وا نەبووە. راستە زەبیحی و چەند کەسێک موخالیفی ئەوە بوون کە پێشەوا ببێ بە بەرپرسیاری کۆمەڵە، بەڵام ئەوە لەبەر ئەوە نەبوو کە پێشەوا لایقی ئەوە نەبێ، چونکە پێشەوا پێش ئەوەی ئێمە لە دایک ببین بەرپرسی سابلاخ بووە. مامی پێشەوا خۆی هەر لەسەر پاراستنی خەڵکی سابلاخ کوژراوە، یانی رووسەکان کوشتوویانە. ئەوانە هەر بە تایفە نفووزیان هەبووە لە سابلاخ. نفووزی قەزاوەتیان هەبووە، نفووزی کاروباری خەڵک دروستکردن. نا ئەوە راست نییە.» لە وەڵامی ئەو پرسیارەشدا کە: «ئەدی خودی زەبیحی لەم بارەیەوە چی ئەگوت؟» دەڵێ: «تۆ برۆ کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی» بخوێنەوە، تێدەگەی، زەبیحی وەختێ کە کۆماری کوردستان کەوت، رایکرد بۆ ماڵە قازی. دوو سەعات و نیو هەوڵی داوە بەڵکە قازی رازی بکات کە سابلاخ بەجێ بێڵێ، قەبووڵی نەکرد. لە عێراق هەوڵی دراوە بە حوزووری نەمر مەلامستەفای بارزانی

که ناوی قازی نەیێنن، هەژار قەبووڵی کردووە، بەڵام زەبیحی لێرە هەمیشە دیفاعی لێ کردووە...»

لە لاپەڕە ٦٠یشدا لە وەڵامی ئەو پرسیارە کە: «بۆچی رووسەکان ئەیانویست ناکۆکی لە نێوان کوردەکاندا دروست بکەن؟» دەڵێ: «بۆ ئەوەی ئەوان رازی نەبوون، دەیانویست کوردستان ببێ بە پارچەیەکی ئازەربایجانی قەفقاز، قازی محەممەد بەوە رازی نەبوو، کورد ئەوەی قەبووڵ نەدەکرد. لەبەر ئەوە ئەوان دەیانویست تێکی بدەن، بەڵام بۆیان نەکرا، رازیبوونیشیان بۆ ئەوەی کورد ئیعلانی ئیستیقلال بکات، واتە ئیعلانی جەمهووری بکات، هەر لەبەر خاتری ئەوە بوو دیتیان کورد رازی نابن، مەجبوور بوون»

لە کۆتایی ئەو بەشەشدا بە پێویستی دەزانم بەڵگەیەکی زۆر گرینگ سەبارەت بە ئامانجەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) لێرەدا بنووسمەوە.

ئەو بەڵگەیە لە لاپەڕە ٦٢ی کتێبی «حکوومەتی کوردستان ـ کورد لە گەمەی سۆڤێتیدا» نووسراوەی کاک «نەوشیروان مستەفا ئەمین»دایە. کاک «نەوشیروان»یش ئەم بەڵگەی لە ژمارە ١٠ی گۆڤاری رۆژی نوێ» رێکەوتی ١٩٦١/١/١ وەرگرتووە. گرینگی بڵاو کردنەوەی ئەو بەڵگە لەو بەشەی ئەم بەرهەمەماندا ئەوەیە کە کاتێک ئامانجەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک)مان زانی ئەوکات بۆمان دەردەکەوێ کە بۆچی سۆڤییەتێکانی بەرواڵەت دۆستی کورد و دواتریش ئینگلیس و دەوڵەتەکانی دراوسێ بە هەموو چەشنێک هەوڵیان داوە «کۆمەڵەی ژ.ک» نەمێنێ و هەوڵیان داوە هەڵیوەشێننەوە. با بزانین بەڵگەکە چییە؟

کاک «نووشیروان» لە لاپەڕە ٦٢ی کتێبەکەیدا دەڵێ: «بەپێی گێڕانەوەی گۆڤاری «رۆژی نوێ» بەرنامەی کۆمەڵەی ژ.ک ئەبێ بەمجۆرە بووبێ: «لە ساڵی ١٩٤٤دا کە شەڕی جیهانگری بەرەو برانەوە ئەچوو، کومیتەی ناوەندی کۆمەڵەی ژ.ک کۆبوونەوەیەکی کرد بۆ رێوشوێن دانان بۆ دوارۆژی کورد، لەو کۆبوونەوەیەدا سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی راپۆرتێکی بەنرخی پێشکەش کرد، وە لە ئەنجامی لێدوان و لێکۆڵینەوەیەکی ورددا کۆمیتەی ناوەندی ئەم بڕیارە مێژووییانەی دا:

١ـ هەر کە شەڕ کۆتایی هات دەوڵەتی کوردستان ئیعلان دەکرێ.

٢ـ خاکی ئەم دەوڵەتە لە ناوچەی ژووری عێراقەوە دەس پێ ئەکا. بە

شاخەکانی دالانپەڕ لە سەر سنووری تورکیا، وە خوارووی ئەم سنوورە، وە لە ڕۆژئاوای ماکۆوە بە کەناری ڕۆژئاوای گۆمی ورمێدا بەرەو خوار بۆ ناوچەی ئەفشار.

٣ـ ڕژیمی ئەم دەوڵەتە کۆماری ئەبێ.

٤ـ بۆ پاراستنی دەوڵەت «کۆمەڵی ژ.ک» لەشکرێکی بەرگری پێک دێنێت کە پێی ئەوترێ «میلیشیا».

٥ـ پێویستە لە سەر کۆمەڵە کە بەشەکانی تری کوردستان ڕزگار بکا، وە ئەو ناوچانەی کە لە سەر کۆمەڵە بوو هەوڵی ڕزگارکردنی بدا، هەمووی دیاری کرابوو وە بڕیاریان لە سەر درابوو.»

دروستیی ئەو بەڵگەیەمان کاتێک بۆ دەردەکەوێ کە ئاوڕێک لە کتێبی «ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا» بدەینەوە. لە لاپەڕە ١٤٧ی ئەم کتێبەدا دەقی ڕاپۆرتێکی «کاپیتان ڤیلچیفسکی» هاتووە. ناوبراو کە لە سەردەمی شەڕی دووەمی جیهانیدا لە ناوچەی موکریان بووە، لەسەر کۆمەڵەی (ژ.ک) بەو چەشنە دواوە و نووسیویەتی: «... ئەم پارتە لە ساڵی ١٩٤٤دا نزیکەی بیست بەیاننامەی دەرکردووە کە ناوەرۆکەکانیان دژی ئینگلیز بووە و بوونە هۆی پەرۆشیی ئینگلیزەکان. بەڵام ئینگلیزەکان توانییان بەشێکی زۆری باڵی ڕاستی ئەم پارتە بەرەو لای خۆیان ڕابکێشن. <لەبەر ڕووننەبوونی پرۆگرامی پارتی ژێکاف و تاکتیکی بۆ دوای شەڕ>، کێشەیەکی زۆر لە ناو کۆمەڵەدا لە سەر ئینگلیز پەیدا بوو...»

ڕەنگە هەر لەبەر ئەو چەشنە قسانەش بووبێ کە کۆمەڵەی (ژ.ک)، بەرنامەی خۆی زۆر وردتر لە جاران و بە ئاشکرا ڕاگەیاندبێ، هەتا بەو چەشنە بە هەمووان بسەلمێنێ کە ئەم کۆمەڵەیە بۆ ئێستا و تەنانەت داهاتووشی بەرنامەی هەیە و بەپێی ئەو بەرنامەیەش خەبات دەکا و دەچێتە پێش.

# گۆڤاری نیشتمان

لەم دواییانەدا کتێبی «بیرەوەریەکانی محەممەدی شاپەسندی»م وەدەست کەوت. کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لەو کتێبەدا سەبارەت بە گۆڤاری «نیشتمان» و شێوەی ئامادە کردن و پیتچنین و چاپ کردنی، زانیاری زۆر وردی باس کردووە کە بەپێی گرینگی و پێوەندیان بە بەرهەمەکەی ئێمەوە دەیاننووسینەوە.

لە لاپەڕە ٣٤ی بەشی بیرەوەریەکاندا دەڵێ: «ئەو کاتە من زۆر هاتوچۆی «تەورێز»م دەکرد. ڕۆژێک یە «میهمانخانەی خورشید»ی تەورێز یەکترمان گرتەوە، [مامۆستا زەبیحی] داوای لێکردم فێری حرووفچینی بم تا لە چاپی گۆڤاری «نیشتمان»دا یارمەتی بدەم. ئەو ماوەیە ئەگەرچی شاری «تەورێز» لەشکرێکی زۆری رووسی تێدا بوو، بەڵام تەشکیلاتی ئەمنی وئیداری رەژیم لە ئازەربایجان، بەتایبەت لە تەورێز، تا ماوەیەک هەر مابوو، سەبارەت بە ئێمە کەمێک جێی مەترسی بوو... زەبیحی تاژمارە ٥ی «نیشتمان» نە جێیەکی ئامادەکراوی هەبوو بۆ ئەم کارە، نە کەرەستەی چاپ، تا بتوانێ ئەم کارە جێبەجێ بکات. دوای ئەمە بوو کە زەبیحی بە ناچاری جانتایەکی تەختەی بە دروستکردن دا؛ ئەم جانتایە ناوەکەی خانەخانە بوو، کە دەکرایەوە دەبوو بە

بلاومان کردەوە. من بۆ ئەووەڵ جار لە سەر ئـەم دەزگایـە فێـری حـرووفچینی بووم.

هەروەها لە نزیک «ریستۆرانی خورشید» خانووێکمان بەکرێ گـرت. ئـەم خانووە لە جێیەکی وەها هەلکەوتبوو جێی مەترسی نەبوو. لەبەر کەمی پیتەکان هەر جارە تەنیا دوو لاپەڕە حـرووفچینی دەکـرا، پـاش لـە چاپـدانی ئـەم دوو لاپەڕەیە، هەڵمامدەوەشاندەوە و دیسان دوو لاپەڕەی ترمان دەست پێدەکردەوە، بەم شێوەیە چاپی ژمارە ٥ی «نیشتمان» کۆتایی هات.

لە درێژەی ئەو باسـە و لـە لاپـەڕە ٣٤ و ٣٥دا باسـی ئـەوەی دەکـا کـە خانوویەکی دیکەیان لە کۆلانی ئەوبەری موسـافیرخانەی شەبوسـتەری بـەکرێ گرتووە. ئەوکەسەی بەکرێی گرتووە کاک «قـاسمی ئێلخـانیزادە» بـووە. و لـە ژمارە ٦ تا ٩ی نیشتمانیان لەو خانووەدا وێڕای کاک «خـەلیلی سـاوجبلاغچی» چاپ کردووە.

لە لاپەڕە ٤٧دا دەڵێ: «شایانی ئاماژە پێکردنـە، ئـەو ماوەیـەی کـە لـە تەورێز بووین، بەڕاستی بە لوتکەی چالاکی زەبیحی دەژمێردرێ، هـەروەها بـە بەهەڵمەتترین رۆژانی خەباتی رۆژنامەگەریی لە قەڵەم دەدرێ، کە خۆشبەختانە بە گوێرەی توانا لە بەشی چاپ و چاپەمەنیدا هاوبەشیم تێدا کردووە...»

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لـە لاپـەڕە ٥٦ی بەشـی دووەمـی کتـێبی «بیرەوەریەکانی محەممەدی شاپەسەندی»دا دەڵێ: «لە تەورێز «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی»م دیت داوای لێکردم فێری حرووفچینی (پیتچینی) ببم. لە ژمارە پێنجـی گۆڤـاری «نیـشتمان» (ئۆرگـانی فـەرمی کۆمەڵـەی ژ.ک) مـن دەسـتم کـرد بـە حرووفچینی. ئەوسا بە نهێنی کارمان دەکرد. گۆڤارەکەمان حرووفچینی دەکـرد و پاشان دەمان‌دا بـە مەتبەعەیـەکی ئەرمـەنیان و چـاپی دەکـرد. پـاش بەینـەک رووسەکان لەگەڵمان باش نەبوون. ئەوان دەیانویـست ئێمـە بەرنامـەی ئـەوان ئیمزا بکەین. ئێمە رازی نەدەبووین. قازی رازی نەدەبوو، زەبیحی رازی نەدەبوو. وردەوردە دەگەڵمان تێکچوون و ئیشارەیان دا بە چاپخانەکە کـە ئیـدی چـاپی «نیشتمان» تەئخیر بکەن (وەپاش بێخن). بۆ ئەو مەسەلەیە ئێمـە مەتبەعەیـەکی بچووکمان پەیدا کردو بردمانەوە بۆ سابلاخ بۆ ئـەوەی لـەوە بـەولاوە خۆمـان «نیشتمان» چاپ بکەین. تا ئەو کاتەی کە من ئەو باسـەت بـۆ دەکـەم ٩ ژمـارەی «نیشتمان» دەرچووبوو...»

لە لاپەڕە ٧١یشدا دەڵێ: لە ژمـارە ٥ی «نیـشتمان»ـــەوە لــە چاپکردنیـدا بەشدار بووم. ئێمە حرووفچینیمان دەکرد. دەمانبردە چاپخانــەی خەلیفەگــەریی ئەرامینە، موساعەدەیان دەکردین. ژمارەی وا هەبوو مانگێک زیاتری خایاندووە. هەر ژمارەی دەوری ٧٠٠ ـ ٨٠٠ی لێ چاپ دەکرا. ئیدی دەبرایەوە سابلاغ، لە وێ و لە ئەغڵەبی شار و دێهاتی کوردستان دابەش دەکرا و لێی دەبرایە کرماشان و ئەو جێیانە. ئەمن هەر لە ئەووەڵەوە لەگەڵ زەبیحی یەک ئامێزیمان هەبوو. زەبیحی زڕدایکی هەبوو. شتی سکرتاریەتی کۆمەڵەی هەر لەماڵــی ئێمــە دادەنــا. ئــەمن لــەوێ نامــەکانی مامۆستا «ئیـبراهیم ئەحمــەد»م دەدیــت لەســەر کاروبــاری حیزبی...»

لەو چەند زانیارییەش ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە گۆڤاری «نیـشتمان» لە کوێ و چۆن چاپ کراوە و لەوانەش گرینگتر ئەوە کە رووسەکان لەبەر ئەوەی ئەندامانی پلە بەرزی کۆمەڵــەی (ژ.ک) رازی نــەبوون بــەپێی بەرنامــەی ئــەوان بجووڵێنەوە، لەمپەریان لەبەر چاپی نیشتمان داناوە و نەیانهێشتووە چیدی ئەم گۆڤارە چاپ و بڵاو بکرێتەوە.

لە کۆتایی ئەو بەشە بەپێویستی دەزانم ئەوەنــدەش زیــاد بکــەم کــە لــە لاپەڕەکانی ٢٣ و ٢٨ و ٣٦ی بەشی بیرەوەرییەکان و لاپەڕە ٤٢ی بەشــی دووەمــی کتێبەکەی کاک «محەممەدی شاپەسەندی»دا باسی «گۆڤــاری نیــشتمان» هــاتووە بەڵام چونکە لە وتارەکانی دیکەدا کەلکمان لــێ وەرگرتــوون لێــرەدا دووپاتمــان نەکردوونەوە.

# بڵاوکراوەکانی کوردی سەردەمی کۆمەڵەی (ژ.ک) و کۆماری کوردستان

هەر وەک دەزانین بەشێکی کتێبی (سێبەری ئازادی) بۆ ناساندنی گۆڤاری «ئاوات» تەرخان کراوە. لە لاپەڕە ٢٥و٢٦یشدا باسی ئەو سەرچاوانەمان کردووە کە لە سەر ئەم گۆڤارە دواون. کتێبی «رۆژنامەی کوردستان، مەهاباد ١٣٢٤ ـ ١٣٢٥ی هەتاوی (١٩٤٦)» لەو دواییانەدا و لە پرۆژەیەکی هاوبەشی دوو بنکەی «ئاراس» و «ژین» چاپ و بلاو کراوە. ئەو کتێبە گرینگییەکی تایبەتی هەیە، چونکە دەقی چەند بڵاوکراوەی سەردەمی کۆمەڵەی (ژ.ک) و کۆماری کوردستان و چەند بەڵگەیەکی دەگمەنی تێدا چاپ کراوە. هەرکام لە لاپەڕەکانی ئەم کتێبە بەڵگەی زیندووی ئەو سەردەمن و بەڕاستی لە روونکردنەوەی لایەنە نادیارەکانی مێژووی ئەو کات یارمەتیمان دەدەن.

لێرەدا بەپێی پێوەندییان لەگەڵ باسەکانی ئێمە و هەروەها بەپێی ئەو پێڕستەی کە لە پێشەکی ئەم کتێبەدا (سێبەری ئازادی) هاتووە، پێدا دێین و باسەکانیان پێ دەوڵەمەندتر دەکەین.

لە لاپەڕە ١٦٨ی کتێبی «رۆژنامەی کوردستان»، یا هەمان لاپەڕە ٤ی ژمارە ٤١ی رۆژنامەی «کوردستان»، «دڵشادی رەسووڵی» لە وتارێکیدا کە لە ژێر ناوی «کورد شایانی شانازی‌یە» چاپ کراوە؛ باسی چەند بڵاوکراوەی کوردستان دەکا کە بە بۆچوونی نووسەرەکەی لە رێگای ئەوانەوە کورد بە دنیای سەلماندووە کە

شایانی شانازی کردن بە خۆیەتی و لە بەشێکیدا دەڵێ: «... ئێمە دووساڵ پێش لە کۆمەڵە [ی ژ.ک]دا گۆڤاری ـ نیشتمان ـ مان وەدەر خست کە هەتا هەتایە گەنجینەیکی تێدا سوودی لێ وەردەگیرێ. بەڵێ نیشتمان بلێسەیەک بوو تا وڵاتی کوردەواری رووناک نەکردەوە، نەکوژاوە. لە دوای ئەو گۆڤارە (هاوار) لە سابلاغ وەدەر کەوت. زۆری پێنەچوو «ئاوات»، ئازەر [؟] هاتە وجوود.

وابوو «گۆڤاری کوردستان» وەک گەلاوێژی ئاسمان لە وڵاتە جوانەکەی خۆمان دەستی کرد بە بلێسە دان. دڵی دانیشتووانی وڵاتی شاد و ئی بەدکارانی بە لەرزە هێنا...» دواتریش باسی گۆڤارەکانی «هەڵاڵە» لە بۆکان و «گرۆگاڵی منداڵانی کورد» لە مەهاباد دەکا کە هەر لەو ماوەیەدا چاپ و بڵاو کراونەوە.

لێرەدا سێ بابەتی گرینگ دێتە گۆڕێ. یەکەم ئەوە کە دەڵێ: «بەڵێ نیشتمان بلێسەیەک بوو تا وڵاتی کوردەواری رووناک نەکردەوە نەکوژاوە» کە ئەوە بۆخۆی زۆر جێگای سرنج و پرسیارە کە بۆچی کوژاوە؟ ئاخۆ کوژاوە یا کوژاندیانەوە؟ ئەگەر کوژاوەتەوە، کێ بەرپرسی ئەم کارە بووە؟ بە بڕوای من پێویست بە شیکردنەوەی زیاتر ناکا و تەواوی بەڵگەکان ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن کە رووسەکان بەرپرسی ئەو کارە بوون و لابردن و داخستنی بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی (ژ.ک) یەکەمین هەنگاویان بووە بۆ لەناوبردنی ئەم کۆمەڵەیە. بابەتی دووهەم ئەوەیە کە باسی گۆڤاری «ئاوات»یش کراوە. ئەگەرچی باسی هۆکاری کوژاندنەوەی ئەویش نەکراوە. گۆڤاری «ئاوات» جگە لە پێداهەڵگوتن بە دەوڵەتی شووڕەوی (لە چەند وتاردا) هیچ دوژمنایەتییەکی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەو دەوڵەتە نەبووە و هەروەک گۆڤاری «نیشتمان» چۆتە پێش و ئەگەر دۆستی بۆخۆی ساز نەکردبێ، دوژمنیشی ساز نەکردووە، (لانیکەم لایەنی زلهێزەکان). بەڵام سەرەڕای ئەوانەش لەمپەریان بۆدانان و لە چاپ و بڵاو کردنەوەیان بەرگری کرا. وەڵامی هۆکاری ئەو کردەوانە تەنیا یەک شتە، ئەویش دەرچوونی ئەو بڵاوکراوانە بە ناوی کۆمەڵەی (ژ.ک)ە.

بابەتی سێهەمیش ئەوەیە کە ناوی گۆڤاری «هاوار»یش هاتووە و نەنووسراوە «هاواری کورد». ئەوەش هەر دەگەڕێتەوە سەر ئەو باسەی کە لە لاپەڕەکانی ١٦٤ تا ١٦٨ی (سێبەری ئازادی)دا لە بابەت ئەو گۆڤارە، لە سەری دواوین.

# پەیمانی سێ سنوور

لە بەشی چوارەمی ئەم کتێبەدا (سێبەری ئازادی)، کە بۆ شیکردنەوەی پەیمانی «سێ سنوور» تەرخان کراوە، باسی گومانی بەشداری نوێنەرانی کوردستانی تورکیا و سووریامان کردووە.

لە لاپەڕە ١٩١ تا ١٩٣، بە وردی باسی ئەوەمان کردووە کە بەپێچەوانەی بۆچوونی هێندێک لە نووسەران «قەدری جەمیل پاشای دیاربەکر» لە پەیمانی «سێ سنوور» بەشدار نەبووە.

ناوبراو ساڵی ١٩٤٦ی زایینی (١٣٢٥ی هەتاوی) هاتۆتە مەهاباد و ڕێکەوتی هاتنی لەگەڵ پێکهاتنی پەیمانەکە یەکتر ناگرنەوە. بەڵگەیەکی دیکە کە ئەو داوایەمان دەسەلمێنێ لاپەڕە ٣٢٩ هەتا ٣٣٢ی کتێبی «ڕۆژنامەی کوردستان»ە کە ژمارە ٩٢ی ڕۆژی پێنجشەممە ١١ی ڕەزبەری ١٣٢٥ (٣ی ئۆکتۆبری ١٩٤٦)ی تێدا چاپ کراوە. لە لاپەڕە ١و٢و٤دا وتارێک بۆ ناساندنی کەسایەتی و خەباتی «قەدری جەمیل» لە ژێر ناوی «قەدری بەگ جەمیل پاشا پیاوێکی نیشتمانپەروەری کورد» چاپ کراوە. دوای ناساندنی کەسایەتی «قەدری بەگ»، لە لاپەڕە ٢دا هاتووە «کۆمەڵی (خۆیبوون) تەشکیلاتێکی بەتینی لە هێزی «ئیحسان نووری پاشا» لە ئاراراتدا هەبوو و لە ساڵی ١٩٣٠ کە تورکەکان هەستی بوونی ئەو کۆمەڵەیان کرد و بۆ تێکدانی کەوتنە کۆشش، قەدری جەمیل بەگ لەگەڵ جەماعەتێکی هاوبیری خۆی بۆ ئیلتیحاق بە ئیحسان نووری

و شەڕ لەگەڵ تورک لە سوریا دەرکەوتن و گەیشتنە چیاکانی ماردین بەڵام بێدەستەڵاتیی کورد بەرامبەر هێزی بەچەکی تورک و یارمەتی دەوڵەتەکانی تر بە تورک بۆ هۆی پیرۆزنەبوونیان... قەدری بەگ کە گەڕاوە سوریا، فەڕانساویەکان بە قسەی تورکان تەبعیدیان کرد. لە پاش گەڕانەوەی بۆ شام دیتیان کاری ئاشکرایان پێ ناکرێ؛ لەبەر ئەوە کەوتنە کارکردن بە نهێنی. کە دیتیان کۆمەڵەکانی کورد لە تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا هەریێک بە ئارەزوو و ئیشتهای خۆی کار دەکات بە بێ ئەوەی رابیتێک و یا ئامانجێکی موشتەرەک لە بەینیان ببێ، حیزبێکیان دامەزراند بۆ یەککردنی ئامانج و هەوڵ و تێکۆشینی ئەو هەمۆ کۆمەڵانە. لە پاش ئەوەی کە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دامەزرا حیزبەکەی خۆیان لە ناو برد و یەکسەر ئیلتیحاقی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێرانیان کرد...»

سەرچاوەیەکی دیکە کە بە پێویستی دەزانم بۆ بەبەڵگە کردنی ئەو بەشە باسی لێوە بکەم و بیخەمە سەر زانیارییەکانی پێشوو، لاپەڕەکانی ١٦٢ و ١٦٣ی کتێبی «رۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی...»ە کە لەودا «هاشمۆف» لە یادداشتی رێکەوتی ١ی ئەیاری ١٩٤٥دا کە بەرامبەرە دەگەڵ رۆژی سێشەممە ١١ی بانەمەڕی ١٣٢٤ی هەتاوی، دەڵێ کە ٢٧ی نیسانی ئەمساڵ (رۆژی هەینی ٧ی بانەمەڕی ١٣٢٤ی هەتاوی) «شێخ سەیید عەبدوڵلا گەیلانی» چۆتە لای و لە کۆنسوولخانەی سۆڤیەت لە ورمێ وتووێژی لەگەڵ کردووە. لە لاپەڕە ١٦٣دا (بەکورتی) دەڵێ: «توانیم ئەم ئەنجامانە لە وتووێژەکانی نێوانماندا دەست بخەم: ١ـ شێخ سەید عەبدوڵلا گەیلانی ئەندامی کۆنی پارتی ژێکافە و درێژە پێدەری نەریتی بنەماڵەکەیانە کە بەشداری لە خەباتدا دەکات بۆ سەربەخۆیی کوردستان و لەبەر ئەوەیە کە لە لای سەرکردەکانی کورد رێزی لێ دەگیرێ. ٢ـ پارتی هیوا لە عێراق هەیە و پەیوەندیی ئەم پارتە بە پارتی ژێکافەوە لە رێگەی پیاوە بڕواپێکراوەکانیان و بەتایبەتی سەید عەزیزی کوڕی ئەوەوە کە ئێستا پلەی کاپیتانی لە ناو سوپای سوارەی عێراقدا هەیە، بەڕێوە دەچێ.

٣ـ ... ئەرکی سەر شانی کۆمیتەی هیوا، وەک کۆمیتەی ژێکاف لە سەردەمی ئێستادا بریتییە لە پێکهێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ. جگە لەوە کارتی سنوورەکانی کوردستانی وەک چۆن ژێکاف دەیخاتە بەردەست، نیشان دام...»

ئەو سێ بابەتە هەرسێک جێگای سەرنجن. چونکە ئێمە لە پەیمانی «سێ سنوور»دا باسی «شێخ عەبدوڵڵای گەیلانی»مان وەک ئەندامی (ژ.ک) و هەروەها بەشداری کوڕەکەی «سەید عەزیزی گەیلانی ـ شەمزینی» وەک ئەندامی بەشدار لە پەیمانی «سێ سنوور» و نوێنەری «کۆمەڵەی هیوا» کردووە. بابەتی سێهەمیش دەگەڕێتەوە سەر ئەو پێوەندییانە و دواتر ناکۆکییانەی کە لە نێو «کۆمەڵەی هیوا»دا پێکهات و سەرئەنجام بوو بە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەم کۆمەڵەیە.

یەکێکی دیکە لەو سەرچاوانەی چەند زانیارییەکی سەبارەت بە «پەیمانی سێسنوور» و گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی باس کردووە، کتێبی «بیرەوەرییەکانی محەممەدی شاپەسندی»یە. کاک محەممەد لە چەند لاپەڕەی جیاواز، ئەم دوو بابەتەی بەوردی باس کردووە. چونکە لەو بەرهەمەدا، گیرانی مامۆستا زەبیحی و هاوڕێیانی هاوکات لەگەڵ چاپی گۆڤاری «ئاوات» باسی لێکراوە، بە دەست هیچمان نەبووە کە بەشێکی جیاوازی بۆ دابنێین و لێکیان جودا بکەینەوە. هەر بۆیە لە شیکردنەوەی بیرەوەرییەکانی کاک محەممەددا، هەر دوو بابەتی گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و «پەیمانی سێسنوور»مان پێکەوە باس کردووە. لە لاپەڕە ٢٦ هەتا ٢٨ی بەشی بیرەوەرییەکاندا بەو چەشنە باسی «پەیمانی سێسنوور» کراوە: «کۆمەڵە، زووتر بڕیاری دابوو لە مانگی ئووتی ١٩٤٥دا نوێنەرانی خۆی بۆ کۆبوونەوەکانی سێسنوور ڕەوانە بکات. بۆ ئەم مەبەستە قاسم قادری، ڕەحمانی زەبیحی و دڵشادی ڕەسووڵی هەڵبژێردرابوون. هەروەها لە کوردستانی تورکیا قازی مەلا وەهاب و لە کوردستانی عێراق شێخ عوبێدیللای زینوێ لەم کۆبوونەوەدا بەشدار بوون. (ل ٢٧) دوای کۆتایی ئەم کۆبوونەوانە، لە گەڕانەوەدا، نوێنەرانی «ژ.ک» لە ئاوایی «باڵانیش»ی نزیک شاری «ورمێ» لە لایەن لەشکری ئێرانەوە دەگیرێن و قۆڵبەست ڕەوانەی تاران دەکرێن»

دواتریش بە کورتی و بەپێی کتێبەکەی «سەرلەشکر زەنگەنە»، باسی چۆنیەتی گیرانی نوێنەرانی «پەیمانی سێسنوور»؟ دەکا و بۆ ڕەتکردنەوەی قسەکانی ناوبراو دەڵێ: «لە لایەکی ترەوە، سەفیری ئەمریکا لە شووڕەوی تاریخی ئەم ڕووداوە بە «١٤ی ئووتی ١٩٤٥» باس دەکات کە جیاوازێکی زۆری هەیە لەگەڵ ڕاپۆرتەکەی سەرلەشکر زەنگەنەدا، بەڵام لە ڕاستییەوە نزیکترە چونکوو ڕووداوەکە لە سەرەتای ئووت دەستی پێکردووە و ١٤ ڕۆژ ماوەیەکی

شیاوە بۆ چوون و گەڕانەوەیان. کە واتە گیرانی ئەم برادەرانە نزیکەی ٤٧ ــ ٤٨ ڕۆژ پێشتر لەو تاریخەیە کە سەرلەشکر زەنگەنە نووسیویەتی.»

لە لاپەڕە ٢٨ و ٢٩ و لە بەشی «گۆڤاری ئاوات»دا دەڵێ: «لە مانگی (مارسی ١٩٥٤ - ڕەشەمەی ١٣٢٣ی هەتاوی)دا عەبدوڕڕەحمان زەبیحی لە «تەورێز» ئامێرێکی چاپی بچووکی دەس کەوتبوو. نیازمان وابوو لەمەودوا ژمارەکانی گۆڤاری نیشتمان لە مەهاباد بەو ئامێرە چاپ بکەین. لە بەر ئەوە بە باشمان زانی تاریخی پەیداکردنی ئامێرەکە بە بناغەی دامەزرانی چاپخانەی «نیشتمان» دابنێین، بۆ ئەم مەبەستە لە ژێرخانی خانووی «دوکتور یۆناتان» دامانمەزراند و حرووف و کەرەسەی پێویستمان بۆ پەیدا کرد. دڵمان بەوە خۆش بوو کە ئەمە ئەووەڵ چاپخانەیە تا ئەو کاتە لە شاری مەهاباد دامەزرێ جگە لەوەی کە ئیتر بۆ چاپی گۆڤاری «نیشتمان» پێویستمان بە چاپخانەی «خەلیفەگەری» تەورێز نابێ. <خۆم چاوەڕوان بووم زەبیحی لە سەفەری سێسنوور بگەڕێتەوە و دەست بکەین بە چاپی ژمارە ١٠ی نیشتمان> بەڵام پاش دوو سێ هەفتە لە ڕۆیشتنیان هەواڵ گەیشت کە زەبیحی و هاوڕێکانی لە گەڕانەوەدا لە «بالانیش»ی ورمێ لە لایەن لەشکری ئێرانەوە گیراون و قۆڵبەست ڕەوانەی تاران کراون. ئەم هەواڵە ناخۆشە لە دوو سەرەوە بوو بە هۆی ناڕەحەتی و شپرزەییم: سەرێکیان گیرانی ئەم برادەرانە کە خوا دەزانێ ڕەژیم چییان بە سەر دێنێ؛ لەو سەریشەوە بێکار مانەوەی چاپخانەکە. ئەگەرچی هێندێک نووسین و بابەتی ئامادە بۆ چاپ لە ژێر دەستمدا بوو بەڵام بە ئامادە نەبوونی زەبیحی کە سەرپەرشتیی گۆڤارەکەی بەئەستۆوە بوو، نەدەکرا لەخۆمەوە دەستی پێبکەم. پاش ئەمە کەوتمە سەر بیری ئەوە، با لەخۆمەوە و لە سەر مەسئولییەتی خۆم گۆڤارێک بە کوردی بڵاو بکەمەوە. ئەممم بە بیرۆکەیەکی باش لێک دایەوە. جێبەجێ دەستم بە ئامادەکاری کرد. بە یادی زەبیحی و بە سەردێڕی «برای دوورم!» بابەتێکم ئامادە کرد و سەردێڕی زۆر لە نووسینەکانی «زەبیحی»م لە بڵاوکراوەکانی «ژ.ک»دا تێدا گونجاند، بێ ئەوەی ناوی «زەبیحی» بێنم. هەروەها چەند بابەتێکی تر لەگەڵ چەند پارچە شێعری <هەژار و هێمن> و بابەتێکی دیکە بە ناوی «محاکەمەی هیتلەر لە دۆزەخ»دا. ئەمانە برێتی بوون لە ناوەرۆکی گۆڤارەکە، ژمارە ١ی ئاوات پێش ئەوەی مانگی ئووت کۆتایی بێ، «ئاوات» بڵاو کرایەوە...»

لە لاپەڕە ٣٤ و ٣٧ی بەشی «نزیکبوونەوەم لە مامۆستا عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی»ش چەند بابەتێکی گرینگ باس کراوە کە بەپێی پێوەندییان بە باسەکەی خۆمان لێرەدا دەیاننووسینەوە.

لە لاپەڕە ٣٤دا دەڵێ: «دوای تەواوبوونی چاپی ژمارە ٥ لە کۆڵانەکانی ئەوبەری (موسافیرخانەی شەبوستەری) خانوویەکی باشی خۆمانەمان بۆ هەڵکەوت کە برادەرێک لە بنەماڵەی ئیلخانیزادە بەکرێی گرتبوو. لەم خانوەدا توانیمان دوو سێ دەزگای (پیت)، پۆندی ورد و درشت ئامادە بکەین. لە ژمارە (٦ـەوە تا ٩) واتا چوار ژمارە لەم خانوەدا حرووفچینی کراوە. پاشان چاپخانەی خەلیفەگەری بۆی چاپ کردووین... (ل ٣٥) مامۆستا زەبیحی دوای چاپی ئاخر ژمارەکانی گۆڤاری «نیشتمان»ی ٧و٨و٩ کە بە هۆی دواکەوتنەوە بە سەریەکەوە چاپ کرابوون، بە نائومێدی لە رووسان گەڕایەوە مەهاباد. بەڵام پێش گەڕانەوە، بە هۆی کۆنسولگەریی سۆڤیەتەوە لە تەورێز دوو نامەی بە زمانی کوردی و ئازەری سەبارەت بە مەسەلەی کورد ئاراستەی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت «بێریا» کرد. بێ گومان ئەم نامانە نەگەیشتنە دەستی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت، بەڵام تووڕەبوونێکی زۆری «جەعفەر باقرۆف»ی سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجانی شووڕەویان لێ کەوتەوە کە دۆستی نزیک و بڕواپێکراوی «ستالین» بوو و بە خەیاڵیدا نەدەهات کەسێ بتوانێ بەپێچەوانەی ویستی ئەو بیر بکاتەوە. بەڵێ زەبیحی بەم جۆرە لە ناوەندی سیاسەتی رەسمیی کوردستان و پەیوەندیە دیپلۆماسیەکانی لەگەڵ کونسولگەریی سۆڤیەت، دوور خرایەوە. تەنانەت لەو کاتەوە ناوی زەبیحی لە ناو هیچ یەک لەو هەیئەتانەی وا بۆ دیداری بەرپرسانی ئازەربایجانی لە «تەورێز»، یا ئەفسەرانی سۆڤیەت لە ئازەربایجان و کوردستان دەستنیشان دەکران، دیار نەبوو. وە بۆ هەر دوو سەفەری «باکۆ»ش دەعوەت نەکرابوو.»

دیسان هەر لە درێژەی ئەم باسەدا لە لاپەڕە ٣٥ و ٣٦دا دەڵێ: «ئێستاش کاک «عەلی کەریمی» و ئەوانەی وەک ئەو بیر دەکەنەوە نایانەوێ دانی پێدا بنێن، کاتی خۆی هەڵپەساردنی زەبیحی لە لایەن کاربەدەستانی شۆڕەوییەوە جێبەجێ کراوە. کەچی ئەم برادەرانە تازە دەیانەوێ مەسەلەکە بە نارێکی بەینی پێشەوا «قازی محەممەد» و «زەبیحی» لە قەڵەم بدەن»

لە لاپەڕە ٢٦ی پاشکۆی ژمارە ١ و لە بەشی «چەند تێبینییەک لە بارەی حکوومەتی کوردستان، کورد لە گەمەی سۆڤیێتیدا» دەڵێ: «گیرانی زەبیحی و

هاوڕێکانی ـ زەبیحی و قاسمی قادری ـ <لە گەڕانەوە لە پەیمانی سێسنووردا گیران>، بەڵام لە بیرم نییە کە دڵشادیان لەگەڵ بوو یا نا، نازانم بۆ سەرلەشکر زەنگەنە بەو بارەدا گۆڕیویێتی؟!».

لە لاپەڕە ٣٣ و ٣٥یشدا دەڵێ: «ئەوەی ماوە بیڵێین، دەرکردنی ژمارەی (١٠ ـ ١٢)ی «نیشتمان»ە. لەو کاتەدا چاپخانەیەکی بچووکی پیت ڕێکخستنمان پەیدا کرد و هێنامانەوە بۆ سابلاغ تا لەوێ لای خۆمان چاپی بکەین. ئەوە بوو «زەبیحی» لە کاتی گەڕانەوەیدا لە ورمێ بەسەردا گیرا... (ل ٣٥) کۆمەڵەی ژ.ک قەومی بوون و بە دەلیلی تەرحکردنی فیکرەی ئاڵا و پەیمانی سێ قۆڵی کوردی عێراق و تورکیا و ئێران.»

سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی ئەو قسانەی کە لە کتێبەکەی کاک «عەلی کەریمی» (ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی)دا هاتووە کە گۆیا مامۆستا «زەبیحی»ساڵی ١٩٤٥ ماوەیەک لە قاوەخانەی «کەریم سێ بست» بەند کراوە، لە لاپەڕە ٣٦دا دەڵێ: «سەبارەت بەمە پێویستە بوترێ ئەو کاتە ئێمە بەشی زۆری کاتمان بەیەکەوە ڕابوارد و لە ژێرخانی خانووی «دوکتۆر وێناتان» خەریکی جێبەجێ کردن و ئامادەکاری بووین بۆ چاپکردنی ژمارە دواکەوتووەکانی «نیشتمان» بەڵام پێش ئەوەی دەست بەکار بین هەواڵی سەفەری نوێنەرانی کوردستان بۆ کۆبوونەوەی «پەیمانی سێسنوور» بڵاو بۆوە. مامۆستا قاسم قادری، مامۆستا زەبیحی و کاک محەممەد دڵشادی ڕەسووڵی بەرەو سنوور وەڕێ کەوتن. دوای ئەم دانیشتنانە کە وێدەچێ لە یەک حەوتوو زیاتری نەخایاندبێ، بەرەو مەهاباد دەگەڕێنەوە. بەڵام بەداخەوە لە گەڕانەوەدا دەگیرێن و دەبرێنە تاران. بەم پێیە لە ١٤ی ئووتی ١٩٤٥ تا ١٩٤٦/٢/١٣ تەنیا (٦) مانگ لە زینداندا مانەوە، بەپێچەوانەی ئەوەی کە خوشکە ڕەعنا وتوویەتی. ئەم خوشکە ئەوسا کە من هاتووچۆیانم دەکرد بۆ گەیاندنی باس و خواسی کاکیان (مامۆستا زەبیحی)، زۆر منداڵ بوو، وێدەچێ بەباشی لە بیر نەمابێ...»

لە لاپەڕە ٧٨ و ٧٩ی بەشی بیرەوەرییەکاندا، کاک محەممەد لە شیکردنەوەی ئەو شێعرەی مامۆستا «هەژار»دا کە باسی وشەی «قڕەی قەل» دەکا و دەڵێ دوژمنانی ناوخۆ واتە لە کوردستان، مامۆستا «زەبیحی»یان بەگرتن داوە، دەڵێ: «هەژاری شاعیر کە خۆی لە ناوەڕاستی ڕووداوەکانی ئەو کاتەدا بووە، زۆر بە ئاشکرا ئەم بۆچوونانە ڕەت دەکاتەوە؛ کەواتە بۆ ئێمە لە گرتنی

شووڕەویدا بگونجێ، لێک نەدەینەوە؟! ئاشکرایە پەیمانی سێسنوور خۆی لە چوارچێوەی کوردستانی گەورەدا بەستراوە، ئەمەش دژی سیاسەت و بەرنامەی شووڕەوی بووە کە ئەوان لە «باکۆ» ساڵی ١٩٤١ ڕەتیان کردبۆوە. بۆیە وێدەچێ رووسان ئەم سەفەرەیان دژی سیاسەتی خۆیان زانیبێ. کە واتە دوور نییە گرتنی مامۆستا زەبیحی و برادەرەکانی هەر لە لایەن خۆیانەوە جێبەجێ کرابێ!»

لە لاپەڕە ٤٢ و ٤٣ی پاشکۆی دووەم و لە وتووێژێکی دیکەدا کە «هانا» سەبارەت بە کاری ڕۆژنامەوانی لەگەڵ کاک «محەممەد شاپەسەندی» پێکی هێناوە، ناوبراو دوای ئەوەی کە باسی چۆنیەتی چاپی گۆڤاری «نیشتمان» لە «تەورێز» دەکا؛ لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ: «... تا گۆڕانکارییەکەی تەواو لە «ژێ. کاف»دا هاتە دی [بوو بە حیزبی دێموکڕات] «نیشتمان»مان چاپ دەکرد. هەر چۆنێکی بوو من گەڕامەوە مەهاباد، بە مەتبەعەیەکی دەستی کە سەفحەیەکی تەقریبەن نیوفولسکاپی چاپ دەکرد، لە تەورێز هێنامەوە سابلاغ. زەبیحی و... چووبوون بۆ سازکردنی پەیمانی سێ لایی (کوردستانی عێراق، تورکیە و ئێران)، ئەوان گیران من تەنیا مامەوە. لە فکری ئەوەدا بووم گۆڤارێک ساز بکەم. ئەو سەردەمە حکوومەت زۆر دەسەڵاتی نەبوو. هێنام بە ناوی «ئاوات» گۆڤارێکم ساز کرد. نزیکەی مانگێک کارم تێدا کرد و بڵاوم کردەوە... دوو هەفتەی پێنەچوو [بەرپرسانی ژ.ک] ناردیان بە شوێنما و پێیان گوتم ئەتۆ دەبوایە پرسێک بکەی.»

## شیکردنەوەکان:

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لە لاپەڕە ٢٦ و ٢٧دا وا دیارە دەقی قسەکانی مامۆستا «هەژار»ی کە لە کتێبی «چێشتی مجێور»دا سەبارەت بە «پەیمانی سێسنوور» دواوە نووسیوەتەوە، بەڵام خودی مامۆستا «هەژار»ی وەک یەکێک لە بەشداران ناو نەبردووە. لە چەند جێگاشدا کوتوویەتی مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی لە کاتی گەڕانەوە لە «باڵانیش» و «پەیمانی سێسنوور» گیراون. لە لاپەڕە ٢٧یش دەڵێ سەفیری ئامریکا لە شووڕەوی ڕێکەوتی ئەو ڕووداوەی بە ١٤ی ئووتی ١٩٤٥ باس کردووە. دواتر دەڵێ ئەگەر بە قسەی «سەرلەشکر زەنگەنە» بێ، ئەوان ٤٧ ـ ٤٨ ڕۆژ پێش ئەو تاریخەی کە ئەو نووسیویەتی (واتە پێش سەرەتای مانگی ئابانی ١٣٢٤) گیراون. هەروەک پێشتر گوتمان لە لاپەڕە ٢٨ و ٢٩شدا سەبارەت بە گۆڤاری «ئاوات» گوتوویەتی کە لە

مانگی ڕەشەمەی ساڵی ١٣٢٣ چاپخانەیان کڕیوە و هێناویانەتەوە مەهاباد و ئەو ڕۆژەشیان کردۆتە ڕۆژی دامەزرانی چاپخانەی «نیشتمان» و خۆیان ساز کردووە کە دوای گەڕانەوەی مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی لە «پەیمانی سێسنوور»، ژمارە ١٠ی «نیشتمان»ی پێ چاپ بکەن. بەڵام ئەوان بەسەردا گیراون و ڕەوانەی تاران کراون. هەروەها کاک «محەممەد» بە هۆی دۆستایەتی لەمێژینەی لەگەڵ مامۆستا «زەبیحی» لە گۆڤاری «ئاوات»دا وتارێک بە یادی «زەبیحی» هاواڵی خۆی دەنووسێ و لە ژێر ناوی «برای دوورم» چاپی دەکا. لەو وتارەدا هیچ ناوێک لە مامۆستا «زەبیحی» نەهاتووە و تەنیا بە چەند نووسراوێکی ناوبراو لە نێو بڵاوکراوەکانی (ژ.ک)دا ئیشارە کراوە. لە لاپەڕە ٢٦یشدا دەڵێ: «... بەم پێیە لە ١٤ی ئووتی ١٩٤٥ تا ١٩٤٦/١٢/١٣ تەنیا ٦ مانگ لە زیندان مانەوە...».

ڕێکەوتی ١٤ی ئووتی ١٩٤٥ بەرامبەرە لەگەڵ ڕۆژی هەینی ٢٣ی گەلاوێژی ١٣٢٤ی هەتاوی و، ١٣ی ٢ی ١٩٤٦یش بەرامبەرە لەگەڵ ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی ٢٤ی ڕێبەندانی ١٣٢٤ی کۆچی هەتاوی.

لە لاپەڕە ٣١دا پێشتر گوتوویەتی ئێمە چاپخانەیەکی بچووکمان پەیدا کرد و هێنامانەوە سابلاغ هەتا ژمارەکانی ١٠ تا ١٢ی «نیشتمان»ی پێ چاپ بکەین. لە لاپەڕە ٣٤یشدا نووسیویەتی لە ژمارە ٦ تا ٩ی «نیشتمان» لەو خانوویە کە یەکێک لە «ئێلخانیزادە»کان لە تەورێز بەکرێی گرتبوو حرووفچینی کراوە و پاشان لە چاپخانەی «خەلیفەگەر»ی بۆیان چاپ کردووین. لە لاپەڕە ٣٥یشدا دەڵێ: «مامۆستا زەبیحی دوای چاپی ئاخر ژمارەکانی گۆڤاری نیشتمان (٧و٨و٩) کە بە هۆی دواکەوتنی بەسەریەکدا چاپ کرابوون بە نائومێدی لە رووسان گەڕایەوە مەهاباد...» لە لاپەڕە ٣٦یشدا گوتوویەتی: «تا گۆڕانکارییەکەی تەواو لە «ژێ. کاف»دا هاتە دی «نیشتمان»مان چاپ دەکرد...»

هەروەک دەزانین ژمارەکانی ٧و٨و٩ی گۆڤاری «نیشتمان» بەسەریەکەوە لە یەک ژمارەدا بۆ سێ مانگی خاکەلێوە، بانەمەڕ و جۆزەردانی ساڵی ١٣٢٣ی هەتاوی ئامادە کراوە. خودی کاک «محەممەد»یش دەڵێ دەمانەویست ژمارەکانی ١٠ تا ١٢ی «نیشتمان» چاپ بکەین، یا ئەو جێیەی کە دەڵێ مامۆستا «زەبیحی» دوای چاپی ئاخر ژمارەکانی گۆڤاری «نیشتمان» (٧و٨و٩) بۆ مەهاباد گەڕاوە. کەوایە ئەوە بۆ هەموومان ئاشکرا بوو کە مامۆستا زەبیحی ژمارەی کۆتایی

بابەتـەکانی نـەگیراوە. پێـشتریش گوتمـان کـە دەقـی هەواڵـی کۆبوونـەوەی «سێسنوور» لە لاپەڕە ١٠ی ئەم ژمارەیەدا (لە نوسـخەی ئەسـڵی) چـاپ و بـڵاو کراوەتەوە. لێرەدا چەند پرسیار دێنە گۆڕێ، یەکەم: ئەگـەر دایبنـێین مامۆسـتا «زەبیحی» و هاوڕێیانی لە دوای گەڕانەوەی «پەیمانی سێسنوور» گیرابن، ئەدی کێ هەواڵەکەی بۆ چاپ لە گۆڤاری «نیشتمان»دا ئامادە کردووە؟

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» بـەپێی قـسەکانی سـەفیری ئامریکـا لـە شووڕەوی دەڵێ کە مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی کاتی گەڕانەوە لە «پەیمانی سێسنوور» و ڕێکەوتی ١٤ی ئووتی ١٩٤٥ گیراون. ئەگەر لێکدانەوەی لاپـەڕە ٢٧ی خودی کتێبەکەی کاک «محەممەد»یش بکەینە بنەما کە نووسیویەتی گیرانی ئـەم برادەرانە نزیکەی ٤٧ ـ ٤٨ ڕۆژ پێشتر لەو تاریخەیە کە «سەرلەشکر زەنگەنـە» نووسیویەتی، هێشتا تووشی بۆچوونی جیاواز دەبین. «سەرلەشکر زەنگەنـە» دەڵێ ئەو چەند کەسە لە سەرەتای مانگی ئابانی ١٣٢٤ گـیراون. ئەگـەر ٤٧ ـ ٤٨ ڕۆژیش بگەڕێینەوە دواتر تەقریبەن ئەو ڕووداوە دەکەوێتـە نیوەڕاسـتی مـانگی گـەلاوێژی ١٣٢٤ یـان چەنـد ڕۆژ کـەمتر یـا زیـاتر. ئەگـەرچی وێـدەچێ کـاک «محەممەد» ئەو ٤٧ ـ ٤٨ ڕۆژەی بۆ هاودەنگی لەگەڵ بۆچوونی سەفیری ئامریکـا نووسیبێ، بەڵام لێرەدا پرسیاری دووهەم دێتە گۆڕێ ئەویش ئەوەیە کـە: ئـاخۆ دەکرێ هەواڵی کۆبوونەوە یـا پـەیمانێک کـە بـە قـسەی سـەفیری ئامریکـا و شووڕەوی و هەروەها بە قسەی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لـە ١٤ی ئـووتی ١٩٤٥ پێکهاتووە، دروست ١٤ مانگ پێـشتر لـە گۆڤـارێکی کـە بـۆ سـێ مـانگی خاکەلێوە، بانەمەڕ و جۆزەردانی ١٣٢٣ ئامادە کراوە؛ بڵاو کرابێتەوە؟! با بزانین چۆن؟

پێشتر گوتمان کە کاک «محەممەدی شاپەسـەندی» لـە لاپـەڕە ٢٨ و ٢٩ی بەشی «گۆڤاری ئاوات»دا سەبارەت بە چاپی گۆڤاری ژمارەی کۆتایی «نیـشتمان» و «پەیمانی سێسنوور» و گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیـانی و هـەروەها چاپی وتاری «برای دوورم» چ نووسراوە.!

لە لاپەڕە ٣٦یشدا نووسیویەتی: «... لە ژێرخانی خانووی دوکتور وێناتان خـەریکی جـێبـەجێ کـردن و ئامادەکـاری بـووین بـۆ چـاپکردنی ژمـارە دواکەوتووەکانی «نیشتمان» بەڵام...» لە لاپەڕە ٤٢ی بەشی پاشکۆی ژمارە ٢شـدا

دەڵێ: «هێنام بە ناوی «ئاوات» گۆڤارێکم ساز کرد نزیکەی مانگێک کارم تێدا کرد و بڵاوم کردەوە.»

بەر لەوەی ئەم چەند بۆچوونە شی بکەینەوە، بەپێویستی دەزانم ئەم چەند زانیارییە باس بکەم:

١ـ بەپێی لاپەڕە ٥٧٤ی کتێبی «ژیان و بەسەرهاتی زەبیحی» کە لەودا رۆژئەژمێری تایبەتی کۆمەڵەی (ژ.ک) بۆساڵی ١٣٢٣ چاپ کراوە، رۆژی ١٦ی رەشەمەی ئەو ساڵە بە «رۆژی بنیادی چاپخانەی (ژ.ک)» دیاری کراوە کە ئەو رۆژە بەرامبەرە لەگەڵ ١٤ی مارسی ١٩٤٥ی زایینی.

٢ـ گۆڤاری «ئاوات» لە ١ی خەزەڵوەری ١٣٢٤ بەرامبەر دەگەڵ رۆژی سێشەممە رێکەوتی ٢٣ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥ چاپ و بڵاو بۆتەوە.

بە لەبەرچاو گرتنی ئەو چەند بابەتەی پێشوو و ئەو زانیارییانەی سەرێ، دەڵێین کە ژمارەی کۆتایی «نیشتمان» بۆ سێ مانگی وەرزی یەکەمی ساڵی ١٣٢٣ واتە خاکەلێوە، بانەمەڕ و جۆزەردان ئامادە و بڵاو کراوەتەوە. کەچی ئەو چاپخانە چکۆلەی کاک «محەممەد» باسی دەکا لە ١٦ی رەشەمەی ١٣٢٣ هاتۆتە مەهاباد، واتە نیزیک ٩ مانگ دوای چاپی ژمارەی کۆتایی «نیشتمان» لە مەهاباد دامەزرێندراوە. هەروەک لە بەشی روونکردنەوەی رێکەوتی گیرانی مامۆستا «زەبیحی» و هاورێیانی و لە لاپەڕە ١٠١ی ئەم بەرهەمەدا (سێبەری ئازادی) شیمان کردۆتەوە، لە لاپەڕە ١٧ی خودی گۆڤاری «ئاوات» و لە بەشێکی وتارە فارسییەکەدا هاتووە کە «چەند مانگ لەوە پێش سێ کەسی خەڵکی مەهاباد کە بۆ کاری خۆیان دەچوونە ورمێ، لە لایەن ژاندرمەکانی «باڵانیش» دەگیرێن و یەکسەر دەیاننێرنە تاران و ئێستا لە قەسری قەجەر زیندانین...» لە لاپەڕە ٦٤ی (سێبەری ئازادی)دا گوتوومانە کە دەقی ئەو وتارە لە لایەن «سەید محەممەدی حەمیدی»یەوە پێشتر لە ژمارە ١ی گۆڤاری «هاوار» و لە رەزبەری ١٣٢٤ چاپ کراوە و گۆڤاری «ئاوات» بۆ دووەم جار مانگێک دواتر چاپی کردۆتەوە. لە دەقی وتارەکەدا هاتووە کە <چەند مانگ لەوە پێش ئەو سێ کەسە لە باڵانیش گیراون>، کەوایە ئەو «چەند مانگ لەوە پێش»ە دەگەڕێتەوە چەند مانگ لەوەپێشی پێش دەرچوونی گۆڤاری «هاوار» کە لە رەزبەری ١٣٢٤

خودی کاک «محەممەد»یش لە لاپەڕە ٤٢ی پاشکۆی ژمارە ٢دا گوتوویەتی کە مانگێکی خەریک بووە تا گۆڤاری «ئاوات» ئامادەی چاپ کراوە. ئەگەر ئاوڕێک لە لاپەڕە ١٣٠ی ئەم بەرهەمە (سێبەری ئازادی) بدەینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە لێکدانەوەی ئەو بەشەمان چەند لە ڕاستی نیزیک بووە. ئەوەی لەگەڵ بۆچوونی کاک «محەممەدی شاپەسەندی» جیاوازی هەیە، ئەوەیە کە ئەو دەڵێ ئەو چەند کەسە لە کاتی گەڕانەوە لە «پەیمانی سێسنوور» گیراون کە ئەو بابەتە بە سەرنجدان بە قسەکانی کاک «محەممەد» سەبارەت بە دەرچوونی ژمارەی کۆتایی «نیشتمان» واتە ژمارە (٧و٨و٩) جوانتر دەردەکەوێ. چونکە نێوانی دەرچوونی ئەو ژمارەیە و بڵاوبوونەوەی، هەتا ئەو ڕۆژەی کە لە لاپەڕە ١٣٠ی (سێبەری ئازادی)دا ڕوونمان کردۆتەوە ١٤ مانگە. کەوایە بەڕوونی بەو ئاکامە دەگەین کە مامۆستا «زەبیحی» و هاوڕێیانی لە کاتی گەڕانەوە لە «پەیمانی سێسنوور» نەگیراون بەڵکوو لە مەئموورییەتێکی دیکەدا بوون.

# کۆمەڵەی پێوەندییە فەرهەنگییەکانی سۆڤیەت

لە لاپەڕە ٢١٥ و ٢١٦ی ئەم کتێبەدا (سێبەری ئازادی) باسی کۆمەڵەی پێوەندی فەرهەنگیی سۆڤیەتمان کردووە. جێی خۆیەتی ئەو چەند زانیارانەشی بخەینە سەر کە چەند سەرچاوەی جیاواز لە سەر ئەم بابەتە دواون. لە کتێبی «ڕۆژنامەی کوردستان»ەوە دەست پێدەکەین. لە ژمارە ٨٨ی ڕۆژنامەی «کوردستان» کە کەوتۆتە لاپەڕەکانی ٣٢٥ هەتا ٣٢٨ی ئەم سەرچاوەیە، وتارێکی مامۆستا «زەبیحی» چاپ کراوە. وتارەکە کەوتۆتە لاپەڕەکانی ١و٤ی ئەو ژمارەیە و لە ژێر ناوی «ئەنجوومەنی ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و شووڕەوی شوعبەی کوردستان ساڵی تێوەرسووڕا!» بڵاو کراوەتەوە. ئەم وتارە بۆ ڕۆژی ٢٨ی خەرمانانی ١٣٢٥ (١٩ی سێپتامبری ١٩٤٦) ئامادە کراوە کە لەبەر گرینگی بابەتەکە وەک خۆی دەینووسینەوە:

«ئەنجومەنی ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و شووڕەوی شوعبەی کوردستان ساڵی تێوەرسووڕا!» ئەنجومەنی ڕەوابیتی فەرهەنگی شووڕەوی دەگەڵ ئێران لە هەر کوێ شوعبەی کرابێتەوە دەرگای زانست و شارستانێتی، دەرگای خۆشی و کامەرانیی، دەرگای ئەدەب و فەرهەنگ بە ڕووی دانیشتوانی ئەو جێگایەدا کراوەتەوە. ئەنجوومەنی ڕەوابیتی فەرهەنگیی شووڕەوی کانگای بەختیاری و

فەرهەنگیی شووڕەوی لە ناساندنی مەدەنییەت و فەرهەنگێکی کە سیستمی شووڕەوی لە ماوەی ٢٨ ساڵدا هێناویێتە وجوود و بە ئیجادی ئەو فەرهەنگە دونیای شارستانێتی تووشی سەرسامی و سەرسووڕمانێکی گەورە کردووە، نەقشێکی زل و مەزن بازی دەکا. هەروەها هۆی هەرە زلی ناساندن و بڵاوبوونەوەی مەدەنییەتی میللەتانی گیتییە لە یەکێتی سۆوەتدا [سۆڤیەت]. ساڵێک شتێکی زیاترە کە ئەنجوومەنی ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و شووڕەوی شوعبەی کوردستان لە شاری مەهاباد دامەزراوە. لە ماوەی ئەو ساڵەدا کورد بە ناسینی فەرهەنگی شووڕەوی و ناساندنی ئەدەبیاتی خۆی پێوەندی و عەلاقەێکی لەگەڵ نەتەوەکانی شووڕەوی پەیدا کردووە کە بە هیچ وەسیلەێکی دیکە بۆی پێک نەدەهات.

دەسیسە و فڕوفێڵی ئیستیعمار چەندین ساڵ بوو پەردەێکی ئەستووری بە سەر یەکێتی سۆوەت داکێشابوو و ئەو وڵاتە پڕ زانست و فەننەی لە مەردومی گیتی حاشار دابوو، ئەنجومەنی ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و شووڕەوی ـ شوعبەی کوردستان ئەو پەردە ئەستوورەی لادا و میللەتانی شووڕەوی ئەو جوورەی لازمە بە نەتەوەی کورد ناساند.

ئاساری شاعیری میللی کورد (هەژار) لە لایەن ئەنجومەنی ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و شووڕەوی شوعبەی ئازەربایجان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئازەربایجان، ئەو ئاسارە لە ئازەربایجانی ئێران و شووڕەوی‌دا باوی ئەستاندوە و بە هۆی ئەوانەوە بە دونیادا بڵاو بۆتەوە. ئەو ئاسارە دونیای تێگەیاندووە کە کورد وەکوو دوژمنانی دەیانکوت وەحشی و نەفام و تێنەگەیشتوو نییە بەڵکو ئەگەر بە چاوێکی بێ‌تەرەفانە تەماشا بکرێ، بە ئەندازەی خۆی لە مەدەنییەت و فەرهەنگدا هەنگاوی زل زلی هەڵێناوەتەوە. ئەدەبیاتی کوردی لە ڕەدیفی ئەدەبیاتی زمانە کۆنەکانی کە چەند چەرخە بە هۆی زانایانی خۆیان خزمەتیان دەکرێ ڕاوەستاوە، بێ‌گومان بە سەد یەکی زمانەکانی دیکە خزمەتی زمانی کوردی بکرێ زۆر لە وان وەپێشتر دەکەوێ.

هیوام هەیە بە هۆی تێکۆشین و جیدییەتی زانایان، بوێژان و نووسەرەکانی کورد بەتایبەتی ئەندامەکانی ئەنجومەنی پێوەندی فەرهەنگیی ئێران و شووڕەوی ـ شوعبەی کوردستان لە ساڵی تازەدا هەنگاوی زۆر زلتر

هەڵبێنینەوە و بتوانین خزمەتێکی لایـق بــە میللەتەکــەمان بکــەین. نووســەری ئەنجوومەن: زەبیحی»

سەرچاوەی دووەممان کتێبەکــەی کــاک دوکتــور «ئەفراسـیاو هــەورامی» (ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا...)یە. لەو کتێبەدا لە چەند جێگای جیاوازدا باسی ئەنجومــەنی فەرهــەنگی کــراوە و تەنانــەت نــاوی هێندێک لە بەرپرسانیشی تێدا هاتووە.

لە لاپــەڕە ١٢٤ تــا ١٢٦ی ئــەو کتێبــەدا ڕاپــۆرتێکی ڕێکــەوتی ١٩٤٥/٢/٦ی «شــەریپۆف»ی بەرپرســی کۆمەڵــەی پێوەنــدیی کولتــووریی سوڤــیەت لەگــەڵ ئازەربایجانی ئێرانی تێدا هاتووە کە چەند بەشی لێرەدا دەنووسینەوە:

«ئەوڕەحمانی زەبیحی و قاسمی ئێلخانیزادە ڕێکەوتی ٢ی شـوباتی ١٩٤٥ [هەینی ١٣ی ڕێبەندانی ١٣٢٣] هاتنە لام. داوایان لــێکــردم ئیجازەیــان بــدرێتێ ڕێکخراوی پەیوەندیی کولتووری لەگەڵ سۆڤیەتدا لە کوردستان دروست بکــەن و سەربەخۆیش بێ. کاتێک ئەم مەسەلەیەم بۆ جەنابی ئەوڕەحمانی زەبیحی ڕوون کردەوە و پێم گوت ئێمە ناتوانین پێشنیاری ئەوتۆ قبووڵ بکەین، زەبیحی گوتی: ئەگەر ئێمە لقێکی ئەم ڕێکخراوە پێــک بهێــنین و نــاوی لــێ بنــێین ڕێکخــراوی پەیوەندیە کولتووریەکان لەگەڵ سۆڤیەتدا. لە وەڵامی پرسیاری مندا کــە بــۆچی ئەوانە نایانەوێ ناوی لێ بنێین (کۆمەڵەی پەیوەندیــەکانی کولتــووریی ئێــران لەگەڵ سۆڤیەتدا). زەبیحی گوتی: ئێرانیەکان ئێمەیان خۆش ناوێ و ڕێزمان لــێ ناگرن و بە چاوێکی خراپ و سووکەوە سەیرمان دەکەن، لەبەر ئەوە ئێمــە حــەز ناکەین ناوی بەشی پەیوەندیە کولتووریــەکانی سۆڤــیەت و ئێــرانی پێــوە بــێ بەڵکوو باشترە ناوی (بەشی یــان لقــی کۆمەڵــەی پەیوەندیــە کولتووریــەکانی سۆڤیەت) بێ. من جارێکی تر هەوڵم دا بۆ «زەبیحی»ی ڕوون بکەمەوە کــە بــۆچی ئێمە پێشنیار دەکەین ناوی پەیوەندیەکانی کولتووریی ئێران لەگەڵ سۆڤــیەتدای پێوە بێ، ئەویش ئەوەیە کە ئێران دەوڵــەتێکی دۆســتە و نابــێ نکووڵــی لەمــە بکرێ، بە پێچەوانەوە ئەو پەیوەندیــە کولتووریانــەی کــە دروســتیان دەکــەین چەندیان پێ بچێ، دەبێ بەهێزتربن. بەکارهێنانی وشەی (ئێرانی) هەموو جارێک هەم زەبیحی و هەم ئێلخانیزادەی قەڵس و تووڕە دەکرد... لە وەڵامــی پرســیاری

سۆڤیەتدا دیاری کردووە، زەبیحی گوتی: برای گەورە جەنابی قاسمی ئیلخانیزادە. بەڕێز ئیلخانیزادە مرۆڤێکی زۆر رۆشنبیر و خوێندەوارە و زمانی عەرەبی و فارسی و کوردیش دەزانێ و خوێندەوارییی لە مەدرەسەی کۆنی کوردی وەرگرتووە. ئەمجارە رووم لە بەڕێز ئیلخانیزادە کرد و لێم پرسی: ئایا ئامادەیە ببێتە سەرۆکی لقی کۆمەڵەی پەیوەندیە کولتوریەکانی سۆڤیەت لەگەڵ ئێراندا لە مەهاباد؟ لە وەڵامدا گوتی: ئامادەیە ببێتە سەرۆکی بەشی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووریی سۆڤیەت لە مەهاباد. منیش گوتم داوات لێ دەکەم بەو چەشنەی کە من ناوی دەبەم ناوی بهێنی...»

لە لاپەڕە ١٥٠ تا ١٥٧ راپۆرتی قولییێف، جێگری کونسوولی گەورەی یەکێتی سۆڤیەت لە تەورێزی تێدا هاتووە کە دەڵێ رۆژی ٢٠ی شوباتی ١٩٤٥ (١ی رەشەمەی ١٣٢٣) قسەی لەگەڵ قازی محەممەد کردووە لە کاتی گەڕانەوەی لە تاران بەرەو مەهاباد و لە لاپەڕە ١٥٦دا لە زمان پێشەواوە دەڵێ: «لە تاران چوومە باڵوێزخانەی سۆڤیەت و لەگەڵ باڵوێزدا وتووێژم کرد و ئەم داوایانەی خوارەوەم خستە بەردەم: ١ــ رێکخستنی بەشی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووری سۆڤیەت لەگەڵ ئێراندا لە شاری مەهاباد ٢ــ کردنەوەی خولی فێربوونی زمانی رووسی...»

کاک دوکتور «ئەفراسیاو هەورامی» بۆ پەراوێزی کۆمەڵەی پەیوەندیەکان لە لاپەڕە ١٥٦دا دەڵێ: «سەرەڕای ئەوەی کە کوردەکان هەر لە سەرەتای هاتنی سوپای سوورەوە (ئابی ١٩٤١) بۆ ئێران، داوای دامەزراندنی کۆمەڵەی پەیوەندیی کولتووریی سۆڤیەت ـ کوردیان کرد، کەچی تەنیا مانگی ٣ی ١٩٤٥ نوێنەری سۆڤیەت بۆ ئەم مەبەستە هاتە مەهاباد. گەرچی لە زۆر شوێنی ئێران، بەتایبەت لە ئازەربایجان لەمێژ بوو ئەم کۆمەڵەیان دامەزراندبوو بۆ بڵاوکردنەوەی رۆژنامە و کتێب و فیلم و کردنەوەی خولی فێر بوونی خوێندن و نووسین و نەخشێکی بەرچاوی رۆشنبیریان لە ناو خەڵکدا هەبوو؛ بگرە کتێبی قوتابخانەی سەرەتایی و مامۆستای ئازەربایجانی لە ئازەربایجانی سۆڤیەتەوە هێنرابوون بۆ ئێران بەڵام بەداخەوە وەک هەمیشە درەنگ ئاوڕیان لە کورد دایەوە. لە نووسراوێکدا بۆ ئەو گروپەی کە هاتوون بۆ مەهاباد تا ناوەندی کولتووریی

سۆڤیەت لەوێ دابمەزرێنن، پاش گەڕانەوەیان بۆیان نووسراوە: نەدەبوایە ئێوە ئەو کارە بکەن، دەبێ کوردەکان خۆیان دەستپێشخەر و داوای ئەو کارە بکەن.»

لە لاپەڕە ١٥٧ هەتا ١٦٨ یادداشتێکی ڕێکەوتی ١ی ئەیاری ١٩٤٥ (١١ی ٢ی ١٣٢٤)ی سەر کۆنسوولی یەکێتی سۆڤیەت لە ورمێ واتە «هاشمۆف» زۆر بابەتی پێوەندیدار بە کۆمەڵەی پەیوەندی کولتووری و (ژ.ک) هاتووە کە لێرەدا دەقی نووسراوەکەی ناوبراو دەنووسینەوە.

لە لاپەڕە ١٥٧دا دەڵێ: «ڕۆژی ١٨ی نیسان [٢٨ی ١ی ١٣٢٤] من و هاوڕێ «شەریفۆڤ» بە مەبەستی ڕێکخستنی بەشی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووری بۆ مەهاباد ڕۆیشتن.» دواتر باسی دیداریان لەگەڵ فەرمانداری ئەوکاتی مەهاباد (سەریعولقەلەم) دەکا و لە لاپەڕە ١٥٨دا دەڵێ«... بەپێی ڕاگەیاندنی هاوڕێ شەریفۆڤ، ئێمە هاتووینە ئێرە بۆ کردنەوەی بەشی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانی کولتووری. فەرماندار لە وەڵامدا گوتی: لەمێژە قازی محەممەد ئەو کۆمەڵەیەی پێک هێناوە. ئەندامەکانی بازرگان و ئەوانەن کە لە قازی‌یەوە نزیکن و کاری نهێنی بە ناوی ئەو کۆمەڵەیەوە دەکرێ. جێی سەرنجە کاتی ڕۆیشتنمان بۆ فەرمانداری، کوردەکان لە هەموو لایەکەوە دەوری ماڵەکەیان دابوو و هەوڵیان دەدا گوێیان لە وتووێژەکانمان بێ. ئێمە سەعات ١٢ چووینە لای قازی و بۆ نانی نیوەڕۆ ماینەوە. کاتی مانەوەمان لە لای قازی هاتوچۆی پیاوە بەناوبانگەکانی کورد بەردەوام بوو. قازی محەممەد هەموو کاتێک وتووێژەکانی بەرەو سەربەخۆیی کوردستان دەبرد... (ل ١٦٠) پاشان ئێمە لەو کۆبوونەوەیەدا کە دەستەی سەرۆکایەتی کۆمەڵەی پەیوەندیەکانیان هەڵبژارد، ئامادە بووین. قازی محەممەد بە سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیە هەڵبژێردرا و محەممەدی کەیوانپوور بە جێگری. لەو کۆبوونەوەیەدا شاعیرانی کورد شێعری خۆیان لە سەر یەکێتی سۆڤیەت و ڕێبەرەکانی بە زمانی کوردی دەخوێندەوە. (ل١٦١) کۆبوونەوەکە لە دوو ژووردا بەردەوام بوو. لە ژووری یەکەم سەرکردە بەناوبانگەکانی کورد بە ساردییەوە پێشوازییان لەم هۆنراوانە دەکرد. بەڵام لە ژوورەکەی تر کە هەژارەکانی تێدا بوو بە چەپڵە لێدانی گەرم و پێشوازییان لە شاعیرانی ناوبراو کرد. لە دواییدا هاوڕێ شەریفوڤ دەستی بە قسە کرد سەبارەت بە ئەرکەکانی

کۆمەڵەی پەیوەندیـەکانی کولتـووری دەسـت لـە ژیـانی سیاسـیی کـوردان و بەتایبەتی (ژ.ک) وەردەدات. بە کۆتایی پێهاتنی کۆبوونەوەکـە قـازی محەممـەد داوای لێ کردین بچینە ژوورەکـەی تەنیـشت. لـەوێ چاومـان کـەوت بـە کـاک محەممەدی مامەش و مارفئاغای مەنگوڕ و پیرۆتئاغای مـەنگوڕ و عەبدوڵـڵای مەنگوڕ، بایزئاغای گەورک و کاک عەبدوڵڵای گەورک و کاک قادرئاغای گەورک. ئەمان بە ناوی (ژ.ک)وە داوای ئەم شتانەی خوارەوەیان لێ کردین: ١ـ تیپۆگـراف (دەزگای چاپکردن) ٢ـ دەزگای وەرگرتن و بلاوکردنەوەی رادیـۆیی. جگـە لـە وە دووبارە داوایان کرد راستەوخۆ نوێنەری ئێمە بۆ جێبەجێکردنی بازرگانیی نێوان کوردەکان و سۆڤیەت دیاری بکـرێ... دیـار بـوو ئامـادە بـوانی نـاوبراو هـیچ پەیوەندییەکیان بە کۆمەڵەی پەیوەندیـەکانی کولتـووری سۆڤـیەتەوە نـەبوو، ئەوانە تەنیا لە لایەن قازی محەممەدەوە هەڵبژێردرابوون بـە نـاوی کۆمەڵـەی (ژ.ک)ەوە وتووێژمان لەگەڵدا بکەن. لە کاتێکدا ئێمـە خـەریکی وتـووێژ بـووین لەگەڵ ناوبراوانی سەرەوەدا، قازی محەممەد میتینگێکی لـە سـەر شـەقام رێـک خستبوو. هەروەها هێندێ کەسیان هەڵبژاردبوو دەیانویست وێنەی ئێمـە بگـرن. کە ئەوەمان زانی بەخێرایی ماڵئاواییمان لە هەموان کرد و رۆیشتین...»

هەتا ئێرە ئەوەی روون و ئاشکرایە و لە یەکەم چاو پێخـشاندندا هەسـت پێدەکرێ ئەوەیـە کـە رووسـەکان زۆر درەنـگ بـەپیر داوای دامەزرانـدنی ئـەو کۆمەڵەیەوە هاتن هۆیەکانیشی چەند بابەتی سەرەکی بوون: ١ـ ئەوان لەمێژ بوو و لە خودایان دەویست کوردەکان داوای بنکەبەکی لەو چەشنە بکەن. لە بنەڕەتدا هەر بۆ ئەوەش هاتبوونە ئـەو ناوچەیـە. بـەڵام ئەگـەر زوو وەڵامـی داخـوازی کوردەکانیان (هەر نەبێ لـە کرانـەوەی ئـەو بنکەیـە) دابـاوە، ئـەوە ئـەوکات دەیانخستنە فکرەوە کە بۆچی وا زوو بە پیر داواکاریەکانمانەوە هـاتن؟ دەبـێ چ قازانجێکی ئەوانی تێدا بێ؟ لە وانەش گرینگتر ئەو ئاوڕدانەوەیەش پێوە دەچـوو کوردەکان داوای دیکەیان دەخستە بەر دمم رووسەکان. ٢ـ درەنگ وەڵام دانـەوەی رووسەکان بۆ کردنەوەی ئەو بنکەیە ئەو بیرەی لە نێو مێشکی کوردەکانـدا سـاز دەکرد کە ئەگەریش کوردەکان پێی بزانن، ئەوان (واتە رووسەکان) لە بنەوە و لە ژێر نـاوی کۆمەڵەی پێوەندی فەرهەنگیدا خەریکی چین، ئەوە هـەر بـۆ خۆیـان وەڵامی خۆیان بدەنەوە و بڵێن ئەگەر رووسەکان مەبەستیان بەرژەوەندی خۆیـان بووبا زۆر زووتر وەڵامی ئێمەیان دەداوە و تەنانەت بە بێ پرسـی ئێمـەش ئـەو

بنکەیان دادەمەزراند و ئەو هەمووە هاتوچۆ یەشیان پێنەدەکردین. ٣ـ کردنەوەی بنکەیەک ئەویش نـەک بـۆ یارمـەتی دان بـە کـورد لـە پێنـاوی گەیـشتن بـە ئامانجەکانیان بەڵکوو بۆ پەیوەندی فەرهـەنگی تـازە لـە ژێـر نـاوی کـورد و کوردستانیش دانا بەڵکوو لە ژێر ناوی «کۆمەڵەی پێوەندی فەرهـەنگی ئێـران و شووڕەوی، هیچ گلەییکی دوایەشی لە لایەن دەوڵەتی ناوەنـدی «ئێـران»ەوە بـە دوادا نەدەهات. پێکهاتنی رووسەکان لەگەڵ قەواموسەلتەنە لە پێناو وەرگـرتنی ئیمتیازی نەفتی باکوور تەواو ئەو داوایەمان دەسەلمێنێ. ٤ـ ئەوە شتێکی حاشـا هەڵنەگرە کە رووسەکان لەو بنکەیەدا و لە ژێر ناوی پێوەندی فەرهەنگیدا تـەنیا یەک مەبەستیان (هەر نەبێ هەتا ملدانی ئێران بـە دانی ئیمتیازێـک) هـەبووە، ئەویش هەڵوەشاندنەوەی «کۆمەڵەی ژ.ک»ە.

راپۆرتەکەی «هاشمۆف» و قسەکانی «شەریفۆف» لە رێوڕەسمی کردنەوەی کۆمەڵەی پەیوەندی فەرهەنگی مەهاباد کە لە بەشێکیدا دەڵێ: «لە دواییدا هاوڕێ شەریفۆف دەستی بە قسە کرد سەبارەت بە ئەرکەکانی کۆمەڵە. پیاوەگەورەکانی کورد وتەکانی ئەویان بە دڵ نەبوو...» لە لایەک و هەڵوەشـانەوەی «کۆمەڵـەی ژ.ک» دوای کەمتر لە ساڵێک تێپەڕ بوون لە کرانەوە و دامەزراندنی ئـەو بنکەیـە لە مەهاباد، ئەو بۆچوونانەمان دەسەلمێنن. قسەکانی «شەریفۆف» لە مەڕاسمی کرانەوەی کۆمەڵەی پەیوەندی ئێران و شووڕەویدا سەبارەت بە ئەرکەکانی ئـەو کۆمەڵەیە ئەوەندە قورس و گران بـووە کـە تەنانـەت «هـاشمۆف» لـە چـاوی بەشدارانیدا خوێندوویەتەوە کـە: «پیـاوە گـەورەکانی کـورد وتـەکانی ئـەویان [شەریفۆف] بە دڵ نەبوو، لەبەر ئەوەی [پێیان وابوو] کۆمەڵەی پەیوەندیـەکانی کولتووری دەست لە ژیـانی سیاسـی کـوردان و بـە تایبـەتی کاروبـاری (ژ.ک) وەردەدات.

لەبەر ئەوەی کە باسی خوێندنەوەی شێعرێک هاتووە کـە بەشـداران بـە دڵیان نەبووە، ئەگەرچی لـە لاپـەڕە ٢١٦ی ئـەم بەرهەمـە (سـێبەری ئـازادی)دا باسمان کردووە کـە ئـەوە شـێعری «مامۆسـتا هـێمن»ە بـەڵام لێـرە هـەمووی دەنووسینەوە. دواتر دەگەڕێینەوە سـەر کتێبەکـەی کـاک دوکتـور «ئەفراسـیاو هەورامی» و لە بەڵگەکانی کتێبەکەی بۆ شیکردنەوەی مەبەستی رووسـەکان لـە دامەزراندنی کۆمەڵەی پێوەندی فەرهەنگی ئێران و شووڕەوی کەلک وەردەگرین.

هەروەک پێشتر کوتمان لە لاپەڕەکانی ١٦٠ و ١٦١ی سەرچاوەی پێشوودا «هاشمۆڤ» لە راپۆرتەکەیدا باس لە خوێندنەوەی شێعر لە لایەن شاعیرانی کورد دەکا. لە لاپەڕە ٢١٦ی (سێبەری ئازادی)دا گوتوومانە کە یەکێک لەو شێعرانە شێعری «بەهاری زانین»ی «مامۆستا هێمن»ە. ئەو شێعرە لە لاپەڕە ١٨ی ژمارە ١ی گۆڤاری «هەڵاڵە» چاپ کراوە و لە ژێر سەردێڕەکەشی نووسراوە: «بە بۆنەی کردنەوەی رەوابیتی فەرهەنگی لە مەهاباد خوێندراوەتەوە».

ئێمە تەنیا دوو بەیتمان ئاماژە پێکردووە لێرەدا هەموو شێعرەکەی لەبەر گرینگی بابەتەکە دەنووسینەوە:

ئەوە هات مانگی خۆشی خاکەلێوە     ئەما سەرما و بۆران و کرێوە
پەڵەک رەش کەوتە کوێستانی وڵاتمان     بە با و باران و لەنگێزە و شڵێوە
لە کێو و کەژ گیا و گژ بەبارە     ئیتر دەرچوو مەڕ و ماڵات لە لێوە
لە لێوی جۆگەلە مێلاقە ئەوڕۆ     لە گوێن سەربازی سوور وێستا بەپێوە
نەوەک کاکۆڵی یارم بەڵکە سونبول     وەکوو ژاپۆن و ئاڵمانێ پەشێوە
نە هەر دێوانە بۆ سەیر و تەماشا     ئەوێستا عاقڵ و زاناش لە کێوە
تەماشای مامی جووتێرکە لە دەشتا     بە دڵگەرمی خەریکی وەرد و شێوە
بەهارە گوڵ سەری هێنا دەرێ تۆش     هەڵستە کوردە چیدی سەر مەنێوە
هەموو قەومێک وەسەرکەوتووە لە هەوراز     بەشی تۆ کوردە تاکەی هەر نشێوە
بخوێنە فکری زانست و هونەر بە     لە لای کوللی کەسێ جاهیل دزێوە
وەرە فێری تەمەددون بە عەزیزم     هەتا خەڵکی نەبێژن کوردە دێوە
مەبە مەئیووس و ئومێدت قەوی کە     فریشتەی جوانی سەربەستیت بەڕێوە
ئەوەندەت فەرقە ئازاد نی وەکوو خەڵک     دەنا فەرقت نییە زەڕێک بە شێوە
ئەوەش موژدەت دەمێ هەر بەو زووانە     دەبێ ساز، هەڵپەڕە جا تۆش لە جێوە
هەتا پێێک لە بێرلین بچنە پێشێ     سوپای سوور دێتە پێش ئازادی ئێوە
بژی مارشاڵ ستالین پێشەوای رووس     کە ئازادی لە گیتیدا بەشێوە

لە لاپەڕە ١٦٧ و ١٦٨ی کتێبەکەی کاک دوکتور «ئەفراسیاو هەورامی» (رۆژهەڵاتی کوردستان...) و لە درێژەی راپۆرتەکەی «هاشمۆڤ»دا هاتووە: «تێکهەڵچوونی کوردان لە ناو خۆیاندا زۆرتر بە پیلانی ئێرانیەکانە کە

مەبەستیان بێهێز کردنیانە. ئیشی ئێمە بۆ چوونە ناو کوردان هێشتا تەواو نییە. ئێمە هیچ رێکخراوێک (قوتابخانە ـ نەخۆشخانە)مان لە ناوچەی کونسولخانەکە نییە کە بتوانین لە رێگەی ئەوانەوە بچینە ناو خەڵک و لە ناو خێزانەکان و لاوەکاندا کاریگەر بین. ئێمە لە مەهاباد کە ناوچەیەکی گرینگە، نوێنەرێکمان نییە تا بتوانێ لە رووداوە سیاسیەکانی ئەم ناوچەیە ئاگادارمان بکاتەوە.»

ئەوەش بەڵگەیەکی دیکەیە بۆ سەلماندنی ئەو داوایە کە رووسەکان بۆ کەلک وەرگرتن لە سەرچاوەکانی ئەم ناوچەیە ئامادە بوون بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان دەکاری بێنن، دروست هەروەک ئەوەی کە پێشتر لە لاپەڕە ١٥١ و ١٥٢ی ئەم بەرهەمە (سێبەری ئازادی)دا باسمان کرد. خودی رووسەکان دەڵێن کە ئێمە بۆ ئەوەی خەڵک نەزانن (لە شاری میانە) خەریکی چین کۆمەڵەی پێوەندی فەرهەنگیمان لێ دانا و هەموو رۆژێ تاقمێک لە کارناسانی رووسی بە کێوانەوە بوون بۆ دیتنەوەی زەخیرە ژێر زەوییەکان.

«ئارچی باڵد رۆزوێلت» لە لاپەڕە ٣٢٧ هەتا ٣٥١ی کتێبی «شوق آموختن»، بەشێکی بە کۆماری کوردستان تەرخان کردووە. ناوبراو جێگری وابەستەی نیزامی باڵوێزخانەی ئامریکا لە تاران و یەکێک لەو چوار ئامریکاییانە بووە کە لە سەردەمی کۆماری کوردستان لەگەڵ «قازی محەممەد» وتووێژ و دیداریان هەبووە. ناوبراو لە مانگی سێپتامبری ١٩٤٦ سەردانی مەهابادی کردووە. ئەو چەند دێڕەی خوارێ کورتەیەکە لە گرینگترین بابەتەکانی پێوەندیدار بە باسەکانی ئێمەوە.

لە لاپەڕە ٣٢٨دا دەڵێ: «لە ئاوریلی ١٩٤٥، رێکخراوی تەبلیغاتی شووڕەوی واتا «خانووی وێکس» VOKS لە رێوڕەسمێکدا «ئەنجومەنی فەرهەنگی شووڕەوی ـ کوردستان»ی لە مەهاباد دامەزراند. یەکێک لە گرینگترین بەرنامەکانی، پێکهێنانی شانۆیەکی نەتەوەخوازیی کوردی بوو...» لە لاپەڕە ٣٢٩شدا دەڵێ: «لە نۆوامبری ١٩٤٥، قازی، سەرۆک‌عەشیرەت و پیاوماقووڵانی شاری بۆ ناوەندی تازەی فەرهەنگیی شووڕەوی و کوردستان بانگێشتن کرد. ئەو هەر لەو کۆبوونەوەدا دامەزراندنی «ح.د.ک»ی راگەیاند...» لە لاپەڕە ٣٤٢ و ٣٤٣شدا دەڵێ: «من لە راپۆرتەکەمدا بۆ

لەو ماوە کورتەیدا کە لە مەهاباد دەریانبڕیبوو، ئاوا لێکداوە: ئەوان لە شوورەوییەکان مەمنوون بوون کە سەربەخۆیی بۆ مەیسەر کردبوون، بەڵام سوور بوون لە سەر ئەوەی شوورەوییەکان دەست لە کاروباری وڵاتەکەیان وەرنەدەن و مەئموورەکانیشیان لە نێو شاری نەبن... (ل٣٤٣) سەر لەبەیانی ١٦ی سێپتامبر [٢٥ی خەرمانانی ١٣٢٥] چووین سەردانی چاپخانەی مەهابادمان کرد کە رۆژنامەی رۆژانەی «کوردستان» و چەند گۆڤاری بەتیراژی کەم بە زمانی کوردی تێدا چاپ و بڵاو دەکراوە... بەرپرسی چاپخانە دەزگای چاپەکەی نیشان داین کە لە جۆری «رۆتاری» بوو و بەرواڵەت رووسیا سازی کردبوو. ئەگەرچی هێندێک لە پارچەکانی ئەو دەزگایە مارکی ئاڵمان یان چکۆسلۆواکی پێوە بوو. ئێمە چەند نوسخە لە تەواوی ژمارەکانی رۆژنامەکانی «کوردستان»مان لە دەسپێکی بڵاوبوونەوەی وەرگرت و هەروەها چەند گۆڤار و دیوانی شێعریمان بو بەرپرسی زانیاری بەڕێ کرد. هەر دوای ئەوەی کوردەکان زانیان ئێمە پێوەین بڕۆین، هاتنە لامان و گوتیان کە قازی محەممەد بۆ نانی نیوەڕۆیە بانگهێشتنی کردووین. بەو جۆرە ئێمە دیسان لە دەفتەری قازی محەممەد قسەمان لەگەڵ کردەوە. ئەوجار زۆربەی قسەکانمان، هەر بابەتەکانی فەرهەنگی بوون. ئەو گوتی: «خۆشحاڵم کە ئێوە نوسخەی بڵاوکراوەکانی ئێمەتان وەرگرتووە. چونکە پێم خۆشە وڵاتە یەکگرتووەکان هەموو شتێک سەبارەت بە کوردستان بزانێ. من شتێکم بۆ شاردنەوە نییە...» لە لاپەڕە ٣٤٧یشدا، باسی دیداری رۆژی ٢٨ی دێسامبری خۆی لەگەڵ دوکتور «ئەردەڵان»ی دۆستی خۆی کە بەرپرسی رۆژنامەی «کووهستان» بوو، دەکا و لە زمان وێوە دەڵێ کە چاپخانە[ی کوردستان] داخراوە. ئەوەی لەو کتێبەدا دەتوانین بۆ ئەم بەشە کەلکی لێ وەرگرین، بەکورتی ئەوەیە کە: ئەنجومەنی فەرهەنگی سۆڤیەت و کوردستان لە ئاوریلی ١٩٤٥ لە مەهاباد دامەزراوە. دەزگای چاپخانەی «کوردستان»یش لە جۆری «رۆتاری» بووە، ئەگەرچی بە نووسراوە لە رووسیا ساز کراوە بەڵام چەند پارچەیەکی ئاڵمانی و چکۆسلۆواکی پێوە بووە.

هەڵبەت لە لاپەڕە ١٧٥ هەتا ٢٠٧ی بەشی کۆتایی کتێبی «کردها و کردستان» نووسراوی «دریک کینان»یش بۆ وتاری «جمهووری مەهاباد»ی نووسراوی «ئارچی باڵد رۆزوێڵت» تەرخان کراوە. لێرەدا لەبەر گرینگی چەند

بابەتێکی ئەو کتێبە، هێندێکی لێ دەنووسینەوە: لە لاپەڕە ١٨٠ و ١٨١دا باسی «ئەنجومەنی فەرهەنگی سۆڤیەت» دەکا و دەڵێ: «لەو قۆناغەدا وێکس VOKS ڕێکخراوی نەتەوەیی تەبلیغاتیی شووروەوی، بەرپرسی دامەزراندنی چەند بنکەیەکی «ئەنجومەنی پێوەندییەکانی فەرهەنگی ئێران و شووروەوی» لە ناوچەکانی ئێران بوو. چونکە کۆمەڵە [ی ژ.ک] پتر لەوە گەشە و پەرەی گرتبوو کە بتوانێ وەک رابردوو کۆبوونەوەکانی دەنێو ماڵاندا درێژە پێبدا، ڕێبەرەکانیان داوایان لە شووروەوی کرد، لقێکی ئەو ئەنجومەنە لە مەهاباد بکەنەوە. هیوادار بوون لەو ڕێیەوە، شوێنێک ببیننەوە کە لەوێ لێکتر کۆ ببنەوە و کەسیش سرنجیان نەداتێ و شکیان لێ نەکا. رووسەکان بەپەلە بەپیر داواکەیان هاتن و ئەنجومەنی ناوبراویان دامەزراند؛ ئەویش نە لە ژێر ناوی «ئەنجومەنی پێوەندییەکانی فەرهەنگیی ئێران و شووروەوی»، بەڵکوو بە ناوی «ئەنجومەنی پێوەندییەکانی فەرهەنگیی کوردستان و شووروەوی». بنکەی ئەو ئەنجومەنە زۆر زوو بۆ بە مەکۆیەک و کوردەکان بە ناردنی دە سندووق سیغاری سازکراو لە توتنی کوردی بۆ پارێزەرانی سەرکەوتووی لێنینگراد، ئەمەگداری و حەقناسی خۆیان لە بەرامبەر پشتیوانە نوێیەکەیان دەربڕی. سەرەنجام لە مانگی ئاوریلی ١٩٤٥دا و لە ڕێوڕەسمێک کە لە بنکەی ئەنجومەن بەڕێوە چوو، کۆمەڵە [ی ژ.ک] ئاشکرا هاتە مەیدان. کونسوولی یەکێتی سۆڤیەت لە ورمێ و سەرۆکی «وێکس»ی ئازەربایجان لە میوانانی فەخری ئەو ڕێوڕەسمە بوون. بەشی سەرنجڕاکێشی ئەو بەرنامەیە، بەڕێوەچوونی «ئۆپێرا»یەک بوو کە لەودا ژنێک بە ناوی «دایکی نیشتمان» دەوری دەگێڕا... لە جەنگەی ئەو ڕێوڕەسمەدا بوو کە «قازی محەممەد»، سەرۆکی داهاتووی وڵاتی کورد، بوو بە ئەندامی کۆمەڵە[ی ژ.ک]...»

لە لاپەڕە ١٨٤ و ١٨٥یشدا، باسی دامەزراندنی (ح.د.ک) و بەیاننامە هەشت خاڵەکەی ئەو حیزبە دەکا و دەڵێ ئەم بەیاننامە کە ئیمزای قازی محەممەد و ١٠٥ کەس لە پیاوە ناسراوەکانی کوردی پێوە بوو، بلاو کراوە.»

# ناوی نهێنی ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک)

لە لاپەڕە ۲۳۲ هەتا ۲۵۱ی ئەم بەرهەمەدا ناوی نهێنی ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک)مان ناساندووە. لە هێندێک لەو ناوانە هەڵە و لە هێندێکیشیان کەموکووڕی هەیە. جا بۆ پوختەتر کردنی ئەو بەشەش لە کتێبی «رۆژنامەی کوردستان» و چەند سەرچاوەیەکی دیکە کەلک وەردەگرین. بەو هیوایەی دوای ئەو زیادکردن و راستکردنەوانەش لە لایەن خوێنەرانەوە زانیاری نوێیان بخرێتە سەر.

لە لاپەڕە ۲۳۵ی ئەم بەرهەمە و لە ریزی ۲۵دا نووسیومانە: «ح. خەمناک، ح. قزڵجی» ناوی نهێنی «حەسەنی قزڵجی»ن. بەڵگەشمان هێناوەتەوە کە لە ل٥ی پێشەکی "ئاڵەکۆک"و گۆڤاری «هەڵاڵە»دا بەو ناوە نووسینی هەیە. بەڵام لە لاپەڕە ۱۷ی کتێبی «رۆژنامەی کوردستان»دا بۆ ناساندنی کەسایەتی و ناوی نهێنی مامۆستا «حەسەنی قزڵجی» نووسراوە: «کە کۆمەڵەی ژ.ک دامەزراوە، بووە بە ئەندامی بە ناوی نهێنی «ژیر» چالاکانە کەوتووەتە کاری حیزبی...» ئەگەرچی لە لاپەڕە ۲۳۵ی (سێبەری ئازادی)دا کاک «عوبەیدیللا ئەیووبیان» دەڵێ «ژیر» ناوی نهێنی «سەید ساڵحی ئەیووبیان»ە، بەڵام وێدەچێ بەپێی ئەو پێشەکییە کە مامۆستا هێمن بۆ کتێبی «پێکەنینی گەدا»ی مامۆستا «حەسەنی قزڵجی» نووسیویەتی (ژیر)یش ناوی نهێنی مامۆستا حەسەنی قزڵجی بێ.

لە لاپەڕە ٢٤٧ و ٢٤٨ی (سێبەری ئازادی)دا گوتوومانە کە بۆمان روون نەبۆوە «ئا.ک: پشتیوان ١٠٤٢» و «ئا.ک.ع: مرۆ ٦٧» کێن و ناوی نهێنی چ ئەندامێکن. بەڵام بە ئاوڕدانەوەیەک لە لاپەڕە ٣ی ژمارە ٢ی «رۆژنامەی کوردستان» کە کەوتۆتە لاپەڕە ٧ی کتێبی «رۆژنامەی کوردستان»، ئەو ناوانەشمان بۆ ئاشکرا دەبێ.

لەو ژمارەیەدا شێعرێکی مامۆستا «هەژار» لە ژێر ناوی «هەژار و مانگی بەفرانبار» چاپ کراوە و بۆ پێشەکی شێعرەکەشی ئەو چەند دێڕە نووسراوە: «لە کاتێکا دوو برای خۆشەویست و ئەندامی بەرزی کۆمەڵەی (دێموکڕات) «مرۆ» و «پشتیوان» لە سەفەری کابەی هاتنەوە بۆکان، (هەژار) ئەو شێعرانەی خوێندەوە».

شێعرەکەش بەو بەیتە دەست پێدەکا:

«بەفرانبار خۆ تۆش چەن هەزار ساڵە     وەکوو گەلی کورد ژیانت تاڵە»

لە بەشێکی دیکەشدا دەڵێ:

«گەلێک لەمێژ بوو وەڵاتی کوردان     دیل و یەخسیر بوو بە دەس نامەردان
ژین و دارائی، دین و پیاوەتی     بۆ کورد نەمابوو لە سەتی سەتی
لە ناو موکریان کۆمەڵێکی چاک     لێک کۆبوونەوە لە لاوی خوێنپاک
بۆ رزگار بوون و نەجاتی وەتەن     تێکۆشین بە ماڵ، بە رووح و بەدەن
لە نێو ئەوانیش نەخوازا (لاوێک)     نەسرەوت لە رێی (نیشتمان) تاوێک
کاکە (رەحمانی ئێلخانی زادە)     لە خزمەتی وی (نیشتمان) شادە
تووش بوو لە رێیدا بە هەزار کلۆ     هەتا (برای راست) خۆی کردە (مرۆ)
ئەم لە رێی وەتەن هەڵکرا چرای     بوو بە (پشتیوان) ئامۆزای برای
کاتێ زەمینەی کارەکە چنیا     وێکڕا گرتیان لای (خوداو) دنیا
(مرۆ و پشتیوان) بوو مەکە ئەوی     لە وەتەن دامان روو بە شوورەوی...»

ئەوەی تا ئێستا لەو شێعرە بۆمان روون بۆتەوە، ئەوەیە کە «برای راست» و «مرۆ» هەردووک ناوی نهێنی «رەحمانئاغای ئێلخانیزادە»ن.

بەڵگەی دووهەممان لاپەڕە ٥ی ژمارە ٧و٨و٩ی گۆڤاری «نیشتمان»ە کە

لەودا وتارێک لە ژێر سەردێری [illegible]

نهێنی «ئا: ک.ع. مرۆ ٦٧» نووسیوە. ژمارەی ئەندامەتی (٦٧) لە لاپەڕە ٣ی ژمارە ٢ی گۆڤاری «نیشتمان»یشدا هاتووە و نووسراوە: «لە شاری (ک ـ K) «برای ڕاست» ئەندامی ژمارە ٦٧ سەرۆکی ئیدارەی محەللی ئەم شارە ٤ دیناری عێراقی (٥٠٠ ڕیاڵ)ی بۆ کۆمەکی چاپخانەی ناردبوو وەرمانگرتووە.»

دیسان لە لاپەڕە ٥ی ژمارە ٣و٤ی گۆڤاری «نیشتمان» لە وتاری «کوردی دەبێ چۆن بنووسرێ؟» بۆ ناوی نووسەرەکەی نووسراوە: «ئا.ک: برای ڕاست ـ ٦٧» لە پشتی بەرگی ژمارە ٦ی گۆڤاری «نیشتمان» و لە ڕیزی ژمارە ٨دا «دەسیاوی بۆ چاپ» ناوەکەی بەم چەشنە هاتووە: «ڕ. برای ڕاست».

هەروەک دیتمان لە هەر دووک ناوە نهێنییەکەدا ژمارەی ئەندامەتی ٦٧ نووسراوە بۆ ناوی چکۆلەش جارێک (ڕ. برای ڕاست) و جارێکیش (ع.مرۆ) هاتووە کە مەبەست لە (ڕ) و (ع) یەکەم پیتی ناوەکانی ڕەحمان یا عەبدوڕڕەحمانە.

هەڵبەت با ئەوەش بڵێین کە چوونی ئەم دوو کەسە بۆ سەفەری حەج شتێک نەبووە کە تەنانەت ئینگلیسیەکانیش نەیانزانیبێ. بۆ ئەو بابەتە ئاوڕێک لە لاپەڕەکانی ١٧٣ و ١٧٤ی کتێبی «ڕۆژهەلاتی کوردستان لە بەلگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی بریتانیادا» دەدەین بزانین لەو بارەوە چی نووسیوە: لە بەشێکی ڕاپۆرتی «٢٢ی سێپتامبر تا ٣ی ئۆکتۆبری ١٩٤٥»دا هاتووە: «سمایل ئاغا کوڕی مەحموودئاغا [ئێلخانیزادە] و ڕەحمانئاغای کوڕی حاجی بایزئاغا [موهتەدی] سەردانی عێراقیان کردووە کە دەڵێن لە سەر ڕێگای چوونیان بۆ مەککەدا بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ پاسپۆرتێکیان نەبووە، چاوەڕاوی ئەوە هەیە کە سەفەرەکەیان لە پێوەندی شەڕی بارزاندا بووبێت...»

لە لاپەڕە ٢٤٧ی (سێبەری ئازادی)دا بۆ «ئا.ک: پشتیوان ١٠٤٢» نووسیومانە: «بۆمان ڕوون نەبۆوە کێیە». ئەو ناوە لە لاپەڕە ١١ی ژمارە ٦ی گۆڤاری «نیشتمان»دا هاتووە. بۆ ڕوونبوونەوەی ئەو ناوەش جگە لەو شێعرەی مامۆستا هەژار، بەڵگەیەکی دیکەشمان هەیە، ئەویش لاپەڕە ٦١ی کتێبی «ڕۆژنامەی کوردستان»، یا هەمان لاپەڕە ١ی ژمارە ١٦ی «ڕۆژنامەی کوردستان»ە. کە لە سەردێڕی وتارێکدا نووسراوە: «وتاری برای «پشتیوان» ئیسماعیلی ئێلخانیزادە».

که وایه به ئەرخەیانی دەتوانین بڵێین: «ئـا.ک پـشتیوان» نـاوی نهـێنی «ئیسماعیلی ئێلخانیزاده»یه. ژمارەی ئەندامەتیشی ١٠٤٢ بووه.

له لاپەڕه ٢٣٩ی (سێبەری ئازادی)دا و له ریـزی ٥٧ی لیـستی ئەندامانـدا نووسیومانه «ئاواڵ» ناوی نهێنی «مستەفا ساوجبلاغی»یه، بـەڵام بـەپێی ئـەو بەڵگەی خوارێ، ئەم هەڵەیه راست دەکەینەوه. له لاپەڕه ٩٧ی کتێبی «رۆژنامەی کوردستان»دا که هەمان لاپەڕه ٥ی ژماره ٢٤ی «رۆژنامەی کوردستان»ه، هاتووه: «جێژنێک که به ئیفتیخاری پێشەوای بەرزی کوردستان رۆژی ١٩ی رێبەنـدان لـه تەڕەف تەواوی ئاغایانی بەگزاده له «یەکشەوه» کـرا.» دواتـر دەڵـێ: «ئاغـای عەبدوڵڵا نیرومەند نووسەری حیـزبی یەکـشەوه ئـەم شـێعرانەی خوێنـدەوه.» شێعرەکه بەو بەیته دەست پێدەکا:

له پاش حەمد و سەنا و تەوسیـفی زاتـی سوبحانی
دەکەم نەعتی رەسووڵی ئەکرەم و وەسفی سەحابانی

له بەیتی کۆتاییشدا دەڵێ:

«ئەگەرچی تەبعی (ئاواڵ) پیر بووه وەک خۆی له داخانا
لەبـەر ئـەم جێژنه هێناویەتۆ دیسان له نـوێ جـوانی

له لاپەڕه ٣ی ژماره ٧و٨و٩ی گۆڤاری «نیشتمان»دا شێعرێک له ژێر نـاوی «راسپێری شەماڵ بۆ کورد» چاپ کراوه که ئاوا دەست پێدەکا و دەڵێ:

«سـرووەی شـەماڵ لـه کـاتی بـەیانا کـه رادەبـرد
دوێنـێ وتی لـه قـەولی منـەوه تـۆ بـڵێ بـه کـورد
پێرێکـه مـن لـه مەجلـسی میللـی لـه ئانقـەره
گوێم لـێ بـوو ترکـەکان هـەموو تـەدبیریان دەکـرد
پـێیـان وەهایـه میللـەتی کـوردی لـه رووی زەوی
هەرچی هەیه لـه نـاوی بـەرن زۆر بـه دەسـتوبـرد
ئـەم کـوردە بـێسـەروبەره بـۆ بوونـه جوولەکـه
بمرن! گـەلێ زۆر باشـتره لـەم ژینـه قـەومی کـورد
«ئـاواڵ» حـەرامی کـردووه ماڵـی خـودا لـه خـۆی
تـاکوو نـەکا زیـارەتی (بیـتالحـرم)ی کـورد»

لە ژێر شێعرەکەشی نووسراوە: «ئا.ک: ئاواڵ».

پێشتر گوتمان مەبەست لە «ئا.ک» رەمزی شاری بۆکانە. «یەکشەوە» دێیەکی پەنا ئەو شارەیە. هەروەک دیتمان «ئاواڵ»ی شاعیر لە هەردووک بڵاوکراوەکەدا (نیشتمان و کوردستان)، هەستی میللی تێکەڵ بە هەستی ئایینی کردووە. هەر بۆیە بە روونی و ئەرخەیانی دەتوانین بڵێین «ئا.ک. ئاواڵ» ناوی نهێنی کاک «عەبدوڵلا نیروومەند»ە.

لەو ژمارانەشدا ناوی چەند کەسێک هاتووە کە دەبنە پاڵپشتێک بۆ ئەو بۆچوونانەی ئێمە و لە راستییان ئەرخەیان دەبین.

لە لاپەڕە ٣ی ژمارە ٢٨ و لاپەڕە ٢ی ژمارە ٣٢ی رۆژنامەی «کوردستان» «بەیان» نازناوی شێعری و ناوی نهێنی «محەممەدئەمینی خاتەمی»یە کە لە لاپەڕە ٢٣٥ی (سێبەری ئازادی)دا ناوی هاتووە.

لە لاپەڕە ٢ی ژمارە ٣٣، نازناوی شێعر و ناوی نهێنی «خاڵەمین» (خاڵە)یە کە لە لاپەڕە ٢٣٥ی (سێبەری ئازادی)دا ناوی هاتووە.

لە لاپەڕە ٤ی ژمارە ٥٥ی رۆژنامەی «کوردستان»دا «زرینگ» نازناوی شێعری مامۆستا «سەید کامیلی ئیمامی»یە کە ئێمەش لە لاپەڕە ٢٤١ی (سێبەری ئازادی)دا بە ناوی نهێنی (کۆمەڵەی ژ.ک)یمان داناوە.

لەو دواییانەدا کتێبی «بیرەوەریەکانی محەممەدی شاپەسەندی» چاپ و بڵاو کراوە. لەو کتێبەشدا باسی ناوی نهێنی چەند کەس لە ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) هاتووە کە ئەوانیش دەخەینە سەر لیستی پێشوومان.

کاک «محەممەدی شاپەسەندی» لە لاپەڕە ٢٤ی بیرەوەرییەکانیدا باسی ئەوە دەکات کە بە هۆی کاک «دڵشادی رەسووڵی»یەوە چووەتە نێو ریزی ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ.ک) و بە ئامادە بوونی کاک «عەلی رێحانی» و «عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی» و «دڵشادی رەسووڵی» لەماڵی کاک «عەلی رێحانی» مەڕاسیمی سوێندخواردنی بەجێهێناوە. بۆخۆی سەبارەت بەو باسە دەڵێ: «هەر لەو مەڕاسیمەدا من ناوی نهێنی «م.ش. ئازەر»م بۆخۆم هەڵبژارد، باوکم ناوی «بازرگان»ی بۆخۆی دیاری کرد.» لە لاپەڕە ٣٢شدا دەڵێ: «سوێندەکەم لە بەردەم دڵشادی رەسووڵی و عەلی رێحانی و سەدیقی حەیدەری و پێنج کەسی تردا خوارد واتە هەشت کەس لە سەرانی کۆمەڵە. ئەمەش لە ماڵی

«عەلی ڕێحانی» بوو کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی «ژ.ک» کەچی بەداخەوە تا ئێستاش باس نەکراوە.»

لە لاپەڕە ٤٦ی بەشی پاشکۆی ژمارە ٢شدا نووسیویەتی: «من و باوکم لە یەک کاتدا و شوێندا بووینە ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک. باوکم پێش من سوێندی ئەندامێتیی خوارد. ژمارە ئەندامێتیی باوکم ٨٢٠ و ناوی نهێنی «بازرگان» بوو. ژمارەی ئەندامێتیی خۆشم ژمارە ٨٢١ و ناوی نهێنیم «م.ش. ئازەر» بوو».

ئەوەی پێویستە لەو قسانەی کاک «محەممەد»ی زیاد کەین ئەوەیە کە ناوی باوکی کاک «محەممەدسالحی شاپەسەندی» بووە.

لە لاپەڕە ٢٧ی بەشی پاشکۆی ژمارە ١دا سەبارەت بە ناوی نهێنی «قازی محەممەد» دەڵێ: «قازی محەممەد کە هاتە ڕیزی «ژ.ک» لە پێشدا ناوی «یەزدی»ی بۆخۆی هەڵبژاردبوو، بەڵام پاش بەینێک نە خۆی نە برادەران ئەم ناوەیان پێ باش نەبوو، وا بوو گۆڕیی بە (بینایی)».

بۆ ئەوەش هەر ئەوەندە زیاد دەکەین کە ئەگەر «یەزدی» ناوی نهێنی هەوەڵ جاری «قازی محەممەد» بووبێ، ڕەنگە پێشەوا لەبەر گەورەیی و نەترسی شاعیری بەناوبانگی ئێرانی واتا «فەڕوخیی یەزدی» ئەو ناوەی بۆ خۆی هەڵبژاردبێ.

لە کۆتایی ئەو باسەشدا ئەو ناوە نهێنییەش بە لیستی ئەندامانی دەستەی لاوانی کۆمەڵەی (ژ.ک) زیاد دەکەین کە کاک «عوبەیدیللا ئەییووبیان» دەیگوت: «عەبدوڕڕەحمانی لەشکری» ئەندامی دەستەی لاوان و ناوی نهێنی «ئاریانا» بووە و ژمارە ئەندامەتیشی ٣ بوو.

# ناساندنی میرزا قاسمی قادری قازی

«لەمێژ بوو پێوە بووم لەسەر کەسایەتی «میرزا قاسمی قادری قازی» کە نێوەنێوە لە سەرچاوەکاندا باسی دەکرا، زانیاری ورد و دروست وەدەست بێنم. ئەوە بوو رێکەوتی ١٣٨٧/٦/٢٢ی هەتاوی بەرامبەر بە ٢٠٠٨/٩/١٢ ، وێڕای کاک تاهیری کەریمی چووینە خزمەت «فاتمە خانمی قادری قازی»، کچی خوالێخۆشبوو و «میرزا عەبدولغەفووری قادری» هاوسەری و ئەم وتووێژەمان لەگەڵ پێکهێنا. فاتمە خانم لە دایکبووی ساڵی ١٣١٤ی هەتاوییە و دانیشتووی شاری مەهابادە. لێرەدا دەقی تەواوی ئەم دانیشتنە وەک خۆی دەنووسمەوە و پێشکەشی خوێنەرانی دەکەم.

«بابم (قاسمی قادری قازی) کوڕی «قازی قادر» بوو. «قازی قادر»ی باپیرم خەڵکی دێهاتی «باخچە» و «سەرباخچە»ی مەنتەقەی «محاڵ» بوو، بەڵام بابم لە مەهاباد لە دایک بووە. دایکی ناوی «ئامینە»خانم و خێزانیشی (دایکی من) ناوی «خانمە» و خەڵکی گوندی «قۆڵغەتەپە» بوو. بابم پێنج منداڵی (کوڕێک و چوار کچ) هەبووە، چواریان بە منداڵی مردن و من تاقانە مامەوە. «میرزا سەعید»ی برای بابم لە شەڕی دژ بە رووسەکاندا کوژرا.

بابم سێهەم کەس لە پێکهێنەرانی کۆمەڵەی «ژ.ک» بوو. لەبیرمە «میرحاج» هاتوچووی ماڵی دەکردین. زۆر جارانیش کاکە «رەحمانی زەبیحی»

دەهات دەیگوت نان‌وچای بەیانی لەگەڵ تۆ دەخۆم. جاری وابوو بابم بە شەو دەڕۆیی و بە ئێمەی نەدەگوت دەچێتە کوێ و درەنگانی شەوێ دەهاتەوە. بەڵام بەبیرم نایە چووبێتە ئەودیو.

ئەمن منداڵ بووم و تازە دەچوومە مەدرەسە. بابم لە «باڵانیش»ی پەنا «ورمێ» دەگەڵ کاک «رەحمانی زەبیحی» و کاک «دڵشادی رەسووڵی» گیران. ویستبوویان کارت و شتی کۆمەڵەی «ژ.ک» بڵاو بکەنەوە. کە گیران، لە نێو شاردا بڵاو بۆوە کوتیان کوڕی «میرزا جەلیلی فاڕووقی» راپۆرتی لێداون. پێم وایە ناوی «محەممەدی فاڕووقی» بوو. دواتر کە بابم لە بەندیخانە ئازاد بوو بە دەستووری «پێشەوا» نێردرا نەخۆشخانەی رووسەکان لە تەورێز و پاشان لەبەر ناسازی و نەخۆشی ئەو ماوەی بەندیخانەی، نێونێوە هاتوچووی «تاران»ی دەکرد؛ لەوێ ئەو «فاڕووقی»یە چووبوو گوتبووی مـن راپـۆرتم لێداون، دەنا دۆستی زۆر نیزیکی بابیشم بوو.(؟!)

شەش‌حەوت مانگ گیران. لەبیرمە ئەودەمی کە بابم گیرابوو، دەساڵانە بووم. رۆژێکی لە سەر رێگای چوونەوەم بۆ مەدرەسەی، «قازی محەممەد» دیتمی، کەوشەکەم دڕابوو. یەکێکی راسپارد بۆ من کەوش بکڕێ، بۆیان کڕیم. زۆر جار بە بەر دەرکی «حیزب»دا دەڕۆیشتم تووشی «قازی محەممەد» دەبووم کوڵی گریانی دەهات بۆ من. زۆر باش لە بیرمە ئەو دەمی کە بابم گیرابوو، «قازی محەممەد» ٥٠٠تمەنی بۆ ناردین، هەمووی دووتمەنی کاغەزی بوو. هەموو جارێ رۆن و کەل‌وپەلی دیکەشیان بۆ دەناردین؛ جارێکیش «حاجی مستەفای داودی» پووڵی داینێ و کوتی بیدەن بە قەند و چا و شتی وا.

رۆژێک خەبەریان داینێ کە بابم ئازاد بووە، ئێمە زۆر خۆشحاڵ بووین کەچی دیسان هەر ئەوێ رۆژێ گرتبوویاننەوە. چونکە لێرە وەختێک ئەو سێ کەسە ئازاد بوون کردیانە جێژن، بۆیە ئەوان دیسان گرتبوویاننەوە. دوای ئەوە ئەو جار بە ئەسەحی خەبەریان داینێ کە هەموو ئازاد کراون، بەڵام بابم لە تەورێز لە نەخۆشخانەی شووڕەوی ماوەتەوە. پێشەوا «قازی محەممەد»، «میرزا کەریمی خوسرەوی» راسپارد من ببەنە لای بابم، چوومە تەورێز و لەوێ چاوم

بابم دەیگێڕاوە کە لە زیندان چییان بە سەر هێناون. دەیکوت: لە دیوێکیان کردبووین، ئاویان لە بن دەکردین و سەموونێکی رەقوتەقیان دەداینێ. بۆیە ئەو ئاوەشیان دەبالْ دەکردین هەتا وردەوردە فەلەج بین. من هەموو سەموونەکانم نەدەخوارد، ئەوەی دەماوە لە سەر یەکم دادەنان و دەمکردە کورسی و لە سەریان دادەنیشتم. رۆژێکی بردیانمە لای ئەو سەرهەنگەی محاکمەی دەکردم. یەک دانە لەو سەموونانەم دەگەلْ خۆم برد و کوتم قوربان لە زیندان ئەوەمان دەدەنێ، ئایا ئەوە دروستە؟...

دوایە لە مەهاباد سێ کوڕە سەرهەنگ و ئەفسەریان گرتبوو، ئەوانیان بەو سێ نەفەرە گۆڕییەوە. چەند سالْ دواتر لە بابم دەپرسی بابە پشتت بۆ وایە، دەیکوت رۆلە لە سەر ئەسپی کەوتووم. بە ئێمەی نەدەکوت. ئاخری رۆژێکی درکاندی و کوتی لە زیندان بە نالْی ئەسپ داغیان کردووم!!

ئەو دەمەی کۆمەلەی «ژ.ک» بوو بە «حیزبی دێموکڕات»، ئەو هەر موعەللیم بوو. لە سەردەمی کۆماری کوردستان هیچ پۆستێکی نەدرابوویە. لەو ماوەیەدا حکوومەتی «قازی محەممەد» تێکچوو، ئەویش هەر نەخۆش بوو. رۆژێکی چووە سەربانی دیتی «قازی محەممەد» و چەند کەسی دی لە سێدارە دراون، هاتە خوارێ بە دایکمی کوت بە خودای مالوێران بووین، ئاغا (پێشەوا) و ئەوان ئیعدام کران. بۆ سبەینێ رۆیشتە «مزگەوتی قازی» بزانێ چ خەبەرە، چەند رۆژ دوایە رۆیشتە «قزلْجە» و لەوێشڕا چووبووە «خانەقای شێخی برهان». ماوەیەک لەوێ ماوە و دوایە هاتەوە مەهابادێ. «سەرهەنگ موزەففەری» لێرە بوو کوتبووی «میرزا قاسمی قادری» کاتی خۆی جەزای خۆی چێشتووە (ئەودەم کە لەگەلْ زەبیحی و دلْشاد گیرابوون) تاقیبی مەکەن.

ماوەی چوار سالْ بۆ ورمێ دووریان خستینەوە (تەبعید). هەلْبەت بە ورمێش رازی نەبوون و بڕیار وا بوو بۆ دێیەکی دوورەدەستی دەوری ئەو شارەمان تەبعید بکەن، بەلاّم رازی نەبوونی بابم لە لایەک و نەخۆشییەکەشی لە لایەک، بەرپرسانی ئەو کاتی رازی کرد هەر لە ورمێ بمێنینەوە. بابم لە دوو سێ قوتابخانەی جیاواز و لە پۆلەکانی سەرەتایی دەرسی بە منداڵان دەکوتەوە. لەو ماوەیەشدا و لە کۆتایی تەمەنیدا هەر زەلیل بوو چونکە «کیسەی سەفرا»ی عەمەل کرابوو.

پێم وایە ڕەشەمەی ساڵی ۱۳٤۸ بوو کە ئەمری خودای کرد و لە سەر وەسیەتی خۆی لە دێی «خانەقای شێخی برهان» ناشتمان. چونکە کێلوقەبرێکی وای نەبوو، دوایە قەبرەکەشمان لێ ون بووا؟»

قسەکان «فاتمە خانمی قادری قازی» لێرەدا کۆتایی پێهات. با بزانین سەرچاوەکانی دیکە سەبارەت بە «میرزا قاسمی قادری قازی» چۆن دواون و چیان نووسیوە:

«ویلیام ئیگلتۆن» لە کتێبی «جمهوری ۱۹٤٦ کردستان»، وەرگێڕدراوی کاک «محەممەدی سەمەدی»، لاپەڕە ٧٦ و ٧٧ و لە بەشی «ئەندامەتی قازی محەممەد»دا دەڵێ: «... هەر بۆیە لە یەکێک لە ڕۆژەکانی مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ۱۹٤٤ «قازی محەممەد» بۆ ماڵی «ئەحمەدی ئیلاهی» بانگهێشتن کرا. لەوێ بیستوچوار کەس لە ئەندامانی کۆمەڵە [ی ژ.ک] کۆ ببوونەوە و لە نێو ئەواندا دە کەس زۆر جێگای متمانە و باوەڕ بوون. بابەتەکەیان بە هەمووان ڕانەگەیاند، بڕیار درا کە دوو کەس «قاسمی قادری» و «قادری مودەڕڕیسی» لە دیوێکی دیکەدا لەگەڵ قازی قسە بکەن و داوای لێبکەن ببێتە ئەندامی کۆمەڵەی «ژ.ک». ئەگەر پەسندی نەکرد هەر لەو دیوەڕا بڕوا و نەیەتە نێو میوانەکان، ئەگەریش قبووڵی کرد و وەڵامی «بەڵێ»ی داوە، بێتەوە دیوەکەی هەوەڵێ و بگەڕێتەوە نێو میوانەکان و لەوێ ڕێوڕەسمی سوێندخواردن بەجێ بێنێ. «قازی محەممەد» بێ دوودڵی و شک و گومان ئەندامەتی کۆمەڵەی «ژ.ک»ی قبووڵ کرد. ئەگەرچی وەک ئەندامی کومیتەی مەرکەزی هەڵنەبژێردرا، بەڵام لە ڕاستیدا ڕێنوێن و زمانحاڵی کۆمەڵە [ی ژ.ک] بوو.»

ئەوەی لێرەدا بۆ ئێمە گرینگە ئەوەیە کە «میرزا قاسمی قادری قازی» لە باوەڕپێکراوترین ئەندامانی کۆمەڵەی «ژ.ک» بووە و یەکێک لەو کەسانەی پێشنیاری ئەندامەتی بە پێشەوا «قازی محەممەد» داوە.

کاک «سەید محەممەدی سەمەدی» لە لاپەڕە ۲۰ و ۲۱ی «ضمیمە نگاهی بە تاریخ مهاباد»دا باسی سێ کەس دەکا کە بە هۆی پێوەندی لەگەڵ «تاران»لە سەردەمی «حکوومەتی کوردستان»دا لە زیندانی «بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی حکوومەتی کوردستان» لە مەهاباد دەسبەسەر بوون. ئەو سێ کەسە بریتین لە «محەممەدی فاڕووقی»، «مەلا عەبدوڕڕەحمانی سورنجداغی» و «هەمزە قاوەچی»

لە لاپەرە ٤٠٠ی هەمان سەرچاوەی پێشوودا سەبارەت بە «میرزا جەلیلی فارووقی»ناوێکیش دەنووسێ: «چەند کەسی وەک «میرزا جەلیلی فارووقی» و مامۆستا «ئەحمەدی تورجانیزادە» (مامۆستای پێشووی زانکۆی تەورێز) بوونە مامۆستای قوتابخانەکان» (مەبەست مامۆستای «قوتابخانەی سەعادەت» لە مەهابادە.)

پێم وایە ئەو «محەممەدی فارووقی»یەی لێرەدا ناوی هاتووە هەمان کەسە کە «فاتمە خانمی قادری قازی» دەڵێ راپۆرتی لە «میرزا قاسمی قادری قازی» باوکی و مامۆستا «زەبیحی» و کاک «دڵشادی رەسووڵی» داوە. ئەگەر ئەو بۆچوون و بابەتانەی بۆ ئەم بەشە باسمان لێکردن راست بن، ئەوە بەو ئاکامە گرینگە دەگەین کە بەراستی ئەو تۆمەتەی دەخرێتە ئەستۆی پێشەوا «قازی محەممەد» کە لەقسان ئەو بە ئانقەست ئەو سێ کەسەی بۆ ئەو مەئموورییەتە ناردووە هەتا بگیرێن و دواتر لە نەبوونی واندا «کۆماری کوردستان» رابگەیەنێ، تەواو رەد دەبێتەوە. رەنگە ئەو «میرزا جەلیلی فارووقی»یەش کە لێرەدا ناوی هاتووە باوکی «محەممەدی فارووقی»بێ. با ئەوەش بڵێم کە روونکردنەوەی ئەوە کە «میرزا جەلیلی فارووقی» چ پێوەندییەکی لەگەڵ «محەممەدی فارووقی» هەبووە، هیچ لە کەسایەتی ناوبراو کەم ناکاتەوە. رەنگە واش نەبێ و هیچی یەکتر نەبن. خودی «محەممەدی فارووقی»ش دواتر ئەوەندەی پیاوەتی کردووە و داوای لێبووردنی لە «میرزا قاسمی قادری قازی» و دوو هاورێکەی دیکەی کردووە کە تووشی ئەو هەڵە گەورە بووە.

سەبارەت بە ئەندامەتی «میرزا قاسمی قادری قازی» لە کۆمەڵەی «ژ.ک»، هەروەک لە چەند لاپەرەی جیاوازی ئەم بەرهەمەدا ناوی هاتووە، ناوبراو یەکێک لەو یازدە کەسەی دامەزرێنەر و بناغەدانەری کۆمەڵەی «ژ.ک» بووە.

لە نامەیەکی مامۆستا «زەبیحی»دا و لەسەر داوا و ویستی سەرکونسوولی یەکێتی سۆڤیەت لە تەورێز کە رێکەوتی ١٩٤٤/١٢/٢٣ی بە سەرەوەیە، «میرزا قاسمی قادری قازی» وەک یەکێک لە ئەندامانی هەڵسوور و بەبیروباوەری کۆمەڵەی «ژ.ک» ناسێندراوە. لیستەکە ناوی ٢٢ ئەندامی تێدایە کە ژمارە «یەک»ی ئەندامەکان «میرزا قاسمی قادری»یە. «میرزا قاسمی قادری قازی»

یەکێک بووە لەو چەند کەسەی وەک نوێنەری کۆمەڵەی «ژ.ک» داوای دامەزراندنی «کۆمەڵەی پێوەندییەکانی فەرهەنگی شووڕەوی و کوردستان»ی لە مەهاباد کردووە. (بڕواننە لاپەڕە ٥٠ی کتێبی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان» نووسراوی کاک »حامیدی گەوهەری»).

ناوی نهێنی «میرزا قاسمی قادری قازی» لە کۆمەڵەی «ژ.ک»دا «ق.ق.ق. پیاو» و ژمارە ئەندامەتیشی ١٠٥٣بووە. هەڵبەت ئەو ژمارەیە ئەوە ناگەیەنێ کە وا درەنگ بووبێتە ئەندامی ئەم کۆمەڵە. هەروەک پێشتر گوتمان ناوبراو یەکێک لە دامەزرێنەرانی سەرەکی کۆمەڵەی «ژ.ک» بووە و تەنانەت ژمارەی ئەندامەتیشی نهێنی بووە.

«میرزا قاسمی قادری قازی» وێڕای مامۆستا «زەبیحی» و کاک «دڵشادی رەسووڵی» لە مەئمووریيەتێکی کۆمەڵەی «ژ.ک»دا لە «بالانیش» دەگیرێ و نیزیک ٦،٧ مانگ لە بەندیخانەی تاران دەمێنێتەوە. ناوبراو لە پەیمانی دووقۆڵی نێوان کۆمەڵەی «ژ.ک» و کۆمەڵەی «هیوا»دا کە ناوی «پەیمانی سێسنوور»ی لە سەر داندرا، وێڕای مامۆستا «زەبیحی» و مامۆستا «هەژار» بەشدار بووە و سەرۆکی نوێنەرانی هەردووک کۆمەڵە بووە.

«میرزا قاسمی قادری قازی» ئەندامی هەیئەتی ناوەندی و هەیئەتی ئیستیشارەی کۆمەڵەی «ژ.ک» بووە. (بڕواننە پێڕستی ناوەکان و ئەو لاپەڕانەی ناوی «میرزا قاسمی قادری قازی» تێدایە)

بەپێی لاپەڕەکانی ١٩٨و ٢٠٢و ٢٠٣و ٢٠٥و ٢٠٨و ٣٨٧ی کتێبەکەی «دوکتور قادری مەحموودزادە (ئاسۆ)» (خاطرات زندگی پر ماجرای دکتر آسو ـ چهره مهاباد» کە لەودا باسی «میرزا قاسمی قادری قازی» هاتووە، دەردەکەوێ کە ناوبراو لە جۆزەردانی ساڵی ١٣٢٩ی کۆچی هەتاوی (مانگی مەی ١٩٥٠ی زایینی) لە «ورمێ» بووە و وەک مامۆستای قوتابخانە بۆ ئەو شارە دوور خراوەتەوە (تەبعید). جا روون نییە چەند ساڵ پێشتر دوور خراوەتەوە «ورمێ» و تا چ ساڵێکیش لەوێ ماوەتەوە.

«دوکتور ئاسۆ» لە کتێبەکەیدا زۆر تاریفی پیاوەتی و گەورەیی و

لە قوتابخانەی «محەممەدڕەزاشای پەهلەوی» شاری «ورمێ» وەک مامۆستا خزمەتی دەکرد و وێڕای «مستەفای موئمینی» بۆ ئەو شارە دوور خرابۆوە.

کاک «خەلیلی فەتاحی قازی» لە چەند لاپەڕەی جیاوازی کتێبەکەیدا (تاریخچۀ خانوادۀ قاضی در ولایت موکری» باسی «میرزا قاسمی قادری قازی» کردووە.

لە لاپەڕە ٦٧ی کتێبەکەیدا باسی کوژرانی کوڕێکی «قادری قازی» باوکی «میرزا قاسم» بە ناوی «میرزا سەعید» دەکا و دەڵێ: «رووسەکانی تیزاری لەو چەند ساڵەی شەڕی نێونەتەوەیی یەکەمی جیهانی (١٩١٤ ـ ١٩١٨ی زایینی) زەبری کوشەندەی گیانی وماڵییان لە کوردستان دا. خودالێخۆشبوو میرزا «فەتاحی قازی» کوڕی میرزا «ئەحمەدی قازی» و میرزا «ئەحمەدی عەلی گۆلێ» کوڕی حاجی «ڕەحیمی قازی» و «میرزا سەعید» کوڕی «قازی قادر»یان کوشت و خانووی خودالێخۆشبوو «قازی عەلی» و «میرزا فەتاحی قازی» و «قازی مونعیم»ی کوڕی «قازی وەهاب»یان ئاور تێبەردا...»

لە لاپەڕە ١١٧شدا باسی ڕۆژی هێرش کردنە سەر ئیدارەی شارەوانی مەهاباد لە ڕێکەوتی ١٣٢٣/١١/٢٦ی هەتاوی دەکا و لە درێژەی باسەکەیدا لە لاپەڕە ١٢٢ باسی ئەوە دەکا کە لە لایەن «میرزا قاسمی قادری قازی»یەوە لە پیلانی کوشتنی پێشەوا «قازی محەممەد» ئاگادار کراوەتەوە.

«قازی محەممەد» لە سەر ڕێگای هاتنەوەی لە تاران لایدابووە گوندی «گوێکچەلی» و ڕۆیشتبووە لای خزمەکانی. بەپێی قسەکانی «میرزا قاسمی قادری» بڕیار وابوو لە لایەن نەیاران و دوژمنانەوە «قازی محەممەد» لە سەر ڕێگای هاتنەوەی لە تاران بکوژرێ. هەر بۆیە «کاک خەلیلی فەتاحی قازی» وێڕای «میرزا قاسم» و چەند کەسی دیکە بە چەکەوە دەچنە گوندی «گوێکچەلی» لە سەر ڕێگای «میاندواو» و «پێشەوا قازی» لە ڕووداوی گرتنی بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی و هەوڵی کوشتنی خۆی ئاگادار دەکەنەوە و بۆ سبەینێ وێڕای چەند چەکداری دیکە دەگەڕێنەوە مەهاباد.

کاک «حامیدی گەوهەری» لە کتێبی «کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان» و لە «لاپەڕەکانی ٣٥و ٣٦و ٥٠و ١٠٩و ١٢٠دا باسی «میرزا قاسمی قادری قازی» کردووە. ئێمە لە زۆربەی ئەو لاپەڕانە و لە جێی خۆی کەلکمان وەرگرتووە. ئەوەی بۆ ئەم

بەشە لەم وتارەی ئێمەدا گرینگە لاپەڕەکانی ٣٥و ٣٦ی کتێبەکەیە. کاک «حامیدی گەوهەری» لەو دوو لاپەڕەیەدا بەو چەشنە باسی «میرزا قاسمی قادری» کردووە:
«قاسمی قادری کوڕی قازی قادر کوڕی میرزا رەحمان کوڕی میرزا عەبدوڵڵای قازی، کارمەندی ئیدارەی فێرکردن و بارهێنان (فەرهەنگ)ی شاری مەهاباد و مامۆستای قوتابخانەکانی ئەو شارە بووە.
دوای هەڵوەشانی «کۆمەڵەی ئازادیخوازی کوردستان» لە ساڵی ١٩٤١دا، یەکێک بووە لە کەسایەتییە هەرە بەتەمەنەکانی کورد کە بەشداری کردووە لە زیندوو کردنەوەی ئەو ڕێکخراوەیەدا... لە مەئموورییەتێکی هەیئەتی ناوەندی کۆمەڵەدا کە خەریک بووە لەگەڵ زەبیحی و محەممەد دڵشادی رەسووڵی لە مانگی خەزەڵوەری ١٣٢٤ ـ ١٩٤٥ بچێ بۆ هەرێمەکانی ورمێ و سەڵماس و ماکۆ، لە نیزیک بەندی ورمێ دەکەمینی ئەرتەش و ژاندارمەکانی ورمێ دەکەوێ و دوای هەڵوەشانی «ژ.ک» و دامەزرانی کۆماری کوردستان ئازاد دەکرێ. [بۆ روون بوونەوەی رۆژی گیران و ئازادبوونیان بڕواننە لاپەڕەکانی ١٠٠و ١٠٢و ١٠٣و ١٠٧ تا ١٠٩ی ئەم بەرهەمە] قازی لەوە دەچێ دوای رووخانی کۆماری کورنستان چووبێتە ورمێ و لە ئیدارەی فێرکردن و بارهێنانی ئەو شارە مامۆستایەتیی کردبێ، چونکە دوکتور قادری مەحموودزادە (ئاسۆ) لە بیرەوەرییەکانیدا پەنجە بۆ ئەو یارمەتییانە رادەکێشێ کە ناوبراو لە ساڵانی دوای رووخانی کۆماری کوردستان بە کوردەکانی مهابادی کردووە. قاسمی قادری لە ساڵانی ١٣٤١ یان ١٣٤٢ هەتاوی کە دەبێتە ٦٢ ـ ١٩٦٣ زایینی لە مهاباد کۆچی دوایی کردووە و تەرمی پیرۆزی لە گۆڕستانی ئەو شارە بە خاکی نیشتمان سپێردراوە.»
ئەوەی وەک تێبینی لە سەر نووسراوەکەی کاک «حامیدی گەوهەری» پێویستە باسی لێوە بکرێ، هەتا ئێرە ئەوەیە کە بە روونی «میرزا قاسمی قادری قازی» یەکێک لە ئەندامە بەتەمەنەکانی کۆمەڵەی «ژ.ک» بووە، بەڵام «هەرە بەتەمەن» نەبووە، بەڵکوو بەتەمەنترین ئەندامی دامەزرێنەری کۆمەڵەی «ژ.ک» «مەلا عەبدوڵڵای داودی» (مەلای حەجۆکی) بووە.
«میرزا قاسم» هەروەک لە نووسراوەکانی «دوکتور ئاسۆ»دا هاتووە و «فاتمە خانمی قاسمی قادری»یش باسی دەکا، لە «ورمێ» وەک مامۆستای

«میرزا قاسم»یش پێک هاتووە، «میرزا قاسم» لە «خانەقای شێخی برهان» نێژراوە نەک مەهاباد.

ئەوەی ماوە و گرینگی تایبەتی هەیە، دیاری کردنی ڕێکەوتی لە دایک بوون و کۆچی دوایی «میرزا قاسمی قادری قازی»یە.

بەپێی بەڵگە و ناسنامە، «میرزا قاسمی قادری قازی» ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ١٢٧٨/٦/١٥ی کۆچی هەتاوی بەرامبەر دەگەڵ ٨ی سێپتامبری ١٨٩٩ی زایینی لە مەهاباد لە دایک بووە و لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا و لە ڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی ١/٥ /١٣٤٧ی کۆچی هەتاوی بەرامبەر دەگەڵ ٢٥ی مارسی ١٩٦٨ی زایینی لە مەهاباد کۆچی دوایی کردووە و لەسەر وەسیەتی خۆی لە گوندی «خانەقای شێخی برهان» نێژراوە.

من لەو بڕوایەدام کە «میرزا قاسمی قادری قازی» ئەندامی «کۆمەڵەی ئازادیخوازانی کوردستان»یش بووە. بەڵگەی ئەو بۆچوونەشم ئەو وێنەیەیە کە ناوبراو بەچەکەوە لە ساڵی ١٣٠٤ی هەتاوی گرتوویەتی. دیارە زۆر زووتر لەو ڕێکەوتەی کە «کۆمەڵەی ئازادیخوازانی کوردستان» و کۆمەڵەی «ژ.ک» دامەزرێندراون، ناوبراو هەستی کوردایەتی و نەتەوەپەرستی لە نێو دڵ و مێشکدا هەبووە.

بەداخەوە «میرزا قاسمی قادری قازی» لە هیچ کام لە بڵاوکراوەکانی سەردەمی کۆمەڵەی «ژ.ک» و «کۆماری کوردستان» وتار و ناوێکی لێ نابیندرێ. جگە لەو دوو ژمارەی کوردستان کە ئەویش هەواڵی ئازادبوونی ئەو دوو هاوڕێیەکەی دیکەی تێدا بڵاو بۆتەوە.

سەبارەت بە کەسایەتی «میرزا قاسمی قادری قازی»یش پێم وایە دۆست و دوژمنی لە سەر ئەو بڕوایەن کە ئینسانی وا خۆشناو و مامۆستای هێندە بەڕوحم و تێکۆشەری هێندە دڵسۆز و موحتەرەم و زانای هێندە لێهاتوو بەدەگمەن هەڵدەکەوێ. ناوبراو لە قوتابخانەکانی مەهاباد و ورمێ و... دەرسی گوتووەتەوە و نموونەی ڕەوشتی باش و مامۆستایەکی پەرۆش بۆ داهاتووی گەلەکەی بووە.

# سەرچاوەکانی پاشکۆی دوو

ئەو سەرچاوە تازانەی لەم دواییانەدا وەدەستم کەوتوون و بۆ نووسینی بەشی کۆتایی ئەم بەرهەمە کەلکم لێ وەرگرتوون ـ جگە لەو سەرچاوانەی پێشوو کە دووبارە کەلکم لێ وەرگرتوون ـ بریتین لە:

١ـ رۆژنامەی کوردستان ـ مەهاباد ١٣٢٤ ـ ١٣٢٥ی هەتاوی (١٩٤٦) لە ئامادە کردنی: رەفیق سالح و سدیق سالح، پرۆژەی هاوبەشی بلاوکردنەوەی ئاراس و بنکەی ژین، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٧.

٢ـ هەورامی، ئەفراسیاو (دوکتور): رۆژهەلاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا (بەپێی بەلگەنامەکانی ئەرشیفی یەکێتی سۆڤیەت) - پێداچوونەوە و ئامادە کردنی: سدیق سالح - چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٨

٣- شاپەسەندی، محەممەد: بیرەوەریەکانی محەممەدی شاپەسەندی، ئامادەکردنی: سدیق سالح، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٧.

٤- هەورامی، ئەفراسیاو (دوکتور): رووداوەکانی رۆژهەلاتی کوردستان لە بەلگەنامەی سۆڤێتیدا (١٩٤٥ - ١٩٤٧) - پێشەکی و پێداچوونەوە و پەراوێز بۆ نووسینی: د. یاسین سەردەشتی، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، بنکەی ژین،

# چەند وێنەی دەگمەن



«A»

لە ڕاستەوە: ١- شێخ عوبەیدیللای زینویَ «نوێنەری کۆمەڵەی هیوا» ٢- سەعیدی کانی‌مارانی «خوارزای شێخ عوبەیدیللای زینویَ» ٣- عەبدورڕەحمانی شەرەفکەندی (مامۆستا هەژار) «نوێنەری کۆمەڵەی ژ.ک» ٤- سەید عەزیزی شەمزینی (گەیلانی) «نوێنەری کۆمەڵەی هیوا» ٥- عەبدورڕەحمانی زەبیحی «نوێنەری کۆمەڵەی ژ.ک» ٦- میرزا قاسمی قادری قازی «نوێنەری کۆمەڵەی ژ.ک و سەرۆکی نوێنەران»

تێبینی: ئەو وێنە دەگمەنە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور گیراوە و بۆ یەکەم جاریشە لەم بەرهەمەدا بلاو دەکرێتەوە.

بۆ زانیاری زیاتر بڕواننە ئەم لاپەڕانە: ١٨٠ - ١٨١ - ١٨٣ تا ١٨٥ - ١٩٠ - ٢١٩ تا ٢٢٤ - ٣١٤

سەعیدی کانی‌مارانی ئەندامی کۆمەڵەی هیوا نەبووە؛ بەڵکوو وەک هاوڕێ دەگەڵ دوو ئەندامی نوێنەری کۆمەڵەی هیوا لەو کۆبوونەوەدا بەشداری کردووە. (بڕواننە لاپەڕەی ١٨١)



«B»

لە ڕاستەوە: ١- میرزا قاسمی قادری قازی ٢- عەبدوڕڕەحمانی شەڕەفکەندی ٣- عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی < سێ ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک > ٤- سەید عەزیزی شەمزینی (گەیلانی) ٥- سەعیدی کانیمارانی ٦- شێخ عوبەیدیللای زینوێ < دوو ئەندامی کۆمەڵەی هیوا و هاوڕێکەیان >

تێبینی: ئەو وێنە دەگمەنە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور گیراوە و بۆ یەکەم جاریشە لەم بەرهەمەدا بڵاو دەکرێتەوە.

بۆ زانیاری زیاتر بڕواننە ئەم لاپەڕانە: ١٨٠ - ١٨١ - ١٠٣ تا ١٨٥ - ١٩٠ - ٢١٩ تا ٢٢٤ - ٣١٤

سەعیدی کانیمارانی ئەندامی کۆمەڵەی هیوا نەبووە؛ بەڵکوو وەک هاوڕێ دەگەڵ دوو ئەندامی نوێنەری کۆمەڵەی هیوا لەو کۆبوونەوەدا بەشداری کردووە. (بڕواننە لاپەڕەی ١٨١)

وەک لە لاپەڕەکانی ١٨٠ و ١٨١ی ئەم بەرهەمەدا هاتووە؛ مامۆستا هەژار لە چێشتی مجێوردا دەڵێ: «مانگی جۆزەردان بوو... لە گوندی قاسملوو میوانی مستەفاغا ناوێک بووین. کابرا دەیەویست رووتمان کا بەڵام کە زانی دەمانچەمان پێیە وازی هێنا.» لە وێنەکانی A و B و Cدا دەبینین کە مامۆستا هەژار و مامۆستا زەبیحی دەمانچەیان دەبەر پشتێندیدایە.

هیچ دوور نییە هەر چوار وێنەی ئەم پەیمانە (وێنەکانی A و B و C و D) لە گوندی گردوان یا نزیک رەشماڵی شێخ عەبدوڵلا (حاجی سەید عەبدوڵلای ئەفەندی) لە «دزە» گیرابێ. هۆی ئەو

سرنج بدەین دەبینین کێوەکانی دەوروبەر پەڵەپەڵەی بەفریان پێوە ماوە کە ئـەویش بـە هـۆی کوێستانی بوونی ناوچەکەیە. هەڵبەت ئەو بابەتە بۆچوونی ئەو نووسەرانەش ڕەد دەکاتەوە کە پێیان وایە پەیمانی «سێ سنوور» لە مانگی ئاگۆست (گەلاوێژ)دا پێکهاتووە. ئەو چەند بۆچوونە هەموو ئەوە دەسەلمێنن کە ئەم چوار وێنە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور گـیراون. ڕەنگە وێنەگریش هەر ئەو کەسە بێ کە لە بەڵگەی پەیمانی سێ سنووردا بە م.س.خوێنین رابیتی دوو کۆمەڵەی ژ.ک و هیوا ناسێندراوە (بڕواننە لاپەڕەکانی ٢٨٣ تا ٢٨٥ و ٣٢١)

لێرەدا تەواو بۆمان دەردەکەوێ کە مامۆستا هـەژار ئـەو باسـەی چەنـد بـە ڕاسـتودروسـتی گێڕاوەتەوە. هەروەها بۆچوونەکانی پێشووشمان تەواو دەسـەلمێنێ کـە بەشـدارانی پـەیمانی «سێسنوور» هەر ئەوانە بوون کە مامۆستا هەژار ناوی بردوون.



«C»

لە ڕاستەوە: ١- عەبدوڕڕەحمانی شەڕەفکەندی ٢- عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی ٣- میرزا قاسمی قادری قازی ٤- سەعیدی کانی‌مارانی «بڕواننە لاپەڕەکانی ١٨٠ و ١٨١»

تێبینی: ئەو وێنە دەگمەنە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور گیراوە و بۆ یەکەم جاریشە لەم بەرهەمەدا بڵاو دەکرێتەوە.



«D»

لە ڕاستەوە: ١- شێخ عوبەیدیللای زینوێ ٢- سەید عەزیزی شەمزینی «بڕواننە لاپەڕەکانی ١٨٠ – ١٨١ – ١٩٠ – ٢٢٢ تا ٢٢٤ – ٣١٤»

تێبینی: ئەو وێنە دەگمەنە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور گیراوە و بۆ یەکەم جاریشە لەم بەرهەمەدا بڵاو دەکرێتەوە.



«E»

**لە ڕاستەوە: ١- میرزا محەممەدی تۆکمەچی (؟) ٢- میرزا قاسمی قادری قـازی « نەخۆشـخانەی شووڕەوی لە تەورێز»**




«F»

له ڕاستەوە: ١- میرزا قاسمی قادری قازی ٢- میرزا محەممـەدی کـوڕی مـیرزا حوسـێنی قـازی ساوجبلاغی

تێبینی: ئەو وێنەیە ڕۆژی پێنجشەممە ڕێکەوتی ٢٠ی ڕەجەبی ساڵی ١٣٤٤ای کۆچی مـانگی «١٥ی ڕێبەندانی ١٣٠٤ کۆچی هەتاوی» «٤ی فێورییەی ١٩٢٦ای زایینی» گیراوە.



«G»

لە ڕاستەوە: ١- میرزا قاسمی قادری قازی ٢- میرزا سەعیدی داوەری (؟) ٣- عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی



«H»

**لە ڕاستەوە: میرزا قاسمی قادری قازی و عەبدولقادری برازای**

**تێبینی: بەپێی نووسراوەی پشتی وێنەکە ڕێکەوتی گیرانی ئەم وێنەیە ڕۆژی دووشەممە ٢٨ی خەزەڵوەری ١٣٠٧ی هەتاوی بەرامبەر بە ١٩ی نوامبری ١٩٢٨ی زایینییە.**

# چەند وێنەی دەگمەن



«A»

لە ڕاستەوە: ١- شێخ عوبەیدیللای زینوێ «نوێنەری کۆمەڵەی هیوا» ٢- سەعیدی کانیمارانی «خوارزای شێخ عوبەیدیللای زینوێ» ٣- عەبدوڕڕەحمانی شەرەفکەندی (مامۆستا هەژار) «نوێنەری کۆمەڵەی ژ.ک» ٤- سەید عەزیزی شەمزینی (گەیلانی) «نوێنەری کۆمەڵەی هیوا» ٥- عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی «نوێنەری کۆمەڵەی ژ.ک» ٦- میرزا قاسمی قادری قازی «نوێنەری کۆمەڵەی ژ.ک و سەرۆکی نوێنەران»

تێبینی: ئەو وێنە دەگمەنە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور گیراوە و بۆ یەکەم جاریشە لەم بەرهەمەدا بڵاو دەکرێتەوە.

بۆ زانیاری زیاتر بڕواننە ئەم لاپەڕانە: ١٨٠ - ١٨١ – ١٨٣ تا ١٨٥ – ١٩٠ – ٢١٩ تا ٢٢٤ – ٣١٤

سەعیدی کانیمارانی ئەندامی کۆمەڵەی هیوا نەبووە؛ بەڵکوو وەک هاوڕێ دەگەڵ بوو ئەندامی

«B»

لە ڕاستەوە: ١- میرزا قاسمی قادری قازی ٢- عەبدوڕڕەحمانی شەرەفکەندی ٣- عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی < سێ ئەندامی کۆمەڵەی ژ.ک > ٤- سەید عەزیزی شەمزینی (گەیلانی) ٥- سەعیدی کانیمارانی ٦- شێخ عوبەیدیللای زینوێ < دوو ئەندامی کۆمەڵەی هیوا و هاوڕێکەیان >

تێبینی: ئەو وێنە دەگمەنە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور گیراوە و بۆ یەکەم جاریشە لەم بەرهەمەدا بلاو دەکرێتەوە.

بۆ زانیاری زیاتر بڕواننە ئەم لاپەڕانە: ١٨٠ - ١٨١ - ١٠٣ تا ١٨٥ - ١٩٠ - ٢١٩ تا ٢٢٤ - ٣١٤

سەعیدی کانیمارانی ئەندامی کۆمەڵەی هیوا نەبووە؛ بەڵکوو وەک هاوڕێ دەگەڵ دوو ئەندامی نوێنەری کۆمەڵەی هیوا لەو کۆبوونەوەدا بەشداری کردووە. (بڕواننە لاپەڕەی ١٨١)

وەک لە لاپەڕەکانی ١٨٠ و ١٨١ی ئەم بەرهەمەدا هاتووە؛ مامۆستا هەژار لە چێشتی مجێوردا دەڵێ: «مانگی جۆزەردان بوو... لە گوندی قاسملوو میوانی مستەفاغا ناوێک بووین. کابرا دەیەویست ڕووتمان کا بەڵام کە زانی دەمانچەمان پێیە وازی هێنا.» لە وێنەکانی A و B و Cدا دەبینین کە مامۆستا هەژار و مامۆستا زەبیحی دەمانچەیان دەبەر پشتێندیدایە.

هیچ دوور نییە هەر چوار وێنەی ئەم پەیمانە (وێنەکانی A و B و C و D ) لە گوندی گردوان یا نزیک ڕەشماڵی شێخ عەبدوڵلا (حاجی سەید عەبدوڵلای ئەفەندی) لە «دزە» گیرابێ. هۆی ئەو بۆچوونەش جگە لە وتەکانی مامۆستا هەژار، خودی ئەم وێنەیە. لەم وێنەیەدا ئەگەر بە باشی

سرنج بدەین دەبینین کێوەکانی دەوروبەر پەڵەپەڵەی بەفریان پێوە ماوە کە ئەویش بە هۆی کوێستانی بوونی ناوچەکەیە. هەڵبەت ئەو بابەتە بۆچوونی ئەو نووسەرانەش رەد دەکاتەوە کە پێیان وایە پەیمانی «سێ سنوور» لە مانگی ئاگۆست (گەلاوێژ)دا پێکهاتووە. ئەو چەند بۆچوونە هەموو ئەوە دەسەلمێنن کە ئەم چوار وێنە لە رۆژی کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور گیراون. رەنگە وێنەگریش هەر ئەو کەسە بێ کە لە بەڵگەی پەیمانی سێ سنووردا بە م.س.خوێنین رابیتی دوو کۆمەڵەی ژ.ک و هیوا ناسێندراوە (بڕواننە لاپەڕەکانی ٢٨٣ تا ٢٨٥ و ٣٢١)
لێرەدا تەواو بۆمان دەردەکەوێ کە مامۆستا هەژار ئەو باسەی چەند بە ڕاستودروستی گێڕاوەتەوە. هەروەها بۆچوونەکانی پێشووشمان تەواو دەسەلمێنێ کە بەشدارانی پەیمانی «سێسنوور» هەر ئەوانە بوون کە مامۆستا هەژار ناوی بردوون.



«C»

لە ڕاستەوە: ١- عەبدوڕڕەحمانی شەرەفکەندی ٢- عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی ٣- میرزا قاسمی قادری قازی ٤- سەعیدی کانیمارانی «بڕواننە لاپەڕەکانی ١٨٠ و ١٨١»

تێبینی: ئەو وێنە دەگمەنە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور گیراوە و بۆ یەکەم جاریشە لەم بەرهەمەدا بلاو دەکرێتەوە.



«D»

لە ڕاستەوە: ١- شێخ عوبەیدیللای زینوێ ٢- سەید عەزیزی شەمزینی «بڕواننە لاپەڕەکانی ١٨٠ – ١٨١ – ١٩٠ – ٢٢٢ تا ٢٢٤ – ٣١٤»

تێبینی: ئەو وێنە دەگمەنە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی پەیمانی سێ سنوور گیراوە و بۆ یەکەم جاریشە لەم بەرهەمەدا بڵاو دەکرێتەوە.



«E»

لە ڕاستەوە: ١- میرزا محەممەدی تۆکمەچی (؟) ٢- میرزا قاسمی قادری قازی « نەخۆشخانەی شووڕەوی لە تەورێز»

تێبینی: ئەو وێنەیە دوای ئازاد بوونی میرزا قاسمی قادری لە بەندیخانەی قەسری قەجەری تاران گیراوە و میرزا محەممەدی تۆکمەچی سەردانی کردووە. «بڕواننە لاپەڕەکانی ١٠١ – ١٠٢ – ١٣٠»



«F»

لە ڕاستەوە: ١- میرزا قاسمی قادری قازی ٢- میرزا محەممەدی کوڕی میرزا حوسێنی قازی ساوجبلاغی

تێبینی: ئەو وێنەیە ڕۆژی پێنجشەممە ڕیکەوتی ٢٠ی ڕەجەبی ساڵی ١٣٤٤ی کۆچی مانگی «١٥ی



«G»

لە ڕاستەوە: ١- میرزا قاسمی قادری قازی ٢- میرزا سەعیدی داوەری (؟) ٣- عەبدوڕڕەحمانی زەبیحی



«H»

لە راستەوە: میرزا قاسمی قادری قازی و عەبدولقادری برازای

تێبینی: بەپێی نووسراوەی پشتی وێنەکە ڕێکەوتی گیرانی ئـەم وێنەیـە ڕۆژی دووشـەممە ٢٨ی

# سەرچاوەکانی پاشکۆی دوو

ئەو سەرچاوە تازانەی لەم دواییانەدا وەدەستم کەوتوون و بۆ نووسینی بەشی کۆتایی ئەم بەرهەمە کەلکم لێ وەرگرتوون ـ جگە لەو سەرچاوانەی پێشوو کە دووبارە کەلکم لێ وەرگرتوون ـ بریتین لە:

١ـ رۆژنامەی کوردستان ـ مەهاباد ١٣٢٤ ـ ١٣٢٥ی هەتاوی (١٩٤٦) لە ئامادە کردنی: رەفیق سالح و سدیق سالح، پرۆژەی هاوبەشی بلاوکردنەوەی ئاراس و بنکەی ژین، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٧.

٢ـ هەورامی، ئەفراسیاو (دوکتور): رۆژهەلاتی کوردستان لە سەردەمی دووەم جەنگی جیهانیدا (بەپێی بەلگەنامەکانی ئەرشیفی یەکێتی سۆڤیەت) - پێداچوونەوە و ئامادە کردنی: سدیق سالح - چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٨

٣- شاپەسەندی، محەممەد: بیرەوەریەکانی محەممەدی شاپەسەندی، ئامادەکردنی: سدیق سالح، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٧.

٤- هەورامی، ئەفراسیاو (دوکتور): رووداوەکانی رۆژهەلاتی کوردستان لە بەلگەنامەی سۆڤێتیدا (١٩٤٥ - ١٩٤٧) - پێشەکی و پێداچوونەوە و پەراوێز بۆ نووسینی: د. یاسین سەردەشتی، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، بنکەی ژین، سلێمانی ٢٠٠٧.

٥- موکریـانی، گیـو: کەشکۆڵـی گیـو (بـەرگی یەکـەم - پـیتی ئـا)، پێداچوونەوەی و ئامادەکردنی: د.کوردسـتان گیـو موکریـانی، چـاپی یەکـەم، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا ١٩٨٦.

٦- مەلا عززەت، مەحموود: جەمهوریەتی کوردسـتان - لێکۆڵـینەوەیەکی مێژوویی و سیاسییە، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ٢٠٠١.

٧- حـەوێزی، بـەکر عەبدولکـەریم: گەشـتێک بـە کۆمـاری مـەهابادا، (بیرەوەریـەکانم لـە رۆژهـەلاتی کوردسـتاندا ١٩٤٤ - ١٩٤٧)، دەزگـای چـاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠٠١.

٨ - پاشکۆی ئەدەب و هونەر، ژمـارە ٢٦٤، ساڵـی دووەم، پێـنجشـەممە ١٩٩٢/٤/١٥، وتاری: لافاو کێیە؟! نووسەر: کەژاڵ ئیبراهیم.

٩ - حکیمزاده فریدون: سردشت در آئینه اسناد تاریخی، ناشر: مؤلـف، چـاپ اول ١٣٨٣.

١٠- کینـان، درک: کردهـا و کردسـتان (مخـتصر تـاریخ کردسـتان)، ترجمـه: ابراهیم یونسی، چاپ اول، مؤسسه انتشارات نگاه، تهران ١٣٧٢.

١١- روزولت، آرچی بالد: شوق آموختن، ترجمه: صـهبا سـعیدی، چـاپ اول، انتشارات اطلاعات، تهران ١٣٧١.

١٢ـ صمدی، سید محمد: ضمیمه نگاهی به تاریخ مهاباد، چـاپ اول، انتـشارات رهرو، مهاباد ١٣٨٠ ـ ٨١

١٣ـ فتاح قاضی، خلیل: تاریخچه خانواده قاضی در ولایت موکری، چـاپ اول، ناشر: قادر فتاحی قاضی، تبریز ١٣٧٨.

## وتووێژ:

بەڕێزان «فاتمەخانمی قادری قازی» و «میرزا عەبدولغەفووری قادری».